قەشە د. جان فیێ دۆمنیکی



# ئاشووری مەسیحییەت

## بەشدار لە لێکۆڵینەوەی مێژوویی و جوگرافیایی کەنەسی و رەبەنی لە باکوری عێراق کوردستان

وەرگێڕانی
د. جەمیل عیسی کریم

بەشی یەکەم

هەولێر/٢٠١٩

# ئاشووری مەسیحییەت

بەشدار لە لێکۆڵینەوەی مێژوویی و جوگرافیایی
کەنەسی و رەبەنی لە باکوری عێراق (کوردستان)

دانانی
**قەشە د. جان فیێ دۆمنیکی**

وەرگێڕانی
**دکتۆر جەمیل عیسی کریم**

یەشی یەکەم

هەولێر/٢٠١٩

❖ ئاشووری مەسیحییەت
❖ نووسەر: قەشە جان فێی دۆمنیکی
❖ لە فەڕەنسییەوە: یوسف تۆسا
❖ پێداچوونەوە: قەشە د. یوسف تۆما
❖ لە عەرەبییەوە: دکتۆر جمیل عیسی کریم
❖ بابەت: مێژوو
❖ هەڵەگری و پێداچوونەوەو داڕشتنی زمانەوانی : نعمت عبدالله باپیر
❖ قەبارەی کتێب: ١٧ × ٢٤
❖ تیراژ:( ٥٠٠ ) دانە
❖ چاپی یەکەم/ ٢٠١٩
❖ چاپ: چاپخانەی ڕۆژهەڵات-هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان /هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی(٢٥٤٠) ی ساڵی ٢٠١٩ی دراوەتێ.

**پێشکەش بە:**

باوکم و دایکم (عیسی کریم و ساری یلدا) خوایان لێ خۆشبێت

هاوسەری ژیانم (جۆلیت توما)

کچە شیرینەکەم (ماریزابیل)

هەموو مێژوونووسانی کوردستان

# پێرست

## بەشی دووەم

# پێشەکی

بەختەوەرم کە لەپێش چاپ و بڵاو کردنەوەی کتێبی (ئاشوری مەسیحیەت) شانسی ئەوەم هەبوو سەروبنی کتیبەکە بکەم ، وێڕای پیداچوونەوە لەرووی زمانەوانی و ڕێنوس چێژو زانیاری وورد و دەگمەنیشم دەستکەوت، کتێبەکە لەلایەن قەشە دکتۆر جان فیێ دومەنیکی بە زمانی فەرەنسی نووسراوە نووسەر و جوگرافیناس و وەرگێڕ بەڕێز دکتۆر جمیل عیسی لەزمانی عەرەبی وەریگێڕاوەتەسەر زمانی کوردی پێشەکی دەستخۆشی ئەو کارە بە نرخ و بایەخدارەی لێ دەکەین کە دەچێتە سەر خەرمانی پڕ بەرەکەتی کتێبە نایابەکانی دیکە کە بە بەچاپی گەیاندوون بەشێوەی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی ئەکادیمی..

کتێبی ئاشوری مەسیحیەت بەزمانی شیرینی کوردی هەڵدانەوەی مێژوو و چوونە نێو ڕەگ و ریشەی سەرەتایی ئایینی مەسیحیەتە بەتایبەتی لەباشوری کوردستان کە نووسەر بە باکوری عێراق ناوی بردووە، گرنگی ئەم کتێبە لەوەدایە زانیاری و شارەزاییەکی فراوان بە خوێنەر دەبەخشێ پڕ لە تۆمار و دەستنوسی ئینجیل و روداو و بەسەرهاتەکان لەسەر دێر و کەنیسە و ژیان و گوزەرانی قەشە و رەبەن و مەتران و ئەبرەشیە و قەدیسەکان و شەفیع و دوعا گۆ و خروەو ماڵی شەهیدان و بەتریك و ژنە قەدیسەکان و قەشە کوردەکان و نەستوری و یەعقوبیەکان....هتد لەسەدەی یەکەمی زایینی ئاینی مەسیحی بۆ نەیناوەو هەولێر پەریوەتەوە کە سەربە دەسەڵاتداری ئاشوریەکان بوونە ...تێبینی ئەوەش دەکرێ لە ناوچە و گوندەکانی دەوروبەری هەولێر تا دەگاتە رواندز و کۆیە و رانیە و شەقلاوە و هەریر و ئاکرێ ناوچەی مەرگە(لەوەرگا) لەنێوان زێی خازر و زێی گەورە دەیان ناوی ئەو سەردەمانە چ وەك خۆی یان بەهەندێ گۆرانکاری وەکوو خۆیان ماونەتەوە نمونەی زۆر هەیە لەساڵی ١٨٥ زایینی رەحتاوە(رەختاوە) سیراوە، خرجاوە، باساوێ، تێلانە لە ٢٠کم باکوری رواندز (دیانا و هاودیان) دۆڵی نەهلە، ئاکرێ، شوش و شارمەن (شەرمن) جگە لەو ناوانەی کە ئێستا مەسیحی نشینن لە دەشتی مووسڵ...

ئەوەی جێگەی تێڕامانە لەسەرەتای سەدەکانی زایینی (اربل) هەولێر ناوەندی بڕیاردان بووە کۆنترین کەنیسە لە هەولێر کەنیسەی قدیس ئیسحاق لەساڵانی ١٣٥-١٤٨ ، ژنە قەدیسەکانیش لە اربیل هەبوونە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ مەسیحیەکان بە ئاسانی هاتوونەتە هەولێر و دەرگایان بۆ واڵا کراوە و خراوەتەسەر پشت بۆیە هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ شاری هەولێر و سنورە جوگرافیەکەی ئەم ئەم خەسڵەتە جوانەی لەدەست نەداوە وەك شاری هەمووان و پێکەوە ژیان ماوەتەوە سەرەڕای ئەوەی ڕۆژگاران لەم پێناوەدا باجی بەسەردا سەپاندووە.

سەرۆکایەتی ئەسقەفیە (میترا پۆلینی) لەهەولێر بووە لەو سەردەمانەدا نینوی زۆر بچوك و کەم بایەخ بووە ناوی زۆر کەم هاتووە ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە پێشتر هەولێر کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی ئاشوریەکان عەشتار واتا شاری هەولێر مەڵبەندی چوار خوایە(اربائیلۆ). ناوەڕۆکی کتێبەکە چەندین ناوی مەتران و قەشە و شوێنی وای جێ کراوەتەوە کە مۆرکی کوردی پێوە دیارە ناوی (داود) دێ کە مەترانی کوردەکان بووە کتێبی بەهەشتی بچووکی نووسیوە. هەروەها لەسەرەتای ڕووداوەکان و پەیدابوونی مەسیحیەت ناوی ئایینی زەردەشتی و یەزیدی و جولەکەش هاتووە.. باس لەوە دەکا کە هەولێر مەڵبەندی قوردایێ-کوردایێ واتە وڵاتی کوردان ئەمە لە کتێبەکەدا هاتوە...

لەساڵی ١٣١٠زایینی ناوی عەنکاوە بە عەمەك ئاباد هاتووە. نووسەر باس لەوەش دەکات هەولێر لەسەدەکانی (٩،١٠،١١) بەختی کز بووە ناوی کەم هاتووە بەڵام لەساڵی ١١٧٦زایینی هەولێر جارێکی تر هۆشیار بووەتەوە.

هاتنی ناوی کورد لەم ناوچانە بەتایبەتی لەسنووری ئاشووری کۆن هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە میدیەکان(ڕەچەڵەکی کوردەکان) لەساڵی ٦٥٠پ.ز دەوڵەتی ئاشوریان ڕوخاند ئیدی ڕۆژی میدیەکان هاتەوە کە پێشتریش لەسەدەکانی پێش زایین گوتی ی و کاردۆخی و لۆلۆیەکان لەم ناوچە و سنورەدا هەبوونە و ماونەتەوە و لە ئاوڕێژی زاگرۆس و ئارارات تێ پەڕبوون بەهۆی شەڕ و پێکدادانی نێوان ئیمپراتۆریە کۆنەکان بگرە لە بابلیەکان و سۆمەریەکان ئەم ئال و گۆڕە هەر هەبووە. بۆیە کە باسی ئایینی زەردەشتی ی و یەزیدی دەکرێ شتێکی ڕەواو ئاساییە ناوی کوردیش بێت .

ئەم کتێبە نایابە لە سنووری موسڵی ئەمڕۆ لەهەولێر ڕا دەمانباتەوە بۆ رواندز و ئاکرێ و ئامێدی و دەپەڕێتەوە باکووری کوردستان پڕە لە کێشە و گرفت و بەسەر دادان و

سوتان و تالان و ویرانکردنی دێر و کەنیسە و شوێنی ڕەبەنەکان کوردیش هەندێك جار بەشێك بوونە لەو ڕووداوانە هەندێك جاریش هاوکار و پشتیوان بوونە و هەندێك جاریش بەرگریکار بونە لەخۆیان، ئەم ململانێیانەش بۆ چەندین سەدە بەردەوام بووە بگرە لەسەدەی یەك و دووی زایینی دەست پێ دەکات کەچی هەڵگرانی ئالای ئایینی مەسیحی کۆلیان نەداوە خۆیان بەناوچەکەو شوێنە پیرۆزەکانیان چڕ کردووەتەوە سەرەڕای کوشتن و بڕی کە ڕووبەڕوویان بووەتەوە و لە ژمارە نایەت... هەندێك جار ئەوانیش واتە مەسیحیەکان توندوتیژیان بەکارهێناوە لەپێناوی مانەو و ئایینەکەیان هەروەها هاوپەیمانی و دۆستایەتیش ئەنجام دراوە لەنێوان ئاینەکان و نەتەوەکان و هاوکاری یەکتریان کردووە . لەدووایی پەیدابوونی ئاینی ئیسلام گۆمەکە قوڵتر بۆتەوە بەداخەوە مێژووی مرۆڤایەتی ئەوەندەی مۆرکی شەڕوشۆڕی پێوەدیارە ئەوەندە ئاشتی و ئارامی درێژەی نەکێشاوە ((دوور نیە رقی شەیتانی بێت لە ئادەم هەتا تەپلی قیامەت دەیەوێ تۆڵە لە مرۆڤ بکاتەوە))

بەهەر حاڵ لە وولاتی ئاشوور، لە وولاتی میدیا، لە باشووری کوردستان ئەوە دەسەلمێنێ کە ئایینەکان زوو پێشوازی لێکراون بەڵام گەلەکانیان بە ئاسانی لەیەك نەترازاون ئەمڕۆ باشترینی شاهێدە!!

جارێکی تر پیرۆزبایی لە مامۆستای بەرێزو خۆشەویست و نیشتمانپەروەر م.جەمیل عیسی دەکەم کەوا خەریکی زانست و ڕۆشنبیری و خزمەت کردنە بە گەل و کوردستانەکەی هیوای تەمەن درێژی بۆ دەخوازم هەمیشە شادو سەرکەوتووبیت

نعمت عبداللە پیرداود

سەرۆکی یەکێتی پەرلەمانتارانی کوردستان-هەولێر

٢٠١٨/٧/٢٠

# پێشەکی وەرگێڕ

دڵنیامە لەوەی کەمێژوو ڕەنگدانەوەی مێژووی بەسەرهات و رابردووی هەموو کۆمەڵگەو نەتەوەیەك لە خۆ دەگرێ" من پێم وایە ئەم زانستە ئەوەندە قەبارەی گەورەیەو بەکەڵکە بۆ ئەمڕۆ و ئایندەی هەر هەموومان و گەنجینەو سەرمایەیە وە مێژوو تەنها بوارێك لە بوارەکان ناگرێتە خۆ بەڵکو ئەوەیە بڵێین زانستێکە هەمووو بابەتەکان لە ئامێز دەگرێت، چونکە هیچ زانیاریەك نیە کەوا مێژووی تایبەت بە خۆی نەبێت جا ئەگەر لایەکان سروشتی بن وەیان ئادەمیزادی بن و ئەوانیش ڕەنگدانەوەی گشت چالاکیەکانن، کەواتەی هەر چالاکیەکیش بە ڕێچکەو ڕێسایەك پەل دەهاوێت و سەرەتایەکی دەبێت و کۆتاییەکەشی هەر بەدواوەیە تا ئایندەش.

ئەوەی کە پەیوەندی بە پەرتووکی (ئاشووری مەسیحیەت) هەیە بابەتە مێژووییەکان لەخۆ گرتووە هەر لە بڵاوبوونەوەی مەسیحیەتەوە، وە ناوچەیەکی جوگرافی تایبەتمەند دەگرێتەوە.

نووسەری ئەم بابەتە خۆی لەسێ بەرگ دەبینێتەوەو لەلایەن مێژوونووسی بەناوبانگ قەشە د. جان فیە نووسراوەتەوە بەزمانی فەرەنسی و د واتریش کراوە بە زمانی عەرەبی و منیش ئەوەی لە توانام دا بوو هەوڵم بۆی داوە کەوا وەرگێڕی بکەمە سەر زمانی کوردی بۆ ئەوەی خوێنەری کوردی هەر نەبێت شتێك دەربارەی مێژووی خۆی و ناوچە جوگرافیایەکەی خۆی و ڕووداوە گرنگەکانی مێژووی کوردستان هەر لەسەدەی یەکەمی زایینی یەوە تا سەرەمانی ئەمڕۆ بەسەرهات و گۆڕانکاریەکانی ناو مێژوو دواڕۆژی مێژووی ناوچەکە لێ بێ بەش نەبێت و بزانێت.

لە لایەکی تریش ئەبێ ئەوە بزانین کەوا قۆناغەکانی مێژوو گۆرانی بەسەرداهاتووەو هەندێکی بەپێ ی ویستی بارودۆخەکە نووسراوەتەوەو هەندێکیشی بێ لایەن نووسراوتەوەو هەندێکیشی چەواشە کراوەتەوەو، ڕەنگە هەندێکیشی بە ئەتکەست لەناو براوە بۆ ئەوەی شوێنەوارەکەی بزربێت.

ئەوەی لەم پەرتووکەدایە بە شێوازێکی ئەکادیمی و زانستیانە نووسەر توانیویەتی تا ڕادەیەکی باش ئامانجەکە بپێکێ.

دەتوانم بڵێم ئەم مێژوو نووسە مێژووی (ئاشووری مەسیحیەت) لە چوارچێوەو بەرگێکی ڕازاوەدا پێشکەشی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی کردوو سەرنجی هەموو نووسەرو

مێژوونووسان ڕۆناکبیرو شارەزایانی بوارە جیاجیاکانی بەلای خۆی دا ڕاکێشاوە دیارە ئەم هەموو بەسەرهات و ڕۆژگارو ڕابردووانەی مێژوو سوودمەندە بۆ هەمووان.
لێرەدا ئەم بەرهەمەی نووسەر و مێژوونووس (جان فیە) کە بەناوی ئاشووری مەسیحیەت لە (٢) بەرگدا نووساروە. منیش بەرگی یەکەم وەکو دیاری پێشکەش بە خوێنەرانی کوردی دەکەم. بەو ئومێدەی بتوانم بەرگی دووەم و سێیەمیش وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی دڵنیاشم کە لەوەرگێرانەکەمدا هەلەو کەم کورتی تیادەبێت و هیچ مومکین نیە سەد دەر سەد سەرکەوتووبووبم لە وەرگێرانەکەمدا ئومێدەوارم توانبێتم کەلێنێك لە پەرتووکخانەی کوردی پێ پڕبکەمەوەو خوا پشتیوانمان بێت بۆ بەرهەمی داهاتوومان لەگەڵ خۆشەویستیم دا.

د. جمیل عیسی کریم
٢٠١٥/٧/٢٧
هەولێر / عنکاوە

# ژیاننامەی نووسەر

ئەو پەرتووکەی لەبەردەستتدایە، کە لە سێ بەرگ پێکهاتووە و بە ناونیشانی (ئاشووری و مەسیحییەت) ە، لە ساڵی ١٩٦٥ بە زمانی فەرەنسی و لەچاپخانەی کاسۆلیکی لە بەیرووت چاپ و بڵاوکراوەتەوە. هەروەها بەرگی دووەمیشی لە ساڵی ناوبراودا بڵاوکراوەتەوە، بەڵام بەرگی سێیەمی لە ساڵی ١٩٦٨ بڵاوکراوەتەوە.
نووسەری پەرتووکەکە قەشەی دۆمنیکی جان مۆریس، کە لە ساڵی ١٩١٤ لە فەرەنسا لە دایك بووە و لە ساڵی ١٩٣٢، بۆتە رەبەنی دۆمنیکی و لە ساڵی ١٩٣٤، بۆتە قەشە و لە ساڵی ١٩٣٩، هاتۆتە عێراق ـ موسڵ و تا ساڵی ١٩٧٢ تیایدا ژیاوە.
سەرەتا تا ساڵی ١٩٤٥ مامۆستای پەیمانگەی(ماریۆخنا نجیب) ، پەیمانگەی قەشەیی سریانی ـ کلدانی، بوو.
لە ساڵی ١٩٤٥، کۆلێژی موسڵی دامەزراندووە و بۆتە بەڕێوەبەری تا ساڵی ١٩٥٩. دواتر جارێکی تر بۆتەوە مامۆستا لە پەیمانگەی ناوبراو تا لە ساڵی ١٩٦٦، موسڵ بەجێدێڵێت و روو دەکاتە بەغدا و دێرێك بۆ قەشەکانی دۆمنیکان دادەمەزرێنێ. لەو ماوەیەی لە عێراقماوەتەوە لە زانکۆی دیزۆنی فەرەنسی بڕوانامەی بەکالۆریۆسی وەرگتووە. هەروەها لە زانکۆی لۆڤانی بەلجیکی و زانکۆی سۆربۆنی فەرەنسی پەیمانگەی رۆژهەڵاتی رۆما بڕوانامەی دکتۆرای فەخری پێبەخشراوە و بە ئەندامی لێژنەی مێژووی نێودەوڵەتی دامەزراوە. لە ساڵی ١٩٩٥ لە بەیرووت لە تەمەنی زیاتر لە هەشتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە و لە تەك ئەم پەرتووکە(ئاشووری و مەسیحییەکان) چەند پەرتووکێکی دیکەی هەیە و لە هەموویاندا بایەخ بە مێژووی عێراق بە گشتی و مێژووی کەنیسەی عێراق بە تایبەتی دەدات.
ئەمڕۆ نووسینەکانی قەشە حەننا فییە بە سەرچاوەیەکی گرنگ دادەنرێت بۆ ئەوانەی لێکۆڵینەوە لە کاروباری مەسیحییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کەنیسە و سەرۆکەکانیان دەکەن بەو پێیەی بە شێوەیەکی دروست و ئەکادیمی نووسیویەتی.

# ناوەخـــن:

لە واقیعدا هەر وەك ئێمە لە سەرەتای لێكۆڵینەوەكەمانین، پرسیارێك دێتە بەر گوێمان ئەویە: ئایا ئەمە راستە ئەو ناوچەیەی، كە لێكۆڵینەوەی لەسەر دەكەین پێی بڵێین ئاشوور؟ سنووری ئاشووری ئاشوورییەكان لە كوێ بوو([1]). لەوەدا بۆمان دەردەكەوێت، كەوا ئاشووری مەسیحی و ئەو ناوچەیەی، كە دانەرە سریانییەكانی ئاشووری لە ماوەیەكدا ئەو زەویانەی دەگرتەوە، كە دەكەوتنە ژێر دەسەڵاتی سێ ئەبرەشییە(ئیبارشیات) میترا پولیتی، ئەو كات ناسراو بوو بە(بێت گەرماوی)، واتە(گەرمیانی ئێستا)([2]). و(حدیاب) و(بیت عەرەبای)([3]). لەوەی لە سەرەوە بۆمان دەردەكەوێت، وەك چاك بوو ئەم لێكۆڵینەوە لە ژێر ناونیشانی(حدیابی گەورە) دابنێین.

لە توانامانـدا بوو ئەم ناونیشانەی سەرەوە بەكاربێنین بە پشت بەستن بەو دەقەی لە نووسینەكانی(تیۆ دۆرسی قوبرسی) دا هاتووە: لەو ماوەیەدا نووسراوە، كە رێكخستنی كارگێڕی بۆ ئەو كەنیسەی رۆژهەڵات كراوە و چووە بواری جێبەجێكردن. بۆ زانینی ئەو جۆرە رێكخستنە یەكسانی بەكارهێناوە لە نێوان(ئاشوور) و(حدیابی گەورە)، بەڵام دەربارەی ئاشوور دەڵێت([4])، دەكەوێتە كۆتایی دوورترین شوێن لە رۆژئاوای دەوڵەتی فارسی، كە پێی دەڵێن حدیاب. لە رووی زانستییەوە من لە توانامدا نییە بۆ داپۆشینی هەموو خاكی ئاشووری مەسیحی ناسراوە لە سەدەی پێنجەم، لەم لێكۆڵینەوەیەمدا، هەروەها لە توانامدا نییە ئەو سەركێشییە بكەم و لە سەر ئەو زەویانە بدوێم لە سەر ناوچە دەشتاییەكانیش ئەوەی بچینە قوڵایی گەورەی چیاكانی حدیاب و(بێت نوهەدار) لەلای باشوورییەوە. من ناچمە سەر ئەو زەویانەی دەكەونە پشت زێی بچووك، كە وەك سنوورێكی جیاكەرەوەیە لە نێوان حدیاب و بێت گەرمایی([5]). لە لای رۆژئاواشەوە سنووری رووباری دیجلە نابەزێنم، چونكە لە پشت رووبارەكەوە بیابانی عەرەبییە، یان ناوچەی (بێت عەرەبایی)، بەڵام بە پێی ئەوەی، كە سنووری جوگرافیای تایبەت رێگەمان پێ دەدا بۆ ئەو لێكۆڵینەوەیە دەتوانین بڵێین، كە دەشێ ئەو سنوورە پرۆگرامییە بێت، باسی لێوە دەكەین بە پێی ئەوەی، كە هەڵوێستەكان رێگەمان پێ دەدا، و بە روونی تەواو بۆ ئەوەی دووركەوینەوە لە هەر خراپەكارییەك، یان خەیاڵێك. ئامانجی یەكەمم هەوڵدانە بۆ دووبارە دامەزراندنی(وێنە) نەخشەی موزاییكی جوگرافیای مێژوویی بۆ باكووری عێراقی

مەسیحی([6]). لێرەدا دەمەوێت داکۆکی لە وشەی(مۆزاییک) بکەم بە چڕی لە سەری بدوێم بەبێ ئەوەی، کە خۆم بە نیگارکێشێك دابنێم، کە دەتوانێت فرچەکەی بە باشی بەکاربهێنێت بۆ ئەوەی تابلۆ دیوارییەکەی بە جوانی دەربکەوێت. ناوچەی(ئاسوور) تەنها بەشێك بووە لە کەنیسەی سریانی، رۆژهەلآتی بێت، یان رۆژئاوا کاکی بە کاکی، بەلآم پێکهاتەکانی تر لە دوای ئەوەوە دێن، زۆر جار دەرکی پێدەکەین و بە هۆی هەڵەیەکی سەرەتایی لە رێکخستنی لێکدانەوەی بۆ هەموو بنجوبنەوانەکان، یان بە هۆی کرچوکاڵی و پەخش و لێدوانەکان، کە دواتر بۆی هەیە پێی تێپەڕبین، ناتوانین بە چڕی لە سەری بدوێین تەنیا بە خێرایی نەبێت پێش ئەوەی لە دەستمان دەربچێت. زۆرن ئەو کاتانە، کە ئێمە هەوڵی خوێندنیان بۆ دەدەین، هەندێك بیرۆکەمان بۆ دێت(لەوانەیە لە رێگەی خەملآندنەوە) بێت، کە ئەو مەتەڵە ئینگلیزییەی لە سەر وتراوە(گای ناو تەوێڵەی چینی). من پابەند دەبم بە هەموو شێوەیەك، بڕوای لێکدانەوەی ورد لەو لێکۆڵینەوەیەمدا، لەبەر ئەوە بە پێی بڕوای خۆم تا ئێستاش کات هەر زووە بۆ پێشکەشکردنی شتێکی تر، لەوانەیە تەنها باوەشێك لە پشتینەکا(فیشە)، کە دەتواندرێت وردەکاری تێدا بکرێت لە شوێن خۆیدا بە پێی رێکخستنێکی خوێندراو بە هێمنی و دووربینییەوە. ئامانجەکەم لەمەدا رێك لەگەڵ ئەو وتەیەی یەك لە نیگار کێشەکان چەسپ دەبێت:(زۆر خۆشحاڵ دەبم، ئەگەر بتوانم پێناسەی ئەو کەسانە بکەم، کەوا کەنیسەی رۆژهەلآتیان خۆشدەوێت، یان ئەوانەی بایەخ بە مێژووی ئەو ناوچە بچووکە دەدەن، کە ئەو کەنیسانەی تێدا بلآوکراوەتەوە بە رەچاوکردنی ئەوەی من بایەخی تایبەتیم هەیە و پێمداوە، لەبەر ئەوەی من لەو ناوەندەدا ژیاوم بۆ چەند ساڵێك و لێرەدا فێرکراوم بۆ خۆشەویستی زۆر و بۆ راستییە لەبیرکراوەکان). ئەو مامۆستا بەڕێزانەی، کە ئەو راستییانەیان فێر کردم: قەشە(ریمۆند ماری تۆنۆ)، لەو قەشە پڕ وتارانە بوو، ماریۆڵس دووەم شێخۆ ـ بەترپکی بابل لە سەر کلدان([7])، بەلآم زۆر کارەکان و بەرپرسیارەتی گرنگتر، کە کەوتۆتە سەر شانیان، بواریان بۆ نەڕەخسا ئەم کارە بکەن. لە کۆتاییدا داوای لێبوردن دەکەم لەو هەلآنە، کە لە ماندووبوونەکەمدا روویداوە و دان بەوە دادەنێم، کە هەڵەکان هی منن، بەلآم گیان و گەرموگوڕی هی ئەوانە.

## پێشەکی:

# شێوازو سەرچاوە و لێکۆڵینەوە لە دێرە کۆنەکان

بەشێکی گەورەی ئەم لێکۆڵینەوەیە تایبەتە بە دێرەکان، چونکە دێرەکان شوێنی گرنگ و فراوانیان لەسەرچاوەکان داگیر کردووە بە هۆی ئەوەی، کە رۆڵی گەورەیان بینیوە لە ژیانی مەسیحییەت و بلاوبوونەوەی لە ئاشووردا. زۆر جار پالمان پێوە دەنێت دووبارەی بکەینەوە بۆ یارمەتیدان و روونکردنەوەی دوور و درێژ لە شوێنی راستەقینەیدا، بۆیە بە زیانبەخشی نابینم، کە ئەو پێشەکییەم تایبەت کردووە بۆ شێواز لە دۆزینەوەی شوێنی ئەو دێرانە، یان ئەوەی بە تایبەتی قسەی لە سەر دەکەین. وشەی دەگمەن و رێزلێنان لەو دەقانە دەردەکەوێت بە تایبەتی بەهای مێژوویی بۆ ئەوانە. هەروەها خوێنەری بەرێز یارمەتی دەدات لە سەر حوکمدان لە سەر راستی مەسەلەکان. ئەوەی دەمەوێت لێرەدا بە وردی ئاماژەی بۆ بکەم ئەویە(٨)، لێکۆڵینەوەکەم هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت، کە پێشەکییە بۆ لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت بە چالاکییەکانی ولاتی میزۆپۆتامیا، هەروەها باس لە کێشەکانی رەبەنەکان ناکا، نەبە دامەزراندنی دێرەکان و نە پەیوەندی بە ژیان و دابرانی تەواو، نە بە مێژووی گەرانەوەی بۆمارئۆچین(ئۆکن)، هەروەها بایەخ نادات بە مێژووی ئەو دێرانە و شوێنەکانیان، یان ناوچەکانیان، نە بە زنجیرەی رووداوەکانی مێژوویی بۆ شەپۆلەکانی دامەزراندنیان یەك بەدوای یەکدا، نە بە یاساکانی رەبەنەکان، یان چاکسازییەکان، کە بە سەریاندا هاتووە لە دواتر، هەموو ئەوانە پێویستە لە دەرەوەی چوارچێوەی ئەو بابەتەمان بێت پێشەکییەکەمان چوارچێوە و سنوورەکەمان دیاری دەکات بە لێکدانەوەیەکی پرۆگرامی هەندێ تێبینی ئامادەکراو بۆ چوونە ناو لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی بۆ چالاکییەکانی رەبەنەکان لە باکووری عێراق(کوردستان).

## زاراوەکان

لە بەکارهێنانمان بۆ زاراوەی تایبەت بە خانووی رەبەنەکان هیچ جیاوازییەکی تێدا نییە لە واتادا، ئەگەر ناوەکەی( Couvent، یان Monastere)، بەلام بە کلدانی(ئارامی - وەرگێڕ). لێرەدا دوو ناو بەکار دەهێنرێت، ئەوانەن( دیرا)، یان(ئومرا)(٩)، کە باسی خانووی رەبەنەکان دەکەم وشەی(Couvent) بەکاردەهێنم لەبەر ئەوەی ئەوە لە ولاتی

ئێمەدا(نییە)، (Monastere) داخراوە(بۆ ئەو راهیبانەی بە تەنهان) دەتوانم بڵێم ـ لە پشت دەرگا داخراوەکانن.بۆ پیاوان لە کاتی پشت بەستن بە زانستی وەرگرتن(علم الاشتقاق)(لێکۆڵینەوە لە ئەسڵی وشەکە) وشەی(Couvent ) بەکارهاتووە بۆ ئەو خانووەی، کە رەبەنەکان بەکاریان هێناوە، یان ئەو شوێنەی، کە رەبەنەکان وەك برا ژیانێکی هاوبەشیان بەرێوەدەبرد، بەڵام واتای ئەو وشەیە بریتییە لە(Convict فەرەنسییە، یان Coenobion لاتینییە) و لە وەرگێران دا بۆ زمانی عەرەبی بە واتای (الحبیس) و بە کوردی(بەندکراو) دێت، بەڵام خەڵکی ناو خانووەکان، کە پێیان دەڵێن(Coenobites) لەبەرامبەر ئەوەدا دەبینین لە زمانی کلدانی وشەی یۆنانی بەکارهێناوە:(Qnobaya قنۆبایا)، واتە(رەبەن)، کە بە ژیانێکی هاوبەش دەژین، ئەو کەسەی، کە پێمان وت:(Coenobion لە رۆژهەلاتە کۆنەکان ژیانێکی تاك و تەنیایی بەسەردەبرد، وەك قۆناغی یەکەم بۆ سەرکەوتن بەرەو ژیانی رەبەنایەتی. لای سریانەکان ئەو کەسانەی، کە بەم شێوەیە ژیاون ناسراون بە(ئەوانەی کاردەکەن)،(جیهاد دەکەن)، واتە مەشق پێکراوەکان([10])، بەڵام تەنهایی(Nonactene) واتایەکی جیاوازی بە تەواوی هەیە، چونکە ئاماژە بۆ ئەو شوێنە دەکات، کە مرۆڤ بە تاق و تەنیا دەژێت نیشتەجێ لەو شوێنە پێی دەڵێن(رەبەن ـ الراهب)، (Monachos) بە لاتینی، و بە کلدانی(ئیحیدایا*، واتە(بە تەنیایی).

واتە ئەو کەسەی بە تەنیا بژێت، دابراو بێت لە خەڵك لە سەر ئەو واتایە دەتوانین بڵێین ئەو کەسە خوا دەناسێ و دەیپەرستێ(دابراو) لە پەیوەندی لەگەڵ خەڵکانی تر، یان بە عەرەبی پێی دەڵێن(الناسك)، ئەمەش زاراوەیەکی بەناوبانگە(Ermite) پەیوەندییەکەی ون کردووە لە ئەنجامی لێوەرگرتنەوە، کە بەو مانایە دێت(بیابان)(Eremos) لەمەدا بۆمان دەردەکەوێت، کەوا(Monastere) بە واتای(الناسك) دێت، یان خەڵوەتگەی تایبەتی بە ژیانی تەنهایی، یان دابراو. لە واقیعدا دێرەکان دەورە دراون بە خەڵوەتگە(Monasterie Detherie) بریتییە لە ئەشکەوتی هەڵکەندراو لە ناو بەردە رەقەکان، یان کۆریتی دروستکراوە لە چۆڵەوانی. کاتێك وشەی(Monastere) بەکاردێنن بەو واتا وەرگیراوەیە دەکەوینە ناوسەرسوڕمانەوە، یان تووشی شۆك دەبین. بۆیە هەردوو زاراوەکە بەکاردەهێنین(Couvent) و(Monastere) بۆ یەك مەبەست. بۆ هەندێك

کاتی بەدەر لەمانە، یان بۆ ئەو کاتەی، کە ژیانی هاوبەش لەو خانووە دا هەیە، هەروەها هەندێك کۆریتە دروستکراوی لابەلایی تاقانە، کە لەگەڵ مەڵبەندەکە جیاوازی هەیە و دوورە دەستە بە پێی شوێن و بارودۆخی دەورە دراو(١١). ئێمە تکا دەکەین، کە تێبینی ئەو زاراوانە بکەن((Higou(Hieromoine)، (Archimandrite)، Laure . Mene ،Ect یەك لە دوا یەك ئەو واتایانە دەبەخشن: دیدی ڕۆژهەلات ـ ناسکی قەدیس ـ ئەرشەمەندرێت(نازناوێکە دەدرێتە ژمارەیەك لە سەرۆکی دێرەکان) و ژمارەیەکی دیکەی زاراوە نەزانراوە لەو ناوچەیە بەکارهێنرابێت، کە بابەتی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەیە. کوڕ و کچی ئەو ناوچەیە لە ڕەبەن و ڕاهیبات پێیان دەگوترا ڕۆڵە، کچی(پەیمان)(العهد)، یان ناسراو بە وەرگێڕاوەکەی بە(Federes)(ئەندام لە کۆمکارێکی فیدراڵی، هەروەك لە بەرایی ڕوونمان کردەوە(١٢) بۆ ئەم زاراوەیە واتای جیاواز هەیە لەگەڵ سەردەم یەکتر دەگرێتەوە هەروەك بەکارهێنراوە و دانەریش بەکاری هێناوە، هەندێك جار بە واتای ڕەبەن دێت بە پێی چەمکی بنەڕەتییەوە(واتە ئەوەی لەگەڵ خەڵکانی تر بە ژیانی هاوبەش دەژێت)، هەندێك جار بە واتای(ڕەبەنە ئازادەکان)،(الرهبان الاحرار)، جیاکراوەتەوە لەگەڵ ئەو ڕەبەنانەی خۆیان بەخش کردووە((Voues بەخشندەکان(Benoites) هەروەها چەند واتایەکی تری هەیە بۆ ئەو زاراوەیە، بەلام کەمتر بەکارهێنراوە و زۆر ڕوون نییە. سەرۆکەکانی دێرەکان پێیان دەوترا(ڕێشە)، واتە(سەر). هەروەها(مدەبرانا)، واتای کارگێڕی ئەومیە(Administrateur)، یان(المدیر ـ بەڕێوەبەر)،(Manager) ـ یان(المدبر) ـ وەرگێڕ. هەندێك جار سەرۆك دوو نازناوی هەبووە بە یەکەوە. ئێمە تەنها نازناوە سادەکە(سەرۆکی دێر) بەکاردێنین. ڕەبەنە ژنەکانی ڕۆژهەلات ناسراون بە(کۆمەڵە ڕەبەنایەتییەکان ـ Congregations)، واتە گردبوونەوە، یان(مستعمرات)، (Groupes Oucolonies)، لە خەڵکانی ناسك(خەلۆەتگەر) هیچ دێرێکی تایبەت بە خۆیانەوە نییە، هەتا کەنیسەش بە تاك و تەنهایی(کنوشتە)، (کۆمەڵێك ڕەبەن ـ وەرگێڕ. بەکارهاتووە لەلایەن سەنهاودس) بەتریك گۆیگۆریسی یەکەم لە ساڵی ٦٠٥ ز(١٣)، بەلام لە دەقەکانی تر(١٤)، بۆ ئەو زاراوەیە بە واتای دێر دێت و بەس.

## ژمارەی دێرەکان:

لێکۆڵینەوە لە سەر دێرەکانی کوردستان وا پێویست دەکات هەر لە سەرەتادا زۆر وریا بیت، چونکە باسی ئەو بابەتە پێویستی بە پەنجا لاپەڕە هەیە. ئەوەندەی پێویستە تەنها لە سەر ١٢ دێر بنووسیت، بەمە کارێکی تەواو دەکەیت. لە راستیدا ئەو دێرانەی ئێستا هەن لە ژمارەی پەنجەکان تێپەڕ ناکەن. مەبەستمان ئەو دێرانەی، کە تا ئێستا رەبەنیان تێدا هەیە، شوێنی هەموویان لە دەوروپشتی شاری موسڵە. بۆیە باسکردنیان ئاسانە. سێ دێر لەمانە هی کلدانییەکانە، کە ئەوانیش: بریتین لە دێری رەبە هورمز، دێری(السیدە حافظة الزروع)، دێری مارگۆرگیس. یەعقوبییەکان دێرێکیان هەیە، کە ئەویش دێری شێخ مەتییە. جگە لەمانە دێرەکان بەتاڵن، واتە هیچ رەبەنێکی تێدا نییە و بەردەوام باڵەخانەکان چاکدەکرێنەوە وەك دێری مارپەهنام(١٣)و دێری مار ئەوڕەها، دێری مار ئیلیا، دێری مارمیخائیل. پاش ماوەکانی دێری مەقەرتایە، دێری ماریاقۆ، دێرێك، یان دوو دێری تر. دێری مەربین قەدیشە ـ لە گوندی هەرمۆتەی کۆیە(١٤) (وەرگێڕ).

بەمە کۆتایی بە باسەکەمان دێنین دەربارەی هەموو دێرەکان. گرنگە لەلام روونیبکەمەوە من توانیم بابەتێك بدۆزمەوە وەك ئەمە لە ساڵی ١٩٤٣ پێوەی خەریکم و هەر لەو کاتەوە وتارەکانم تایبەت بە دێرەکان بلاّودەکەمەوە بە ناونیشانی ناوەکانیانەوە لە گۆڤاری(ئیکلیریکیە ـ المعهد الکهنوتی) ماریۆحەننا الحبیب السریانیه ـ الکلدانیه). لە موسڵ، چەند ساڵێك دواتر دۆسیەکان پڕ بوون و کەڵەکەیان کرد بەسەر یەکەوە لە وتارەکان. بەلاّم سەرباری ئەمەش بڕی ئەوە ناکەم بڵێم کارەکەم تەواو کردووە، چونکە کەلاوەی دێرەکان بەبەردەوامی بۆمان دەردەکەوێت لێرە و لەوێ لەوانە: لە ئەسکی موسڵ ـ بەلەد ـ پاشماوە و شوێنەوارەکانی بەرچاوی خەڵك و گەڕیدەکان دەکەوێت، کە رەنگە بە رۆخیدا برۆن، یان بەسەریدا.

ژمارەی ئەو هەموو دێرە زۆر و گەورانە بۆ سێ هۆکار دەگەڕێتەوە، کە ئەمانەن: هەبوونی ژمارەیەکی زۆری رەبەنان، هەبوونی ئارەزووی دروستکردن و دامەزراندنی دێرەکان، ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە شوێنی دێرەکان لەو ماوە دوور و درێژەدا. لێرەدا سەرگوزشتەیەکی بچوك هەیە، کە لە مێژوودا باس دەکرێت و تیایدا بیرۆکەیەکمان پێدەبەخشێت دەربارەی ژمارەی رەبەنەکان لەو ماوەیەدا. سەرگوزشتەکە بۆمان

دەگێڕێتەوە([15])، لە ساڵی(515) یەك قەدیسی یەعقووبی هەبوو بە ناوی(شەمعون جەبەلی)، گوایە شەمعون توانیویەتی باوەڕ بە خەڵکی گوندێکی دوورە دەست و دابڕاو بهێنێت بۆ پەیڕەوکردنی چالاکی رەبەنایەتی. بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجەکانی ناچار هەندێك رەبەن و کچی پەیمانی پێگەیاند، بەڵام خەڵکی گوندەکە بەمە رازی نەبوون، لەبەر ئەوە رازی نەبوون، چونکە پێویستیان بە دەستی ئیشکەرێکی زۆر هەبوو. شەمعون لەو کەللە رەقییەی ئەوان واقی وڕمابوو - رۆژێك لە کەنیسە بە دزی نەوەت کوڕ و کچی لاوی گوندەکە و گوندەکانی دەوروبەری کۆکردەوە و سەری 18 لاو و 12 کچی لاوی بە پێی یاساکانی رەبەنایەتی تاشین. رەنگە چیرۆکەکە زۆرتر هەڵبگرێت، بەڵام لە هەمان کاتیشدا بە چیرۆکێکی گرنگ دەژمێردرێت لەبەرئەوەی شەمعون لە نەوت کەس سی لاوی هەڵبژاردووە بۆ کەنیسەکە. ژمارەکە سروشتی و ماقووڵە، چونکە بە سێیەکی ژمارەکە دەژمێردرێت.([16]). دەڵێن ئەو کاتە ژمارەی دانیشتوانی عێراق بیست ملیۆن کەس بووە، ئەگەر ئەو ژمارەیە بە زیادەش نوسرابێت بۆیە ئێمە دابەشی دووی دەکەین، کەواتە دە ملیۆن کەس بووە و با دووبارە دەیەکە کابەشی دووی بکەین بە هۆی ئەوەی ژمارەیەك لە مەجووس و جولەکە لە پاڵ مەسیحییەکان دەژیان، کە لە ئەنجامدا پێنج ملیۆن، ئەگەر یەك لە سەر سێی ئەو پێنج ملیۆنە وەربگرین ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە ئەو ژمارە رەبەنەی سەریان تاشرابوو ژمارەیەکی زۆرە، بۆیە باوەڕ ناکرێت و قبوڵ ناکرێت(بە پێی لۆژیکی ئێمە(فەلسەفەی ئێمە)(وەرگێڕ)، ئەگەر ئەو ژمارەیەش بۆ جارێکی تر کەمبکرێتەوە ئێمە پێویستمان بە ژمارەیەکی زۆر گەورە لە دێرەکان هەیە بۆ ئەوەی ئەو هەموو ژمارە زۆریەی رەبەنەکان جێبکاتەوە. بۆیە جێی سەرسوڕمان نییە کاتێك گوێمان لە کۆنە دێرەکان هەیە و دەڵێن چیای مەقلوب چیای هەزارەهایە و چیای هەزارانە؟

## دامەزراندنی دێرەکان و دامەزرێنەرانی

دووەمین هۆکاری زۆری ژمارەی دێرەکان بە پێی ئەوەی، کە لە بەراییدا ئاماژەمان بۆ کرد هەوسی کاتی، کە دڵ و دەروونی رەبەنەکانی پڕ کردبوو پاڵی پێوە دەنان بۆ دروستکردنی دێری نوێ. هەندێکیان دوو دێریان دروست کرد، هەندێکی دیکەیان سێ دێر و ئەو هەوەسە تەنها لای رەبەنەکان نەبوو، بەڵکو دڵی ئەو رەبەنانەشی داگیر کرد، کە بە پیرۆزی باسیان لێوە دەکرێت. ئەو خەونە زێڕینەیان لەبەر نەدەچوو، کە بە خەیاڵیان دادەهات بۆ

ئەوەی ناوەکانیان بە نەمری بمێنێتەوە بەو دێرەی، کە درووستیان دەکرد. ئەم کۆششەش بەشی زۆری لە ئەزموونی شەیتانی لەعین دا نەبوو، کە مامۆستای ئەم شکۆیە بۆش و بەتاڵەیە. لە سەر ئەم بابەتە دەخوێنین(١٧).

چیرۆکێکی دیکە هەیە، کەوا ڕەبەنێك بەربۆتەوە و گیانی لە دەست داوە، چونکە قوربانی ئەو خواردنە زۆرەوە بووە بۆ گورچیلە(گورچیلەی ئاژەڵ)، چونکە شەیتان بۆی دەرکەوت خۆی حەشار دابوو بە جلکی ڕەبەنی، کاتێك ڕەبەنەکە ویستی زەرەرمەندییەکەی بگەڕێنێتەوە شەیتان ئەوەی خستە بەردەم ڕەبەنەکە و بەو جلەی، کە خۆی پێ حەشار دابوو بە بیرۆکەی دروستکردنی دێرێك ڕەبەنەکانی تێدا کۆبکاتەوە و پێشوازی لە ئامۆ و گەشتیاران دا بکات، بەمە پاداشتی خۆیان بەدەست دەهێنن. کاتێك ڕەبەنی هەژار بۆ دووەمین جار بەردەبێتەوە بە وریسی شەیتان بە ڕەزامەندی بوونی لە سەر ئەوەی، کە پێی دەدات. شەیتانەکە ئەوەی لە دەروونی خۆی دۆزییەوە و وتی: من تۆم تاقیکردەوە بە خۆشەویستی شکۆمەندی بەتاڵ بێت تێکچوو بەهۆی ئارەزووت بۆ جێبەجێکردنی بە درووستکردنی دێرێك، کە بەڵێنم پێت دابوو بۆ یارمەتیدانت لە درووستکردنیدا. سرووتەکانی کەنیسە ئەم یادگاریانە دەپارێزێت(ئاهەنگەکانی ئایینی ـ سرووتی ـ وەرگێڕ. بە تایبەتی بە دامەزرێنەری دێرە باوەڕ پێکراوەکان(واتە بەڵگە نامە هەیە بۆ سەلماندنی ئەوانەی ئەو دێرانەیان بە کردەوە دامەزراندووە). هەڵسەنگاندنێك و پاداشتێك بۆ ئەو مافە ڕەوایە، ئەم یادەوەرییە پەیوەندی نییە بە یادەوەری مارنۆکن(نۆچین) و هاوڕێکانی. ئەمانە یادەوەرییەکی تایبەتی خۆیان هەیە. ڕۆژی ئاهەنگگێڕان بۆ ئەو یادە دەکەوێتە ڕۆژی هەینی یەکەم لە هەفتانەی پیرۆزکردنی کەنیسە(ساڵی سرووتی دابەشکراوەتە سەر چەند کۆمەڵە هەفتەیەك بە پێی سرووتی کەنیسەی ناسراو بە(شاووعی)، (سابووع)،(هەفتانە)، زۆربەی ئەوانە ژمارەیان حەوت هەفتەیە بۆ هەر کۆمەڵەیەك ـ وەرگێڕ. جگە لەو یادکردنەوەیە تایبەت بە مارنۆجین و هاوڕێکانی ڕۆژمێری ساڵی سرووتی تایبەت بە کەنیسەی سریانی ڕۆژهەڵاتی ـ کەنیسەی ڕۆژهەلات ـ بە پێن ڕۆژی هەینی دابەشکراوەتە سەر نێوان شاووعی ساڵی سرووتی و ئاهەنگی تێدا دەگێڕن بە یادەوری دامەزرێنەرانی کۆمەڵەکانی ڕەبەنی خودایی.(١٨)، ئەمانەن: برقوسری، ئێلیا میخائیل، گبرائیل لە ناوچەی(ئاسوور)(١٩)، ئەبراهام، دادیشۆ، باوای، عەودیشۆ، ئیرامیا لە

ناوچەی چیای ئیزل(ئیزلە)([20])، سووریشوو، ئیشۆ عیاب، یەعقووب، ئادۆنا، سلێوە، ئیبنی مارن، لە ناوچەی بان و هەدار([21])، یەعقوب لە بەیت عاوی، برحەز بشەبا، قامیشۆع، ئەبرەم، بەرعیتە، لە ناوچەی(مەرگە) المرج، و داسن([22])عەودیشۆ، ئیشۆع زخا، سەرکیس لەحانیتا، و ئەبراهام لە ناتەبۆر لە ناوچەی حدیاب([23])، لە کاتی باسکردنی هەڵکەوتی دروستکردنی دێرەکان تەماشا دەکەین، کە رەبەنەکان تەنها نەبوون لە بایەخدان بە دروستکردنی دێرەکان، بەڵکو کۆمەڵەێك خەڵکی دیکەی عەلمانیش هەبوون لەوانەی، کە غیرەت پاڵی پێوە دەنان بۆ چوونە ناو ئەو گۆڕەپانە. دێرە دروستکراوەکان لەلایەن عەلمانییەکان داگیر دەکرا و مافەکانیان دەخورا لەلایەن دامەزرێنەرانی، کەوا پیشەیان بوو، کە چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد عەلمانییەکان وەك چوونە ناو مەیدانەکە بۆ خۆدەرخستن و خۆ بە زل زانین، سەرباری لێکدانەوەی پێشوەختە بۆ ئەو پێشەوەرانە بە تێکدانی خانووەکانی نزیکیان([24])، داگیرکردنی ئیسلامی ئەو بوارەی نەرەخساند بۆ جێبەجێکردنی ئامانجی گەشەکردن لە سەردەمی ئیمپراتۆرییەتی فارسی، بەڵکو هەوڵی فراوانکردنی هەروگیفی بۆ ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی دراوسێشدا، کە پێشتر ئیمپراتۆرەکەیان یاسایەکی بەناوبانگی دوژمنکارانەی بۆ گەشەکردنی موڵك و سامانی کەنیسە فراوانەکە دەرکردبوو لە ساڵی ٩٦٤ لەلایەن ئیمپراتۆرەوە(Nicephore Phocas). بۆیە موسڵمانەکانیش قەدەغەی دروستکردنی دێری نوێیان کرد، کە زۆربەی ئەو نەبوو هۆکار بێت بۆ دروستکردنی وەك لە خۆبایی بوون و خۆدەرخستن.([25]) لەگەڵ ئەوەشدا لەوەبەردەر هەبوو، واتە دامەزرێنەری دێرەکان عەلمانی بوون(پەسند بوون) دانیان پێنراوە بە جۆرێك ناوەکانیان لە دێرەکان هەڵواسرابوو بە یەکەوەی بەستبوونەوە لەو دێرانە وەك دێر(شەمعوونە) لە هەمان کاتدا ناسراوە بە دێری(رەبەن کابرۆنە)([26]). هەروەها خانوویێك ـ دێرێك هەیە بەناوبانگە و پێی دەوترێت دێر(قووقە) لەلایەن مارسۆرئیشوا دامەزراوە([27]). هەروەها دێر(صەلیبە)(سلێوە)، کە دەکەوێتە(تەل ـ واتە گرد) لە سەر لێواری سەرسار([28]). هەروەها دێری بەناوبانگی ناسراو بە(دێری مارماری) بەشی زۆری بە ناوی ژنان بەستراوە. ئەو ژنەی، کە چاکبوونەوەی لە سەر دەستی مارماری و ناوەکەی(دێری قنێ) یە([29])وە ئەبی لەو بوارەدا ناوی دێری(هیند) و(شیرین) لە یاد نەکەین. جگە لەمانە سێ کەسی عەلمانی هەیە بە دامەزرێنەری دێرەکان دادەنرێن

ئەمانە:(رامۆی)، ککری، قاین، وە یان قائین،( Gain)([20]). ئەم سێ کەسە بواریان بۆ رەخسا لە پاشکۆدا بەشداری بکەن(واتە لەو زیادە دروستکردنە، کە لە دوای ئەو مێژووە دا کراوە) بۆ دەقەکان: Lebercastihatis پەرتووکی(العفة) بخوێنەوە.

لە بواری تریشدا دەبینین، کەوا عەلمانییەکان چالاکانە پاڵپشت بۆ بزووتنەوەی رەبەنی بوون سەرەرای دروستکردنی دێری تایبەت بۆیان وە ناوەکانیان نەداوەتە دێرەکان، کە دروستیان دەکرد لە مێژووی رووداوەکان، کە تۆمارکراوی تایبەتە بە دێرەکان بۆ نموونە لەوانە ناوی(سۆریشۆ) دەهێنن پەیوەندی هەیە بە دێری کەفەر عوزێل)([3]) لە بابەتی پەیوەندی نێوان خەڵك و دێرەکان، پێویستە ئاماژە بە ناوی ئەو گوندانە بکەین، کە بەشدارییان کردووە لە دروستکردنی دێرەکە بە کەرستە و کەلوپەل، یان کەرستەی دروستکردن و گواستنەوەی بۆ ئەو شوێنە، یان بە هاوکاری کۆمەڵەی هەرەوەزی بە خۆڕایین ئەم جۆرە پشتگیرییە بۆ ئەم جۆرە پرۆژانە تا ئێستاش باوی هەیە، بە تایبەتی لە دروستکردنی کەنیسە لە گووندەکان. مێژوو ئەوەمان بۆ باس دەکات، کە هەندێ گووند و بە پیرۆزی ناوی دەبات بە هۆی ئەو کۆششە بەردەوامەیان لەلایەن رۆڵەکانی ئەو گووندانە لە جێبەجێکردن و دروستکردنی کەنیسە لە گووندەکەیان. هەروەها هەندێك دێر بە ناوی ئەو گووندانەوە ناو نراوە دوای زیادکردنی وشەی پیرۆز بۆ سەر ناوی گووندەکە بۆ نیشانەکردنی هاوبەشی خەڵکی ئەو گووندە لە دروستکردنی دێرەکە، وە کراوەتە(شەفیع) ی واتە(پارێزەری) گووندەکە وە(شەفیعی) خوودی دێرەکە نموونەی ئەو دێرانە دێری(باری قنایە) کە دەکەوێتە نزیك حەدیسە(حەدیسەی موسڵ - وەرگێر) لە سەر ئارەزووی کەنیسە لە داخوازی پارانەوە و خێروبەرەکەت بۆ هەموو ئەوانەی بەشدارییان کردووە لە دروستکردنی کەنیسە، یان دێرێك، رۆژێك داندرا بۆ نوێژ کردن، رۆژێکی وەبیرهێنانەوە و یادکردنەوەیان، بە پێی سرووتی خۆیان. لە لای یەعقووبییەکان رۆژی ١٧ ی کانوونی دووەم دیاریکراوە بۆ گشت باوەڕداران ئەوانەی بەشدارییان کردووە بە ماڵ و سامان، یان کردەوەیەکی خێرخوازی بۆ دروستکردنی پرۆژەیەك، یان دێرێك([3]) بڕیاری کۆمکارەکانی سینۆدس پاڵنەرە بۆ خەڵك بۆ دروستکردنی دێرەکان بۆ ئەوەی بەردەوام ئەو چالاکییانە لە کار دابن و لە خزمەتکردن دابن لە کۆتایی سەدەی شەشەم زۆرێك لە دێرەکان بەرەو رووخان دەچوون و هەندێکیان وەك کەلاوەیان لێهاتبوو.

سەنهادۆس بەتریك(ئیشوعیاب) پاساو بۆ ئەوە دێنێتەوە لە ساڵی ٥٨٥،([٣٣]) بە پێی ئەو دەقە:(فەرامۆشكردن و خۆدزینەوەی رۆڵەكانی ئێستامان لە شڵەژاندا، هەروەها بابەتی نەبینین كە زۆر گرنگە و پێویستە لێی وریابین، چونكە عیلمانییەكان لە توانایاندا نییە بە درووستكردنی دێرەكان بەبێ رەزامەندی وەرگرتن لە(مەتران) دا([٣٤]) لە كاتی هەبوونی ئارەزوو لای كەسێك بە درووستكردنی دێرێك پێویست دەكات پێش هەموو شتێك رەزامەندی لە مەتران بەرپرسی یەكەم وەربگرێت و پێش دەستبەكاربوونی بە كارەكەی و بە مەرجی پەیداكردنی سامانی پێویست بۆ بەردەوامبوونی ژیانی رەبەنەكانی نیشتەجێ لەو خانووە(دێر) دا([٣٥]). جگە لەمە چەند مەرجێكی تر هەیە پێویستە پابەندی بن لە درووستكردنی دێرەكان، ئەو پابەند بوونە پەیوەستە بە شوێنی دێرەكە. كۆمكاری بەتریك(ئاقاق) بەستراوە لە ساڵی ٤٨٦ قەدەغەكردنی درووستكردنی دێرەكانی لە ناوشارەكان، یان لە نزیك شاریدا بوو، وە بۆ ئەوەی ئەو گوومانە بڕەوێتەوە، كە روودەدات بە هۆی كردەوەی خراپی هەندێك لە رەبەنەكان([٣٦]) ئەم یاسایە لە ناو یاساكانی كۆمكاری بەتریك یوسف دا هەیە و بەستراوە لە ساڵی ٥٥٤ و تەئكید لەسەر نموونەی باش كە پێویستە رەبەن بیكات لەبەر ئەوە قەدەخەكردنی لە ئاو هەڵكێشان(العماذ) لە دێرەكانی ناو شاردا كرا، هەروەها مەراسیمی نوێژكردنی بۆنەكان، بۆ ئەوەی ئەوانە پێشبڕكێ نەكەن لەگەڵ خەوەرنەكان(واتە قەشە و كەنیسەی ئەو ناوچەیە) ـ وەرگێڕ. بە پێی ئەمە دەبێ رەبەن بچێتە كەنیسەی سەرەكی(پێی دەڵێن كەنیسەی كاتدرائیە)(وەرگێڕ).
بۆ وەرگرتنی قوربانی پیرۆز، یان ئامادەبوونی نوێژی جەژنی یەكشەممە، یان وەرگرتنی هەر نهێنییەكی تر([٣٧]).

## دێرەكانی ژنان:

یاسا توندەكان زیاتر پەیوەندی بە ژنانەوە هەیە لە دێرەكاندا و پێویستە پابەندی بێت. كۆمكاری بەتریك ئیشۆعیاب بەستراوە لە ساڵی ٥٨٥، هیوا خوازە، كە هەر نەبێت(٣٨)، لە دەقەكانی ئەو یاسایە دەخوێنینەوە: (رێگە نادرێ ژن بە تەنیا بژێت، ئینجا ئایا ئەوە لە دێرەكان بێت، یان لە خەڵوەتگەكانی دابڕودا. وە ئەگەر بكرێت نابێت دێری تایبەت بە ژنان هەبێت، ئەگەر هەشبوو، یان یەكێك دامەزرێنرا وا پێویست دەكات بە یەكەوە بژین لە

هەمان دێردا، بە مەرجێك ژمارەیان لە چوار بۆ پێنج راهیبە کەمتر نەبێتن بۆ ئەوەی کردەوە و رەفتارەکانیان گونجاو بێت لەگەڵ رێنماییەکانی رەبەنەکان ئەگینا سارد و سڕی تێدا روودەدات).

لە سەرەتای ئەو یاسایەی کە ئاماژەمان پێی دا - یاسای ژمارە(۹) - ئەم بەڵگەیەی بۆ ساردوسڕییەکەی هێناوە: (لە وڵاتی ئاسوور و وڵاتانی دەوروبەرەکەیدا هەندێك دێر هەیە لە دەرەوەی گووندەکان درووستکراون، هەندێك بۆ پیاوان و هەندێکیشیان بۆ ژنان، بەبێ گوێدان و ملهوڕی و بێ بیرکردنەوە سەردانی یەکتر دەکەن. هەندێك پەرستگە لەو بابەتانەن، کە تەنها یەك ژنی تێدا دەژی و زۆر جار تووشی ئەوە دەبین کە پیاوان هاتوچۆی نزیکی ئەو شوێنە دەبنەوە، دەبنە هۆی گفتوگۆکردنی شەرمەزاری و عەیبدا و کە لەگەڵ خاسیەتی بنەڕەتی رەبەنەکاندا یەکتر ناگرێتەوە و گونجاو نییە.

## دێرە گواستراوەکان:

هۆی سێیەم بۆ زۆری دێرەکان دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری گواستنەوەی شوێنی دێرەکان لە ناوچەیەکەوە بۆ شوێنێکی تر. ئەمە روبەڕوی ئەوەمان دەکاتەوە، کە لە دوو شوێندا هەمان ناوی هەیە و وەرگرتووە. بەڵام هۆی سەرەکی بۆ ئەمە ئارەزووی زیاد لە پێویست بۆ ئامادەکردنی ناوچەیەکی تر، کە ئارامی باشتر بێت. نموونەمان بۆ ئەمە، دێری رەبەن یوسف لە(ئەنیشکی)([۳۹])، چیرۆکی ئەم دێرە وا دەخوێنرێتەوە: لەبەر ئەوە شوێنی ئەو دێرە گونجاو نییە بە هۆی قورسی باری ژیانەوە لەو کاتەدا ناچار بوو رەبەن(عەودیشۆ) لە داسن شوێنی دێرە کۆنەکان بگوازێتەوە شوێنێکی نوێ. ئەمە لە ساڵی ۹٤۷. شوێنە نوێیەکە باشی لەوەدایە لە بەرزاییەکی زۆردایە و لە هەموو لایەك دەبینرێت لە گووندەکانی دەوروبەری دێرەکە چاودێری و بەدواداچوونی بۆ بکەن، بە تایبەتی لەو کاتانەی، کە رەبەنەکان کرابوونە ئامانج هەڕ و گیفی دووژمنە دڕندەکانیان لێ دەکرا، چونکە گوێیان لە نەنکەو هاوار و پەنابردنیان دەبرد و داوای فریاکەوتن و یارمەتیان دەکرد.

بۆ ئەوەی خانووە نوێیەکە زیاتر ئارام بێت لەدەوروپشتەکەیدا(دێروخەڵوەتگەی رەبەنەکانی نزیك لێی) شوورەیەکی بەرز بۆ ئەوەی دووژمن نەتوانێت هێرش بکاتە سەر حوورمەتی بینایەکە، یان هەر نەبێت ببێتە کۆسپ و تەگەرە بۆ ماوەیەك. ئەو راستیە رەنگە دژ بێت لەگەڵ بیردۆزی بابەتی بەلێکدانەوە بۆ جیاوازییەکانی نێوان شوێنی

دێرەکان لە ناوچە شاخاوییەکان بۆ رەخنەگرتنی توونـد هەنـدێك لـە دێرەکان دەبیـنن دروستکراون لـە بنپاڵی چیایەك، یـان لـە قەدییـەوە، کـە شـوێنێکی رك و تیـژە بـۆ سـەر چیاکە. لەو دێرانـەی کـە ئـەو جۆرە شوێنانەیان هەیە وەك: دێـری رەبـەن هـورمز، دێـری مارپـاقۆ، دێـری شـێخ مـەتی، بـەلاّم دەبیـنین هەنـدێك لـە دێرەکـان لـە سـەر لووتکـەی چـیا بڵندەکان دروستکراون وەك دێری ماردانیال، وە دێری هەڵواسراوە(المعلق) وە دێـری(وزینـە) ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کەوا دێرەکانی کۆمەڵەی یەکەم کۆنترن لەوانـەی دوایی لەبـەر ئـەوەی نـوێتر دروستکراون، یـان هۆکارەکە بـۆ پاراسـتنی بـاری ئاسایش و ئـارامی بـووە لـە دەستنیشانکردنی شوێنی دێرەکان؟ بە تەئکید، ئەگەر لیستێکی شـوێنی دێرەکـان و مێـژووی دروستکردنیانمان هەبێت، ئەو کـات بـواری باشـترمان دەبێـت بـۆ بـەراورد کـردن و گەیشتن بە ئەنجامی باشتر و لەبارتر.

هەنـدێك جـار گواسـتنەوەی شـوێنەکە تـەنها بەشـێکی تایبـەتی دەگرێتـەوە(بـە دەسـتەی دامـەزراوی کـارگێڕی) بۆیـە رەبەنـەکان ئـەو بەشـەیان لادەبـرد، نـەك بـە چـۆڵی بمێنێتـەوە. بـەلاّم گواسـتنەوەی ئێسـك و پرووسـکی قەدیسـەکان هـیچ کاریگەرییـەکی نـەبووە لـە سـەر هەندێك لە دێرەکان و هەروەها هیچ بواری دواکەوتنی نەدراوە.

هەنـدێك لـە دێرەکـان شـوێنەکەیان گواسـتەوە ئـەو کاتـەی، کـە ژمـارەی مەسـیحییەکان لـە دەوروپشتیدا کەم بووە. کۆچکردنی مەسیحییەکان لـە شـوێنی خۆیـان هەنـدێك لـە دێرەکان دابڕاو بن، یـان مەسـیحی تیـا نـەبێت. بۆیـە رایـەکان لـە سـەر ئـەوە کـۆکن بـە دروستکردنی دێرێکی نوێ لە شوێنێکدا، کە چـەقی کۆکردنـەوە، یـان گردبوونـەوەی چـڕی مەسـیحییەکان بێـت و چـالاکی تیـا بێـت. لـەم جـۆرە دێرانـە: (هەیکـەلی مارپۆحـەننا بـەرەنگاری) لـە بێـت ئاگرێ، کە لە ساڵی ١٢٨٤ تالاّن کرا، بۆیـە لەلایـەن مـەفرەیان(ابـن العـبری) لـە نزیـك(بەرتلـە) (بەرتلێ) دووبارە دروستکرایەوە. هەروەها دێری(سـارا) خوشـکی(زەمینـا) شـوێنەکەیان گـۆڕی و گواستیانەوە بۆ شوێنێکی نـوێ، ئەگـەر لێکۆڵینـەوە لـە سەرچاوەکانی بەردەسـتمان بکـەین یارمەتیمان دەدا بۆ ئەوەی هەندێك رۆناکی بخەینـە سـەر شـوێنی دێرەکـان و مێـژووەکانیان.

دەبینین سێ کۆمەڵە سەرچاوەمان لەبەردەسـت دا هەیـە، ئەمانـەن: کۆمەڵـە سەرچـاوەکانی ئیسـلامی، کۆمەڵــە سەرچــاوەیەکی مەسـیحی تایبــەت و گشـتی، وە کۆمەڵــە سەرچــاوەی جۆراوجۆر.

## کۆمەڵە سەرچاوە ئیسلامییەکان:

هەندێ پەرتووکی گشتی جوگرافیناسی عەرەب هەیە وەك: (المسالك) یان(احسن التقاسیم)، کە هەمووومان دەزانین بەلام ئەو پەرتووکانەی، کە بایەخ بە ناوچەکە دەدەن و ئێمە دەمانەوێ لێکۆڵینەوەی لە سەر بکەین وەك ئەو پەرتووکەی، کە لەلایەن(الموسلی)، (یاسین بن خیرالله العمری) لە دایك بووی ساڵی ١٧٤٤،([٤٠]) و(فچل الله العمری)، ([٤١])...(یاقوت) (الحموی) - (وەرگێڕ) دەخەینە سەر ئەمانە لەبەر ئەوەی زانیاری نوێی زیاترمان پێدەدەن، دانراون، بەلام ئەوەی کە وەرگێراوە لەلایەن ئەو دانەرانە و نووسراوە دەربارەی تایبەتمەندی دێرەکان، هەمووی پشت ئەستوور بووە بە پەرتووك و نووسینە کۆنەکان +الدیارات). (حبیب الزیات) لە یەکێك لە وتارە بەناوبانگەکانی بە ناوی (دێرە مەسیحیەکان لە خاکی ئیسلام دا)([٤٢]) نووسیویەتی لیستێکی بە ناوی دانەرەکان، ئەوانەی لە سەر دێرەکان نووسیوە، بەلام زۆر بەداخەوە دەڵێن زۆربەی ئەو پەرتووکانە ئەمڕۆ بزرە و هیچ شتێك دەربارەی ئەمانە نازانین تەنها هەندێك ئاماژە نەبێت لە هەندێك کۆمەڵە هەڵبژاردە دەیانخوێنینەوە وەك(معجم البلدان) یان (وفیات الاعیان) بزربوونی یەکێك لەو سەرچاوانە بە ناونیشانی(کتاب الدیارات) ی(ابی الفرج الاصفهانی) نووسەری بەناوبانگ بە پەرتووکەکەی(الاغانی)، (حبیب الزیات) بە خەسارەتێکی گەورەی لە قەڵەم دەدات و قەرەبوو ناکرێتەوە ناوەڕۆکی دەقی ئەو پەرتووکانەی باس لە دێرەکان دەکەن بریتییە لە هەڵبژاردەی ئەدەبی لە شیعرەکانی باخۆسی(الخمریە - واتە پەیوەستە بە(باخۆس) (خواوەندی شەڕاب لای رۆمانەکان) رێکخراوە بە پێی شوێنی دێرەکان، کە لەوێدا ئەو شیعرانە نووسراوەتەوە. بۆ نموونە پەرتووکی(شاپشی) باس دەکەین دەقەکان بە وردی بلاوکراوەتەوە لە بەغدا ساڵی ١٩٥٤ لەلایەن مامۆستا گۆرگیس عەواد. هەندێك لەو دەقە شیعرییانە بۆ جاری دووەم بلاوکرایەوە لەلایەن (ئەحمەد محەمەد زێن السقاف)، لە بەیرووت بە ناونیشانی(الاوراق). بەلام ئەو پرسیارەی لەمبارەیەوە دەکرێت ئەوەیە: چ پەیوەندییەك هەیە لە نێوان ئەو سەرچاوانە و بە لێکۆڵینەوەیەکی ئێمە و ئەو دێرانە؟

وەلامەکە ئەمەیە: هەندێك رستەی بچووك هەیە لەم دەقانە تیایەتی ئاماژەیە بۆ هاوجووت بوون، خۆشی دەبەخشێت بە دڵی لێکۆڵەرەوەکان. بۆ نموونە یەك لەو دەقانە دەڵی ئەم دێرە پێی دەوترا بە فلان. یان شوێنەکەی دەکەوێتە ناوچەی ئەوێ یان نزیك ئەوێ لە شوێنە ناسراوەکان. ئەو بەرهەڵستی کردنە زۆر جار ئاراستەی راست دەداتە لێکۆڵەرەوەکان. هەندێك جار هێما بۆ ناوەکە ئەدات وەك ناوی پاشایەکی بەناوبانگ، یان شاعیرێکی ناسراو، ئەمە ئاراستەیە بۆ زانین و دیاریکردنی ماوە مێژووییەکەی کە ئەو کات

دێرەکە چالاك بووە بە رەبەنەکان و بە کردەوە ژیانی تێدا هەبووە. بەو بۆنەیە پێویستە ئاگادار بینن یان پێویستە لە سەررمان ئەوە لەبیر نەکەین پشت بەو سەرچاوانە ببەستین لە ژێر چاودێری و رێنمایی تەواو بێت، لەبەر ئەوەی هەندێ لەو نووسراوانە، کە دەقەکە پشتی پێ دەبەستێت بۆی هەیە ئەو دەقە باوەرپێکراو نەبێت، یان لەوانەیە ئەو دێرەی کە ئاماژەی پێ دەکرێت لەناو چووبێت لە دێر زەمانەوە. بەلآم نووسەری دەقە تایبەتەکە بە دێری دیاریکراو، وەك ئەوەی دێرەکە تا ئێستاش مابێت و کار و چالاکی خۆی بکات.

## کۆمەڵە سەرچاوە مەسیحییە تایبەتییەکان:

سەرچاوە مەسیحییە راستەوخۆ تایبەتییەکان تایبەت بە کاروباری رەبەنایەتی دەکرێنە دوو بەش ئەمانەن: دانانە گشتییەکان، واتە نووسینی یەکلایەنە(لێکۆڵینەوەی تایبەت بە یەك بابەت) بۆ یەك دێر، یان رەبەنێکی دیاریکراو و تاك و تەنها، یان جیاواز لە تووخمەکەی و هاوشێوەی نەبێت و نموونە بۆ ئەو سەرچاوەیە پەرتووکی(العفە) یە. نووسەری پەرتووکی ناوبراو، یان پەرتووکی(ژیانی دامەزرێنەری دێرەکان لە مەملەکەتی فارس و عەرەبی مەترِان)(ئیشۆع دناح).(یسوع دناح). ئەم مەترانە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم ژیاوە(شابۆ) بەبلاوکردنەوەی ئەم پەرتووکە هەڵساوە لەگەڵ وەرگێرانەکەی بۆ زمانی فەرەنسی بۆ ساڵی ١٨٩٦. لە ساڵی ١٩٠١ قەشە بێجان بلآوی کردەوە، بەلآم بە زمانیکلدانی لە لای بزك) لە ساڵی ١٩٣٩ خوا لێخۆش بوو بەتریك پۆڵس شێخۆی دووەم وەرگێرانەکەی بە زمانی عەرەبی بلآوکردەوە([٤٣]) قەشەی بەرێز(ریمۆند ئیم، تۆنو)، هاتە موسڵ و دەستنووسێکی وەرگێری تری بە زمانی فەرەنسی، کە لەلایەن خۆیەوە کرابوو بۆ جێهێشتم. وەرگێراوەکەی دوایی بەداخەوە پشتی بە سەرچاوە بەستووە زۆر بەداخەوە نەماون. وەرگێرانەکەی قەشە ریمۆند لە راستیدا(ناوەرۆك - فەهرس) بە نرخ بوو، ژیاننامەی ١٥٠ کەس(وەرگێرانی ژیانیان) کورتەی ژیاننامەی دامەزرێنەری دێرەکان بوو. ئەوەی لە ژیانی ئەمانە بەدیدەکرا هەندێك تێبینی بوو ئاماژە بە شوێنی دێرەکان دەکات لەوانەیە ئێمە سوودی لێوەربگرین بۆ ناسینی شوێنی دێرەکان بە تەواوەتی([٤٤]). هەروەها کۆمەڵێك پەراو هەیە Codex لە ژێرەوەی ژمارە(٦٣) لە بەرایی(٤٤)،(نوێژی خودایی) (تسبیح الالاهیە) سروودێکی تایبەت بۆ دوو قەدیسی نەناسراو. لە دەقەکەدا ئاماژە بە ناوی قەدیسێکی دیاریکراون شوێنی دانانی نیەوە.([٤٥]) ئەم سرووده هەر وەك وتەی کورت وایە بەبێ دیاریکردنی مەبەست لە رێکخستنیدا بە کردەوە، جگە لە هەندێك هەندێك گۆرانکاری کە لە دواییدا لێکۆڵینەوەی لە سەر دەکەین ئەم سرووده دانراوە بە پێ

پەرتووکی(Libercastitatis )، (العفە)، ئەو سەرچاوەیە پشتی پێ دەبەستین لێرە بە دواوە بە ناوی(کورتکراوە ـ المختصر)، لە کۆتایی ئاماژە بە(شابۆ) دەکەین لێکۆڵینەوەی لەو دقە کردووە. (Libercastitatis ) کتاب العفە) پەرتووکی ـ العفە ئەو کات هەبوو لە ژێر دەقەکانی پەرتووکەکانی سریانی لە(مەلا بار) سووتێنراوە لە ساڵی ١٥٩٩، دوای ئەوەی کە سنهادس دیامپەر (Diamper) حوکمی بەسەر دا دەکرد لە ژێر کاریگەری Menezes([46]). لە بەراوردێکدا ئەو زانیارییانەمان بۆ دەردەکەوێت لە ناواخنی ئەو دەقانەی لەو بەرگەدا هەبوو، کە لەگەڵ دەقەکەدا فەوتێنراوە لە Libercastitatis(کتاب العفة) سەرنجمان بۆ هەندێك تێبینی رادەکێشێت لە دوایدا باسی دەکەین. ئەنجامی ئەو بلاوکردنەوە بە تێبینی لەو دەقەی کە هاتووە لە Libercastitatis بە شێوەیەکی خراپ کەوتە بەردەستمان، ئێمە بە هیوای ئەوە بووین، کە لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەگرانە بۆ ئەو نووسرە گرنگە بکرێت، رەنگە زۆر گرنگ بێت ئەگەر ئەو تێبینیانە کۆبکرابایەوە بە پێی قۆناغەکان یان بە پێی ماوەی کاتەکەی، رەنگە لە توانادا بێت دوورخستنەوەی هەموو دەقە شێوێندراوە لەو ماوانەی دوایی لە دەقە رەسەنەکەی خۆیدا. لە خوارەوە ئەو دەقە شێوێنراوانە تۆمار دەکەم. روون و دیارە لە یەکەم چاوپێکەوتن:

ـ دەقێکی زۆر نامۆ شێوێنراوە دوای ناونیشانەکەی لە ژێر تێبینی ژمارە(٣٠) بەڵام دەقە رەسەنەکە بە تەواوی بزر بووە و نەماوە ئەو دەقە تایبەت بە(مارێوگاما)([47]).

ـ لە تێبین ژمارە(٨٥)(باس لە مارعسقیا دەکات)، دەبینین تەنها ناونیشانەکەی ماوە، ناوی کەسە دیارەکە ناسراوە لە دەقەکانی تردا، هەروەها جێگیر کراوە لە شوێنێکی لەبار لە تەوەرەکاندا تێبینییەکانی(٧٥ ـ ٨٦) تایبەت کراوە بە ناوچەکانی دەوروبەری (حیرە) واتە: بێت حالی، المحـرة... تاد وە دیاریکراوە بۆ قوتابییە لابراوەکان(باوای) وە(خوداوی). لێرەدا لابراو دەقە رەسەنەکەی وەلا ناوە، وە چیرۆکێکی زۆر نامۆی خستۆتە جێگەی پەیوەندی بە خراپترین دەق هەیە لە تەوەردا کە پەیوەندی بە مارئۆجین هەیە.

ـ لە تێبینی(١٢٢) پەیوەندی بە گابریێل کەشکەری) هەیە، پێویستە ئەو دەستەواژەیە وەلا بنرێت(وە هەروەها ئەو پیاو چاکە مارگبریلی) لە موسڵ دروست کرد ناوی ئەو دێرە لە ناونیشانەکەدا نییە هەروەها ژمارەی دێرە درووستکراوەکان سێیە لە جیاتی چوار هەروەك لە دەقەکەدا هاتووە. لە هەندێك شوێن بۆشایی ماوەتەوە(بۆشایی بۆ دەقە بزرکراوەکان) بەشێك لە پەرتووکی(ئیشۆعە دناح) پێویستە ئەوەی بۆ زیاد بکرێت:

ـ دەقی بزرکراو تەواو کەری کۆتایی تێبینی ژمارە ١١٩.

ـ تەواو کردنی وشە ناتەواوەکان: سا ...(تێبینی ژمارە ٢٦) وە حەز... تێبینی ژمارە ٥٤).

ـ لەوانەیە هەندێك وشەی ناتەواو لە دەقەكەی تێبینی ژمارە ٣١ هەبێت دەكەوێتە نێوان دەستەواژەی(پیاو چاك ماردانیال كە چووە لای مار ئەورەهام) وە دەستەواژەی(لە چیای ئۆرۆخ).

ـ بۆشاییەك هەیە لە كۆتایی تێبینی ژمارە ٦٦ وە سەرەتای تێبینی ژمارە ٦٧ بە پێی رای(شابۆ) كە زۆر لەبارو شیاوە، ئەوەی ئەو نازناوەی وەردەگرت بە دوو ناو بانگ دەكرا(ئەسنائیل ـ نەسنائیل) هەردووكیان یەكخراون و كورتكراونەتەوە و لە دەقی مەلا بار)(تێبینی ژمارە ٣٨). سەرەرای لایەنی هەیكەلی دامەزرێنەر لە سەر دەق ئەگەر لێكۆڵینەوەیەكی ورد بكەین لە سەر نووسەر(دانەرەكە) ئەوەمان بۆ دەست دەكەوێت كە دەمارگیرییەكی تێكدەرانەی هەبووە بۆ شێواندنی رووداوەكان وەك ئارەزووێك بۆ ئەوەی كە بڵێن ئەمە فێربوونێكی تایبەتە بە خۆیەوە.(٤٨). یا بۆ تێپەڕكردنی هەندێك رووداو كە بۆ بەرژەوەندی پاڵەوانەكان نیە كە ئەو دەیوێت باسیان بكات بە هێمنی بێ دەنگی تەواوە. هەر وەك نووسەرەكەمان چۆن دەبینین بە سەر هەندێ رووداودا تێپەڕ دەبێت بێ ئەوەی گوێ بداتە هۆكاری رووداوەكە لە سەرەمانە گومان لەو بابەتە بكەین. وە لێرەدا چیرۆكەك هەیە زۆر ئارەزوومەند نیە و نایەوێت هەواڵەكەمان پێ بڵێت ئەگەرچی زانین دەربارەی پێویستە بۆ ئەوەی بیرۆكەیەكی راستمان لە سەر كەسایەتی ئەوەی كە باسەكەمانی لێوە دەكەین. لە لێكۆڵینەوەكەمان ئاماژە بە هەندێك(دەستەواژە یان رستە) دەكەین ئەمانە كلیلی گرنگن بۆ زانینی درێژەی ئەوەی پەیوەندی بە باسەكەمانەوە هەیە وەك(النعمة دفعته الی...) (واتە خێرەكە لەوەدابوو پاڵی پێوە بنێی بۆ...) بەهۆیەوە نووسەر، یان دانەری پەرتووك هەندێك درۆودەلەسەی پێوە بنێ لە ژێر پەردەی ئاینی و باوەڕداریدا.

لە توانامانەدا هەیە كە هەندێك شتی تر وەربگرین لە سەر(ئیشۆعا دناح) وەك نەبوونی وردەكاری لە دیاریكردنی شوێنی جوگرافیایی. ئەو لە دوورەوە قسە لەسەر ئەمانە دەكات لەبەر ئەوەی خەڵكی(بەسرە) ایەوە بەنسبەت ئەو شوێنانەی لە كوردستانی عێراقدایە وا ئەزانی لە یەكتری نزیكن ئەو دوورییەی لە ناوچەكە هۆیەكی ترە بۆ ئەو گۆڕانكارییە كارگێڕانەی دوایی، كە داینەوە ناگونجێت لەگەڵ راستییەكەی بۆ نموونە(تۆما مەرگەیی) دەهێنین كە پێش ئەو بووە(پێش ئیشۆعا دناح) لە نووسینەدا بە پشتێنێك لە ساڵاندا. دەخوێنینەوە، كەوا نازناوی(رێشە)(سەرۆكی گشتی دێرەكە) تەنها بۆ سەرۆكی دێرەكە دەدرا لە ناوچەی مەرج(مەرگە) نەك لە شوێنەكانی تر، بەڵام دەبینین ئیشۆعا دناح ئەو نازناوەی دەداتێ(وەك ئەو سەرۆكە) هەتاوەكو ئەگەر لە ناوچەی(بانۆهەدار) یش بێت. بۆیە پێویستە باری ئەو(بەسری) بەسریە قورس نەكەین، چونكە ئەو تەنها فێڵبازێكی

تەڵەکەبازە. لە سەرەمان پێویستە بە تایبەتی ئەمڕۆ سزای نەدەین، لەبەر ئەوەی لەوانەیە لە دوا رۆژ هەندێك شتی سەیر و راستەوخۆ بێتە پێشمان لە کاتی بەراورد کردندا لەگەڵ وەرگێڕاوەکە لە پیتی Lc بۆ پەرتووکی(العفە) کە لە ناوی بردووە Menezes بۆمان دەردەکەوێت، کەوا ئاماژە بەو تێبینیانە بکات کارمان تێ بکات لە دوا رۆژدا وە لێرە پرسیار دەکەین: ئەم وەرگێڕانە بۆمان دەرناکەوێت بە کردەوە، کەوا(مارنۆجین) (ئوکن) ی گەورە لە گۆڕەپانەکە دوور بووە بە ئاشکرایی. سەرەڕای ئەوەی ئەو لیستەیە دەست پێدەکات بە ئەبرەهام(ئەورەهام) ئەورەهامی گەورە، بەڵام ئەو لە دەقەکەدا پەڕیوەتە(١٥)؟ بە مسۆگەری دوورکەوتنەوەی مارنۆجین(ئۆکن) لە لیستی(دیامبەر) لەوانەیە بە تەگبیر بووبێت بەم شێوەیە: لەبەر ئەوەی ئەو ماوەیەی مارنۆجین تیای ژیاوە دەکەوێتە دەرەوەی ماوەی سەرکۆنە کردن، ئەمە هۆکارێکی ناڕاستەکراوە بەوەی، کە ئەو حوکمە نەیگرێتەوە(الحرم - لێ بێبەشکردن - مەهروم کردن(وەرگێڕ)، لە بارێکی لەو شێوە پێویستە ئەوها سام بێت لەسەر هەموو قوتابییەکانی وە ئەوانیش بگرێتەوە. بۆ زانیاریتان دەبینین ئەوانە دابەشکراون بەسەر دامەزراوەکانی دێرەکانی تر. ئەو جیاوازییە لە نێوان دەقەکەی L.C کە ئەمڕۆ لای ناسراوە ئێستا وە دەقەکەی لە بەرگی(مجلد)(مەلابار) دا هەیە، کە ئەمە بە شێوەیەك ئێمە گومان لەوە ناکەین کەوا هەر دوو دەقی سەرچاوەکە هەمان پەرتووکە وە بۆ هەمان دانەرە. بەڵام لە سەرەوەشەوە دەبینین پەرتووکەکە شێوازێکی جیاوازە.([٤٩]) ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کەوا گۆڕانکاری کراوە لە دەقەکە ئەگەر وەڵامەکە بە ئەرێنی بوو، ئایا ئەوە کێیە بەم کارە هەڵساوە بۆ ئەوەی تاوانباری بکەین؟ ئاشکرایە پێشەکییەکەی مارنۆجین(ئۆکن) لە سەر ئەبرەهامی گەورە ناڕاستەمان دەکات ئەو کارە(گریمان)(الفرضیة) لە کردەوەی یەکێك لە هەواداراني بیردۆزی نوێی تازە لە دایك بووبێت تایبەت بێت بە پێشەکییەکەی ئۆجینی، بۆیە ئێمە پێویستمان بە دەقەکەی(مەلابار) هەیە بۆ ئەوەی بزانین ئەو رۆڵەی کە بە کردەوە دەیبینی بۆ تێبینی قوتابییەکانی مارنۆجین لە سەری. بزرکردنی تەواو بۆ ئەم پەرتووکە خەسارەتێکی گەورەیە و زەرەرێکە بۆی نییە قەت چاکبکرێتەوە، هەروەها گومان لە ئاماژەکانی(شابۆ) دەکەین. دەربارەی دەڵێین هەڵەیەکی گەورەی کردووە ئەو کاتەی گوتوویەتی دەمارگیری مەزهەبی لای Menszes نەبۆتە هۆی زەرەرگەیاندنی هەستیار بە ئەدەبی سریانی) ئەوەی لە سەر پەرتووکی(الرؤساء) دەیڵێین زۆر لەوە کەمترە. هاسانترە چاو بە دەقە ئینگلیزییەکە بخشێنین بەهۆی ئەو وەرگێڕانەی کە لەلایەن Sir e. AWallisBudge کراوە (سێرواليس بيدك)([٥٠]) خاڵی گرنگ ئەوە دەمانەوێت تەئکید لەوە بکەین کەوا ئەو

پەرتووکـەی(تۆمـا) داینـاوە وەك Historа monastic پەرتووکێکـە لـە سـەر چـالاکی رەبەنـەکان دەدوێـت - وە یـا وەك پـەرتووکێکی گشـتی. لەبـەر ئـەوەی لابردنـی بەشـێك لـە دەقـەکان، کـە بـاس لـە ئـۆجین دەکـات وە یـا تایبەتـە بـە بەشـێك لـە رەبەنـە ژنـەکان کـە ناوبانگیان هەیە([51]) وا دەکات بابەتەکە زۆر ئاچوغ نـەبێت. لـە رووی کـردەوەدا پەرتووکەکە لێکدانەوەیەکی یەکلایەنانە و فراوانە ئەم پەرتووکـە لـە پێـنج بـەش پێکهاتووە وە بـاس لـە سـەرکەوتنەکانی باوکـانی قەدیسـییەکان دەکـات(لـە بێـت عـاوی) دواتـر بەشـێکی تـری لـە باسەکە بۆ زیاد کراوە بە کورتی، بـەلآم ئـەو باسـەی دوایـی سـەربەخۆی زۆری هەیـە لەگـەڵ هی یەکەم، باس لە پیاو چاکی گبریل و قوبرسی دەکات، پەرتووکەکە ژمـارەی بەشـی(شـەش) لـە پەرتووکـە سـەرەکییەکە کـە وەردەگرێـت بـەلآم ئـەو ئاماژەیـە ورد نییـە. ئـەو پـەراوێزە ئینگلیزییە زۆرەی وەرگێڕ بەشی زۆری کار دەکاتـە سـەر تێکچوونی رەوتەکـە و بـێ ئـەوەی روونکردنــەوەی بەکـەڵك لـە دەقـەکان هـەبێت، بـەلآم نەخشـەکانی بـرتین لـە نەخشـەی ئەندێشەیی و بەس. لە راستیدا پەرتووکەکە دوور نییـە لـە راسـتییەکان و زانیـاری نـوێ کـە سوودێکی گـەورەی هەیـە. ئـەو بەڵگانـەی کـە نووسـەر پشتی پـێ بەسـتوون هەمـە چەشـن و جۆرا و جۆرن و وردەکاری تیایە. زۆربەی جار نووسـەر خـۆی سـەردانی شـوێنەکانی کـردووە کـە خـەڵکی تیـا ژیـاوە و باسیان دەکـاتن بـەلآم لـە سـەر ئەوەشـەوە لـە تواناماندا نییـە ئـەم پەرتووکـە بـە دیکـۆمێنتێکی بـەهێز دابنـێین لـە سـەرووی پەرتووکـەکانی تـردا. لـە باسـە یەکلایەنەکان بۆ ژیانی دیـاری پـڕ لـە بەرهەڵستی زۆر لەوانـە(مێـژووی دێـری مارسۆریشو) لـە(بێـت قووقـا)([52]) وە پـەرتووکێك لـە سـەر ژیـانی(رەبـەن یوسـف بۆسـنایە) لەلایـەن دانەرەکـەی (یۆحـەننان بوکلـدوون)([53]) وە هـەروەها پـەرتووکێك لـە سـەر ژیـانی (رەبـەن هـورمز) ی (فارسـی) وە (رەبـەن برعێتـا) ژیاننامـەی ئـەو دوو رەبەنـە لەلایـەن(بـووزی بەناوبانگ) وەرگێڕاوە، کە خاوەن بەرهەم و پەرتووکێکی زۆرە([54]).

ئـەو دەقـە کلدانیانــە دەدۆزینــەوە کــە لەلایــەن(بێجـان) نووسـراوە کـە لـە سـەر بـواری جوگرافیایی و مێژوویی نووسراوە لەم لاولەولا بلآوکراوەتەوە دەربارەی ژیانی قەدیسـەکان. پەرتووکەکانی بێجان بلآوکراونەتەوە لە ژێـر نـاوی(منتخبـات مـن اعمـال الشـهداء و القدیســین)([55]) Acta Martyrum Etsanctorum مـەتران (ئەدیشـێر) ئـەم پەرتووکــەی بــە زمــانی ئینگلیــزی دەرکــردووە بــە ناونیشــانی(ســیرة شــهداء المشــرق)(ژیاننامــەی شــەهیدەکانی رۆژهــەلآت([56]) لــە کۆتــایی دەمانــەوێت ئــەوە روونبکەینـەوە کـەوا چـەند دەقێك هەیـە بـە چـاپ نەگەیـەنراوە لەوانەیـە لـە دەستنووسـە

پارێزراوەکانـــدا بتـــوانین بیخـــوێنین لـــە هەنـــدێك لـــە پەرتووکخانـــەکان، بـــە تایبـــەتی پەرتووکخانەی(دیر السیدة حافضة الزروع)([57])
وە یـان لـەو دانـە دەستنووسـە پـەرش و بڵاوانـە دەیدۆزینـەوە و دەتـوانین بیخـوێنین لـە بۆنـەکانی(شـێرا) وە یـان فێسـتیڤاڵی ئـاینی و ئاهەنگـەکانی شـەوانە کـە بـە بۆنـەی جەژنی(قەدیسەکان) پارێزەری ئەو کەنیسە وە یا کەنیسەکانی تر.

## سەرچاوە مەسیحییە گشتییەکان:

لەبەر ئەوەی ئەو مەیدانە زۆر ناسراوە بۆیە بـە شـێوەیەکی سـاکار باسـی دەکـەین ئاشکراشـە شـێوازی سـریانی رۆژئـاوایی زۆر بـە روونـی جیادەکرێتـەوە لـە شـێوازی رۆژهـەڵاتی. لـە فەرهـەنگی سـریانی - یـەعقووبی دەبیـنین: سێ لایـەنی تێکهەڵکێشـراو زنجیرەیـەك لـە سێ کردەوەی هونەری لە سەر یەك بابەتی بەدوایەکدا بۆ(دێنسی درۆزن)(دینس الکذاب)(لە تل محری) میخائیل سریانی وە(ابن العبري) کـە هـیچ هاوشـێوەیەکی نییـە و هاوتـەریبی نەبووە لە(کلدو - نەستۆری) هەر یەك لە(میخائیل سـریانی و ابـن الحبری) پـەرتووکیان زۆر داناوە و بـە لێکۆڵینـەوەی هەڵساون لەوانـە مێـژووی بەتریکـەکانی رۆژهـەڵات لەلایـەن(مـاری کـوڕی سلێمان) لـە سـەدەی دوازدەهـەم وە لەلایـەن(عـەمرو کـوڕی مـەتی و سلێوەی کـوڕی یۆحەننان) دووبارە کراوەتەوە لە سەدەی چواردەهەم([58]). لـە رووی زمانـەوانی دەقـەکان بـە جـوانی دانـەنراون(بـە زمـانی عـەرەبی) وە زۆر هەڵـەی تیایـە وە یـا بـە شـێوەیەکی سـاکار هـاتووە کـە زۆر ماناکـەی نابەخشێ بۆیـە لـە بـەکارهێنانی ئـەو دەقانـە وریـایی دەوێـت لـە رێکخستنی ناوەکانی نەسقەفییەکان. ئەو پەرتووکـە کـە زیـاتر ئـاخێنراوە مێـژووی سعردیە بـە زمـانی عـەرەبی بڵاوکراوەتـەوە و وەرگێـڕاوە بـۆ سـەر زمـانی فەرەنسـی بـە پێنووسـی خوالێخۆشـبوو مـەتران(ئەدیشـێر) لـەم پەرتووکـە نـاوی زۆر کـەسمان بەرچـاو دەکـەوێت لەوانـە: Liber Castitatis (کتـــاب العفـــة) وە لـە هـەمان مـاوەدا، وە لەوانەیـە گواســترابێتەوە لــە هــەمان سەرچــاوە. لــە کۆتــایی پێویســتە ئــەو دەقــە مێژووییانــە روونبکەینـەوە چ بـە زمـانی سـریانی وە یـان عـەرەبی چـاپکراو بێـت وە لەلایـەن کۆمـەڵێك نووسـەرەکانی رۆژهـەڵاتی(C.S.Co) لـە لۆڤـان - واشـنتۆن - وە یـا لەلایـەن کۆمەڵـە قەشـەیەکی رۆژهـەڵاتی(P.O) بـۆ قەشـە Graffin کـە زۆرێـك دوور و درێـژە و هەنـدێك وردەکـاری شـاردراوەی لـە گۆشـە دەقییـەکان لـەبیرکراو تیایـە بـەڵام ئـەو دوور و درێژییـە دەمانباتە سەر ناسینەوەی هەندێك شوێن و کەس و مێژووی رووداوەکان بە وردییەوە.

## سەرچاوەی تر:

سەرەڕای سەرچاوە نووسراوەکان چ سەرچاوەی ئیسلامی وە یا مەسیحی بە عەرەبی وە یا سریانی، لێرەدا ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە دیکۆمێنت و بەڵگە هەیە.

ـ ئەو نەریتە خۆجێیەی دەماو دەم گوازراوەتەوە ناو شوێنەکان باس دەکرێت لەلایەن خەڵکێکی زۆر باس دەکرێت، بەڵام ئەوانە لە سەر نەخشە نەچەسپاون. لەوانەیە ناوەکە لەگەڵ دەربڕین (تلفظ) شێواندرابێت لەبەر بەسەرچوونی ماوەیەکی دوور و درێژ لە بەکارهێنانیدا وە یا لە ئەنجامی جیاوازی زمانی ئەو کەسانەی کە ناوەکە دەردەبڕن. هەیە لەوانە عەرەبە وە یا کوردە وە یا یەزیدییە وە یا شەبەکە وە یا لە ئارییە کۆنەکانە.

ـ ئەو دەقانەی باسکراون لە کۆتاییەکانی دەستنووسەکانی سریانی و عەرەبییە بەربڵاوانەی لە پەرتووکخانەکانی جیهان بڵاوبوونەتەوە، وە یا تا ئێستاش پارێزراون، هەندێ جار گریانت بۆی دێ چونکە لە سەر سەکۆیەك کەوتووە لە قوژبنێکدا(السکرسیتا) زۆر شێدارە.

ـ باسکردن و لێکۆڵینەوەکانی ڕۆژهەڵاتناسەکان و بەتایبەتی فەرهەنگەکانی تایبەت بەناوی شوێنەکان لەوانە(فەرهەنگی کەنیسەیی بۆ مێژوو و جوگرافیا) (القاموس الكنسي للتاريخ و الجغرافية) (D.H.G.E) کە شوێنێکی یەکەمی لە گرنگیدا هەیە.

ـ ئەو چیرۆکانەی گەریدە بێگانەکان باسی لێوەدەکەن، پشت بە بینینی دەبەستێت بێ ئەوەی لێکۆڵینەوەی لەسەر کرابێت وە یا ئەو بێگانانەی کە ماوەیەك لە وڵاتدا ماونەتەوە.

ـ ئەو وێنانەی کە بە فرۆکە وەرگیراون و ڕوون و ئاشکران، هەندێ جار خاڵی سپی وە یا لاکێشەیی دیارن و سەرنجمان ڕادەکێشی و ئاماژە بەوە دەکات بە کەڵەکەبوونی بەردەکان وە یا پاشماوەی دێرێکی لەبیرکراو.

هەموو ئەو بەڵگانە و دیکۆمێنت و نووسراوانە پاڵپشتمانن وە لە بن نایەن بۆ زیادبوونی سەرچاوەی زانیاری بەڵام ئەبێ ئەمە لەبیر نەکەین سوود وەرگرتن لەو سەرچاوانە و پشت بەستن پێیانەوە بۆ دەربڕینی ڕایەك ڕەنگە گیروگرفت و زەحمەتی زۆرمان تووش بکات.

## بەکارهێنانی سەرچاوەکان:

ئەو دەقانەی لەبەردەستمان دایە جا ئەگەر سەرچاوەکان دەستنووس بن وە یا پەرتووکی چاپکراو بێت پێویستە زۆر بە وردی ڕەخنەگرانە و وریاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین. زۆر جار دیاریکردنی مێژووەکەی بە خەمڵاندن دانراوە بۆ دەقێك لە ئەنجامی ڕەخنەگرانەی دوور و درێژی ناوەوەی ئەمەش گرنگی و بایەخدانە بە مێژووەکەی زۆربەی ئەو دەقانە دەگەڕێنەوە بۆ پێش سەدەی نۆیەم و دەیەم. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە

نووسینەکان لە دوای چوار سەد وە یان پێنج سەد ساڵ دوای روودانە مێژووییەکە بۆیە باوەڕکردن بە راستی و دروستی دەقەکان تا رادەیەك نییە وەیا زۆر کەمە. زۆر لەو دەقانە نووسراون بۆ ئەوەی لە بۆنەکاندا بخورێنرێتەوە بە تایبەتی فێستیڤاڵە ئاینییەکان(شیرا) (الشیرا) تەنها بۆ دڵنیاکردنەوەی خەڵك و رازیکردنی باوەڕداران و سەرنجراکێشانی میللەتەکە، کە دابەشی دەکەین بە پێی پێویستی نوێژکردنەکە، ناسراوە بە(کلام القندلفت) (خادم الکنیسە) ـ(خزمەتکاری کەنیسە) بێ پەروا، واتە ئەو قسانەی کە متمانەیان پێ ناگرێت بە هۆی ئەوەی لە رووی مێژووییەوە گومانیان لە سەرە ئەو کاتەی وەرگێردراوەکان بە زمانی ئەوروپی بۆ ئەو دەقانەمان لا دەست بکەوێت پێویستە لە سەرمان وردەکاری تیا بکەین. لەبەر ئەوەی جیاوازی بچووك لە یەك مانادا بە چاوی وەرگێڕەوە رەنگە زۆر بایەخی نەبێت هەروەك مێژوونووس بۆ دەڕوانێت بۆیە وەك ئەو نموونەیە باسی دەکەین(Lestrange ) بەبێ سێ و دوو هێڵی بە ژێر ئەو نووسینانەی(ابن الحوقل) ساڵی ٩٣٩ دا بکێشی و دەڵێ، لە موسڵ(تل نینوی) ـ گردی نەینەوای بینیوە کە لەو شوێنە(یۆنان پێغەمبەری) تیا نێژراوە، بەڵام لە واقیعدا ئەم گۆڕەی ئەو پێغەمبەرە نەدۆزرابۆوە تا ساڵی ١٣٤٩. کە دەگەڕێینەوە سەر دەقە عەرەبییە رەسەنەکە، دەبینین مەبەستی(بە عەرەبی ابن الحوقل) لە قسەکانی دا تەنها مەبەستی خەڵکی نەینەوایە) کەوا خوا یۆنان پێغەمبەری بۆ نارد([٥٩]) نموونەیەکی ترمان لەبەردەستدایە کە لەلایەن مێژوونووسی گەورە مەتران(ئەدیشێرە) ئەو مێژوونووسە سەرەڕای ناوبانگیەکەی دەبینین لە بیری چووە، وە یا بە سەهووێکی وا کە مەبەستی نەبووە، لە ناوەڕاستی بینایەی کەنیسەکانی رۆژهەڵاتی لەو ماوە مێژووییەدا، سەکۆیەك هەبووە پێیان دەوت(دیما) لە ناوەڕاستی ئەو سەکۆیە قاپەکە بەرز دەکرایەوە(مەبەست بەرزکردنەوەی قاپی قوربانی پیرۆزە ـ وەرگێڕ). ئەوە بینایەکی ئاسایی نیە و پێی دەوترێت(الجلجلە) ـ جومجومە لەبەر ئەوەی خاچەکەی لە سەرە، قسە لە سەر گۆڕی یەکێك لەو بەتریکانە دەکات، کە لە ژێر(بیمە) کە دایە هەر وەك لە دەقە عەرەبییەکە زۆر ئاشکرایە. لە سەر گۆڕی(بەتریك) سەکۆیەك دروستکراوە لە سەر شێوەی خاچ([٦٠]) تا ئێستا زۆر هەوڵ دراوە بۆ لێکجیاکردنەوە و باوەڕ کردن و دیکۆمێنتی شوێنەکانی مێژووی مەسیحی. لە هەموویان بەناوبانگتر و گرنگترینیان ئەوەی(جۆرج هۆفمان)، کە پێی هەڵساوە بە ناونیشانی( Auszhge Aus Sgrschen Aklen Persischer

Marturer ) زۆر بـە داخـەوە کـە دانـە کۆنەکـە بـە چاپگەیەندراوە وە لـە سـەر هـەمان شێوەی کۆنی خۆی کە زۆر خاڵی تیا بـوو پێویست بـە چاکردنەوەی دەکـرد وە یـا هەنـدێك زیادە.

هەمان تێبینی لە سەر پەرتووکی Thnoldeke هەیە بە ناونیشانی Geschichre der Perser Und Araber Zun Zeite Der Sassaniden ئەو پێشکەوتنە کە بـە دەست هاتووە لە مەیدانی دۆزینەوەکان و وێنەکێشانی نەخشەکان بە ڕێگەی نـوێ. هـەروەها هونەری بە چاپگەیاندنی دەقەکان هەموویانی وریا کردەوە بە تایبەتی ئەوانـەی بایـەخ بـەو نووسـراوانە دەدەن کـە ئێمـە ئاماژەمـان پێـی دا بـە هـۆی گرنگیانـەوە چـونکە ئەوەنـدە بـە نرخە و هەرگیز بۆی نییە شتێکی تری نوێ شوێنی ئەوانە بگرێتەوە.

- لیسـتەکانی(الســمعاني Assemani ) سـەر بـە پەرتووکخانـەی ڕۆژهـەڵات Bibliotheca – Orientalis ڕێکخـراوە لـە لایـەن Lequien ، وە بڵاوکراوەتـەوە لـە ( Christianus Oriens) وە هـەروەها لیسـتی(Pognon) لـە ژێـر ناونیشـانی(Semitipues Lnscription) (نـەخش و نیگـاری سـامییەکان) وە لیسـتەکانی Budge لـە وەرگێڕانـی بـۆ پـەرتووکی(الرؤســاء) (سـەرۆکەکان) وە لیستەکانی(شـابۆ) بڵاوکراوەتـەوە لـە(سینۆدسییەکانی ڕۆژهـەڵاتی . کۆمکارەکانی کەنیسـەی ڕۆژهەڵات) وە لیستەکانی مەتران(بەرسوم) بڵاوکراوەتەوە لە پـەرتووکی(الؤلؤ المنثور) وە لیسـتەکانی بـەتریك مـارپۆڵس شـێخۆ بڵاوکراوەتـەوە لـە پـەرتووکی(الـديارات) هـەموان جیادەکرێنەوە وەك کەرستەیەك بۆ کارکردن لـە سـەری. بـەڵام لـە سـەر ئەوەشـەوە دەبیـنین ڕێگەی نووسەر پـڕە لـە کۆسـپ و تەگـەرە، دانـەرە جیاوازەکـان هـەر یەکـە ڕێگەیـەکی جیـای هەیە لە نووسینی ناوەکاندا.

کۆنـەکان بـەبێ سـێ و دوو ناوەکـانی لاتینیـان دەخسـتە سـریانییەوە. بـۆ نموونـە: هەیانـە ناوی(عەودیشۆ) دەبێتە(Ebedjesus) لێرەدا نـاوی قەشـە(بـیتەرس) وەبـیر دەهێـنین، کـە وتوویەتی:(ئاگادار بە لە نووسینی ناوەکانی سریانی!، لە راسـتیدا کێشـەیەکی گەورەیـە، نـەك هەر زۆر زەرەرە بەڵکو بە دڵنیاییەوە جێگـەی گاڵتـەجارییـە بـۆ ئەوانـەی کـە چـەند زمانێـك دەزانن)([٦]) لە سەر ئەوەشەوە هەندێك کێشـەی راسـتەقینە لێـرە و لـەوێ دووچـاری دەبێـت، چۆن ئەو ناوانە دەخوێنینەوە؟ وە ئایا ئەو ناوانە بـە ئاخـافتنی سـریانی ڕۆژهەڵاتییـە وە یـا ڕۆژئـاوایی وە یـا وەك ئـاخفتنی عـەرەبی، وە یـا بـە پێـی ئـەوەی لەگـەڵ زمـانی فەڕەنسـی

تەرازوو دەکرێت؟ هەموو ئەو گۆڕانکارییە بە پێی بارودۆخەکانە وە یا تایبەت بە سەرچاوەکان وە یا کردەوەی بەکارهێنراو وە یا قسەکردن لە سەری، لەو بارانەدا دەتوانین هەردوو زارەکییەکە(لفظ) بەکاربێنین، وەك بزانین کە کامیان باشترە.([٦٢]).

لە هاوکێشەکانی تەرازووی فەرەنسی کە پەسند و زانراو بێ و زیاتر بەکاردێت ئەمە دەخەینە بەرچاو:

George Guorguis _ Gorgeis Guiwarguis
Gabriel Gibrail Gawri
Abraham Lbrahim Awraham
Jean Hanna Yhanannan
Joseph Yousif Yawsip
Aba Awa
Etc...Habib Habbiwa

بە کردەوە ئەو وشانە زۆر دەخزێنە ناو دەقەکان، زۆر جاریش کورت کراوەتەوە، هەروەك وشەی رەبەن(مەبەستی سەرۆکی دێرە کورت دەکرێتەوە ئەو کاتەی کە ئاماژە بە رەبەنە سادەکان دەکەی. دەنووسرێت و کورت دەکرێتەوە بە پیتی( R ر) وە هەروەها وشەی (بیث)(مەبەستی شوێنی گوندە وە یا ناوچەیە) بەم دەنگانە تەلەفوز دەکرێت: با، بی، بۆ، بی بیۆ Ba.Be.Bo.Bi.Bu. بە کورتکراوەیی دەنووسرێت بە پیتی(ب).

کۆسپێکی تریش تووشمان دەبێت، پێویستە ئاماژەی پێبکەین. دەقەکانی خۆجێیی پشت بە کاروباری کەسێك دەبەستن کە مەبەستە. بەڵام رەنگە لە واقیعیشدا مەبەستی کەسێکی تر بێت. لە یەکێك لە دەستنووسەکانی موسڵ([٦٣])، ئەوە دەخوێنینەوە راستیەك هەیە کە پێویستی بە گفتوگۆ ناکات هەر وەك دەردەکەوێ رەبەن یووسف بۆسنایە شەفیعی(دێری ئینیشکێ) یە بەڵام راستی واقیعی دەڵێ شەفیعی(دێری ئینیشکێ) ناو یووسفێکی ترە و زۆر دیار نییە، لە نزیك دێری(بێت عاوی) خەڵوەتگەیەك هەیە، با وا دابنێین(هی رەبەن هورمز) ە، بەڵام لە راستیدا هی قەشەیەکی سادەیە بە ناوی(ئیشۆ عداد).ئەوەی پەیوەندی بە دانەرەکان هەیە کە هەندێك جار کۆمەڵەیەکی تایبەتیان دروست کردووە بۆ ئەوەی بایەخ بە ناوە لێکچووەکان بدەن، لەوانە:(بدج)([٦٤]) کە دەڵێت ناوەکانی(زەخائیشو) وە(ئیشوزەخا) وە(مشیحازەخا) هەموویان ناوی یەك کەسن.

وە دەبێ دان بەوە دابنێین، کە زۆر زەحمەتە جیاکردنەوەی لێکچووەکان هەروەك لە دەقەکان باس کراوە. بۆ نموونە ئاماژە بە ناوی(ابن مارن) دەکەین کە بەستراوەتەوە

بە(بیدعاوی) لەگەڵ پەیوەندی بە ناوی خوێندکارە بەناوبانگەکەی(ابن مارن الکبیر) لە(بێت گەرمای) دامەزرێنەری دێری زەعفەران. ناوی دێری ناوبراو لە کۆتایی دەقەکەدا هاتووە، ئەمەش سەرنجمان رادەکێشێ کاتێك دەمانەوێ شوێنەکە دیاری بکەین، لەبەر ئەوەی دوو دێر هەیە و هەمان ناویان لێنراوە یەکەمیان دەکەوێتە نزیك زاخۆ و دووەمیان نزیك ماردین.

وە هەروەها دێرێك هەیە بەناوی(سەرکیس) یەکەم هی سەرکیسی شەهیدە ناسراو بە(قەسر سەرکیس ـ کۆشکی سەرکیس) وە دووەمیان هی سەرکیسی ناسکی بەند کراوە، وە هەروەها پێی دەڵێن(دێری هەڵواسراو) وە هەروەها دوو دێر هەیە بە ناوی(میخائیل)(٦٥) یەکێکیان نزیك موسڵە و ئەوی تریان نزیك هەولێرە. وە دوو دێر بە ناوی(ماڕیۆنان) یەکەمیان نزیك موسڵ و ئەوی تر لە(حدیاب) ە(٦٦) جگە لەوەی ئاماژەمان پێدا دێری تر هەیە هەمان ناوی(یۆنان و میخائیل) یان هەیە دێری یۆنان لە دیمەشق و ماردین هەیە بە هەمان ناو. ئەمە وای کردووە کارەکەمان ئاڵۆز بێتز ئەگەر بە شێوەیەك ناوەکان لەبەر کرابن لە سەر پشتی دڵ بۆ هەموو ناوەکانی ئەو دێرانە لە سوریا و تورکیا و عێراق. وە لە هەمان کاتیش ئەمانە لە میسریش هەیە. پێم وایە زۆر زەحمەتە بۆ دوور کەوتنەوە لە هەڵە کردن وە هەتاوەکو دانەرەکانیش بە بایەخەوە باسیان کردبێت. بۆ نموونە دەبینین(٦٧) Honigmann پشت بەوە دەبەستێت، کەوا دێری یەعقووبییەکان لە(الکنوشیا ـ کەنوشیا) ناوەکەی بە زمانی عەرەبی(دێر المجمع ـ دێری کۆمکار) ە، لێکۆڵەرەوەیەك دەچێتە(عین المجمع) کە دەکەوێتە ناو بیابانی فراوانی نزیك سنووری سوریا، بەڵام ناوەکە تەنها(دێر المجمع) ە(ئەو شوێنەی کە کۆبوونەوەی کۆمکارانی تیا کراوە ـ وەرگێر). بەڵام ناوە نوێیەکەی ئەو دێرە کۆنیشیایە شوێنەوارەکەی بە چاو دیارە زۆر بە روونی هەموو ئەوانە زۆر کاریگەرن لە سەر کارەکەمان.

## دۆزینەوەی شوێنەکان( وە یا ناسینەوەیان )

رەنگە بڵێین ئەم کارە هاسانە، بە کردار ئەمە راستە بە تایبەتی ئەگەر هۆکارەکانی پێویست هەبوو. وەك هۆکاری گواستنەوە، بەڵام لێکۆڵەری بایەخدار زۆر کۆسپی دەکەوێتە پێش کە چاوەڕێی ناکات، وەك: ئەو کۆسپانەی بۆ بێگانەکان دادەنرێت لە گواستنەوەدا، دووری ماوەکان، نەبوونی رێگای باش بۆ گەیشتن بەو شوێنانە، نەبوونی ئاو وە یا کەمی

ئاو لە سەر ناوچە شاخاوییەکان وە یا بیابانـەکان، لەبـەر ئـەوەی زۆربـەی رەبەنـەکان شـوێنە ئاسێکان دیاری دەکەن کە زەحمەت بیگەنێ بۆ شوێنی جێنشینی ئەمانە لە قوژبنەکاندا.
باشترین رێگە بۆ دۆزینـەوە و دیـاریکردنی شـوێنەکان فڕۆکـەی هەلیکۆپتـەرە، چونکە تـەنها چـارەیە بـۆ دۆزینـەوەی گەشـەی هونـەری کـە لەلایـەن قەشـە Poidebard بـەکاری هێنـاوە، کاتێـك دەگـەڕا بـە دوای رێگـاو بانـەکانی نێـوان کێڵگـەکان کـە دەیگەیانـدە شـارە سەرەکییەکە لە ناوچەی(Euboea) یەکێك لە دوورگەکانی یۆنـان. تـەنها بـە هەلیکۆپتـەر دەتـوانین لـەو کێشـەیە دەربازمـان بێـت بـە تایبـەتی شـوێنە بـەرز و ئاسـێکان وە زەحمـەتی گەیشتن بۆ ئەو شـوێنانە، وە هـەوەرها کێشـەی گۆشـەکانی وێنـەگرتن، وە هـەروەها فرسـەتی جۆنیەتی و لـەباری شـوێنی وێنەگرتنـەکانمان پێـدەدات. جگـە لەمـەش بابـەتی هاسـان هاتـە خـوارەوە بـۆ شـوێنە لـەبارەکان کـە بـە هاسـانی دەتـوانین بچـینە شـوێنەکە و هەڵسـان بـە کـرداری سـپیکاری چـینەکانی بـەردە دیارەکـان وە هـەروەها بەرزبوونـەوەی بـە فڕۆکـە بـۆ جاری دووەم بۆ وێنە گرتنی شوێنەکە بە تەواوەتی، هەتاوەکو ئەگـەر شـوێنەکە کەلاوەیـەکی زۆر گەورەش بێت هەر وەکو مانەوەی شوێنەکانی بینایی میگالیتی(واتـە ئـەو شـوێنەوارانەی پەیوەندی بە پێش مێژوو هەیە، دروستکراوە بـە بـەردی زۆر مـەزن) لـەو شـوێنەی ناسـراوە بـە دێـرە وێزنیـا) کـە دەکەوێتـە سـەر لووتکە کراوەکـەی چیای(شـەنگال) ئەگـەر بمانـەوێت لێکۆڵینەوە و باسی ئـەم شـوێنە بکـەین کاتێـك ئێمـە لـەو شـوێنە راوەسـتابین ئەمـە کـارێکی زەحمەت و ئاڵۆزە، بەلام لە رووی زانستییەوە وێنەیەکی کامیرایی بـە هەلیکۆپتـەر(وە یـا بـە فڕۆکەیەکی ئاسایی بەلام ئەمەیان رەنگە چانسەکەی کۆسپی سـەرکەوتنی هـەبێت) قـەبارەی کارەکـەمان پـێ دەبەخشـین کـە ئێمـە دەمانـەوێت، ئـەو مەبەسـتانەی هـەر بەشـێك لـە بینایەکەمان دەداتێ.
سەرەڕای ئەوەش پێویستمان بە خەڵکی شارەزا هەیە بۆ یارمەتیدانمان. رەنگـە ئـەو دەلیـل و شارەزایانە هەندێك جار بەکەڵك بێن و لەوانەشە هەندێك جار سەرلێشێواو بـن ئـەو دەلیلـە مەسیحیانە باسـەکەمان پـڕ دەکـەن لـە چیرۆك کـە هـەرگیز کۆتـایی نابێـت رەنگـە لـە دێـر زەمانــەوە دەگوازرێتــەوە بــۆ یــەکتری وەیــا چــیرۆکی شــوێنەکان کــە زۆر جــار بــاوەڕ پێکراوە(نەریتە) وەك ناوچەیەکی پیرۆزز
وە ئــەوەش دەدۆزینــەوە کــەوا هەنــدێك جــار شــوێنەکە تووشــی هێــرش و پــەلاماردانی غـەمبارمان دەکـات. پـێش نزیکـەی بیسـت سـاڵێك کەسـێکی مێـژوو نـووس دانەیـەك لـە

پـەرتووکی(تۆمـا المرجـی) هـەبوو ئـەو بـرادەرە هـەوڵێکی زۆری داوە بـە دابەشـکردنی ئـەو ناوانـە بـە راسـت و چـەپ و بـە سـنگێکی فراوانـەوە وە بێوچـان وە بـەبێ هـیچ بەڵگەیـەکی باوەڕپێکراو جگە لـە هەنـدێك لێکچوون نـەبێت لەگـەڵ هەنـدێك نـاوی بـاوەڕ پێکـراو داوای دەکرد کەوا تەنها رایەکەی ئەو راست و دروستە کە باسی لێوە دەکات، بەڵام لەوبارەیـەوە کەوا دەلیلێکی تری جگە لـە مەسیحی، ئەمـە دەگۆڕێ، چونکە مەبەستەکە زۆر دیـار نیـە، بۆیە دەلیلەکە وێنەکێشە وە بە تایبەتی ئەگەر مێژوونووسەکە بەبەرگی پیاوی ئاینی بێت. مەبەسـت لـە باسـکردنەکان لـە کـەلاوەی دێـر و شـوێنەکەی بـۆ ئەوەیـە داخـوازی بکـەین بـە موڵکداری ئەو سەردەمانە، کە باب و باپیرانمان جێیـان هێشتووە. ئـەوەم بـە بیـر دێتـەوە بـۆ شوێنێك کـە پەیوەنـدی بـەو چـەند دێـرەی باسـم کـرد لـە پێشـەوە. گـەنجێکم ناسـی کـوڕی موختاری گوندی(خنس) بوو لەگەڵی دوام دەربـارەی ئـەو دێـرە نزیکـەی گووندەکـە، دەسـتی کرد بە سوێند خـواردنی گـەورە کـەوا ئـەمرۆ هـیچ دێرێکـی نزیـك لـەو گوونـدە و ناوچـەکە نییـە، بـەڵام ئێـوارەی هـەمان رۆژ برادەرێکـی خـۆم لەگـەڵ موسـڵمانێکی گووندەکـە شـوێنی دێرەکەی پێداین. ئێمە کە بـاس لـەو بابەتـە دەکـەین لـە هـەمان شـوێن راوەسـتاین. شێوازی پرسیار کردنی لایەکی ترە و گرنگی خۆی هەیە لـە لێکۆڵینـەوە دەربـارەی شـوێنی دێرەکـان. بۆ گەڕان بە دوای شوێنی هەر دێرێك لە سەرتە هەوڵ بدەی پـاڵ بـە دەلیلەکـەوە بـدەیت بـۆ قسەکردن بێ ئـەوەی بـواری وەڵامدانـەوەی ئـەو شـێوەیەی ئـەو دەیـوێت پێـی بـدەیت وە بـۆ دەرئـەنجامی شـێوازی پرسیارەکەت بـە پێچـەوانەوە وەڵامێکـت پێـدەدات کـە بـەلای ئـەو تـۆ رازی دەبیـت پێیـەوە. بەشـی زۆری ئـەو پرسـیارانە قـازانجی لێـوە دەکـەیت کـە زۆر سـاکارە وەك: ئـەم گـردە نـاوی چییە؟ وە یـا ئـەو رێگەیـە بـەرەو کـێ دەچێت؟ جارێکیـان دەلیلێکم لەگەڵ بوو بـۆ ناوچـەیەك دەکەوێتـە نزیـك شـاری تکریـت. کـە زنجیرەیـەك نـاوم پێـوت هـی شوێنە کۆنەکان کە پێویستە لەناوچەکەدا هەبێت راوەستا بـە واق وڕمـاوی، وە کاتێـك باسـی نـاوی یاریـدەدەری مـەتڕانم کـرد(مـەتڕانی ئەسـقەفیەی کـۆن کـە لـەو ناوچـەیە بـە(کـەرما) یان(گەرما)(٢٨) ناسرابوو، هیچ شتێکی گـژی لـە دەموچـاو نـەما، وە هـیچ وەبیرهێنانەوەیـەك بۆ گەرما(الکرما) پێنەبوو. دوای ئەوە بە کەمێك گەیشـتینە دەروازەی ئـەو رێگەیـەی بـەرەو شوێنەکە دەڕوات خـەڵکی ناوچـەکە پێـی دەڵـێن(کـەریم) وە دەڵـێن پەیوەنـدی هەیـە لەگـەڵ ناوی(کەریم ئەبو خلخال) یـەکێك لـە رۆڵـەکانی(ئیمـام موسـا) هـیچ شـوێنەوارێکی دیـار لـەو جێگەیە نیە تەنها گومەتێك چیرۆك باس لە پێشینان دەکات. ئەم گومەتە لـە سـەر کـەلاوەی کەنیسـەیەك دروسـتکراوە کـە جێگـای باسـکردنە. دوای گەیشـتن بـۆ شـوێنی دێـرە کۆنەکـە

پێویستە تەماشای دیوی دەرەوەی بکەین: واتە چۆن دەبینرێ؟ باری ئەو پلەیەی تێکچووە، چونکە ئەمە ئەوەمان پێدەدات تا چەند کۆنە.

وە دووری لە شوێنە فەرمبالغییەکان بە دانیشتووان ئەگەر ئەمە لە سەر لووتکەی چیایەکی دابڕاو بێت، رەنگە لە رووی تالان و بڕۆوە دێرەکە دووچاری هاتووە وە یان ئەوانەی کە هێرشیان کردۆتە سەری کرداری تاکە کەسی بووە و کەمتر کاریگەر بووە. رەنگە دیوارەکانی نەڕووخابن و مابن بە بەرزی مەترێك وە یا دوو مەتر لە سەر ئاستی زەوییەکەن بەلام ئەگەر بینایەی دێرەکە بکەویتە نزیك لە گوندێك بەردەکە بۆ دروستکردنی خانووی گوندەکە بەکارهاتوون. بۆیە هیچ پاشماوەیەکی دیاری نامێنێت هەروەك دێری شەمعوون جەبەلی(شمعون الجبلي).

لە سەر زێی دیجلە نزیك(عەرایر ـ عرایر) تەنها ئەو رێزە بەردانە دەبینین، کە لە سەر رووی زەوییەکە ماون بە شێوەیەکی رێز و کەڵەکە کراو. هەروەها پاشماوەکانی دێری(الکبیر) ناسراو بە دێری(مارشلیتا) تەنها ئەو کەلەکە بەردانە لە سەر یەك لە کێڵگەیەکی کشتوکاڵی دەبینرێن وەك قاعیدەیەکی گشتی هەموو کاتێك تووشی کۆمەڵە بەردێکی لاکێشی وە یا چوار گۆشەیی دەبینین. نەخشەی ناوەخۆییەکەی لەبەر چاو لاچووە. بنمیچەی ژوورەکان بە تەواوی وێران بوون و بەردەکان رووخاون، زەوییەکانیان وەك چاڵێك وە جیا جیا لە قوڵایی دیارن، لە ناوەڕاستی گۆڕەپانەکانی ناوخۆ کوپە کۆنەکان دەبینرێن بە شکاوی و چاڵاییەکی دیاری هەیە. ناتوانین ببینین وەك پاشماوەی راست و دروستی بینایەی کەنیسەیەك و بەس بینایەی کەنیسە هەردەم بە بەرد(هەڵنەکەنراو) وە کلس و گەچ دەکرێن، لە ناو ئەو بینایە دەبینین بەشێکی شەشە پاڵوویە پێی دەڵێن خۆرس)(بەشی گرنگی بینایەی کەنیسە بە دڵی کەنیسە دادەنرێت)(وەرگێڕ).

هەندێك جار ئەو بەشە تا ئێستاش دەبینرێ زۆر بە روونی سەرەڕای تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر بەسەردا، بەلام هەندێك جار تەنها شوێنەواری بینایەکی چوار گۆشەیی دەبینین ئاڕاستە بە هەر چوار لاوە، چونکە کەنیسە هەردەم بەم شێوەیە دەبێت باکووری ـ رۆژهەلات(الشمالیة الشرقیة) وە یا باشووری ـ خۆرهەلات لە بیناکە. میحرابەکە نووساوە بە دیواری رۆژهەلات. گۆڕەپانێك بەلای رۆژئاوای کەنیسەی دێرەکە هەیە لە دێرەکانی یەعقووبییەکان. بەلام دێرەکانی نەستۆری ئەم گۆڕەپانە روو لە لای رۆژهەلاتە لە بینای کەنیسە دەرگای سەرەکی بۆ چوونە ناو دێرەکە دەکەوێتە ناوەڕاستی بینای دێرەکە، بەدەر لە هەندێك باردا کە سروشتی ناوچەکە و زەوییەکە وا دەخوازێت بینای دێرەکان بریتی

بوون.([19]): پەرستگەی(خەڵوەتگەی) سەرۆکی دێر، وە یەکێکی تر نزیك دەرگای دەرگاکەر، سالۆنێکی(هۆڵێکی) گەورە شوێنی نووستنی رەبەنە نوێیەکان، ژوورێك بۆ میوانداری، چێشتخانەیەکی فراوان لەگەڵ فڕنی نان کردن، ژووری کەلوپەل(کۆگا) وە ژوورێکی نازووقە(هۆڵی خواردن) بۆ گشت ئەوانەیە کە تیایدا دەژین بە یەکەوە لەگەڵ رەبەنە نوێیەکان، لە رۆژانی جەژنە و ئاهەنگەکان پیاو چاك و دابراوەکان(خەڵوەتگەکان) بەشدارییان دەکرد کە لە رووی روحی و گیانی پشتگیری دێرەکەیان دەکرد لەوانەی لە دەوروپشت و نزیك دێرەکە بە تەنها دەژیان واتە ئەوانەی لە ئەشکەوت و کۆنە ببڕ و کۆریتە دابڕاوەکانی دەوری دێرەکە دەژین وەك پێوەرێك بۆ هەر رەبەنێك مەترێك زەوی لەلایەکی بینایەکەی بۆ تەرخان کراوە.

## دیاریکردنی ناسنامەی دێر و دەستنیشانکردنی شوێنەکانیان

دوای دڵنیا بوون کە شوێنی کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دێرە، ئەو کێشەیەمان بۆ سەرهەڵدەدات چ ناوێکی بۆ پاشماوەی کەلاوەکانی(شوێنەوار) دیار بکەین؟ هەندێك جار ناوەخۆجێییەکەی هاوچەرخ(نوێ) بۆ جێگەکە هیچ ئامازەیەك بە ناسنامەی راستەقینەی دێرەکە ناکات.

ناوچەی شەنگاڵ بۆ ئەو بوارە نائومێدمان دەکات. کاتێك بە دوای دێر(مارشەمعوونی زەیتوونی) وە یان ناسراو بە(بارتووری) وە یا دێرەکانی بە ناو ماز بسیون) وە یا رەبەن (سابۆخت) وە دێری تریش... لە جیاتی ئەوانە ناوی ترمان بۆ دەردەکەوی(بانا دێرا) وە (دێر زیتجێگی) وە یا(دێرە وزینە) وە یا(دێر ئاسێ ـ عاصی)... تاد

لەو ناوانە. بۆ زانیاریتان کۆمەڵە ناوی دووەم یارمەتیمان نادات بۆ ناسینی یەکێك لەمانە کە لە کۆمەڵی یەکەمدا هەیە. هەندێك جار کە گوێمان لە ناوێك دەبێت ئامازەیە بۆ ناوێکی دیاری بەناوبانگ لە سەر گوێچکەماندا بەلام بە شێوەیەکی شێوێنراو بە هۆی ئەو گۆڕانکاریانەی بە سەریدا هاتووە.

لێرەدا تووشی ناوی دێری(رەبەن سلێوە) دەبینین ئێستا ناسراوە بە دێری سلێوە ـ دیر الصلیب) ئەم راستیە ئەوەمان بۆ دەردەخات کە چەند هۆکارێك هەیە تووشی هەڵەمان دەکات رەنگە زۆر باسی درێژی بچووك بە لێکۆڵەر ببەخشێ بەلام رەنگە لێکۆڵەرێکی تر بەسەریدا تێپەڕ بێت و هیچ بایەخێکی پێنەدات سەرکەوتن بە رێگایەك و بە پێچاوپێچی زۆر کەم دەبێتە ئەو هۆیەی بەشێکی کەم بزر بێت و چارەسەری نەکرێت. هەموو ئەوانە

ئـەوە دەگەیـەنێت کـەوا بـوارێکی فـراوان لـە پێشـمانە بـۆ وردبوونـەوە لـە باسـەکەمان وە گفتوگۆکردن لـە سـەر کـارێکی لـەو شـێوەیە. دوا وشـەمان ئەوەیـە پـێش بچینـە نـاو دوور و درێژی لێکۆڵینەوەکەمان کە بە ناونیشانی(ئاشـووری مەسـیحییەت) ە بـۆ دوورکەوتنـەوە لـە دووبارە بوونـەوە و زیـادی ئـەو قورسـایەی دەکەوێتـە سـەر خوێنـەر وە یـا ئـەوەی بایـەخ بـە بابـەتێك لـەو شـێوەیە دەدات کۆکردنـەوەی سەرچـاوە جوگرافیاییـەکان تایبـەت بـە شـوێن و جێگە لەو ناوچانە کە بابەتی باسەکەمانە(واتە(حدیاب) وە(مەرگە)، المـرج، وە (بانۆهـەدار)) وە دەخرێتە شوێنێك کە باسەکە بەرێوەیە بۆ ئەو کات. ئەگـەر نـاوی جێگەیـەکی دیـاریکراو بۆ نموونە، بکەوێتە ناوچەی(بانۆهەدار) وە باسی بکرێـت کـە لـە سـەر حـدیاب دەدوێـن ئـەو کـات پێویسـتە بگەرێینـەوە بـۆ ناوەرۆکەکـە بـۆ ئـەوەی سەرچـاوە سـەرەکییە تایبەتییەکـە بدۆزینـەوە بـۆ شـوێنی مەبەسـت بـەلام نـاوی ئـەو جێگایانـەی کـە دەکەونـە دەرەوەی باسەکەمان، ئـەوە باسـێکی روونکردنـەوەی لەگـەڵ دا دەکـەین ئەگـەر بـۆ جـاری یەکـەم بـوو. ناوەرۆکەکە یارمەتیمان دەدات بـۆ لێکۆڵینـەوە لـە سەرچاوەکان ئەگـەر دووبـارە بـۆوە وە لـە دەقەکانی دواتر.

# بەشی یەکەم
# حدیـــاب

## چوارچێوەی جوگرافیایی:

سنووری کارگێری هەرێمی حدیاب بە درێژایی مێژوو چەسپاو نـەبووە، بـەڵکو لـە گـۆڕانێکی بەردەوام دا بووە بە پێی بارودۆخی سەپێنراو لە لایەن سنووره سروشتییەکانەوە. هـەرێمی حدیاب زەویەکی ناڕێکە لە شێوەی(معین) سێ لایەنی لەو چوار نیمچە چەسپاون و زۆر بـە هاسانی دەناسرێن.

ـ ڕێـڕەوی رووبـاری دیجلـەی گـەمارۆدراو بـە هـەر دوو زێیەکـە لایـەنی سـنووری رۆژئـاوای ناوچەکە، وە بە ئاراستەی باکوور باشوور.

ـ زێی گەوره (سەروو) لای باکووری ناوچەکە پێکدێنێ وە بـە پێـی ئاڕاسـتەی رووبارەکـە کـە لەلای باکووری خۆرهەڵات بەرەو باشووری خۆرئاوایە.

ـ زێی بچووك (خواروو) سنووری باشـوور دروسـت دەکـات، وە بـە ئاراسـتەی تـەریبی بـۆ زێـی گەوره.

ـ سنووری رۆژهەڵات بە گشتی تـەریب نیـە لەگـەڵ سـنووری رۆژئـاوا، واتـە ڕێـڕەوی رووبـاری دیجلـە لەگـەڵ لادان بـەرەو تـەوەری بـاکوور: بـاکووری رۆژئـاوا وە لـە باشـوورەوە: باشـووری رۆژهەڵات. ئەم تەوەرە دەچێتە ناو(چیاکانی حـدیاب) وە بـۆ هەنـدێك ناوچـەی دراوسـێ بـۆ ئەبرەشیەی سالاخ(سلێخ) ی کـۆن ئـەو گۆڕانکاریـەی بـە درێـژایی سـەدەکان بەسـەر ناوچـەی حـدیاب دا هـاتووە، لـەو بەشـە رووپـدەدا، لەبەرئـەوەی هـیچ لەمپـەرێکی سرووشـتی نیـە بـۆ ئەوەی قەدەغەی هاتنـە نـاوەوە وە یـا بەزانـدن، لـەو بەشـەی باسـەکەمان تیشـکێك دەخەینـە سەر ئەو ناوچەیە. کەواتە لە باسـەکەماندا ناوچـەی حـدیاب دیـاری دەکرێـت بـەو زەویانـەی گەمارۆ دراوە لە نێـوان هـەر دوو زێیەکـە بـاکوور و باشـوور.(٢٠) ناوچـەکە پێکهـاتووە، وە لـە دەستپێکردنی لە رۆژئاوا بۆ رۆژهەڵات بەبەرزی و نزمی زەویەکە بەم شێوەیە:

ـ ئەو دەشتەی درێژ دەبێتەوە لە نێوان رووباری دیجلە و زنجیرە چیای(قەرەچوغ) ئەم دەشتە گرنگە رێگەی کۆنی بەرەو بەغدا پێدا تێپەڕ دەبێت کە دەکەوێتە نێوان حەدیسەی موسڵ و بەوازیج.

ـ ئەو دۆڵەی ئەمڕۆ ناسراوە(بە کەندێناوە) دەکەوێتە نێوان زنجیرە چیاکانی هاوتەریبی یەکتری کە دەکەونە نێوان چیای قەرەچوغ و ئیۆیەناداغ ـ ئەوینا داغ).

ـ ئەو زەویە بەرزانە ناسراوە بە(حەززا) کە دەکەوێتە لای رۆژهەلآت لە زنجیرە چیای (ئەویناداغ).

ـ چیای حەدیاب دەکەوێتە لای باکووری خۆرهەلآت. ئەم چیایە بریتییە لە چەند پێچاوپێچێك دەست پێدەکات لە چیای سەفین) کە ناسراوە بە چیای(سەلآحەدین) وە پێویستە تێبینی بکەین بۆ ئەو کۆتاییانەی باکوور و باشوور لە کەرتکە چیا بۆ ئەو پێچانە وە هەوەرها ئەو ناوچانەی کە کۆتایی بە چیاکان دێت هەندێك نزمایی پێکدێنی لەگەڵ رێڕەوی هەر دوو رووبارەکەیە: ئەو زەویانەی دەکەونە لای باکووری خۆرهەلآت نزیك بە زێی گەورە ناسراوە بە(ئەبرەشییەکانی رووبار) (واتە ئەوانەی کەوتوونەتە لێواری رووبار ـ وەرگێڕ) وە ناسراوە بە(حیۆتۆن) وە(مەعەلتا) ی زێ. بەو ئاراستەی بۆ ناوەوە دێنە ناو ئەبرەشیەی(حەنیئێتا).

ـ دابەشبوونی جوگرافی سەرەوە ناچارمان دەکات کارەکەمان دابەش بکەین(باسەکەمان) بە پێی ئەمە و لەبەر ئەوەی مەڵبەندی سروشتی و سیاسیی و(ئاینی) بۆ ئەو ناوچەیە کە شاری هەولێر بەهۆی هەبوونی هێڵەکانی پانی بۆ چوارچێوەی مێژوو. بۆیە قۆناغی یەکەمی باسەکەمانە لەو بەشە.

(١)

## هەولێر ـ اربيل

## ئەو ماوەیەی دەکەوێتە پێش مژدە بە ئنجیل:

(اربيـل) هـەولێر مەڵبەنـدی هـەرێمی حدیابـە، وە لـەو شـارانەیە کـەوا کێبڕکێـی نازنـاوی(کـۆنترین شـارە بەبـەردەوامی مرۆڤـی تیـا نیشـتەجێیە بـەبێ وەسـتان) ئەوانـەی تەفسیری پـەرتووکی پیرۆزیـان کـردووە لـە سـریانەکان، کـە دوای مـارِ ئـەفرام هـاتن.([٧١]) بـۆ ئـەوەی بیسـەلمێنن شـاری(رەحبـوت ـ عیـد) کـە لـە سـفری(التکوین)(١٠ ـ ١١) نـاوی هـاتووە یەکێکـە لـەو شـارانەی(نـەمرود) کورشـی(کـوش) کـوڕی(سـام)(یـەکێك لـە رۆڵـەکانی نـوح ـوەرگێڕ).

لە ئاشووری دروستی کردووە. بـە داخـەوە شـوێنی شـاری هـەولێر لەلایـەن شوێنەوارناسـەکان وەك پێویست لێکۆڵینەوەیان لە سەر نەکردووە. لە شـاری هـەولێر گردێکـی سـەرکەش هەیـە بەرگری گشت وێرانکاری و شـەڕەکانی کـردووە بـە سـەربڵندی ماوەتـەوە، ئـەم دیوارانـە هـی قـەڵای هـەولێری بـەناوبانگن. جێگـەی ئـەو بەرزایـەی لـە زەوی، لـەم گـردە هـیچ پشـکنینی شوێنەوارناسی بـۆ نـەکراوە. زانیارییـەکانی Reallexicon Der Assyriologie کۆکراوەتەوە و بڵاوکراوەتەوە لـە وتارێـك بـە ناونیشـانی ئـەربائیلۆ([٧٢]) سـاڵی ١٩٢٩، لـە سـەر دەقی خۆی ماوە، ئەمە جێی داخە زانیارییەکان ماون هەر وەکو خۆیـان بـەبێ زیـادە رەنگـە هاوکارمان بێت بۆ مێژووی دوور و درێژی نوێ.

بە کورتی دەڵێین:(ناوی شارەکە)(ئۆربیلیۆم) ـ Urbilum لە دەقەکان دا هـاتووە پـێش سێ هەزار ساڵ(پ. ز) هەر وەك لە پەیمانەکانی ئاشووریدا هاتووە بە شێوەی(ئارِبـائلۆ) بـە واتـای شاری چوار خواوەند. ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێ، کـەوا پایتـەختی ئـاینی، روحی مەملەکەتەکە بـووە، وە هـەروەها پەیکـەرێکی بـەناوبانگی تایبـەت بـۆ خواوەنـد عەشـتاری لێیـە. نـاوی(ئـەربیل) وە یـا(ئـەربل) بەسـتراوە بـەو شـەڕە بەناوبانگـەی کـە لـە سـاڵی ٣٣١ پ. ز روویداوە لە نێوان ئەسکەندەر مەقدۆنی ـ وەرگێڕ) یۆنانی و داریۆشی سێیەمی فارسی. لـەم شەڕەدا ئەسکەندەر بە سەر داریۆس دا سەرکەوت ئەم شەڕە پێی دەڵێن شـەڕی(کۆکامیـل) Gaugamels دوای ئەو وردەکاریەی تایبەت بە ناوی(ئەربیل) لـە باسـەکەماندا دەچینە سەر شوێنەکەی([٧٣])

دوای سەدەیەك بەسەر ئەو شەڕە فرشییەکەیان داگیریانکرد، دامەزرێنەری بنەماڵەی ئەرشاقی هەڵسا بە دروستکردنی گۆرشستانێکی پاشایەتی تێدا.

(کارکالا) ئیمپراتۆری ڕۆمانی حورمەتی ئەو گۆڕستانەی شکاند لە ساڵی ٢١٦ ی ز. دواتر ئەربیل مایەوە وەك مەیدانی ململانێ لە نێوان فرشییەکان و ڕۆمانییەکان، وە هەتا ئەو کاتەی کە ئەرمەنەکانیش دەسەڵاتیان بەسەر دا کێشا وە لەبەر ئەوەی بارەگای کورسی پاشایۆکە(الملك)(بچووکراوەی پاشا لەبەر ئەوەی لەوێ نیشتەجێ بوو لە بارەگای پاشایۆکە نوێنەری پاشا بوو لە(قەتەیەسەفوون)(سەلمان پاك ـ وەرگێڕ).

شێوە سەربەخۆییەکی نیمەچەیی هەبوو لە چاو هەرێمەکانی تر ناسراو بە حەدیاب) بە گلدانی(حزیاو)([٧٤])

دوای ئەرمەنەکان ئەرشاقییەکان هاتن نازناوی(بەهلەوی) یان لێنا وە یا(ئونورشیرەکان) یەکێکە لە شاژنەکانی حدیاب لە سەدەی یەکەمی ز، ئەم ژنە جولەکە بووە(یەهودیە)([٧٥]).

لەمە دەردەکەوێت کەوا هەندێك لە میرەکان گەیشتبنە ناوچەکە. بە هۆی کەمی زانیاری وردێ دانیشتووانی شارەکە(حدیاب) ڕوو لە کەمی بووە لەو ماوەیەی کە ئینجیلی تیا بلاوکراوەتەوە، واتە لە سەدەی دووەم وە یا سێیەم ز دەوترێ: زۆربەی بتپەرست بووە وە بەشێکیان بۆ جولەکە بووە. بەڵام وا پێدەچێت جولەکە هیچ ڕۆڵێکی ئەوتۆی نەبووە لەبەر ئەوەی کەمینە بووە.

هیچ بەڵگەیەکمان نەدۆزیوەتەوە کە باس بکرێن لە چیرۆك و قسەو باس بۆ مژدە بەخشی بۆ زانیاریتان جولەکە ڕۆڵێکی خراپیان گێڕاوە بۆ سەر ژیانی ئەوانەی شەهید کراون.

## مژدە بە مەسیحییەت: موژدەبەخشی مەسیحییەت

مێژووی بڵاوبوونەوەی مەسیحیەت لە ئەربیل و هەرێمی حدیاب دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی کۆن تەئکیدمان بۆ ئەمە دامەزرێنەر و پشت بەستن نەك تەنها بۆ بڵاوبوونەوەی مەسیحیەت لە وڵاتی فرسیەکان کە ناوی هاتووە لە سفری کردارەکانی نێردراوەکان ـ سفر اعمال الرسل(٩ :١١) بەڵکو ئەوەی کە مارماری قەدیس(القدیس ماری)([٧٦]).پێهەڵسا خۆی خوێنکارێکی(ئەدای) بوو. لە سەدەی یەکەمی زاینی ژیاوە، هەولێر(ئەربیل) ی ڕزگار کرد بە مژدەبەخشی کردنی ئینجیل بە سەرسوڕمانی بێ وێنەوە ماوەی ژیانی ئەو ماوەی خۆشی بڵاوبوونەوەی باوەڕداری بوو هەموو پاشا و فەرماندەکان و سەرکردەکانی سوپا باوەڕیان هێنا ئەمانەباوکی ئەو کچانە بوون کە کچەکانیان تووشی نەخۆشی گرەتی و پیسبوون ببوون، واتە شەیتان کاری تێکردبوون).

بە پێی دەقەكان كە لە مێژووی(ئەربیل) داهاتووە(مارئەدای) نێردراو توانیویەتی بە تەئكید بەهۆی عەجائیبەكانیەوە زۆرترین خەڵك بۆ باوەڕداری رابكێشن لەوانەی كە باوەڕیان پێ هێناوە(باكیدە) كە دواتر بوو بە یەكەم مەترانی حدیاب[٧٧](الفونس منكنا) هەڵساوە بە نووسینی(مێژووی ئەربیل) وە ئەو ناوچانەی لە بن دەسەلاتی(مشیحا زەخا بووە) ئەو یەكەم كەس بووە كە درگی بە دوو لایەنی هەبووە لە نێوان ئەوانەدا، بەلام خۆی بەبێ سێ و دوو هەڵبژاردووە و بانگەشەی هەڵوێستی خۆی كردووە وە تەئكید لە سەر مێژووی رۆڵی ئەدای كردووە[٧٨] كە دەڵێ:(ئەو رایەی تایبەتە بە رۆڵی كاریگەری(مارماری) نێردراو، كە كاری پێدەكرێت هەتاوەكو پەیدا بوونی سیستەمی نوێش رایەكی گوماناویە رەنگە هەڵبەستراو بێت). ئەمە بێزارییەكمان پێدەدات بە تایبەتی لە سەر ئەو بابەتە كەوا دەقی مێژوویی ئەربیل خۆی، ئەوەی كە(مەنكنا) نووسیویەتی جێگای باوەڕ و گومانی تیا نیە وە هەروەها لەلایەن Harnack بەجۆشەوە پشتگیری كراوە بۆیە داوای لە Sachau كردووە بۆ ئەوەی وەرگێڕی بكات لە ساڵی ١٩١٥[٧٩].

دواتر بۆ ئەم پەرتووكە بابەتی لێكۆڵینەوە پەیدا بوو وەریگێڕا سەر زمانی لاتینی لە ساڵی ١٩٢٧ لەلایەن Zorelli تەواو بوو.[٨٠].

دواتر بۆ زمانی عەرەبی وەریگێڕا لەلایەن مەتران(پەترۆس عەزیز) ئەمە لە ساڵی ١٩٢٩ ـ ١٩٣٠ ـ ١٩٣١ تەواو بوو.[٨١].

ئەم پەرتووكە رەخنەیەكی توندی لێگیرا لەلایەن قەشە(پیتەرس) ساڵی ١٩٢٥[٨٢].

ئەنجامی ئەو رەخنەگرتنەی قەشەی ناوبراو ئەم پەرتووكە وەك سەرچاوەیەكی باوەڕپێكراو شوێنی خۆی لە دەست دا وە پێش ئەویش رەخنەیەكی توند لەلایەن قەشە (ئۆرتیس) (لە نۆربینە) گیراوە[٨٣].

كاتێك قەشە بیتەرس بەراوردی كردووە لە نێوان مێژووی ئەربیل و مێژووی كەركووك وتوویەتی: مێژووی كەركوك جێگەی هەڵسەنگاندنە و مێژووی ئەربیل پێش ئەو بووە، واتە یەكەم پێش دووەم كەوتووە لە پێشەنگیدا، بەلام مێژووی كامەیان كۆنترە، وەلامەكە بە پێی رای هەردووكیان برا بووین هەندێ جار هەردووكیان بەیەك دەگەنەوە لە یەك سەرچاوە، بەلام سەرەڕای ئەمەش دەبینین ئەو لێكنزیك بوونەوە و لێكچوونە ناتوانن دڵنیایی بە لێكۆڵەر ببەخشن بەلام ئەنجامی قەشە ئۆرتیس بەم شێوەیە:

Un Documento Dimediocre Autorita Storice,
Che Quindi Deve Essera Adaoperato Con Cautela

بەڵگەیەکە لە چەشنی ناوەڕاست، ڕاستگۆیی مێژوویی تێدا نییە، بۆیە پێویستە بە وریاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.
دوای ئەو هەموو هەراو هۆریایە کە لێکۆڵەر و بایەخدارەکان نایانەوە پرسیار لەخۆم دەکەم ئەگەر گەڵکی نەبێت پشت بە Liber Pontificalisd, Erbil وەك سەرچاوە و پەراوێزێك بۆ پێداچوونەوە. هەموو جارێك ئەو پەرتووکە بەراورد دەکەین لەگەڵ سەرچاوەیەکی تر، بایەخی پێدەدەین. تووشی زانیاری زۆر دژ بە یەکتری دەبین.([٨٤]).
ئەم واقیعە پاڵ بە لێکۆڵەر دەنێت واز لە پەرتووکی مێژووی ئەربیل بێنێت وەك سەرچاوەیێك کە پشتی پێدەبەسترێت، ئەگەر واز بێنین لەبارودۆخ و مێژووی دەستپێکردنی موژدەبەخشی بە ئینجیل لەو وڵاتە ئەو کاتە دەبێ واز بێنین لەو هێندەی فراوان بووە لە ناوچەی موژدەبەخشی وە هەروەها تا چەند ئەو باوەڕداریە چۆتە دڵ و دەروونی مەسیحییەکان تاوەکو سەرەتای سەدەی چوارەم، واتە سەرەتای دەستپێکردنی چەوساندنەوە خوێناوییەکان، لە توانادا نیە بزانین تا چەند و دیاری بکەین ڕێژەی ئەوانەی کە هاتوونەتە سەر ئاینی مەسیحی و باوەڕیان هێناوە لە کۆی گشتی دانیشتوان، ئەوانەی کە نیشتەجێی(ئاربیرە) (ئاربیرە ئەو ناوە بوو کە فارسەکان بۆ ئەو ناوچەیە بەکاریان دەهێنا کە پێداچوونەوە کە بەوەی Sozomene نووسیویەتی([٨٥]).
لەوبارەیەوە دەبینین گەشبینە لەبەر ئەوەی باسی حدیاب دەکا وەك وڵاتێکی فارسی زۆربەی دانیشتوانی مەسیحیە بەڵام لە واقیعدا تاوەکو سەرەتای سەدەی حەوتەمی زاینی ژمارەیەکی زۆر لە مەجوسی تێدا بوو چاوەڕێی باوەڕداریان دەکرد.
سەلماندنمان بۆ ئەوە ئەوەیە، باوەڕهێنانی مەهانۆش) - (ئیشوع سورەن) لەیلایەك ئاینی فەرمی مەجوسی لە وڵاتدا تاوەکو رووخانی دەوڵەتی ساسانی لەلایەکی تردا باری مەجوسیەت زۆر قورس بوو لە سەر ملی باوەڕداران دا وە هەوڵەکانیان بێ هودە بوو هەردەم بۆ گەڕانەوەیان بۆ سەر ئاینە کۆنەکەیان.

## چەوساندنەوەکان:

مێژووەکان بەو هۆکارەکانی چەوساندنەوەکانی خوێناوی کە لەلایەن شاپووری دووەم جێبەجێکرا ئەمانە ڕووداوی جێگیرن([٨٦]).
وە یەکەم بڕیاری ئیمپراتۆری دەرچووە و دەسەڵاتی داوەتە خوارەوە بۆ جێبەجێکردنی چەوساندنەوەکان لە ساڵی ٣٤٠ سەرەتا لە سەر شێوەی باجی ملانە بووە(لە پەرتووکی شەهیدەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەلبێر ئەبونا ئاماژە بەوە دەکات باجە بنەڕەتییەکان دوو

هەندەی لێکرا بۆیە بەتریك شەمعوون برسەباحی رەتیکردۆتەوە وە هەروەها لە لایەن رۆڵەی مەسیحییەکانیش رەتکراوەتەوە، بڕوانە(شهداء المشرق ـ الصادر في بغداد ۱۹۸۵ ، البيرابونا) سەرانە(جزيه الراس) تەنها لە باوەڕداران وەردەگیرێ دواتر گەشەی کرد بۆ هێرش بردن و تۆقاندن و ستەمکاری جۆرا و جۆر کە هەموو کەنیسەکانیشی گرتەوە دوای ئەوەی هەندێ بەرگری کرا لەلایەن مەسیحییەکانەوە لە سێدارەدان جێبەجێکرا بەسەر هەندێکیان. ئەمە لە ساڵی ۳٤۱ روویدا. بەرگری کردن و رەتکردنەوە و بەرپەرچدانەوە فێڵی ئاگر هەڵسانەوەی چەوسانەوە بوو، وە بۆ ناو ناخی ئیمپراتۆڕ کاریگەری هەبوو، بۆیە فەرمانێکی شاهانەی دەرکرد بە جێبەجێکردنی کوشتاری گشتی و فراوان بەسەر هەموو مەسیحییەکان. رۆژی سێزدەی نیسان بە کردار ئەمە جێبەجێکرا(لە ساڵی ۳٤۱ کە رێکەوتە لەگەڵ رۆژی هەینی ئازارەکان ـ جمعه الالام ـ وەرگێڕ).

وە تا رۆژی یەکشەمە دوای جەژنی گەورە(هەڵسانەوە) بەردەوام بوو راوەستانەکە نەهاتە دی تەنها بە بڕیارێکی شاهانەی نوێ لە لایەن ئیمپراتۆری فارسی. بەڵام لەبەر ئەوەی فەرمانی نوێی فەرمانە کۆنەکەی(یەکەم) بە شێوەیەکی فەرمی نەسڕییەوە. بۆیە فەرمانی یەکەم بە بەردەوامی جێبەجێدەکرا. لە هەرێمی حەدیابیش چەوسانەوە دەستی پێکرد وە لە هەمان کاتدا کە لە ناوچەی ئیمپراتۆریەتەکە.([87]).

وە لە توندی دڕندەییدا وەك هەموو ناوچەی و هەرێمەکانی تر وابوو. ئەم چەوساندنەوە دڕندەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوپشتیوانیکردنەی لەلایەن(ئەردەشێر) دەکرا چونکە جێگری پاشا بوو لە هەرێمی حەدیاب کە لە دوای براکەی لە سەر کورسی پاشایەتی دانیشت واتە لە دوای(شاپوور) ی برای. ئەم چەوساندنەوەیە باڵی بەسەر ناوچەکە و هەموو خاکی مەملەکەتەکە داگرت تاوەکو ساڵی ۳۷٦.

لەو کەسایەتییە بەناوبانگانەی کەوا دەستی درێژی لەناوبردنیان بە شێری قەسابخانەکان وەك یەکەم تیم ئەوانەن:

خەسێ لە کۆشکی پاشایەتی نازناوی(کۆهیشتازاد)(کوشتازاد ـ شهداء المشرق ـ البيرانونا)(وەرگێڕ).لە ساڵی ۳٤۱ دواتر یۆحەننا مترانی ئەربیل لە تشرینی یەکەمی ساڵی ۳٤۳([88]).

لە دوای متران یۆحەننا پاش ئەو(ئەبراهام) لە سەرەتای ساڵ ۳٤٥([89]).

دواتر کەسایەتی عەلمانی(حەننیا) لە تشرینی دووەم لە هەمان ساڵ، ئینجا قەشە بەعقووب و کچێك بە ناوی(ماری) خوشکی قەشەکە لە ساڵی ۳٤۷. ئەم کچە لە خوشکانی پەیمان بوو

دواتر پێنج کچی تر لە کچانی پەیمان ناسراو بە(تەقلا) و هاورێکانی لە هەمان ساڵ([٩٠]). واتە ساڵی ٣٤٧([٩١]).

## دواتر شەهیدکردنی شەماسی هەڵکەوتوو( بارحەسبشەبا ) لە ساڵی ٣٥٥.( ٩٢ ).

قەشە بیتەرس خۆی دووره پەرێز دەگرێت لە(ئیت ئالاها) و (هەپسای) ،Hapsai وە هەوڵ دەدات لە بێژینگیان بدات و پیس و پاکژ لێك جیا بکاتەوە کە لە سەرچاوەکاندا هاتووە چونکە بە رای ئەو هەندێك مێژوو و زانیارییەکانیان لە راستیدا شێواندووە بە تایبەتی لە سەر قەشە(یەعقووب)(شەماس ئازاد)([٩٣]).

هەندێك زەحمەتیمان تووش دەبێت لە باسەکەماندا کامەیان مێژووییە لە دەقەکانی ئەو کۆمەڵەی کە ناسراوە بۆ ماوەیەکی درێژ بە(ئەکوشما)کە ئەو هەوڵانەمان پێدەدات دەربارى ئەو شەهیدانە پێیان دراوە. لەوەدا وەڵام: لەو پرسیارە ئایا ناوی یوسف کە لە دەقەکەدا هاتووە(ئایت ئالاها) یەکی ترە([٩٤]).

وە لە کوێ کۆتایی دێت ئەو کۆمەڵەی کەوا نازناوی(ماروتا دەمیفرقا)([٩٥]).

دواتر چیرۆکی(قەرداغ) دەردەکەوێت کە تاوەکو ئێستا و ئەمڕۆ بەناوبانگە و میللەتی خۆی هەیە([٩٦]). کە هیچ نرخێکی وەهای نیە، قەشە بیتەرس دەقەکان باس دەکات بەو شێوەیە ئەو دەقانەی بەم جۆرە هاتوون هیچ جۆرە مەنتیقێکیان نیە لە سەرەتاوە تا کۆتایی([٩٧]).

دانایی ئەو زانایە لەوەدایە خۆی لە رەبەنەکانی پۆلەندییەکانە Bollandiste بە پشت بەستن بە رەخنەگرتنی مێژوویی بگاتە ئەنجام بە پێکهاتەی دەستنووسی سریانی لە فاتیکان لە ژێر ژمارەی ١٦٠([٩٨]).

کە لەلایەن کاردینالْ تیسرِان دواتر جێبەجێ کراوە. ئەم بەرێزە دۆزیویتیەوە لە ناو هەندێ کاغەزۆکە کە ژمارەیان لە نێوان هەشتا بۆ سەت و نۆیە و دەگەرێتەوە بۆ کۆمەڵە هەڵبژاردە رەسەنەکان، وە بە دەستنووسێك بە تەواوی بە پێنووسی خۆشنووسی بەناوبانگ(ئەددت) ە وە دەستنووسەکەی ئێستاکە هەیە لە ژێر ژمارەی ١٢١٥٠ لە مۆزەخانەی بەریتانی مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ ساڵی ٤١١. شەهیدەکانی حەدیاب کە ناویان لەو خشتە ئامارەدا هاتووە لەو بەڵگەنامە کۆنەیەدا تەنها(کۆیشتازاد) و (یەعقووب و خوشکەکەی بە ناوی(ماری) و(تەقلا) و کچە هاورێکانی.

پەرتووکە سریانییەکە چەوساندنەوەی تریش بەدەردەخەن بە تایبەتی لە سەردەمی رۆژانی کۆتایی دەسەڵاتی یەزدا جوردی یەکەم(٣٩٩ ـ ٤٢٠) وە ئەو قەتڵ و عامەی لە ساڵانی حوکمڕانی(بەهرامی پێنجەم رووياندا(٤٢٠ ـ ٤٣٨) وە دواتر چەوساندنەوەکانی

یـەزدەجوردی دووەم سـاڵی(٤٥٥). بـەڵام ناوەکـانی شـەهیدانی حـدیاب لـەو سـەردەمانەدا نازانین. بە بیرهێنانەوەیەکی زۆر تایبـەت کە پێویستە تۆماری بکـەین بـە مـاڤ یـەکێك لـە شـەهیدەکانی ئـەربیل کـە لـە کۆمەڵـەی دوایـی دا بـوو: شـەهید(مـەها نـۆش) ی فارسـی رچەڵەکە کە بە ناوی(ئیشوعسورەن) لە ئاوهەڵکێشراوە(عماد) کراوە.(٩٩).

نووسەری چیرۆکی ئەو شەهیدە(بەتریك ئیشۆع زخـا) ی سێیەمی حەدیابییـە(لـە سـاڵی ٦٥٨ کۆچی دوایـی کـردووە). چیرۆکی ئـەم شـەهیدە لـە سـەر زانیـاری ورد و درشـت کـە لەلایـەن هاورێیەکی شەهید باس کراوە بە ناوی(ئیشەعزەخا).(یسوع المنتصر ـ عیسای سەرکەوتوو) ئـەم چـیرۆکە بـەوە ناسـراوە و گرنگـی گـەورەی هەیـە چـونکە زۆر بـە درێـژی باسـی چەوسـاندنەوەکان و رێگـەی ئـازاردان و ئەشـکەنجەدانیان لەلایـەن ئاگرپەرسـتەکانەوە کـە زیاتر ئەو کاتە باوەڕداریان توونـدتر دەبوو بـە مەسـیحیەت، وە چیرۆکی ئـەو ئاگرپەستانە باس دەکات کە داوایان لە مەسیحییەکان دەکرد بۆ ئەوەی لە باوەڕداریان پاشگەز ببنـەوە بـە تایبـەتی ئەوانـەی کـە دۆسـتایەتیان لەگـەڵ پاشـا و ئەمیرەکانـدا هـەبوو کاریگـەری باشـیان لەسـەر کردبـوون. لـەو کەسـانەی کـە بـەرگریان دەکـرد بـەناوبانگترینیان بـە تەئکیـد نـاوی(یـەزدین) دێـنن. یـەزدین بـە بـەرگرێکی گشـتی دادەنرێـت لـە چەوسـێنەرەکان و نازنـاوی(ئـەمیر مـوئمنین) وەردەگـرێ و وە لـە کـەرکوك دەژیـا. خۆشەویسـتی نێوان(خەسرەوی) پاشای فارسی و (یەزدین) وەك خۆشەویستی نێوان(فیرعەون بـۆ یووسـف)ە(١٠٠).

لـە دەقەکانـدا بـە روونـی دەردەکـەوێت ئـەو هێرشـە بەربڵاوانـەی جێبەجێـدەکران بـۆ مۆنـۆفیزی(ئـەو مەزهەبـەی بـاوەڕی بـە یـەك سروشـتی هەیـە) هـەتا ئەگـەر شـوورەی بەندیخانەی بەزاند هەموویان ئەو کەسانە لە ژێـر ئەشکەنجەدا چاوەڕێی شـەهید بوونیـان دەکرد. دواتر دەقەکە ئـەوە دەردەخات کەوا پاڵەوانەکە دێرێکی دامەزرانـد لەگـەڵ هـەتیو خانەیەك لە چیای حدیاب کە زیـاتر لـە بیست هـەتیوی تیـا بـوو، ئەگەرچی رەبەنـەکان لـە دژی ئەو کارە بوون.

مێژووی بەندکردنی(ئیشوع سەبرن) لە ساڵی ٦٠٥ بوو بـەڵام مێـژووی شـەهید بـوونی سـاڵی ٦٢١ زانیارییەکانمان لە پەرتووکی(ئیشوع دناح) ئەلبەسری وەرگرتووە.(١٠١).

رووداوەکـان لـە سـاڵانی سـییەکانی حـوکمڕانی خوسـرەوی پـەروێز بـووە(٥٩٠ ـ ٦٢٨) وە لەگەڵ(ئیشوعسـەبرن) دوازدە شـەهیدی تـریش هەیـە(جومعـەی سێیەم) لـە مـاوەی(سـوبار) ئـەو ماوەیـە کـە دەکەوێتـە پـێش لـە دایـك بـوون و ماوەکـە چـوار حەفتەیـە ـ وەرگێـڕ. دوی شەهید بوونی ئەوانە و ناشتنیان لە ئەربیل دێرێك لـە سـەر گۆڕەکەیان دروسـت کـرا بـەڵام

بەداخەوە شوێنەوارەکەی ئەم دێرە نەماوە. دێرەکە تەنها کەنیسەیە، ئەوەش کاولکراوە لە ساڵی ١٣١٠.

## میترۆپۆلیتەکانی سەردەمی ساسانییەکان:

(میترابۆلێت) پۆستێکی کاریگەری کەنیسەییە هاوشێوەی سەرۆکی ئەساقیفەیە - (وەرگێڕ).
بە هۆی ئەوەی لە توانامانـدا نیە پشت بە(مێژووی ئەربیل)([١٠٢]) ببەستین وەك سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو لەبەر ئەوەی زۆر دەقی شێوێندراوی تێدایە لەبەر ئەوە ناتواندرێت بە دڵنیاییەوە یەکەم مەترانی(ئەربیل - حدیاب) دیاری بکەین.
لەوانەیە لە ساڵی ٣١٠ وە یا ساڵی ٣١٧ بێت و کورسی مەترانیەی حدیاب کورسی میترابۆلێت بێت ئەمە لەو کاتەدا کە لە سەر کورسی بەتریکی(جاتلیق بابا) واتە لە کاتی گرێدانی(کۆمکاری نیقییە) دا([١٠٣]).
بۆ کورسی ئەربیل وە یا حدیاب، وە یا بە واتایەکی فراوانتر ئاشوور شوێن چوارەم لە نێوان کورسییەکانی میترابۆلیت، وە شوێنی پێنجەم کاتی ئەژمارکردنی شوێنی بۆ کورسی بەتریکی لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین ئەو دوو مەترانەی شەهید کران: حەننا(یۆحەننا) لە ساڵی ٣٤٣ وە ئەبراهام لە سەرەتای ساڵی ٣٤٥([١٠٤]).
هەردووکیان بە پلەو پایەی میترابۆلیت بوون. ئەربیل پارێزگاری لە شوێنی خۆی کردووە لە کاتی بەستنی کۆمکاری ئیسحاق ساڵی ٤١٠([١٠٥]).
ئامادەبوون لەم کۆمکارە بە لیستێك ناوی یاریدەدەرەکانی مەترانەکانی تیایە. شەش ئەبرەشییەتەکان کە هەیکەلی سەرۆکایەتی ئەسقەفیەی حەدیاب ئەو زەویانە دادەپۆشی کە زیاترە لە رووبەری زەوی حدیاب بە واتای دیاریکراو.
بە کردار مەترانی ئەربیل خۆی سەرۆکی ئەساقفەی حدیاب، وە دەسەڵاتەکەی نزیکەی هەموو باکووری عێراقی ئەمڕۆ دەگرێتەوە(کوردستانی عێراق - کوردستانی باشوور - وەرگێڕ).
سێ ئەبرەشیەی یەکەم بەشدارییان کردووە لە کۆمکاری سینهادۆسی بە پێی ئەوەی لە مێژوودا هاتووە(ئەربیل) زۆر باش ناسراوە کە(بێتنوهەدار)، (بێت بەگاش)، (بێت داسن) ئەو سێ ئەبرەشیەی تر لە دواییدا لەناو چوون. رەنگە ناوەکانیان بۆ مەبەستێك شێوێندرابێت کە رەنگە سوودی نەبێت هەر شتێکی تر بکەین لەو بابەتەوە هەتا ئێستا بۆ ناسینی ناسنامەکەی، کارێکە و لێکۆڵینەوەی لە سەر نەکراوە، بۆ دوورکەوتنەوە لەو سەرسوڕمانە تکایە گوێ بگرە لەو تیۆرەی خۆم. ئەو سێ ئەبرەشیەی دوایی کە باسکردنی

ئێمەیە ئەمانەن:(رامۆنین) و(داباربنۆس) وە یا(راباربن قەلا - راباربن حصن) وە(بێت مەهکارت) یەکەم واتا(رامۆنین) ناسنامەکەی بەوە ناسراوە(راسۆینن)([106]).

دواتر ئێمە گوندێك دەبینینەوە بە ناوی روویمینی) دەکەوێتە ناوچەی حدیاب. ئایا لە توانات دا هەیە ئەو ناوە لە جێی ناوی(رامۆنین) ی ناوی کۆن بۆ ئەو پارچە چیایە زللە دابنێین؟.

لە پشت چیای حددیاب ناوچەیەك هەیە پێی دەڵێن(بێت داروون) Darun قەشە Levencq جێگری شوێنەکەی بەراستی چەسپاندووە و کردوویەتی بە(بیداروون) Bidarun دەکەوێتە ناوچەی(شێروان)([107]).

ئەم ناوچەیە بەشێك لە سالاخ بووە، وە لە تەنیشت حنیسا) بووە ئەگەر لە جیاتی ئەو ناوانەی ئێمە لێکۆڵینەوەی لە سەر دەکەین بە ناوی هاوشێوە بۆ ئەوەی نهێنیەکە بزانین لە(داباریونۆس) و(راباربن قەلا) - (راباربن حصن) - وەرگێڕ(١٠٨).

ئایا چارەنووسی ناوە کۆنەکە بۆ(سالاخ) چی بەسەر دێت؟([109]).

با وا دابنێین هەموو ئەوانە راستن؟ ئەو کات بابەتی(بیت هەکارت) وە یا(بیهکارت)(١١٠) هەروەك لە مێژووی ئەربیل دا هاتووە پێویستی بە چارەسەرکردن هەیە. دواتر رووی خۆم دەکەمە هەرێمی ناسراو بە مەرگە هۆکارەکەش بۆ ئەمە نەبوونی ناویئەو هەرێمە لە لیستەکەدا کە پێویستە تێبینی بکرێت کە دەبووایە ناوی بە درێژی لەگەڵ ئەو ناوچەیە وە یا سەربەخۆ لەو هەرێمانە بهاتایە.(واتایەکی نەگرتۆتەوە، وە یا بە بەشێك لە یەکێك لەوانە دانەمەزراوە) ناوەکە تاکێکی فارسییە، بەڵام راستیەکەی کوردیە - وەرگێڕ. بۆیە دەبێ فارسەکان رەچەڵەکی ئەوەمان پێ بڵێن. بەکارهێنانی سریانی بە تەنهایی(مرگە - مەرگە) لە ماوەکانی دوایی روویداوە. واتە دوای بڵاوبوونەوەی مەسیحیەت بە تەواوی لە هەموو ناوچەکە.

دەربارەی لیستی مەترانەکانی ئەربیل کە لە دوای شەهیدبوونی دوو مەترانەکە حەننا و ئەبراهام، دەتوانم بڵێم لە توانامانداییە لیستی ناوەکان بە وردی رێکبخەین، کاتێك بینیم لیستی یەکەمی ناوەکانی میتڕ و پولیتەکان لە سەر یەك بابەت نیە، هاتووە لە(دیبێیك)(پەراوێزەکانی دەستنووسەکان کە بە زیادە خراوەتە سەر هی دانەرەکە نیە کە دەستنووسەکەی نووسیوە، لە دواتر ئاماژەی پێدەکەین بە(الاضافات - زیادەکردنی بە تەنها - وەرگێڕ) - بەم کارە هەڵسام بۆ ئەوەی زنجیرەیەك ناومان بۆ دەربکەوێت ئەوانەی ئەو پایەیان هەبوو(میتراپۆلیت) لە ئاشووردا.

لەبەر ئەوەی بارەگای کورسی ئاشوور لە سەرەتادا لە شاری(ئەربیل) بوو ئەو لیستەی لەبەردەستماندایە لیستی میترۆپۆلیتییەکانە ژمارەیان ٥١ بیترابۆلیتە.
لیستی ئاماژە پێکراو لە کۆتایی دەفەکاندا نووسراوە(دەستنووسی ـ جنە عدن) ـ بەهەشتی عەدەن) ی ناسراو هی عەودیشۆ وە یان عەبدیەشوع) ی نهێنی مێژووی ئەو دەستنووسە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٦٧٠، ئێستا پارێزراوە لە پەرتووکخانەی گووندی کەرملێس) نزیك موسڵ. ئەم دەستنووسە بە رەچەڵەك بۆ خودی گووندەکە نووسراوە بۆ بەکارهێنان تیایدا. دوایی باسی ئەو دەسنویە دەکەین کاتێك باسی کەرملێس دەکەم پڕ لە مێژووی دوور و درێژ و خاوەن نرخ و بەهایە([111]).
دوای بەسەرەوە نانی دەسنوسی کەرملێس، تایبەتە بە(٥٢) میترۆپۆلیت لە سەر کورسی ئاشوور دانیشتوون، دەبینین لیستی دووەم هەیە بەناوی(٣٥) متران نەك میترۆپۆلیت بەبێ دیاریکردنی شوێنی کورسیەکانیان جگە لەوانەی لە سەرەتا بوون، بەڵام پاشماوەی ناوەکە نووسەر تەنها باسی ئەوە دەکات. کە ئەمانەن:(لە ولآتی ئێمەن) بەڵام دواتر راستەوخۆ دەبینین وە لە سەرەتاوە ئەو بابەتە پەیوەندی بە ناوی مەترانەکانی نەینەوا هەیە، ئەمەش لێکۆڵینەوەی لە سەر دەکەین لە بابەتی تایبەت بە خۆی.([112])
راستی و وردی ئەو لیستانە بە پێی زنجیرەی مێژوویدا دەتوانین لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەین لە سەرچاوەی تر کە کۆمەڵێك ناوی تیایە ئەمە وا دەکات کەوا زیادەکانی سەر دەسنووسی کەرملێس بەڵگەیەك لە چەشنی یەکەم بێت هیچ جێگەیەکی پێ نەدراوە کە جێگەی خۆیەتی بایەخی پێ بدرێت لە مێژووی کەنیسەدا([113]).
وە وەك بەرپەرچدانەوەیەك ئەمە وا دەکات متمانەکە بمێنێتەوە وە بە پەرتووکی(مشیخەزەخا) ی تێکدەر، کە پێشتر دووچاری مەبەستە دیاریکراوەکەی هەیە لە تەسککردنەوە. سەرەڕای ئەوەی بەرهەڵستی ئەو زیادەیەی کردووە لە دەسنووسەکەدا.
ئێمە پرسیاری ئەوە دەکەین دەربارەی ئەو لیستەیە ئەوەیە: مێژوویەکەی چیە؟ ئەو زنجیرە بەتریکەی کۆچیان کردووە پێش لیستی میترۆپۆلیتییەکان بەردەوام دەبێت تاوەکو پەتریك دەنحای دووەم ١٣٣٢ ـ ١٣٦٤، جگە لەمە ئەوە دەخوێنین بە دوا ئەمیر(میر) ی ئەو کاتە، وە بە دڵنیاییەوە ناوی هاتووە لە شوێنێکی تر ئەمە لە مێژووی ساڵی ١٣٦١، پێی دەگوترا(حەسەن) بەڵام ئەو زیادەیەی ئاماژەمان پێ کرد دەبینین ئەو ساڵە درەنگ هاتووە لەگەڵ ساڵی کۆچکردنی ئەم واقیعە ئەوە دەسەلمێنێ هەڵەی دەفەکەی کرملێس بە زەقی لە دوای ساڵی ١٣٦٤، واتە ماوەی دانیشتنی شەمعوونی دووەم لە سەر کورسی پەتریکی بۆیە بوار هەیە بۆ باوەڕ کردن کەوا لیستی میترۆپۆلیت و ئەساقیفەکان پێویستە لەو مێژووە

رابوەستێت. زۆر بە داخەوە دەڵێین زۆر زەحمەتە ناوی دانەری ئەو لیستانە بزانێت. وە هەروەها ناتوانین ناوی(عەودیشوعی نسیبینی) وا دانەرێك بۆ بەشی دوایی ئەو بەرگە دابنێین تەنها لەو بارەدا نەبێت کە لیستەکە زنجیرەی مێژوویانی تەواو رێکخراوە بۆ ماوەی پەنجا ساڵ دوای کۆچی دوایی کردنی لە ساڵ ١٣١٨.

لە میترۆپۆلیتەکانی سەرەتایی کە لە لیستەکە ناویان هاتووە، هیچ شتێك دەربارەیان نازانین تەنها ناوەکانیان نەبێت هەندێکیان ناویان هاتووە لە میتراپۆلیتی ئەربیل کە ساڵانە لە رۆژی هەینی سێیەم بەر لە جەژنی هەڵسانەوە لەلایەن سریانەکانی رۆژهەلاتی ئاهەنگی نوێژکردنی بۆ دەگێرن.([١٤]).(سابوع القیامە ـ هەفتانەی هەڵسانەوە ـ وەرگێر).

لە خوارەوە ناوەکان تۆمار دەکەم بە پێی زنجیرەی هاتوو لە زیادەکەدا، وەك زیادەی دووەم. ژمارەکە لە ناو دوو کەوانەدا نووسراوە بۆ رونکردنەوە و جیاکردنەوەیان لە یەکتری:

-(١) سەلیمۆس(وە یا سالیمۆس) ناوی لە سرووتەکان دێت.
- (٢) ئادۆنا(لە نوێژی فەرزیدا ناوی دێت.
- (٣) یووسف.
- (٤) عەویشۆ(عەبدیەشوع).
- (٥) دانیالی یەکەم.
- (٦) برحە زبشەبا.
- (٧) دانیالی دووەم.
- (٨) شیمبیتی.
- (٩) بەتا.
- (١٠) حەبێوە.
- (١١) دانیالی سێیەم.

لەو سێیانەی کە ناوی دانیالیان وەرگرتووە یەکێکیان ناوی لەگەڵ ناوی سلیمۆت و ئادۆنا لە نوێژی یادکردنەوە دێت. وە کامیان لەو سیانە ئامادەی کۆمکاری ئیسحاق بووە لە ساڵی ٤١٠.([١٥]).

وە کۆمکاری داد یەشوع لە ساڵی ٤٢٤، بەلاَم هیچ یەك لەم دووانە ئامادەی کۆمکارەکە نەبوون واتە کۆمکاری یاوا لاهای بەستراوە لە ساڵی ٤٢٠؟ مێژووی ئەربیل هیچ شتێك بەجێناهێڵێت بەبێ باسکردن. ئەم دوا کەوتنە دەگەرێتەوە بۆ نەخۆشی. هەروەك ئەم مێژووە بۆمان دەگێرێتەوە کەوا دانیال مەبەستی ئەو دانیالە کە بە رەچەڵەك خەڵکی (تاحالە) و باوکی بتپەرست بووە و دایکیشی مەسیحی بووە.([١٦]).

وە بۆ یەکێك لەم سێیانە دەگەڕێتەوە بە دوای(خەلافەتی(رەحیمە)(؟)، کە بە هیچ شێوەیەك ناوی نەهاتووە تەنها لە مێژووی(ئەربیل) نەبێت.(١١٧).
وە دەڵێن لەو ماوەیەی کە ئەو لە سەر کورسی دانیشت مەزهەبی نەستۆری لە هەموو هەرێمی حدیاب بلاوبۆوە. بلاوبوونەوەی ئەو مەزهەبە نوێیە بە هاسانی بلاونەبۆوە هەروەکو دەڕوانین بە هۆی ئەو کێشانەوە ناچار بوو بەتریك ئاق دەستوورێکی تایبەت بۆ هەرێمی حدیاب بخاتە بەردەست(١١٨).
ئەو یاسایانەی لەو دەستووره دا هاتوون ئاماژە بە ئالۆزی کێشەکان دەکات لەو هەرێمە پەیوەندی بە جێگیر بوونی باوەڕداری و چاککردنەوەی رەوشتە. ئەو باوەڕەی کە پەتریك دانی پیا دەنێ پەیوەندی بە ئاوازەکانی هاوجووت و باوەڕداری مەزهەبی نەستوورییە.
بەلام دەربارەی رەوشت لە دوو بواردا تایبەت بە(زواج الاكليروس -) بابەتێکە ماق مەترانەکان نیە قەدەغەی بکەن دوورکەوتنەوە لە بەلایەکی گەورەتر، بەلام لایەنی دووەم پەیوەندی بە بابەتی رەبەنە بەرەلاکان، دەرۆزەکەرەکان هەیە.
مەترانەکانی حدیاب ئامادەی کۆمکاری(ئاق) بوون کە لە ساڵی ٤٨٦ گرێدراوە. بەلام ناوی میترۆپۆلیت لە ناو ناوی ئەوانەی لە سەر بڕیارەکان واژوویان کردووە نیە. هۆی نەبوونی ناوی ئەو جۆرە کەسانە و ئەو پاساوەی تایبەتەی بە دەستووری حدیاب هەیە کە(ئاق) دایناوە، دەتوانین لەلایەن دانەری(مێژووی کەنەسی) بزانین.(ابن العبری) دەڵێ: چیرۆکی ئەو قەسابخانانە دەگێڕێتەوە، کە لە لایەن(میترا پۆلیتی نەسیبین) ی نەستۆری بە ناوی(برسۆما) وە ئەنجام دراوە( میترا پۆلیتی ئەربیل لە بەرامبەردا شکستی هێنا ئەم دەستەواژەیە لە چیرۆکەکە دا نیشانەی ئەوەیە ئارامی لە ویژداندا نەبووە. بەلام پرسیارەکە ئەوەیە لەبەرچی؟ ئایا مەزهەبە نوێیەکە، کە بەلای خۆی راکێشا و جەماوەرەکەی بەدوای کەوتن هەروەکو دانەرەکانی یەعقووبی دانی پێدادەنێن، کە لە دواییدا دەبینین وە بە پێی ئەوەی نەیارەکانی تۆمەتباری دەکەن؟ وە یا باوەڕی بە مەزهەبی نەستۆری نەبوو بەس. وە لای باشتر بووە لە سەر ئەرسۆزوکسی بمێنێتەوە واتە بە کەتالۆکی بمێنێتەوە؟ ئێمە ناتوانین ئەوە بڵێین. هەرچۆنێك بێت؟ بەلام برسۆما بەردەوام بوو لە کوشت و بڕ لە ئەربیل، بە قەشەو جەماوەرە زۆر و باوەڕدارەکە.
میتراپۆلیت بە خێرایی رای کرد بەرەو دێری(کوختا) کە لە سەر چیای مەقلوب دروستکراوە. ئەو ناتوانێت لە مردنی مسۆگەر رزگاری ببێت تەنها بە روو کردنی بۆ یەکێك لە ئەشکەوتەکانی چیا و پێش گەیشتنی خوێنرێژی بەدفەڕ بۆ بینای دێرەکە.

مێژووی نەستۆری بۆ(برعێتە) هەموو ئەوانەی پێشەوە دەسەلمێنێ کاتێك لە سەر کوختە دەدوێ دەڵێ:(ئەو دێرە لە پێشدا بارەگای کورسی میتراپۆلیتی حدیاب بووە.([119]).

ئەم رستە بچووکە هەموو کاتێ سەرسامم دەکات. وا پێدەچێت ئەو دانەرە دەقەکەی لە دەقێکی کۆن وەرگرتبێ بەبێ ئەوەی بزانێ ئەوە راستە یان نا.

لە وقیعدا هەرچەندە هۆکارەکانی برسۆما بۆ هێرش بردنە سەر حدیاب، بەلام حدیاب سوور بوو لە سەر مانەوەی لە سەر مەزهەب و باوەرداری خۆی وە یا رێگا بدات بە باوەرداری مۆنۆفیزییەکان بە سەری زاڵ بن لە کۆتایی سەدەی پێنجەمی زاینی، ئەو کاتە یەعقووبییەکان بلاوبوونەوەی مەزهەبەکەیان بۆ سەدەیەکی تر دوا دەکەوێ.

ئێستا پرسیار دەکەین: ئایا ناوی میتریۆلیتی هەڵاتوو لە نووسینە زیادەکاندا هەیە و ئایا ناوێکی تر هەیە شاردرابێتەوە؟ وە یا ناوەکەی لادراوە لە تۆمارگەی زیندوو و مردووانا بە ئەنقەست بە هۆی ئەوەی(هرتۆقیا) لە دین وەرگەراوە)؟(وەرگێر).

ئەمە لەوانەیە بەلام لە هەمان کاتدا ناتوانین ئەمە بزانین بە وردی بە دڵنیاییەوە.

- (١٢) ئەیۆ(ئەیوب)

- (١٣) یووسف.

وا پێدەچێ هەمان ئەو کەسە بێ کە ناوی لە لیستەکانی کۆمکاری باوای) سێیەم دا هاتووە لە ساڵی ٤٩٧ بەستراوە.([120]).

بەلام بە پلەی(مەترانی ئەربیل) وە میترا پۆلیتی حدیاب. لیستی سێیەم تەنها لیستە کە ئەم تێبینیانەی نووسیوە:

(من، سیدوورە، نووسەری داد، لە(عابوشتا) م(مەتران و میتراپۆلیتی حدیاب) م وەرگرت فەرمان بە واژوو کردن.

شابۆ وای بۆ دەچێ ئەم رستەیە زیادە بە سەر نانەوەیەکی دواترا. مێژوو رێکخستنی کارەکان بە شێوەیەك پەسند دەکات، لە سەرەتادا ناوەکە بە(عابووشتا) دێ.([121]).

کە لە سەر کورسی دانیشت لە نێوان ساڵانی ٤٥٠ - ٤٩٩) هۆکاری دواکەوتنی لە ئامادەبوونی کۆمکارەکە ئەوە گوایە پیرییە وە یا قەشەکەی بە ناوی یووسف(لێرەدا پێویستە ئەو سێ لیستە چاکبکرێنەوە) واژووی لە سەر دەکات. دواتر واژووی نووسەری داد رەتدەکاتەوە بە تایبەت بە سیدۆرە.

لە ساڵی دواتر دەبینین یووسف لە دوای(عابووشتا) دێت و لە سەر کورسی دادەنیشێ تا ساڵی ٥١١([122]).

ناوی(عابووشتا) نەنووسراوە لە زیادەنووسەی لە دەستنووسەکەی کەرەملێسدا هاتووە.

- (١٤) باوای.
- (١٥) شەموتا.
- (١٦) شەمعوون. وە یا شومعوون.
- (١٧) قەشیشە وە یا قاشا. ئەم چوارە لە سەر کورسی میتراپۆلیت دادەنیشن لە ماوەی نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەم ناوەکانیان هاتووە لە بەشە زیادەکەی دەستنووسی کەرملیس. هیچێك دەربارەیان نازانین تەنها ناوەکانیان نەبێت.
- (١٨) حەننای یەکەم ناسراوە لە بابەتێکی تردا. ئامادەی کۆمکاری بەتریك ئەبای یەکەم بوو([١٣٣]). بەستراوە لە ساڵی ٥٤٤.(مێژوو)(ئەربیل)([١٣٤]).

دەڵێی: ئەو خۆی خستە ناو چاکسازی کێشە ناوخۆییەکانی قوتابخانەی نەسیبین، هەروەها چەند وتاربێژییەك بە ناوی ئەو ناسراوە. پێدەچێت ئەو درێژیەی دوایی ئەنجامی ئەو لێکحاڵینەبوونەیە لە نێوان ئەو دوو کەسە کە هەمان ناویان هەیە واتە(حەننا) دکتۆری بەناوبانگ لە قوتابخانەی فولس وە حەننای حدیابی ئەو تێبینیە مەنکننا خۆی هەیەتی([١٣٥]).

- (١٩)(برسەهدێ) وا پێدەچێت هەمان ئەو کەسەیە کە پێی دەڵێن مشوحا) ناوی لە کۆمەڵەکاندا هاتووە. هیچ دەربارەی نازانرێت تەنها ئەوە نەبێت ئامادەی کۆمکاری یووسف بووە گرێدراوە لە ساڵی ٥٥٤.([١٣٦]).
- (٢٠) حەننای دووەم کاریگەری هەبووە لە سەر ژیانی رەبەن(برعێتە) ساڵی ٥٦٢.

بەشداری کۆمکاری بەتریك حزقیل، حسقیل - دا کردووە، کە لە ساڵی ٥٧٦ بەستراوە.(١٢٧).

وە هەروەها بەشداری لە کۆمکاری(ئیشوعیاوی) یەکەم دا کردووە کە لە ساڵی ٥٨٥ بەستراوە.

سەرۆکی شەماشەکانی بە واژوو کردن هەڵدەستا لە جیاتی ئەو.

- (٢١) ئەبراهام: ئەم ناوە ئامادەیی نیە تەنها لە پاشکۆی زیادەی دەستنووسی کەرەملێس نەبێت.
- (٢٢) یۆناداب.

لە سەرەتای سەدەی حەوتەم کەسایەتیەکی زۆر بەهێز دەدۆزینەوە کە بەناوبانگترینیانە لە مێژووی ئەربیل. ئەم کەسایەتییە لە(میترا پۆلیت یۆناداب) لە حدیاب دا هەیە([١٣٨]).

ئەم سەربازە ئازایە لە هەموو بەرەکاندا دەجەنگی. شەرشی لە دژی ئەو هێزانەدا کرد کە دەیانویست کەنیسەی نەستۆری پارچە پارچە بکەن لە سەرەتای دەرکەوتنی ئیسلامدا لە

لایەك: وە هەروەها شەڕی یەعقووبییەکانی کرد کە دەیانویست بێنە ناوەوە لە دووەمدا. وە بەهەڵە شەڕی Messalienne کرد لە لایەنی سێیەم.
وە چەوساندنەوەکانی خەسرەوی دووەم لەلای چوارەم(بەو بۆنەیەوە دەریدەخەین کەوا ئیشۆعسورەن خراوەتە بەندیخانەوە ساڵی ٦٠٥ ) وە دەبینین کەوا(یۆناداب) بەشدارە لە کۆمکاری بەتریك گریگۆریۆس یەکەم ساڵی ٦٠٣، هەروەها دەبینین کەوا ئەندامی ئەو لێژنەیەیە کە پێی دەوگوترێ ئەلتەرناتیف بۆ جاسلیق دوای مانەوەی ئەو کورسیە بە بۆشی لە ماوەی نێوان ٦٠٩ ، ٦٢٨ ، سەرەڕای ئەمەش ئەم سەربازە پاڵەوانە بەشداری کرد لە گفتوگۆکرد لەگەڵ یەك لە یەعقووبییەکان لە پێش ئەنجوومەنی شاخەسرەوەی ساڵی ٦١٢.
بەڵگە زۆرەکان ئەو دوورودرێژیەمان پێ دەدەن کە لە ژماردن نایەن دەربارەی هاتنە ناوەوەی یەعقووبییەکان بۆ هەرێمی(مەرگە) و وڵاتی نەینەوا، بەڵام راوەستانێکی بێدەنگ بەرامبەر بە هەرێمی حەدیاب. ئەو راستیە پاڵمان پێوە دەنێ کەوا هەست بکەین(یۆناداب) سەرکەوتوو بووە لە تەگەرە نانەوە لە پێشڕەوکردنی هەرتەقەی(هەڵگەڕانەوەکانی) مۆنۆفیزی تا ئەو سنوورەی دەسەڵاتەی ئەو بووە، لە دوای نزیکەی دە ساڵ وە لە دوای رەتکردنەوەی بەتریك ئیشوعیاو) ئەو خستنە رووەی کەوا بۆ یەکەم جار کورسی حدیاب پێشکەش کرد، بەرهەڵستی کرد لە سەر ئەمە و ئارەزووی ئەوەی کرد کەوا بەردەوام بێت لە خزمەتکردنی ئەبرەشیەی نەینەوا کە شەڕێکی دڕندانە لەگەڵ بتپەرستەکان و هەڵگەڕاوەکان(الهراطقة) دا دەکرد.
ئەمە لە کاتێکدا کە باری هەولێر بایەخی بە کاروباری تر دەدا([١٢٩]).
گەواهییەکان دیار و راستەقینە و جیاواز و مەدحکردنی زۆر و زەوەند لە ابن العبری خۆی دا دەبینن([١٣٠]).
دەنووسی لە ساڵی ١٢٦٢ کەنیسەیەك بۆ یەعقووبییەکان لە هەولێر دروست کرا. وە هەروەها باس لە داگوتانی رەگ و ریشەی ئەرسۆدوکز بۆ یەکەم جار دەکات لە ئەربیل، وە ناوچەکانی سەر بە ئەربیل. ئەمە لە سەدەی سێزدەهەم بەڵام لە واقیعدا بوونیان نیە لەو ناوچانە پێش ئەو سەدەیەی ئاماژەمان پێ کرد لەو هەڵسەنگاندن و مەدحە جوانەی لە زمانی ئەو دووژمنە سەرسەختە دەتوانین بڵێین وە ئەوەمان بۆ روندەبێتەوە کاریگەری و خەباتی بێ وچانی(یۆنادا) و تێکۆشانە جوامێرانەییەکانی. لە تواناماندایە ئەو هەڵێنجین و پێوەری ئازایەتی ئەو پیاوە ئاینییە نازدارە ئەو کاتەی کە دەمەتەقێ دەکات بە حیکمەت و چاونەترسییەوە دەربارەی مەسەلەی دێری(مارمەتی) وە بە ئامادەبوونی بکوژەکانی

دکتۆری گەورە گەبریلی شەنگالی. دەبینین لە سەر ئەو دەمەتەقێیە شای فارسی خەسرەوی ئەو پالەوانە لامله هەلدەسەنگێنین لە سەر لاهوت دا لە سالی ٦١٢([١٣١]).
ئەمە لە لایەك بەجێدێلین بۆ دیاریکردنی دۆستەکانی حەدیاب دەبینین کە قسە بۆ بەرژەوەندی ئەو دەکەن کاتێك کە کێشە روودەدات لەگەل ئەوانەی بانگەشەی مونوفیزی تورمەهات دەکەن.
- (٢٣) پولس.
لە واقیعدا دەردەکەوێ یونادا پێش شاخەسرەوی کۆچی دوایی کردووە، لەبەر ئەوەی لاپەرەکانی مێژوو دەخوێنێتەوە(مێژووی ئەربیل - وەرگێر). ئەوە لە سالی ٦٣٠ میتراپۆلیتی ئەربیل ناوی پولس بووە. هاورێیاتی بەتریك ئیشوعیاوی دووەم جدالی کردووە وەك سەفیری نێردراو بۆ لای ئیمپراتۆری رۆمانی(هیرقیلیۆس) لە لایەن شاژن(پوران) ژنی(شێرۆیی)([١٣٢]).
- (٢٤) مەکیخا.
ماوەی مێژووی دەسەلاتی ئەو میترۆپۆلیتە وە بە شێوەیەکی کۆتایی لە نێوان سالی ٦٣٠- ٦٣٧ بووە لەبەر ئەوەی پێش خۆی پولس بووە ناوی هاتووە لە سالی ٦٣٠ وە لە دوای ئەو(ئیشوعیاوی حدیابی) هاتووە، ئەینەوای بەجێهێشت کە(مارعەمیا) لە جیاتی ئەو، ئەمە لە پێش سەرکەوتنی عەرەب و زالبوونی بە سەر موسلدا بووە لە سالی ٦٣٧([١٣٣]).
باس دەکرێت کەوا مەکیخا هەردەم لە خەمۆکی دا بووە لەبەر ئەوەی دوو ئەسقەفیەی بە ناهەق و ناشەرعی دامەزراند ئەوانیش:(ئەشیم ئیشوعیاوی) و(نرسای) ئەمانیش هەلسان بە رەسامەتی ئەسقەف بۆ(ئازربێجان)([١٣٤]).
لەوانەیە مەکیخا بەم کارە هەلسابێ لەبەر ئەوە ناوی لە پاشکۆزیادەکە نەهاتووە.

## کەنیسەکانی ئەربیل:

نازانم کام کەنیسە لە کەنیسەکانی ئەربیل کۆنترە، کەنیسەی ناسك و خوا پەرست شەهید(ئیشوعسورەن) و دوازدە هاوراکانی مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ سەدەی حەوتەمی زاینی([١٣٥]).
دەکەوێتە دەشتێکی کراوە، وە بە رەچەلەك بەشێك بووە لە دێرێك. دوای بزربوونی بینایەی دێرەکە، کەنیسەکە بە تەنیا مایەوە. وە ئەمە زۆربەی جاران بەم شێوەیە ئەوەی لە ئارادایە کە ئاماژە بۆ سالی (١٦٠٠).([١٣٦]).

بە(کەنیسەی شەهیدەکان) ئەمە ئەو کەنیسەیەیە، واتە پاش دارمان و کاولکردنی لە ساڵی ١٣١٠ بۆ جارێکی تر دروستکرایەوە وە بەو هۆیەوە بەتریك(دنحا) دووەم روفاتی شەهیدەکانی گواستەوە بۆ کرملێس.
لەوانەشە کەنیسەی قەدیس ئیسحاق کۆنترین کەنیسە بێت لە ئەربیل بە پێی ئەوەی لە مێژووی ئەربیل دا هاتووە لەبەر ئەوەی لەلایەن مەتران ئیسحاق دروسکراوە. ئەمە لە ساڵی ١٣٥ و ١٤٨. ئەم کەنیسەیە تا نووسینی مێژووی ئەربیل لەلایەن نووسەرەکەیەوە مابوو.([١٣٧]).

سەرەرای ئەمەش هیچ زانیارییەك لە سەر رووداوەکانی وێرانکردنی ساڵی ١٣١٠ نازانین، بەلأم تا ساڵی ١٦٠٠ هەر مابوو جگە لەو دوو کەنیسەیەی ئاماژەمان پێی دا لە پێشەوە (کەنیسەی نوح) نوحیش دەخەینە لیستی کەنیسەکانی ئەربیل کە دوا کۆچی دوایی مەتران، کە ئەو ناوەی هەبوو(واتە بە ناوی نوح)(وەرگێر). ئەمە لە ساڵی ١٧٩؟. ئەو بەڵگەیەی لەبەردەستماندایە باس لەو کەنیسە دەکات کە(مێژووی ئەربیل) ە. بە پێی دانەری مێژووی ئەربیل. جێگەی کەنیسەکە و پاشماوەکانی دیار بوون و خەڵك زیارەتیان دەکرد لەو سەردەمانە(مێژووی ئەربیل) تۆمار دەکرا.([١٣٨]).
دەقێکی وەرگێر هەیە لە The Book Of The Cave Of Treasures ([١٣٩]).
پەرتووکێکە ناونیشانەکەی(کهف او مغارە الکنوز- واتە ئەشکەوتی خەزنەکان) ئاگادارمان دەکات: کەوا حننیا) قوتابی یۆحەننا لە دیمەشق و ئەربیل دەیخوێند، وە P?1 فەرماندەی ئیمپراتۆر Aretas(Aristus) بە مردن حوکمی بەسەردا سەپاند وە لە کەنیسەی ئەربیل نێژراوە بە پێی ئەوەی بە دەستمان دەکەوێت لە خشتەی ناوەرۆکی پەرتووکی Budge دوو دڵ نیە لە تێکچوون و وەك یەکی ناسنامە Arbil لەگەڵ Arbeli بە هەمان ناسنامە. ئەم واقیعە ئەوە دەگەیەنێ کەوا لە سەدەی شەشەمی زاینی ماوەی تۆمارکردنی دەقەکان بووە(ئەشکەوتی کەنزەکان - ئەشکەوتی خەزنەکان)،(وەرگێر)، کەنیسەیەك بە ناوی قەدیس حننیا ئەگەر ئەمە راست بێ رایەکی تر هەیە کەوا شەهیدێکی عەلمانیٚ هەیە لە ساڵی ٣٤٥ ناوی ئەو کەنیسەی پێدراوە. ئەم رایە باشترە لەو بیردۆزەی کە بە گریمانە دادەنێت قوتابیەکی قەدیسی نەزانراو هەیە بە ناوی یۆحەننا. لەمبارەیەوە پێویستە تێکەڵ بە یەکی نەکەین لە نێوان ئەو کەنیسەیە و کەنیسەی مەعانیۆ کە دەربارەی دەڵێ مێژووی یەباڵاها لە ساڵی ١٣١٠ خاپوور کرا([١٤٠]). خاوەنی راستەقینەی ئەو ناوە ئەو کچە قەدیسەیە مەعانیۆ لەگەڵ (تۆباوی شەهید خوشکی ساما)

بە پێی سرودێکی تایبەت بە ژنە قەدیسەکە کە زۆربەی جار گوێمان لێ دەبێ خەڵکەکە باوەڕدارەکان دیلێنەوە لە سرووتی سریانی رۆژهەڵاتی.([41]). لە زۆربەی دەقەکانی ئەم سرووده ناوی ئەو دوو قەدیسە دەخرێتە ناویەوە(جەستەکانیان نێژراوە لە تەك یەکتر لە شوێنێکی پیرۆز لە حزیاو) دیاریکردنی جێگەی ئەو شوێنەیە زۆر زەحمەتە هەروەها ئێمە ناتوانین پشتگیری پێشنیارەکەی شابۆ بکەین کەوا ئەو کچە شەهیدە(مەعانیۆ) (راحابی) بەناوبانگ بێت، لەبەر ئەوەی ناوی راحاب لە پێشەکی(عۆنیتا)(بەشێکە لەو سرووده‌ی وەرگیراوە لە نوێژی فەرزی تایبەت بە جەژنی وە یا یادگاری دووبارە دەکرێتەوە لە کاتی قەداسی ئاهەنگی بەو جەژنەوە یا ئەو یادە - وەرگێڕ.

وە ناتوانین هیچ شتێکمان دەست بکەوێت لە سەر شوێنی ئەو دوو کچە قەدیسەیە لە دەقی سرووده‌کاندا، هەندێ جار وا هەست دەکەیت کەوا لە قەدیسەکانی سەردەمی کۆنن وە هەندێ جار لە قەدیساتی سەردەمی نوێدا. رەنگە یەکێك لەو کەنیسانە ناویان هاتووە یەکێك لەو کەنیسانە بێت([42]).

کە مێژووی ئەربیل ئاماژەی پێ دەکات بە بێ ئەوەی ناوی لێ بنێت. ئەوەی باسی دەکەن مەتران(عابووشتە) یە؟ بە نوێکردنەوەی هەستاوە رازاندوویەتییەوە بە هەموو جوانییەك لە رازاندوویەتیەوە بە شێوەیەك هەرچی دەیدیت سەری لێ دەسوڕما و سوپاسگوزاری خوای دەکرد. ناتوانین هیچ بزانین دەربارەی ئەو کەنیسەیە ئایا ئەو کەنیسەیە لەو سەردەمە مابوو لە رۆژانی مێژوونووسی(نووسەری مێژووی ئەربیل)(وەرگێڕ).

## قوتابخانەی ئەربیل:

سەمعانی لەو لێکۆڵینەوە نووسیویەتی دەربارەی قوتابخانەکانی سریان و کلدان و فورسی کۆن و نوێ برگەیەکی تایبەت بە قوتابخانەکانی حدیاب لەگەڵ پاشکۆیەك بە قوتابخانەکانی(مەرگە - مەرگا)([43]).

پارێزگاری لە مێژووی حدیاب و واتاکەی. تەنها سێ قوتابخانە ناوی هاتووە: قوتابخانەی ئەربیل و قوتابخانەی(قوبلانە وە قوتابخانەی کەفەر عوزێل - کفر عوزێل). دوو قوتابخانەکەی دوایی ئەو کاتە باسیان دەکەین کە دێینە سەر باسی شوێنەکانیان. دەربارەی قوتابخانەی ئەربیل وە یا قوتابخانەی حدیاب دەڵێین سەرەتایەکەی هیچی لێ نازانین تەنها ئەوە نەبێت لە دەقەکانی مێژووی ئەربیل دا هاتووە.([44]).

لەوانەیە لە سەر دەستی دکتۆر پۆڵس مامۆستای کۆن لە قوتابخانەی نسێبین کە ئەو کاتە بەڕێوەبەرێتی قوتابخانەی نسێبین دراوە بە(ئەبراهام) ٦٠٩ - ٦٦٩ لە(بێت رەبان) ی

مەتران(حەننا) مەترانی حدیاب نازناوەکەی(دکتۆر نوێیە بە نسبەت ئەو چەرخە مێژوویەی کە پشتی پێ دەبەستین لەبەر ئەوەی دانەری بەرێز مەبەستی مەلپانە - الاستاذ، مامۆستا)(بە پێی بەکارهێنانی نوێی - وەرگێر) پۆلس ٣٠ ساڵ لە ئەربیل بووە واتە تا ئەو کاتەی(مارئەبا)(٥٤٠ - ٥٢٢) ناچاری کردووە ببێتە مەترانی نسێبین. بە پێی ئەوەی لە مێژووی ئەربیل دا هاتووە، قوتابخانەیەك بۆ کوڕان دامەزرا بۆ ئەوەی باوەڕداری لە دڵیاندا بچەسپێ بە گیانەوە وە هەروەها بۆ ئەوەی پارێزگاری لە خۆیان بکەن لە هێرشەکانی هەڵگەڕاوەکان هەرتەقەکان و جادوکەرەکان.([١٤٥]).
دکتۆرێکی تریش هەیە کاری لە قوتابخانەی ئەربیل دا کردووە بە پێی پۆلس دامەزرێنەری قوتابخانەکە لە دوای ئەویشدا هاتووە زانیارییەکانمان لە ناوڕۆکەکەوە وەرگرتووە - لیستێك: عەبدیشوعی نسێبین (ژمارە ٧٧). لە هەمان کاتیشدا قوتابیەکی بەتریك بووە(مارئەبا) وە ناوەکە(سیرج)، Serge بووە(سەرکیس - وەرگێڕ).
سەمعانی ئەم مێژووە دەگەڕێنێتەوە بۆ ساڵی ٥٠٠ بەلام لە تواناداییە ئەو مێژووە بۆ نیوەی سەدەی شەشەم دوابخەین. چەند قوتابیەکی زیرەك و هەڵکەوتوو سەرکەوتوو هەبوو لە قوتابخانەی حدیاب و ناوەکانیان لە پەرتووکی(العفە) ئەمانەن: مارسۆریشو، دامەزرێنەری دێری(عاوا شەپیرا) لە دوا رۆژەوە(مار داد ئیشۆ) قوتابی ئەبراهامی گەورە.([١٤٦]).
گریگۆر، نووسەر و میتراپۆلیتی نسیبین لە دواییدا(کراوە بە مەتران لە نێوان ساڵانی ٥٩٦ - ٦٠٤) لە ماوەیەکدا کورسی مامۆستایەتی وەرگێران بووە لە ئەربیل([١٤٧]).
هەروەها دانیال نازناوی دکتۆری هەبووە مامۆستا لە ئەربیل لە کۆتایی سەردەمی ساسانییەکاندا، دواتر هیچ هەواڵێکی قوتابخانەی ئەربیل نازانین.

## میترا پۆلیتەکانی کۆتایی سەدەی حەوتەم:

ئەو ماوەیە بە ماوەیەکی گرنگ دادەنرێت لە ماوەی قۆناغی گواستنەوەدا، ئەگەرچی ماوەیەکی دیار نیە کە تێپەڕیوە لە ڕێچکەی مێژووی شاری ئەربیل، لە ماوەی ساڵانی کۆتایی سەدەی حەوتەمی زاینیدا(ئەربیل) سێ مەترانی هەبووە کە لە مەترانەکانی پۆلی یەکەمدا دێن چونکە هەر سێکیان لە سەر کورسی بەتریکی دانیشتن(واتە بوون بە بەتریك - وەرگێڕ) ئەمانیش:
- (٢٤) (ئیشۆعیاو) لە(قوبلانە).
لە دایك بووی قوبلانەیە، گوندێکی حدیابە کە لەوێوە نازناوی حدیابی وەرگرتووە وە هەروەها لە (حزە) بەناوبانگی لەوەوە وەرگرتووە چونکە ناودارترین کەس بووە لە

مەیدانی ئەدەبی سریانی. خێزانەکەی لە چینێکی دەوڵەمەند بووە پەروەردەیی و فێربوونی نسێبینی بووە وە دەگەڕێتەوە بۆ(بیت عاوی) هەموو ئەوانە وایان کردووە شوێنێکی دیار و پایەبەرز وەربگرێت لە سەرەتای باوەڕداری ڕێچکەی ئاینیدا لەو کاتەی قەشەیەکی سادەی نەینەوا بووە دەبینین شوێنی وەرگرتووە وە ئەندام بووە لە تیمی باڵوێزە نێردراوەکان بۆ شای ڕۆمانی کە لە پێشتر ئاماژەمان پێی داوە لە ناونانی ئەسقەفیەکان خۆی تێدەکرد.([148]).

پەیوەندی باشی هەبووە لەگەڵ خاوەن بڕیارەکاندا جا چ لە ئەکلیرۆسەکان وە یا عەلمانیەکاندا بوویێت لە ناو تایەفەکەیدا. بە تەئکید هاووڵاتیانی ئەربیلی لە بیر نەکردووە بۆیە دەبینین دەنووسێت بۆ دانیال دکتۆر لە قوتابخانەی ئەربیل پێی دا هەڵدەگوت چونکە بایەخی دەدا بە بەندکروەکان([149]).

لە لێکۆڵینەوەی ورد لە ژیانی ئەو پیاوە ئاینیە گەورە و لاوە، وەك دەردەکەوێت سەرەڕای گەرمی گوڕی بۆ ئەرسۆدۆکسی نەستۆری، لە قووڵایی دڵیەوە غیرەتێکی دژایەتیکردنی هەبوو لە دژی یەعقووبییەکان وە بایەخی زۆری بە چاکسازی ڕەبەنەکان دەدا. وە هەروەها هەوڵی چاککردنی پەیوەندییەکانی دەدا بە گشتی ئایا ئەمە تەنها تەماعیە و بەس؟ لە خوێندنەوەمان بۆ نامەکانی هەست بە بەرگری دەکەین لەمەدا و هەست بە لاوازی دەکەین، وە هەڵاتن لە شکۆی بێ مانا([150]).

بە هەر حاڵ، ئەو هەست دەکات وە بە دڵنیاییەکی جێگیر، ئەو لە دایك بووە بۆ دوا ڕۆژێکی جیاواز و دیار ڕۆژێك لە ڕۆژان جێبەجێ دەبێت. دوای بەرپەرچدانەوەی داواکاری سەرۆکی شەماسەکان(یۆحەننا میری باوەڕدارانی ئەربیل(تانی) لە سەرەتادا. دواتر(ئیشۆعیاو) مەترانی نەینەوا ڕەزامەندی دەربڕیە بە وەرگرتنی پایە و دانیشتن لە سەر کورسی، دواتر بوو بە میتراپۆلیتی ئەربیل. دواتر دێینە سەر ژیانی(ئیشۆعیاو) بە زنجیرە باس لەو زەحمەتیانە دەکات دووچاری بووە، بە تایبەتی ئەو نازناوەی وەك مەترانی نەینەوا کە پێی بەشدار بوو وەك ئەندامی ئەو شاندەی بەتریك سەرۆکایەتی دەکرد بۆ لای شای ڕۆمانی کە لە لایەن شای فارسی نێردرابوو لە ساڵی ٦٣٠ . ئەمە ئەوە دەگەیەنێت سەرەتای سەرکەوتن و دەرکەوتنی بەتریك(ئیشۆعیاو) ی جدالییەکە لە دوای بەتریك(مارا) هات بە بۆنەی کۆچی دوایی(مارا) وە([151]).

لەبەر ئەوەی ئێمە(مارعەمما) ـ Maremmeh خەڵکی ئەرزۆنەو مەترانی نەینەوایە کاتی داگیرکردنەکانی عەرەب واتە لە ساڵی ٦٣٧.([152]).

ئـەوەمان بـۆ دەردەکـەوێت کـەوا(ئیشـۆعیاو) پـێش سـاڵێك نەینـەوای جێهێشـتووە و روی کردۆتە ئەربیل ئەو فەرمانەی بۆ ئەساقیفەی نەینـەوا دەرچووە لەوبارەیـەوە نووسـراوە لـە پاشکۆی دەستنووسی کەرملێس کە ئەم رایە دەسەلمێنێت.

بەلأم لێرەدا رووبەرووی ئەو کارانە دەبینـەوە کـە ئـالۆزن و تێگەیشـتنی دەوێت، ئـەوە ئـەو نامەیەیـە کـە خـۆی ئاراسـتەی کردبـوو واتـە(ئیشـۆعیا) کـە دەڵـێ:(بـە بەرەکـەتی خـودا کەنیسەی نەینەواییەکان بەکاردێنین)([١٥٣]).

نامەکە ئەوەشی تیایە کە ئامـاژە بـە عـەرەب و موسڵمانەکان دەدات بـە ئاشـکرا. زاراوەکـانی نامەکـە ئـەوەی تیایـە کـەوا موسـڵمانەکان دەسـەلأتیان بـە دەسـتەوەیە و فـەرمانی چـاك و خراپیان بەدەستەوە لەبـەر ئـەوەی خۆیـان فـەرمان دەردەکـەن. لەبـەر ئـەوەی لـە توانامانـدا نیە کە بڵێن تەنها سوپا تێپەڕبووە بەڵکو داگیری کردووە.

ئـەوەی پەیوەنـدی بـە نازناوەکـان هەیـە لـە نامـەکانی تـردا هەیـە.([١٥٤]). ئەمـە هـیچ جـۆرە پەیوەندیەك لە نێوان ناوەڕۆکی ئەو نامانـە و دیفـاکتۆی رووداوە مێژووییـەکان نـابینین کـە خۆی سەپاندووە، کەمترین خەملأندن گومـان دەخاتـە راسـتی ئـەو نازناوانـە، وە ئەمـە هـیچ ئەستەم نیە وە یا دەقێکی تێکدەرانە خزاوەتە ناو کۆتایی نامەکە. ئاماژەیـەکی تـریش هەیـە ئـەوە بـەهێز دەکـات کـەوا(ئیشۆعیاب) گەیشـتبێتە ئـەربیل پـێش رووخـانی ئیمپڕاتۆریـەتی ساسـانی، ئەمـە ئـەم نامەیـە نووسـیویەتی کـە ئـەو کـات میترۆپۆلیـت بـووە و پرسـە نامـەی چەوساوەکانی کردووە.([١٥٥]).

بـارودۆخی سـەردەمی ساسـانی باشـتر بـووە لـە سـەرەتاکانی ئیمپراتۆریـەتی عـەرەبی. بزانـە چۆن بووە هەڵسوکەوتی مەسـیحیەکانی ئـەربیل و سـەرۆکەکەیان ئیشـۆعیاو کـاتی گەیشـتنی موسڵمانە داگیرکەرەکان؟([١٥٦]).

وە ئایـا دەرگاکانیـان بـۆ والأکرایـەوە بـەبێ شـەڕ کـردن، هـەروەك چۆن موسـڵ و تکریتییـە مەسـیحییەکان کردیـان؟ بەهــەرحاڵ بێـت مــاف خۆیــان بــووە وا بکــەن. ئــەو کاتــە ئەرکی(ئیشۆعیاو) بوو کە زیرەکی خۆی دەربخات، کە پێی ناسرابوو ئەو زۆر بـە سـڵکردنەوە جۆشـەوە بێتوانـا و کـەمتر لـەوەی کـاری کـردووە بۆتـە هـۆی ئـەوەی دڵـی(مارعـەمما) ی نەینەوای پیرەمێرد پڕ بکات لە خەفەت. رەنگە عەرەبەکان لـە هەڵبـژاردنی بـەتریك ئـەویان لا پەسند نەبووبێت ئەوە هۆکار بێت بۆ ئەم رایە. بەهەرحاڵ دەڵێین:

(ئیشـۆعیاو) پیـاوێکی دووربـین بـووە وای کـردووە ببێتـە کەسایەتییەکی ئارەزوومەندانـە و ئـەو رۆڵـەی پـێ بـدرێ. لێـرە بـە دواوە دۆسـتی دەبێـت لـە نێـوان پیـاوە گـەورەکان و، دەسـەلأتدارە نوێیـەکان، وە دەتـوانێ بـەکاریان بهـێنێ بـۆ بەرژەوەنـدی گشـتی وە لەمـەش

ڕوواندنی کاروباری تایبەت بە کەنیسەی موسڵ. بەشداری کرد لە وەفدی نێردراوی شاژن پووران. لەو کاتەوە پەردەی لەسەر هەڵماڵدرا و بێباك بوو بەم شێوەیە ئەو میترابۆلیتە بەتوانایە و زیرەکە توانی ئیشوکارەکان لێپرسراوەتی گەورە بەڕێوە ببات. دوای ئەوەی(ئیشۆعیا) و نازناوی میترا پۆلیتی ئەربیل و حەززای وەرگرت، ئایا لە هەمان کاتدا نازناوی موسڵی وەرگرت؟

ئەو نووسەر و دانەرانەی دواتر هاتن ئەو ڕووداوانەی پێشتریان لەبیرچووە بۆیە ئەو نازناوەیان داوەتێ.

ئەوەی لێرە بەرچاو دەکەوێت لەو بابەتە جیاوازی لە مێژوودایە لە بەکارهێنانی نازناوێك، کە پێویست بوو ڕاستیەکان بەدیارنەکەوتبایە تەنها لە دواتر نەبێت. لە واقیعدا شاری موسڵی نوێ دامەزراو، ناوەکەیان لە داگیر کەرە عەرەبەکان وەرگرتووە. وە لە نزیکیش ناوی حدیابی کۆنیش دەگەڕێنێتەوە بۆ شوێنی ئەو دەسەڵاتەی جاران لە سەردەمی ئیمپراتۆڕی باکوور هەیبووە ئەو کاتەی پایتەختی سێیەمی ئاشوورییەکان بووە.([157]).

ئەگەر پرسیار بکەین ئەو ماوەیەی کە(ئیشۆعیاو) لە سەر کورسی میترابۆلیتی ئەربیل مایەوە؟

وەڵامەکە بە دڵنیاییەوە لە دوو ساڵ زیاتر بووە Leqvien باسی کردووە کە بەلای کەم دە ساڵ بووە لەبەر ئەوەی بۆتە بەتریك لە ساڵی ٦٤٧ وە یا ٦٥٠. چالاکی و کردەوەکانی لە ئەربیل بووە بە تایبەتی لە دەمەتەقێی نووسینەکانی لەگەڵ(سەهدۆنا)([158]).

خەباتکردن لە دژی یەعقووبییەکان، کردەوەکانی ئەدەبی و قانوونی و سرووتییەکان زۆر ناسراون وە پێویستی بە درێژەی زیاتر نیە. کاتێك باسی(قوبلانە) ی گوندەکە دەکەین کە لێی لە دایك بووە، دەبینین ڕۆڵی گەورەی گێڕاوە لە دامەزراندنی قوتابخانە لەو ناوچەیە.

- (٢٥) جۆرج لە کفرا، کەفرا.

قوتابی و دۆستی ئیشۆعیاو بوو، وە لە دوای ئەویش هاتۆتە شوێنی بەبەراورد کردن لەگەڵ پێش خۆی و مامۆستاکەی دەبینین(تارمایی جۆرج) دیارە. ئەو لە خێزانێکی دەوڵەمەند و دیارە هەروەکو(ئیشۆعیاو) لە ڕەبەنەکانی(بێتعاوێ) یە، دێرەکەی بەجێهێشت بۆ ئەوەی بگاتە برادەرە نوێیەکەی لە نەینەوا، وە دواتر لە ئەربیل لەوێ مایەوە وەك میترابۆلیت.

جێگەی سەرسوڕمانە لەبەر ئەوەی هیچ نامەیەکمان نەدۆزیوەتەوە ئاڕاستەی کرابێت لە بەتریك بۆ برادەرەکەی. هۆکارەکەشی ئەوەیە جاسلیقی پیرەمێرد سەرقاڵی ڕۆڵەکانی بووە لە جالیەی مەسیحی وڵاتی فارس و قەتەڕ لەبەر ئەوەی هەڕوگیفی جیابوونەوەیان دەکرد لەلایەك، وە لەبەر ئەوەی جۆرج ەوانەی کە لەوێی دانابوون هەڵسوکەوتیان لەبار نەبوو لە

لایەکی تردا. لە جیاتی ئەمە هەوڵەکانی حدیابی بۆ ناچارکردنی رەبەنەکان بە کردنەوەی قوتابخانە سەرقاڵی کردن بە کاری لاوەکی وە یا بە نووسینەوەی ژیانی قەشەکان. لە راستیدا جێی خۆیەتی بە(پیاو چاك و ساوا) باس بکرێت. ئەو پێناسەیە مارتۆمای مەرگە باسی کردووە. لە گفتوگۆی دامەزراندنی لەلایەن بەتریکەوە لە دوای خۆی هیچ نازناوێکی وەرنەگرت بەڵکو ئەوەندەی بەس بوو کە لە ژێر دەستی بەتریکی پێش خۆی پەروەردە کراوە.

سادمیی بەتریك جۆرج هۆکاری یەکەمە بۆ چارەسەرکردنی گرفت و کێشەکان کە روبەڕوی دەبوونەوە.([159]).

سەرۆکایەتی کەنیسەی ئەربیلی کرد لە ساڵی ٦٤٧ ـ ٦٥٠ ـ ٦٦١. دواتر لە پاشکۆکەی دەستنووسی کەرملێس ژمارەیەك لە میترابۆلیت ناویان هاتووە کە هیچ زانیارییەکیان لە سەر نیە لەوانە:

ـ (٢٦) سەرکیس لە تەمەنی بیست ساڵی چۆتە دێری(رەبەن برعێتا).

وە ئەمە هەمان ساڵە کە برعێتە کۆچی دوایی کردووە(٦١١ ـ ٦١٢). سەرکیس بۆتە میترابۆلیتی حدیاب لە ساڵی ٦٦١، وە دەستکەوتی بۆ دێرەکە پەیدا کردووە لە زەوی و باخچە و ئاش.(بڕوانە مێژووی برعێتە جزمی دووەم بەشی یەکەم(٢٥٦ ، ٢٥٧).

ـ (٢٧) یۆنان.

ـ (٢٨) ئەستەبانۆس(ئستیفان).

ـ (٢٩) شەمویل(سامۆئیل).

لە شوێنێکی تریش ناوی سلێوە زەخا دەبینین، هەندێ جار باس دەکرێت کەوا میترۆپۆلیت بووە لە ئەربیل پێش ئەوەی ببێتە بەتریك لە ساڵی ٧١٤. ئەم بەتریکە لە تیرهان لە دایك بووە.([160]). سەر بە(بێت گەرمای ـ بێت گەرمیان ـ وەرگێڕ) بووە. بەتریك حەننان ئیشۆعی یەکەم کردوویەتی بە مەترانی ئەنبارِ ئەمە لە ساڵی ٦٨٥/ ٦٨٦ وە یا ساڵی ٦٩١، دواتر لابردراوە لەگەڵ جاسلیق لە سەر دەستی یۆحەننا لە داسن. دووچاری رووداوی سەیروسەمەرەی زۆر هاتووە پێش ئەوەی ناوبنرێ بە پێی(ماری)([161]).

میترابۆلیت بۆ(حەززا) و (موسڵ) وە یا بە پێی نووسینەکانی(عەمرو) مامۆستایەکی سادە بووە. دوای گەڕانەوەی(حەنان یوشوع) بۆ پلەی خۆی و دانیشتنی لە سەر کورسی پەتریکی گشتی ساڵی ٦٩٣، گریمان کەوا(سلێوە زەخا) گەڕایەوە ئەربیل، لێرە گومانمان لەوە دەبێت کەوا خەڵکی لەگەڵ بێت، لەبەر ئەوەی ئەو ماوەیە دوورخرایەوە هیچ ئارەزوومەندانەیەکی میللی نەبووە بۆ ئەوەی یاریدەدەر دەرچێت ببێتە میترابۆلیت کە لە

سەر کورسی نسێبین دادەنیشێت. سەرەڕای ئەوەی بابەتی رەبەنە سەرەتاییەکان لە دێری(بێت عاوی) ئەو کاتەی خۆیان پڕ چەك کرد بە دار و بەرچیخ و بەرد و هێرشیان کردە سەری ئەو کاتە بەتریك بووە لە هەوڵی بەتاڵانبردنی دەستنووسێکی ئینجیلی بەنرخ بوو لە کەلوپەل و شتەکانی دێرەکە دابوون. تۆمای مەرگەیی بەرپەرچی ئەو لێپرسراوەتیە دەدات بۆ کوشتنی(قسەکردن لەسەر خەڵکانی تر بە خراپەکاری) ئەنجامی باسکردنی ئەو پەتریکە(بە رەزیل و..) ئەوەی کە مێژوو لە سەری نووسیوە(مێژووی کەنیسە) و دەڵێ.([١٦٢]).

ئەم واقیعە پاڵمان پێوە دەنێت بەسەر سوڕمان پرسیار کردن لە سەر چۆنیەتی توانای ئەو کەسایەتییەی ئەو پەتریکە کەوا هەڵدەبژێردرێ بۆ پایەی پەتریکی.([١٦٣]).

میتراپۆلیتییەکانی سەدەی هەشتەمی زاینی:

- (٣٠) شەمعوون.

با وا دابنێین کەوا موسڵ و هەولێر یەکیان نەگرتووەلەگەڵ یەکتریدا هەر وەك هەندێك لە دەقەکان دەڵێن کە لە نووسینەکانی عومەر دەیانخوێنێتەوە ئەو کاتە لە توانادایە دابنێین و بە دڵنیاییەوە، کەوا کەسێك هەبووبێ پێی دەڵێن شەمعوون مەترانی موسڵ بووە، وە رۆڵێکی بەرچاوی گەورەی گێڕاوە لە مێژووی(سڵێوەزەخا) چونکە لە هەمان سەردەم بوون لەو کاتەدا، وە بە پێی دەقەکانی هەیە پێویستە ناو شەمعوونێکی تریش هەبێت کە لە سەر کورسی حەدیاب بووە وە لە هەمان کاتدا ئەگەر ئەو ئەگەرەی سەرەوە راست نەبێت واتە دوو کەس بە هەمان ناوی شەمعوون نەبن ئەو کاتە دەتوانین ئەو ئەگەرەی کەوا(سڵێوەزەخا) بۆتە بەتریك لە ساڵی ٧١٤ بەڵێنی بە خەڵکی مەسیحی ئەربیل داوە کەوا شەمعوون مەترانی موسڵ بۆیان بگوازێتەوە(واتە لە موسڵ بۆ ئەربیل لەبەر ئەوەی سوپاسی کۆششەکانی(شەمعوون مەترانی موسڵ دەکات وە یارمەتی داوە لە گەڕانەوەی حەننا نشێوع) هیچ زانیارییەکمان لە سەر کار و کردەوەکانی ئەو مەترانەی ئەربیل نیە.([١٦٤]).

- (٣١) یۆحەننان

دوای مردنی شەمعوون و هەموو مەترانەکان و حکوومەت و باوەڕدارانی حدیاب(حەننان) یان هەڵبژارد، کە دەکاتە کوڕە خوشك و کوڕە برای نووسەر(حەننان ئیشۆع) ئەو نووسەر قوتابی مامەکانی وە یا خاڵەکانی(حەننان ئیشۆع) و(ئیشۆعیاو) لە دێری(بێتعاوی). لە سەرەتادا یۆحەننان مەترانی بێت بەغاش بووە، دواتر بەرز کرایەوە بۆ پلەی میترا پۆلیتی ئەربیل لە سەر دەستی بەتریك سڵێوەزەخا)(٧١٤ - ٧٢١) یۆحەننان پیاوێکی قەدیس بووەو

بناغەی دانا کە لە ئەربیل دانەنیشی و لە دوای ئەویش ژمارەیەك لەوانەی لە سەر کورسی میترا پۆلیتی ئەربیل دانیشتن هەمان هەڵسوکەوتیان کرد. ئەو لە دێرکەی خۆی دادەنیشت.([165]).

ڕۆژەکانی لە سەر کورسییەکە بەسەردەبرد لە ناو شوێن پەرستگەکەی خۆی بە پاڕانەوە و تێرامان و هێمنی و لە سەرەخۆیی و بێ دەنگییەوە. لەوێ(لە دێرەکە) لە سەر بەرپرسیارێتی مایەوە وەك سەرۆکی دێری بیت عاوی لە پاڵ کارەکەی هەروەها وە بۆ ماوەی چەند ساڵێك تا کۆچی دوایی کردنی و ناشتنی بە ئاشتییانە.

- (٣٢) ئەحا

ئەحا ئەو ڕەبەنەیە کەوا تۆما مەرگەیی زۆر بە شان و شەوکەتی دا هالگوتووە لە ڕەبەنەکانی دێری(بێت عاوی) یە([166]).

بۆتە سەرۆکی دێرەکەی خۆی لە دواتردا شێوازی کارکردنی لە کارگێڕی دا وا نیشان دەدات کەوا کارگێڕی و هەڵسوڕانی خراپ بۆ ئەبرەشیە کە پەیدا بێت لە دوا ڕۆژدا. لەبەر ئەوەی(بەڵێنی بە خەڵکانی تر دەدا بۆ کاروباری ناوخۆیی تایبەت بە دێرەکە هەروەکو میرێك لە ناو دەرگا ڕابوەستێ، وە یا لە ناو بەتریك خانە دابنیشێ و پاڵی لێ بداتەوە). لەگەڵ ئەوەشدا، لە دوای کۆچی دوایی یۆحەننان، باوەڕدارانی حەدیاب چوون ئەمانەن چینە موڵك دارەکان و دەرەبەگەکان بۆ ڕووبەڕووبوونی جاسلیق(مارئابا) ی دووەم(٧٤١ - ٧٥١) وە داوایان لە ئەحا کرد، ناچارکردنی بەتریك بە قەبوڵکردنی بەرپرسیارەتی بابەی میتراپۆلیت. نازانین ئەوە بەردەوام بوون بووە بۆ ڕێچکەی پێش خۆی وە مانەوە لە دێری بێت عاوی بە دیارکەوتنی ئەم کارەی نەکردووە، مادەم سەرۆکی نوێی دێر ناوی دیاریکراوە کارگێڕییەکەی بۆ ئەسقەفیە باشتر و ڕاستڕەوتربوە لە کارگێڕکردنی سەرۆکایەتی دێرەکە. ئەحا هەڵدەستا بە سەردانی گوندەکانی سەر بە ئەبرەشیەکەی. ئەحە بەوە بەناوبانگ بووە بە پێشبینییەکانی و شتە سەرسوڕمێنەکانی، بە ڕۆڵێکی گەورە و خەتەرناك هەڵسا لە لەناوبردنی یەعقووب و سورین، Surin.([167]) کەوا لە لایەن بەتریکییەوە لێی داواکرابوو تیایدا بمێنێتەوە ساڵی ٧٥٤. ژیری و توانای ئەحا و ناوبانگی قەداسەتی پاڵی پێوەنا بە پۆڵێنکردنی مەترانەکان بۆ جێگیرکردنی یەعقووب و نەهێشتنی و وازهێنان لە خەڵکی نامۆ.

لە سەردانێکی دا بۆ گوندەکان کە دەکەوێتە شەلەت لە ناوچەی(سابسبا) لە هەرێمی مەرگە کۆچی دوایی کردن ئەو کەنیسەی ئەو بەناو ئەوەوە ناونراوە.

- (٣٣) مارەن عەمیە لەعاواخ.

لە سەرەتادا ئەم بەڕێزە دکتۆر، مامۆستا، استاد بووە لە قوتابخانەی(کەفر عوزێل) دوای دامەزرێنەرەکەی(باوای) لە(کوێلتا) دواتر لەلایەن میترابۆلیت مار(ئەحا) کراوە بە مەترانی سالاخ لە دوای مردنی مارئەحا شوێنی گرتەوە و لە سەر کورسی دانیشت. ئەمە لە سەردەمی جاسلیق یەعقووبی دووەم بوو. واتە لە نێوان ساڵانی ٧٥٤ و ٧٧٣([١٦٨])

ئەگەرچی میترابۆلیتی نوێ بۆ هەر یەك لە(حدیاب) و(مەرگە) و(حیوتوون) کۆتایی بەبابەتی خاوەنداریەتی ئەو ئاشەی کێشەی لەسەر بووە بە سەرسوڕمانییەوە([١٦٩])

ئەو کارە سەرسوڕمانە یارمەتی(ماران عەمیە) ی دا لە دواتر بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتەکانی بە کردەوە و خەڵکیش گوێڕایەڵی بوون.

ئەو گۆڕانکاریانەی لە سنووری ئەبرەشییەکانی سەر بە کەرتەکەی خۆی، نیشانەی چالاکی و زیرەکی و توانای لە رێکخستنی کارگێڕی، خاڵی کۆتایی بەتەنها پەیوەندی بەو ئەبرەشیە نوێیە هەیە، کە تایبەت بە حدیابە. ئەمە لە دواییدا لە سەری دەدوێین. لە ماوەی دانیشتنی لە سەر کورسی، لێژنەیەکی پێکهێنا بۆ رێنمایی کردن بۆ ئەو ناوچەیەی دەکەوێتە پشت زێی گەورە، ئەم لێژنەیە جۆرێك لە زانیاریمان پێ دەبەخشێ، کە زۆر گرنگن ئەو کاتەی دێینە سەر باسی جوگرافیای(مەرگە) ماران عەمیا روبەڕوی برسیەتیەکی بەناوبانگ هات لەو کاتانەی کە تووشی پیری هاتبوو هەموو هەرێمی حدیابی گرتەوە، بەو هۆیەوە روی کردە موسڵ سەرەڕای خەتەرناکی رێگا و بان وە گەیشتە شاری ئاسورایێ(الاثوريين) وە لە ناوچەی نەینەوا دەسوڕایەوە لە پێناو کۆکردنەوەی کۆمەکی.

مێژووی ئەو وشکە ساڵیەی هەرێمەکەی گرتەوە بووە هۆی برسیەتی و قات و قڕی نووسراوە لە دەقەکانی پەرتووکی(الرؤساء) لە ساڵی ٢٠٤ ی کۆچی دەکاتە ٨١٩ ـ ٨٢٠ ز([١٧٠])

لە سەر ئەو هەوڵە زۆرانەی کە لە وتارەکانی(برج) وە(هۆفمان) هاتووە([١٧١])بەڵام دەقەکانی ئەو دەستنووسانە یەکتر ناگرنەوە کە دەمەوێت لێی بکۆڵمەوە و ناوەڕۆکەکانی بزانم.

کاتێك مێژووم دەخوێند لەوەدا لە توانامانـدابوو شتێك هەڵێنجم: وە یا هەڵەیەکە و تۆما کردوویەتی بەڵام رەنگە ئەمەیان دوور بێت وە یا کەمە وە یا تەزویرێك کراوە لە دەقەکە بە نووسینی تەعلیقێکی(توانج) ێکی هەڵە هەڵبەستراو. لە واقیعدا تۆما خۆی دەڵێ و بە روونی کەوا قەدیس ماران عەمیا کە مرد کورسی حدیاب بە بۆشی مایەوە ئەو کاتەی تیماسیۆس یەکەم هەڵبژێردراو ببو بە بەتریك لە ١ ی ئایاری ساڵی ٧٨٠.([١٧٢])

ئەم کۆچکردنە مەترانی مەرگە باسی دەکات و نەیتوانیوە بیشارێتەوە بە هەڵچوونەوە نووسیویەتی:(دوای هەوڵدانێکی بێ هودە بۆ چارەسەرکردنی ئەو ئاوە زۆرەی لە نزیك دێری بارەقتا) میترا پۆلیتی پیرەمێرد بە سواری ئەسپ رووی کردەوە هەولێر. بۆ ئەوەی

ڕۆژەکانی دوای ژیانی تیا بە سەر ببات، بەڵام بە زیندوویی نەگەیشتە ئەوێ چونکە مردن ڕێگەی نەدا و کۆچی دوایی کرد لە نیوەی ڕێگادا.

ـ (٣٤) ئیشوعیاوی مەرگەیی.

ئیشۆعیاو لە دوای ماران عەمیە) باوکی پەرجووەکاران موعجیزەکاران هات. تۆما مەرگەیی هیچێکی دەربارەی ئەوە تۆمار نەکردووە بە هیچ خاسیەتێك تەنها ئەوە نەبێت نازناوی میتراپۆلیت هەبووە.([١٧٣])

لە دوای ئەوەی کەوا سەرۆکی دێری بێت عاوی بووە([١٧٤])

سەرەتا ئیشۆعیاو بوو بە مەتڕانی نەینەوا لە سەردەمی میتراپۆلیت(مارئەحا) دا لە دوای مردنی(حەننان ئیشۆع) ی دووەم ساڵی ٧٨٠ وا پێویست دەکرا بکرێت بە بەتریك، بەڵام مەتڕانی(بیت بەگاش) کە مەترانێکی لاوو بوو گفتوگۆی لەگەڵ کرد کەوا چۆن بەو تەمەنە گەورەیەوە ناتوانێت بەرهەڵستی دووژمنکارانە بنێتەوە کەوا چاویان تێبڕیبووە وە بوونە هۆکاری کێشەی زۆرەوە(حەننا ئیشۆع) ڕازی بوو بەوەی خۆی لە گۆڕەپانەکە بکێشێتەوە دواتر پایەکە بۆ چەند ڕۆژێك درایە(تیماسیۆس) وەك وەفا داری بەو بەڵێنەی کە دابووی ناوی نرا بە(ئیشۆعیاو) مەتڕان بۆ کەنیسەی حدیاب و میتراپۆلیت بۆ هەموو ئەو ناوچانەی کە سەر بەوەوە بوون. وەك نارەزایی دەربڕینێك لەلایەن پیاو ماقوڵانی حدیاب و(شەهریکان) وە(کەفرعوزێل) وە دانیشتوانی(باناراوی) بە هۆی ئەوەی کە پرسیان پێ نەکراوە بەو ناو نانە، یەکتریان گرتەوە لەگەڵ نەیارەکانی تیماسیۆس و بەلای خۆیان دا ڕاکێشان ئەو جەماعەتەی هەڵگەڕابوونەوە بە سەرۆکایەتی مەتڕانی پیرەمێرد شلیمۆن لە(حەدیسە) بۆ ئەوەی بەشدارییان لەگەڵ دا بکات لە کۆنگرە جیابوونەوە کە لە دێری(بێزێ) بەسترا. لە دوای کۆنگرە(ڕۆستەم) یان هێنا کە مەتڕانی حەنیتا) بوو وە لە سەر کورسی میتراپۆلیت حدیاب دایانا، وە ناویان لەو دەسەڵاتە نا(کورسی بێت مارقەرداخ)([١٧٥]).

ئەم دەنگۆیەی دزینی پایەی کەنیسە گەیشتە گوێچکەی ئیشۆعیاو) کەوا نزیك بە هاتنە ناوەوەی سنووری ئەبرەشیەکەی بوو بە تایبەتی سەرۆکایەتی ئەسقەفیە ـ وەرگێڕ).

دوای ماوەیەك لە دوودڵی وە لە سەر ئەو ئامۆژگاریانەی کەوا تیماسیۆس پێی دا، میتراپۆلیتی یاسایی بەردەوام بوو بە ڕێگاوە و لە ناوچەی خۆی جێگیر بوو. بۆ ئەوەی دوورکەویتەوە لە لێکدان لەگەڵ ئەو یاخیبووانەی کەوا لە ناوچەی ئەربیل خۆیان قایم کردبوو، دەستی کرد بە سەردان بۆ ئەو ناوچە سنوورییانەی کەرتەکەی خۆی لە باکوورەوە دەستی پێ کرد و بەرەو باشوور چوو. سەرەتا سەردانی(بانی کایە) ی کرد، دواتر ڕۆڵەکانی

ناوچە شاخاوییەکان لە حدیاب، دواتر سەردانی دەوروبەری(حیۆتۆن) ی کرد، لەو دیوە پەڕیەوە بۆ(مەرگە) کە پێشوازییەکی گەرمی لێ کرا.
دوای مردنە تاڵەکەی رۆستەمی زەندیق و پەرش و بڵاوبوونەوەی دەست و پێوەندەکانی(شلیمۆنی لە خوا ترس) گەڕایەوە پلەکەی خۆی. وە هەروەها رۆڵەکانی شەرکان) داوای لێبوردنیان کرد و بەم شێوەیە بابەتەکە کۆتایی هات و(ئیشوعیاو) گەڕایەوە پایتەختەکەی خۆی تێیدا جێگیر بوو. زانیاریمان لەبەردەستدا نییە دەربارەی هەڵوێستی کەرتەکەی خۆی. دواتر دەبینین سەرقاڵە بە سەرۆکایەتی کردن و ئاڕستەی کارەکانی بیناسازی تایبەت بە هەیکەلێکی نوێی زۆر جوان لە بێت عاوی سەرەڕای هەموو ئەو کێشە و گیروگرفتانە کە روبەڕوی بۆوە لە دروستکردن و تەواوکردنی ئەو هەیکەلە. ئارەزووی دەکرد دێرەکە سەر لە نوێ دروست بکاتەوە. دوای کۆچکردنی لە هەولێر نێژرا. ئەو هەموو کۆدێتا راستەوخۆیانە وە لە ماوەی(میترابۆلیت) و(ئیشوعیاو) بوو تەنها دە ساڵێکی خایاند، دواتر دەبینین لە دوای ئەو لە سەر کورسی دادەنیشی لە ساڵی ٧٩٠ـ (٣٥)
نەستۆرۆس
پەرتووکی(الرؤساء) باسی نەستۆرس دەکات بە پیاوی ئاییندار.([١٧٦])
ئەو زانیاریانەی لەبەردەستماندایە زۆر کەمە لە ماوەی دانیشتنی لە سەر کورسی ئەربیل، وە هیچ پاشماوەیەکمان لێ رەچاو نەکردووە. بەشداری کردووە لە کۆمکاری تیماسیۆسی یەکەم بەستراوە لە ساڵی ٧٩٠([١٧٧])
لە ژێرەوەی پلەی(میترابۆلیت) واژووی کردووە(ئاشوور) وە ئەمە بۆ یەکەم جار تووشی ئەم جۆرە نازناوە دەبین. لە سەر داوای بەتریك تیماسیۆس چۆتە دێری بێت عاوی بۆ ئەوەی مەراسیمی رەبەن(ئیلیا) بکات بە مەترانی(موقام) لە دیلمان. تۆما مرگەیی ناوی دەهێنێ بە(میترابۆلیتی حدیاب)([١٧٨]). نازانین ماوەی دانیشتنی لەسەر کورسی چەند بووە، دوورترین ماوە بۆ ئەو مێژووە کۆچکردنی بەتریك تیماتیۆستی یەکەمە لە ساڵی ٨٢٣(١٨٧).
ناوی ئەو میترابۆلیتە لەگەڵ ناوی دامەزرێنەری ئەو مەزهەبە وەکو یەکە. ناوی لادراوە لە پاشکۆی دەستنووسی کەرملێس. بێگومان ئەمە ئەنجامی شێلگیری یەکێك لەباوەڕداران بووە.

## سەدەکانی سڕبوون

ئەفل ئەستێرەی ئەربیلی کۆنە، لە سەدەی نۆیەم تاوەکو سەدەی یازدەهەم بەشاری بالکاد ناودەبردرا. تۆمارگەی مێژوی ئەم شارە نیمچە ون کراوە. لاپەڕەکانی مێژووی درەوشاوە و

رابردووی دەرگەوتووی بە چینێکی ئەستووری لەبیرکراو داپۆشراوە، لە ناوەڕاستی سەدەی دەیەم، نووسەر(ابن بهلول) باس دەکات بە شپرزەیی بە گوندێك لە ولاتی حەززا وە ناوەکەی خۆی وەك ئەبرەشیەی میتراپۆلیت داوەتە موسلّ([٧٩]).

زۆر بە کەمی نووسەرە عەرەبەکان ئاماژەیان بە ئەربیل داوە وە زۆر بە دەگمەن ناوی دەهێنن کاتێك کە باسی دەکەن دەڵێن: لە ئاقاری پارێزگای حەلوانە([٨٠]).

دواتر ناوچەیەکە بەستراوە بە جەزیرە وە یا بە پارێزگای موسلّ، لەبەر ئەوەی موسلّ لە سەدەی نۆیەمدا شوێنێکی زۆر گرنگی داگیر کردبوو.

ڕێکخستنەکانی کەنەسی لەگەڵ ئەم واقیعە جیاوازیان نەبوو بەڵکو لەگەڵ یەك بە تەریبی ڕۆیشتوون. لە سەدەی نۆیەم موسلّ نازناوی پایەی بەرزی میتراپۆلّ و مەترانەکەی نازناوی مەترانی: (ئاشوور) و(موسلّ، وە یا موسلّ و ئەربیل وەرگرتووە)([٨١]).

ئەوەی تێبینی دەکرێت بزربوونی نازناوی نەینەوایە لێرە بەدواوە، وە هەروەها(حدیاب) وە بارەگای میتراپۆلیت گواسترایەوە بۆ موسلّ بۆیە کارگێڕیکردنی ئەربیل لە دوورەوە سەرپەرشتی کراوە.

بەم بۆنەیەوە پرسیارێکی هەڵپەرستانە دەکەین لە مێژووی رووخان(بزربوونی گرنگیەکەی)(ئەربیل) ی کۆن کە پلەی دووەمی هەبوو لە دوای پایتەختی باکوور ئەو رووخانە مەترسیدارە؟ عەبد ئیشۆعی نەسیبین([٨٢]).

ئەو بڕیارەی دەرچووە لەسەر ئەو بابەتە بۆ بەتریك(ئیشوعبرنوون)(٨٢٣ ـ ٨٢٩) هەر دوو ئەبرەشیەکەی کردە یەك و خستیە ژێر دەسەلاتی موسلّ و کاری پێ کرا تاوەکو ساڵی ١١٧٦.

لە دوای ئەو مێژووە لیستێك لە ناوی مەترانەکانمان بۆ دەردەکەوێت کەوا هیچ بایەخێك بە هەولێر نادەن تەنها بە شێوەیەکی لاوەکی نەبێت. پێم خۆشە لیستێکی ئەوانە بخەمە بەرچاو بۆ ئەوەی سەرچاوەیەك بێت بۆ بایەخدەر و ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان هەیە.

ـ (٣٦) عەودیەشوع

ـ (٣٧) ئیسحاق ـ یەکێك لەو دوو مەترانەی ناویان لە پاشکۆی دەستنووسی کەرملێس. کەوا نازناوی نوێی بۆ ئەو کورسیە وەرگرت([٨٣]).

دواتر ناوی میترۆپۆلیتەکان دەردەکەوێ کەوا چەسپ کراون، لە واقیعدا بەلاّم ناوەکانیان لادراوە لە دەستنووسەکەی کەرملێس. ئەم ڕاستیە شاردراوە نیە کەوا ئەگەری ئەوە هەیە ئەنجامی لەبیرکردن بێت، وە یا ناوەکانیان سڕابێتەوە. بەلاّم لە هەمان کاتدا دەتوانین ئەوە روون بکەینەوە کەوا هەر دووکیان ئەگەر بووبنە بەتریك ـ کەواتە ئەو دوو ناوە تۆمارکراوە و هاتووە لە پاشکۆکان ئەو دوو ناوەی کەوا میتراپۆلیتی ئاسوور بوون. بەلاّم لە

رووی زانستیدا وە بەبێ کەمکردنەوە لە راستییەکان تەئکید دەکەینەوە کەوا بەتریکەکان بەشی زۆریان ناوە کۆنەکانیان دەگۆڕی بە ناوی نوێ.

ـ (٣٧) A نینۆس یەکەم میتراپۆلیتی ناسراوە لە سەر کورسی موسڵ کەوا لە لایەن بەتریک(جۆرج) دامەزرێنرا(گۆرکیس ـ وەرگێڕ)ز٨٦٠ ـ ٨٧٤ وە بوو بە بەتریک لە ساڵی ١٨٨٧([٨٤]).

ـ (٣٧) B یۆحەننان برنرسای لە خانیجار(تووزخورماتوو) گواسترایەوە بۆ موسڵ بە بڕیاری ئینۆسی یەکەم(٨٧٧ ـ ٨٨٤) لە سەر کورسی بەتریکی دانیشت لە ساڵی ٨٩٣([٨٥]).

ـ (٣٨) یۆحەننان بربەختیشوع، ٨٩٣ ـ ٩٠٥([٨٦]).

بە پێی ناوەڕکی سریانی ژمارە(٣٥٤) پارێزراوە لە پەرتووکخانەی نیشتمانی ناوی هاتووە بە نازناوی میتراپۆلیتی ئەربیل([٨٧]).

ـ (٣٩) لۆقا نازناوەکەی ئەبراهامی سێیەمە(٩٠٥ ـ ٩٣٦ تاوەکو ساڵی (٩٣٨) لە ژیاندا مابوو([٨٨]).

ـ (٤٠) ئیسرائیل لە دوای پێش خۆی هات(رابردوو)([٨٩]).

ـ (٤١) جۆرج برتۆبی، ناسراوە بە جۆرج ئەربیلی، نازناوی بە میتراپۆلیت هاتووە لە موسڵ، وە هەروەها میتراپۆلیتی(ئاسوور) یاخود(میتراپۆلیتی ئەربیل و موسڵ)... تاد ئەدەبی سریانی گفتوگۆی دەربارەی نووسینەکانی دەکات. لەلایەن بەتریک عەمانوئێل یەکەم(٩٣٧ ـ ٩٦٠) دەستنیشان کراوە و هەڵبژێردراوە بە بەتریک بۆ ئەو سێ ساڵە ٩٦٠ ـ ٩٦٣ ـ ٩٧٨ بەڵام لە هیچ یەکێکیان سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا([٩٠]).

ـ (٤٢) ئیشۆعیاو: لە دوای ئەوەی پێش خۆی هات(جۆرجبرتۆبی).

بەرتیک ماری دووەم(٩٨٧ ـ ٩٩٩) گواستیەوە لە ئەبرەشیەی حەدیسە بۆ شاری گەورە(میتراپۆل) ی موسڵ تاوەکو ساڵی ١٠٠٠([٩١]).

تیایدا مایوە و بە ئیشۆع ئەربیلی بەناوبانگە.

ـ (٤٣) جوبرائیل(گبرئیل). لەلایەن بەتریک یۆحەننا کوڕی نازۆك گواستراوەتەوە لە ئەبرەشیەی(ئەرزۆن) بۆ کورسی موسڵ) رۆژی دامەزراندنی ئەو کورسیە دەکەوێتە ١٠ ی کانوونی یەکەم ساڵی ١٠١٢([٩٢]).

ـ (٤٤) ئیلیا لە سەر کورسی موسڵ دانیشتووە لە ساڵی(١٠٢٠ ـ ١٠٢٩)([٩٣]).

ـ (٤٥) عەودیەشوع کوڕی بەهریز، لە دوای ئیلیا هاتووە، سەرۆکی دێری سەعید(دێری مارئیلیا) ی نزیك موسڵ بووە، نازناوی بە(ئەبی سەعید هاتووە، لەلایەن بەتریکەوە پاڵێوراوە ساڵی ١٠٢٨، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو تیایدا، دواتر پلەی بەرز کرایەوە بۆ میترا

پۆلیتی(ئاشوور) قانوونەکانی شوێنیان هەیە لە(ماف قانوونی فەرمی) تایبەت بە کەنیسەی سریانی ڕۆژهەڵات([194]).

- (٤٦) جبارئیل، کوبرائیل کوڕی راکۆ لە ساڵی ١٠٦٤ گواستراوەتەوە لە ئەبرەشیەی تیرهان بۆ کورسی موسڵ بەڵام مردن بە خێرایی کۆتایی پێهێنا([195]).

- (٤٧) یاوالاها(باوکی دارا) سەرەتا مەترانی(مەعلتا) بوو، چونکە دوای کبرئیل هاتووە، لە سەر کورسی دانیشتووە لە ساڵی ١٠٦٤ تاوەکو ١٠٨٥([196]).

- (٤٨) هۆرمزد ئەگەری ئەوە هەیە پەتریکی دوا ڕۆژ بێت بە ناوی(مەکیخا) کوڕی سلێمان کە لە پایەی مەترانی تیرهانە و بۆتە میترا پۆلیتی موسڵ ساڵی ١٠٨٥ لەو جێگایە مایەوە تاوەکو هەڵبژێردرا بە بەتریك لە ساڵی ١٠٩٢([197]).

- (٤٩) ئیلیای کوڕی موقلی: دەسەڵاتی لە موسڵ بەکارهێناوە لە ساڵی ١٠٩٢ وە بارەگاکەی جێهێشتووە بۆ وەرگرتنی کاری بەتریکی لە ساڵی ١١١١([198]).

- (٥٠) یۆحەنان کوڕی حەداد، لە سەر کورسی دانیشتووە لە موسڵ لە ساڵانی ١١٣٤، ١١٣٨، ١١٣٩([199]).

بەڵام ڕەنگە ئەگەر هەڵەیەك هەبێت لە نووسینی لیستی پاشکۆکان لەلایەن نووسەرەکەوە کراوە و هەر دوو ناوەکەی پێچەوانە کردووە.

- (٥١) تیتۆس سەرۆکی دێری بێت قووقا بەتریکی ئیلیای سێیەم(١١٧٦ - ١١٩٠) کردوویەتی بە میتراپۆلیتی یوسف([200]).

## هۆشیاری ئەربیل:

لە ساڵی ٥٦٣ ی کۆچی بەرامبەر بە ساڵی ١١٦٧ ز ئەربیل هۆشیار بۆوە لەو سڕ بوونە لە سەر دەستی میرێکی کوردی ئازا و بە جەرگ بە ناوی(زێنەدین عەلی کوو تچوك بکتاکین) لە سەرەتادا ئەم میرە دەوڵەتێکی بچووکی دامەزراند، ئەوانەی لە دوای ئەو هاتن هەوڵی فراوانکردنیان دا بە کۆشش و چالاکیەوە شکۆیان بۆ ئەربیل گەڕاندەوە([201]).

دوای کۆچی دوایی میری دامەزرێنەر دەسەڵات کەوتە دەستی کوڕەکەی زینئەدین موسڵ) دوای مردنی کوڕەکەی ساڵی ١١٩٠ برایەکەی هاتە سەر حوکم بە ناوی(مزەفەرەدین کۆکبری) پێش ئەوەی ناوبراو دەەڵات وەربگرێت دەرەبەگێکی بەناوبانگی سێ ناوچە بوو ئەمانەن: ڕەهاو و حەڕان و سامۆسات([202]).

کاتێك زاواکەی دەسەڵاتی وەرگرت کە ناوی(سەلاحەدین) بوو کاری کرد بە هێز و خێراییەوە دەسەڵاتی بەسەر دەوڵەتەکانی دراوسێی داگرت وە لە هەولێر خۆشی و

خۆشگوزەرانی بڵاوبۆوە کە هیچ کاتێك بەم شێوەیە نەبووە، بە ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی جەژنەکانی ئاینی تایبەت بە موسڵمانان لە نووسینەکانی مێژوونووسی ئەربیلی(ئیب خەلەکان) ئەمانە دەخوێننەوە([٢٠٣]).

ساڵ بە دوای ساڵ خێر و بەرەکەت هەمووانی گرتەوە و شاری عەشتار فەرهەنگی کۆنی بۆ گەڕایەوە کە لە باب و باپیرانەوە وەریگرتبوو بە هەموو شانازییەوە دوای مسۆگەرکردنی هۆشیاری ئابووری و کۆمەڵایەتی بۆ شاری هەولێر هۆشیاری هەڵسانەوەی سیاسی بە دواوە بوو لەگەڵ ئازادکردنی ئاینی. کورسی ئەربیلی ئەسقەفی بەستراوە بە موسڵ بۆ دوو سەدە گەڕایەوە بۆ دەسەڵاتی خۆی بە پێی یاساکانی بەتریك ئیلیای سێیەم(١١٧٦ ـ ١١٩٠)([٢٠٤]).

تایبەت بە مەراسیمی مەترانەکان وە یا دامەزراندنی میتراپۆلیتەکان وە یا بەتریکەکان، ئەربیل و ئاشوور دەردەکەون وەك دوو کەسایەتی شاری میترۆپۆل(جیا و سەربەخۆ لە یەکتری. بە پێی ئەو زانیاریانەی هەیە لێکجیابوونەوە دوای ئەوەی تەیتس ـ طیطس کورسی ئەسقەفیەی وەرگرتووە([٢٠٥]).

Le Qyin ئەم مێژووە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی میتراپۆلیت یووسف واتە لە ساڵی ١٢٢٢. بە کردەوە ئەمە دەخوێنینەوە لە یەکێك لە دەستنووسەکانی مەترانی موسڵی کلدانی([٢٠٦]).

یووسف نازناوی(میتراپۆلیتی ئاشوور و موسڵی وەرگرتووە لە ساڵی ١١٨٨ بەبێ ئەوەی ئاماژە بە(حەززە) وە(ئەربیل) بدات کۆتایی بە لیستی میتراپۆلیتی گەورەکان بە(تەیتس) دێت، ئەو هەشت ناوەی دوایی لە پاشکۆی دەستنووسی کەرمێس داهاتووە هەموویان ناوی میتراپۆلیتی(موسڵ) ن بە تەنها. لە لایەکی ترەوە، ئاماژە بە زنجیرەیەکی نوێ بۆ میتراپۆلیتەکانی حەززە و ئەربیل دەکەین ئەم ناوانەن:(سوریشوبرقیوما) یەکەم میتراپۆلیتی ناسراو([٢٠٧]).

کوڕی برا وە یا خوشکی بەتریك(یاوالاها) ی دووەم(١١٩٠ ـ ١٢٢٢) مامی/ خاڵی دەستنیشانی کرد ببێتە مەترانی(باتۆهەدار) دواتریش میتراپۆلیت بۆ کورسی حدیاب کە بووە هۆی چاککردنەوە، جێگری مێژووی مسۆگەر بۆ سەرەتای وەرگرتنی لە هەولێر نەزانراوە. ئەو لە دوای مامی/ خاڵی لە سەر کورسی پەتریکی دانیشتووە لە ساڵی ١٢٢٢.

لە کۆبوونەوەی هەڵبژاردنی بە بەتریك برادەرەکەی میتراپۆلیتی موسڵ ئامادەبوو، یووسف([٢٠٨]).

بە یووسف(کۆتایی بە ناوەکانی میتراپۆلیتی موسڵ دێت وە لە دواتر پێویستمان بە هیچ لیستێکی تر نابێت تەنها بە لیستی ئەربیل نەبێت. لە ساڵی ١٢٢٢ منداڵێك لە تەمەنی

حەوت ساڵیدا کوژرا بە دەستی کوڕی(عەرەبێکی کۆچەر) لە بەرپەچدانەوە بۆ وازهێنان لە ئاینی مەسیحی([209]).

مزەفەرەدین لەو ماوەیەدا حاکمی دەسەڵاتداری سەر شارەکە بوو. سنووری دەسەڵاتەکەی درێژ کردەوە بۆ ناوچەکانی باشوور(خواروو) بۆ ئەو گەرمکانەی کە لە سەر کەلاوەکانی ئاشووری تووندوتۆڵ کرابوون کە تا وەکو ئێستاش بە قەڵا ناسراوە.

هێرشەکانی مزەفەرەدین بۆ لای خۆرهەڵات و باشوور بۆ ئەوە بوو بیخاتە سەر مەملەکەتی خۆی، هەر وەك دەیویست وا بوو توانی دەست بە سەر کەرکووکیش دا بگرێت بەڵام لەلای رۆژئاوا و باکوور تووشی پێکدادان هات لەگەڵ میرێکی تەماع کە لە هی ئەو کەمتر نەبوو. سەرەرای ئەوەش ئەو میرە کوردە زۆر لە سەرەخۆ و زیرەك بوو کە مزەفەرەدین وەك ئەو نەبوو. ئەو میرە کوردە بە توانایە ناسراوە بە(بەدرئەدین لوئلوئە) حاکمی موسڵی بەناوبانگ پاشکۆکانی دەستنووسی(المکین ابن العمید) زۆر بە درێژی پەیوەندیە خراپەکانی نێوان ئەو دوو دوژمنە سەر سەختانەمان بۆ دەگێڕێتەوە([210]).

گیانی چەکەرەبووی دوژمنایەتی لە دڵی ئەو دوو دوژمنە سەر سەختانە زۆر بە روونی دەردەکەوێ لە هێرشەکانیان بۆ سەر یەکتری. ئەو گوندانەی، کە گۆڕەپانی شەڕ و پێکدادان بوون لە نێوان ئەو دوو ئاگرەدا زۆر جار دەبوونە قوربانی تالان و بڕ و کاولکاری لە نێوانیاندا بە بەردەوامی. وە هەر یەکێك کار بکات لە پێناو پشت بەستن بە بەڵایەکی تردا چانسی دۆڕاندنی تەواوی هەیە. ئەمە لەلایەن شەمعوون بەرتلەیی روویدا کاتێك کەوا ناکۆکی لەگەڵ سەرۆکەکەی ـ مەفریان ـ پەیدا بوو، وە ئەوەی دووەم حرمانی کرد کە بووە بەتریك لە ساڵی ۱۲۲۲. شەمعوون نامەیەکی بۆ مزەفەرەدین نووسیوە رەخنەی لە بەدرەدین لوئلوئ گرتووە زۆر بە توندی و دژواری. بەدرەدین لە ناوەرۆکی نامەکە ئاگادار بووە بۆیە فەرمانی داوە شەمعوون لە خاچ بدرێت و فەرمانەکەی بەسەردا جێبەجێکرا([211]).

کاتێك مزەفەرەدین مرد، فەرماندەکانی خەلیفە موستەنسر لە هەولێر جێگیر بوون. ئەمە روویدا لە سەرەتای دەرکەوتنی کردەوەکانی تاڵان و بڕۆکان کە لە لایەن سوپای داگیرکەری مەغۆلی هێرشبەر بۆ سەر ئەربیل هات. رۆڵەکانی شارەکە بەرگریان کرد لەو هێرشانە بە شۆرشی بەردەوام([212]).

بەدرەدین لۆلۆ ئەو هێرشانەی قۆستەوە کە لەلایەن مەغۆلەکانەوە دەکرا بۆ بەرژەوەندی خۆی و بە دەرفەتێکی زێرینی دانا تا تۆڵە لە پایتەختی دوژمنە سەرسەختەکەی بکات سەرەرای کۆچکردنی. دوای داگیرکردنی بەغدا لەلایەن مەغۆلەکانەوە ساڵی ۱۲۵۸،

سەربازەکانی حاکمی موسڵ بەدرەدین لولو یارمەتی مەغۆلەکانیان کرد بۆ گەمارۆدانی ئەربیل کە شەش مانگی خایاند([٢١٣]).

دوای کۆتایی هاتنی گەمارۆکە مەغۆلەکان داوایان لە بەردرەدین لولو کرد شوورەکان تێك بدات بەلاَم وا پێدەچێت رێوی فێڵباز پەلەی نەکردووە لە جێبەجێکردنی فەرمانەکە. ئەو ئاشتیەی کەوا باڵی بەسەر ئەو گوندانەی نێوان موسڵ و ئەربیل کێشا ماوەیەکی زۆری نەخایاند لەبەر ئەوەی شۆڕشی کوڕی لولو و ئەوەی دوای ئەو ـ مالك سالح ئیسماعیل ـ دژ بە مەغۆلەکان لە ساڵی ١٢٦١، دەرکەوتنی ماوەیەکی نوێیە لە برسێتی دەربەدەری بووە هۆی هەلاَتنی ژمارەیەکی زۆری مەسیحی لە دەشتی موسڵ بەرەو ئەربیل بە تایبەتی خەڵکی گوندی(بێت سەخرە) کاتێك هەوڵی پەرینەوەیان دا لە زێی گەورە قەسابخانەیەکی ترسناك و درندانەیان بۆ دانان لە سەر دەستی میر(کووتلۆبیك) چونکە وای زانی کەوا لە لایەن دوژمنەوە بۆی دێن([٢١٤]).

بەلاَم سۆز و بەزەیی خەڵکی گوندەکانی نەینەوا نەیانهێشت ئەو قەسابخانەیە بەردەوام بێت دانیشتوانەکانیان دەستی یارمەتیان بۆ درێژ کردن بۆ ئەوەی بیانپارێزن بە هەموو هەوڵ و تواناییانەوە. ئەم هەڵوێستە جوامێرانەی مەسیحییەکان لە کەسایەتی گەورەی میتراپۆلیت دنحا دەردەکەوێت.

## دنحای ئەربیلی:

سەرەڕای ئەوەی ئەو کەسایەتییە ناسراوە لە مێژوو بە(بەتریك دەنحای یەکەم) لەبەر ئەوەی لە سەر کورسی رۆژهەلاَت بوو لە نێوان ساڵانی ١٢٦٥ و ١٢٨١، بەلاَم خۆمان بە بێ توانا دەزانین لە نەبوونی بەستنەوەی ناوی دنحا بە شاری هەولێر کە رزگاری کردووە و پاراستوویەتی بەلاَم، زۆر بە داخەوە بۆ ماوەیەکی کورت. ئەمە هاتەدی لە ئەنجامی سیاسەتی بوێرانە و واقیعیدا.

یۆناداب کۆششی زۆری کرد بۆ ئەوەی هەرێمی حدیاب قەدەغە بکات لە هاتنی یەعقووبییەکان دەبینین پاش شەش سەدە لەبەردەم هەوڵەکانی(دنحا) نەماون کە لە هەوڵی هاتنیان دا بوون بۆ هەرێمەکە و تیایدا جێگیر ببن بە ئاشتی و ئارامی. جەماوەری یەعقووبییەکان بە چڕی روویان کردە ئەربیل و دەوروبەری گوایە ئەمانە لە لایەنگرانی هەڵگەڕاوەکان و(دعات هرطمة) ی خەتەرناك نین کە پێویستە دژایەتیان بکرێت. بەڵکو ئەمانە پەناهەندەن و پێویستیان بە سۆز و یارمەتیان بدرێت. وە بە کەمێك ئاوڕدانەوە دەبنە هاوڕێ و برادەری بە وەفا. جگە لەمە دەبنە ئامێر بۆ تێکدانی ریزەکان لەگەڵ

نەستۆرییەکاندا کاتێك کە زەنگی خەتەرناك لێدەدا بە هەڕ و گیف بۆ شاری ئەربیل و دانیشتووانەکەی بەتایبەتی ئەمە لە چارەنووسێکی مەترسیدار دووریان دەخاتەوە کە ئەمانە دووچاری هاتوون.(یەعقووبییەکان) بۆ لابردنی خووڕەوشتە دزێوەکان، وەك رق و قینە و کوشت و کوشتار و خوێنڕشتن کە لە مێشکیان دا پەنگی خواردوە لەبۆ چەند سەدەیك بۆ ئەوەی بە تەواوەتی بنبڕ بکرێت، رایەکانی پێویست ئەوەی بۆ خەڵکەکە ئەو وتارانە باس بکرێت کەوا ئەوانە دەبنە هۆی لەناوچووونی هەمووان بەبێ ئەوەی هیچ یەکێکیان تیایدا رزگار ببن، ئەم هەوڵانە هەموو کەسێك قبوڵی نەکرد لەبەر ئەوەی کە بنیان پێویستە دوور بین و حیکمەت و کارامەیی سیاسیی تیا بێت، دنحا بەم جیاوازییانە دەردەکەوێت کاتێك هاتە سەر کورسی و کاری بە هەستیارییەوە پێ کرد. لە خوێندنەوەی نووسینەکانی(ابن الفوطي) دەتوانین واقیعی سیاسیی ئەو کاتە بزانین لەو ماوەیەی دنحا بە وردی، وە بە تایبەتی ئەو دەسەڵاتدارانەی مەسیحییەکان کەوا هاوکاری پیاوانی مەغۆلیان کردووە، لەو ماوانەی یەکەم گەیشتنیان([٢١٥]).

(دنحا) دۆستایەتی گەرمی لەگەڵ(ابن العبری) هەبوو. دووەمیان ژمارەیەك وتاری لە سەر دنحا نووسیوە لە لاپەڕەکانی مێژووی کەنەسیدا تۆمار کراون([٢١٦]).

وە یا لە نووسینی(مێژووی سریانی([٢١٧]).

لە کۆتایی مێژوو ژیانی دنحامان لەبەر دەست دایە لەلایەن رەبەن یۆحەننا نووسراوە بە چەند ساڵێکی کەم لە دوای مردنیدا([٢١٨]).

دەتوانین بڵێین هەموو ئەو بەڵگانەی ئاماژەمان پێیدا تەنها بەشێکی کەمە لە سەر دنحا لەبەرئەوەی پێویستی بە هەڵسەنگاندنی زیاتر هەیە بەلاَم وا پێویست دەکات ئەو دەقانە بخوێنینەوە بە تایبەتی ئەوەی(ابن العبری) نووسیویەتی چونکە نەیتوانیوە زۆرێك لەوانە بشارێتەوە کە لە سەر یەکێك لە نستۆرییەکان نووسیویەتی و دەهۆڵی بۆ لێدەدات کە دواتر بۆتە خۆشەویسترین لە برادەرەکانی.

(دنحا) یەکێك بوو لە رەبەنەکانی دێری بێت قۆقا هی کۆنەکان، وە لە دوا رۆژ بۆتە میترابۆلیتی ئەربیل واتە لە ساڵی ١٢٥٦، ئەمە بە پێی نووسینەکانی(ابن العبری)([٢١٩]).

دنحا لە سەر کورسی میترابۆلیتی دانیشتووە لەو پەڕی تەمەنی لاوێتیدا - تەمەنی نەدەگەیشتە سی ساڵ([٢٢٠]).

تەمەن بچوکی دنحای میترابۆلیت نەبۆتە هۆی ئەوەی کە خۆی بۆ پەتریك نەپاڵێوی لە ساڵی دووەم دوای بوونی بە میترابۆلیت. بەربەرەکانێی(مەکیخا) (١٢٥٧ - ١٢٦٩) بۆ (دنحا) لە سەر ئەو پایە وانەیەکی توونە بووە بۆ دنحا و زۆر شتی لێ فێر بووە لەوانە یەکەم سادەیی

و خۆ بە زل نەزانین دوایی وریا بوون لە هۆکارەکان و کاریگەری سەردانەکان لە هەڵبژاردندا([٢٢١]).

بۆ ئەوەی بەکاری بهێنی لە سەردانەکەی داهاتوودا. زۆر بە هێمنی لە سەر خۆیی رووبەرووی بەرهەڵستکارە سەرکەوتووەکەی بۆوە. ئەو گیانە نوێیەی کە لە دڵیدا چەکەرەی کردبوو لە دژایەتیکردنی بۆ پەتریك(مەکیخا) ساڵی ١٢٦٢ وە پارمەتیدەری بوو بۆ ئەوەی بڕیار بدات و کاری تێدا بکات بە درێژایی ساڵانی خزمەتیدا و بارهەڵگرتنی ئەو گرنگیە، لەوانە چارەنووسی مەسیحییەکانی ئەربیل کاتێك هاتە سەر کورسی پەتریکی لە ساڵی ١٢٦٥ بە پشتگیری و هاتنە ناوەوەی(دوو قوز خاتوون)([٢٢٢]).

توانی کەوا هێڵێ سیاسەتەکەی رابگەیەنێ کە سوودی دیاری هەبوو بە شێوەیەکی فەرمی و بە هەموو ئازادییەوە.

## دەرگاکان والآن لەبەردەم یەعقوبییەکان:

لێکۆڵینەوەی سیاسیی دنحا بەرامبەر یەعقوبییەکان ناچارمان دەکات کەوا زنجیرە رووداوێکی پازدە ساڵی کۆبکەینەوە وە هەروەها لە سەرمان پێویستە باسی گوندی(بێت سەیادی) بکەین بەڵام ئەوەی پەیوەندی بە شوێنی جوگرافی هەیە داوای لێبوردن دەکەین لەبەر گۆڕانکارییە مێژووییە تۆبۆگرافییەکان بە پێی ئەوەی کە لەبەر چاومان دایە، مەترسی یەعقووبییەکانی موسڵ و گوندەکانی نەینەوای گەورە دەرکەوت لە ساڵی ١٢٦١. ئەربیل بە شوورە بڵندەکانی و حاکمە مەسیحییەکەی ئەمیر تاجەدین موختاس) بە چاوی چەوساوەکان وەك بەندەرێکی ئاسایش و ئاشتی وایە بۆی هەیە رووی تێ بکەن ئەگەرچی لە کۆتایی نسکۆ بەرۆکی گرتن لە هەوڵەکانی ساڵی ١٢٦١، دواتر ئاوارە دەرکردن، بە کۆمەڵ و کۆچکردنی بە کۆمەڵ لەبۆ ساڵی دوایی. بەڵام ئەو کۆچکردنەی ئەمجارمیان لەبار و سەرکەوتوو بوو([٢٢٣]).

ئەوانەی کە خاوەنی بیردۆزی باوەڕداری بێ هودە بوون کە باوەڕیان پێی هەبوو ئەو ئاوارانە وە لەگەڵ خۆیان بردیان و لە دەرگاکانی ئەربیلیان دا بۆ داخوازی شوێنێکی ئارام ئەو کاتە بەتریکی نەستۆری(مەکیخە) لە شاری ئەربیل بوو. ئەم رووداوە کاری کردە سەر دڵی بەتریك شەڕانگێزی و دووبەرەکی پڕ ئازار لەلایەك دڵی پڕ بوو لە سۆز و بەخشندە و میهرەبانییەوە بۆ ئەو لێقەوماوە هەزارانە کە روویان تێکردووە و داوای یارمەتی پەناهەندەیی دەکەن، بەڵام لایەنی دووەم ترسیان هەبوو لە نەستۆرییەکان چونکە ئەم ناکۆکیە مێژوویە و چۆن ئەم یەعقوبیانە ببینن لە تەنیشت ئەوانە نیشتەجێ بوون

مەکیخە هەوڵیـدا بـە دوای چارەسـەرێکی گونجاو بـە مـەرجێك ئەمـە کاتی بێت و خستیە بـەردەمی یەعقوبییـەکان بەدابەشـکردنی لایـەکی کەنیسـەی خـۆی بۆیـان ئـەم داخوازیـەی بـەتریك بـووە هـۆی هەڵچـوونی دنحـای لاو، کـەوا ئەمــە تـەنها چارەسـەرەو بـەس. دوای دەرچوونی بەتریك لـە شارەکە و بـەرەو بەغـدا ڕۆیشت. مـیترا پۆلیـت لەگـەڵ(تاجەئـەدین) ڕێکەوت و ڕێگەیان بە یەعقووبییەکان دا بە دروستکردنی بینایەك، ئەمـەیان دژی فـەرمانی مەکیخەیـە. لـە سـەرەتادا یەعقوبیـەکان بینایـەکی بچـوکیان کـڕی و لـە ناوەڕاسـتیدا مەلەوانگەیـەکیان دروسـت کـرد دواتـر سـەرەڕای هـەژاریان کەنیسـەیەکیان دروسـت کـرد و ناویـان نـا کەنیسـەی(ماربهنـامی) شـەهید. ئەمـە وای کـرد میوانخانەیـەکی لـەبار بێت بـۆ ئەوانەی حەج دەکەن بۆ ئەو مەزارە کە بە ناوی ئەو قەدیسـەیە وە هـەروەها بـۆ ڕەبەنـەکان ئەوانەی کە سەفەر دەکەن، وە هەروەها بارەگایەکە بۆ مەترانی دێتە سـەردان دەبێتـە بارەگا و بنکەی حەسانەوە بۆی. ئەو دەستە خێرخوازیەی کەوا دنحا درێژی کردبـۆ یەعقوبییـەکان ئـەوە ناگەیـەنێ کـەوا سـەربەخۆیی وەرگرتـووە و دابـڕاوە لـە بـەتریك مـەکیخای سـەرۆکی، بـەڵکو دڵنیایـە بـۆ سیاسـەتێکی چەسـپا و ئاراسـتەی دەکـات بـە نـاوی ئەسـقەفیەك بـۆ یەعقوبیەکان لە ساڵی ١٢٧٧ بابەتی نازناوی دوو بە دوو واتە(مەتران)(بێت تەکشور) و(بێت صایدە ـ سیادێ) قەدەغـە کـراو بـۆ ئـەو ئەسقەفە کە نـاوی(باسیل) ە لـە دێـری مارمـەتی سەرسامی مێژوو نووسەکانی کردووە([٢٢٤]).

لە تواناماندایە لێکدانەوەی ئەمە بەم شێوەیە بکەین: جگە لە ئـەربیل کـە پێشوازی گـەرمی لە ئاوارەکان کرد، دنحا هەڵسا بە ئامادەکردنی مەڵبەندێك بۆ پێشوازیکردن لـەو ئاوارانـە لـە گوندی(بێـت سـایدا) لـە سـاڵی ١٢٦٥ ژمـارەی ئاوارەکـانی یەعقوبییـەکان یـەکجار زۆر بـوو کـە بووە هۆی بتوانن کەنیسە دروست بکەن([٢٢٥]).

لەگـەڵ ڕەچـاوکردنی ئـەوەی کـەوا گونـدی بێـت تەکشـور گوندێکـە لـە گونـدەکانی نەینـەوا واتـە(دەشـتی یەعقوبیـەکان) کـە دەکەوێتـە نێـوان بـەحزانی و خـازری خـواروو(چـیای عـێن سەفڕا) ئەو گوندە بەرگری و موقاوەمەتی هێرشەکانی کرد تا وەکو ساڵی ١٢٧٥([٢٢٦]).

لـەو ساڵەدا گونـدی بێـت سـایدە تووشـی هێرشـێکی تێکشکێن و کوشـتاری کـرا، لەبـەر ئـەوە خەڵکی گوندەکە ناچار بـوون بـە یـەکجاری کۆچبکەن و بـڕۆن. خـەڵکی ئـەو گونـدە زۆر بـە چـڕی ئـاوارەبوون و ئەسـقەفەکە تـوانی نـاوی گوندەکـەیان هـەڵبگرێ وەك نازنـاوێکی دوولایەنە بە پشت بەستن بەو ڕاستیەی کەوا نازناوی(بێت سایدە) ئاماژەیـە کـە بـۆ نازنـاوی کورسی نوێ و بێت تەکشوور ئاماژەیەك بۆ گوندە کۆنەکە. بـەم شێوەیە ئـەو نازنـاوە نوێیـە

بۆ ئەسقەفیەکە بە واتای دوو لایەنە ئاماژەیە کە بۆ دانیشتوانە کۆنەکە و ئاوارە نوێیەکان کە بۆی هاتوون([٢٢٧]).

## کەنیسەی قەلا:

مێژووی دروستبوونی کەنیسەی قەلا بەستراوەتەوە بە رووداوێکی گرنگ و خەمناك، سەرچاوەی زۆر هەیە بە بێدەنگی بەسەریدا تێپەڕیوە بەبێ ئەوەی ئاماژەی پێ بکەن، بەلام هەندێك هەیە رووداوی ئەو بەرپرسایرێتییە دەخەنە ئەستۆی دنحا جارێکیان([٢٢٨]). وە ئەوی تر لەسەر مەکیخا([٢٢٩]).

بەلام مێژووی رووداوەکە دەکەوێتە نێوان دوو ساڵی ١٢٦٤ ـ ١٢٦٨. بە کورتی، دەردەکەوێ کەوا ئەو کارە تاوانباریە کەوا پەتریکی پێ تاوانبار کراوە ئەمەیە: پەتریك هەڵساوە بە بەندکردنی وە یا لەوانەشە ژەهراوی کردن بێت([٢٣٠]).

بۆ مەسیحیەك دوای ئەوەی بۆتە موسڵمان بە پێی رای بەتریك کەسی ناوبراو لە ژێر حوکمی هەڵگەڕانەوەیە و کوفری کردووەن بەلام بە پێی رای موسڵمانان ئەمە هیدایەتە بۆ ئیسلامەتی، کەواتە هیچ بۆ پەتریك نەماوەتەوە وە هیچ دەسەلاتێکی لە سەر ئەو کەسە نیە و هیچ مافێکی نیە تاوانباری بکات. پرسیارەکە ئەوەیە، کام لەم دووانە گوناهبارن لەم تاوانەدا، مەکیخە وە یا دنحا؟ لە سەرەتاوە ئەگەرچی رەبەن حەننا تەئکید دەکات و دەڵێت کەوا کەنیسەکە لەلایەن دنحا دروست کراوە ئەو کاتەی میترا پۆلیت بووە ئەمە باس کراوە لەگەڵ رووداوی ساڵی ١٢٦٢ ـ ١٢٦٥، پێویستە لەسەرم کەوا پارێزگاری لەو پەیوەندیە بکەم لە نێوان دەقەکانی تری تایبەت بە بابەتی دروستکردنی کەنیسە و نێوان نامادەبوونی بەتریك لە ئەربیل. لە رووی دەروونییەوە دەبینین بایەخدانی پێویستە دەبینین کەوا پێویستە دنحا زەرەرمەندی گەورە بێت کاتێك کە دێتە سەر کورسی پەتریکی لە دوا رۆژدا ئەگەر کارێکی وا قێزەونی کردبێت لە رۆژانی رابردوودا با وا دابنێین بەرپرسیارەتی تاوانەکە دەکەوێتە ئەستۆی مەکیخا کارێکی لەو شێوەیە کێشەو هەست و سۆزی خەڵك دەبزوێنێ وە ئەو تاوانەش بەبێ سزادان تێپەڕ نابێت کەوا لە بەغداوە حوکم دەدرێت لە ساڵی ١٢٦٤. دوای ئەوەی موسڵمانان ددانەکانی خۆیان چیڕ دەکرد بەبێ ئەوەی بتوانن هیچ بکەن وەك بەرپەرچدانەوەیەك بۆ ئەو رووداوە قێزەونە بەلام دەڵێن مەکیخە بەرەو بەغدا هەڵاتووە هەموو ئاماژەکان ئاڕاستەن بۆ ئاڕاستەی پێچەوانە، وە بەرپرسیارەتییەکە دەخاتە ئەستۆی دنحا. ئێستا و هەرچەندەکو دۆخەکان لەبارن لە توانامانداییە بپارێینەوە بۆ گەردن ئازادی بەتریك(مەبەستمان ئەو ساڵانەیە کەوا کاری توونە و تیژی و دڕندەیی

مەسـیحییەكان دووچـاری ببـوون كـە بـە تەئكیـد كـاری كردۆتـە سـەر تووڕەبوونەكـەی بـەتریریك) بەرپەرچـدانەوەكە ئاماژەیـە بـۆ ئـەوەی كـەوا سـێبوری لێـبڕاوە و هەڵەكـە بارگرانیەكە وەك بـارێكی تۆپەڵە ئاسنە هەڵیـدەگرێت كە حوكم دانـە بە مـردن وە یـا بـە كردەوەی قورس بە درێژایی ڕۆژانی ژیانی داهاتوویدا. بۆیە دەبینین لە سەر خۆیی دیـوانی پاشایەتی مـەغۆلی سـەرەڕای هـەموو ئـەو هۆكارانـەی پێویسـتن كە دنحا ناچار بكرێت بـۆ كـاركردن لـە پێنـاو پتـەوكردنی رەگ و ریشـەی مەسـیحییەكان لـە ئـەرِبیل لێـرە بـەدواوە وتەیـەكمان دەبێـت بـەتریك ترساوە! لـەوەی كـەوا ئامـاژە هەیـە ئامـانجی دواكـەوتنی وە یـا كۆسپ دروستكردنە بۆ دروستكردنی كەنیسەكەی قـەلاّ لـە مـاوەی دوورخستنەوەی بـەتریك دنحا بۆ شـارە كۆنەكـەی خـۆی كـە كورسـی میتراپۆلیـت بـوو لـەو ماوەیـەی دەكەوێتـە نێـوان ساڵانی ١٢٦٨ ـ ١٢٧١.

## ساڵانی دوای د نحا :

دنحا زۆر لە ئەرِبیل نەمایەوە لەبەر ئـەوەی سزای میلـەتی بەسـەردا درابـوو، لەبـەر ئـەوەش لـە شـار و قەسـرەكەی خـۆی لـە بەغـدا دەركـرا، دواتـر دوورخرایـەوە، لـە ساڵی ١٢٧٢ هـەوڵی كوشتنی عەلائەدین لە بەغدا ڕاگەیەندرا([٢٣١]).

لەو ڕووداوە حاكمی مەدەنی دنحای تاونبـار كـردو سـكاڵای لـە سـەر دنحـا بـەوە تاوانبـار كـرا لەلایەن بەتریك كـەوا كاریگـەری و دەسـتی هـەبووە لـە ڕووداوەكـەدا لەبـەر ئـەوە(قوتبۆكـە) حاكمی ئەرِبیل فـەرمانێكی دەركـرد بـە گـرتنی جاسلیق و ژمارەیـەك لـە مەتڕانـەكانی سـەر بەو دوای چەند هەفتەیەكی كـەم فـەرمانی پاشـایەتی لـە بەغـدا گەیشـت ناسـراو بـە(ئوڕتـا) بەبەرِاڵاكردنی گیراوەكان([٢٣٢]).

دنحا ئەوەی نەدەخوازی كە تووشی هات بۆیە هەڵات بەرەو(شنۆ) لە ئازربێجـان. نەگەڕایـەوە بۆ ئەرِبیل تاوەكو بەو شارە دوای ماوەیەك تێپەڕ بووە، كە دەكاتـە ڕۆژی جـەژنی خـاچ(عیـد الصلیب) ساڵی ١٢٨٠. وە حكوومەتەكە لەو كاتەدا تووشـی نەخۆشـی هـاتبوو، وە گەڕایـەوە بـۆ بەغدا تاوەكو كۆچی دوایی تێدا كردووە([٢٣٣]).

لە كۆتاییدا دەبینین كەوا نەعلەت و نەفرەت لە دنحا دەكرێت هەتاوەكو لـە گۆڕەكەشـی بێـت لە ڕۆژی ٢٤ مانگی شوباتی ساڵی ١٢٨١ نێژراوە لە قەسـرێكی نـەفرەت لێكـراو كـە هـی یـەكێك لـە ئەفسـەرەكانی خەلیفـە(الدوائیـدار) بـووە، ئەمانـە پێشكەشـی مـەكیخایان كردبـوو، كـە لەوێوە مەكیخا هەڵات، ڕۆژانی سووتانی گەورە و هەڵچوونی میللـەت لـە سـاڵ ١٢٦٨. لـە سـاڵی ١٢٩٥ پـەتریكی دوای دنحـا دەركـرا كـە نـاوی(یـەهوالاهای سێیەم) بـوو، دوای ئـەوەی(قـازان)

کەنیسە نوێیەکەی گەڕاندەوە و فەرمانی دەرکرد بۆ مەسیحییەکان بە دەرگردنی ئێسك و پروسکی مردوەکانیان و بردنیان بۆ دەرەوە. دوای ئەوەی رووفاتی هەردووکیان هەلگرت مەکیخا و دنحا کە بەرپرسیارن بەارمبەر هەموو ئەو کێشانەی دووچاری مەسیحییەکان هات دوای مردنیان، وە گواسترایەوە بە شێوەی کاتی نێژران لە کەنیسەی بازاڕی سێشەممە لە بەغدا([٢٣٤]).

زانیارییەکانمان لە سەر باری مەسیحییەکانی ئەربیل لە دوای دوورخستنەوەی دنحا زۆر کەمە. ئەو ئاگرەی کە لە ساڵی ١٢٧٤ روویدا یارمەتیدەرە بۆ هەست کردن بەو ناخۆشیانەی کە تێیدا دەژیان. لە هەمان ساڵدا و لە ترسی ئەوەی نەتوانن بسوڕێنەوە بە چڵە زەیتوونەکانیان لە(جەژنی سەعانین، وەیا شەعانین) بە شێوەیەکی ئاشتیانە، ناچار بوون پەنا بەرەن بۆ هەندێك لە مەسیحیە تەتەرەکان بۆ ئاهەنگ گێڕان. ئاهەنگگێڕەکان دەرچوون بە سەرپەرشتی میتراپۆلیتی ئەربیل و بە هەلگرتنی خاچەکانیان کە لای سەریان بە رم چەسپێنرابوون. سوڕانەوەکە بە پێی سرووتی ئاسایی کرا. بەلام عەرەبەکان بەردەبارانیان کردن و ئاهەنگگێڕەکانیان پەرت و بلاوە پێکرد و تۆقاندنیانی. دەتوانین بلێین:(ئەو تەتەرانە مەسیحی راستەقینە بوون) فەرمانێکە باوەڕی پێ ناکەم.ئەگەر ئەم وتەیە وتەیەکی راست بێت دانیشتوانی ئەربیل ئەو جورئەتەیان نەدەکرد هێرش بکەنە سەر مەغۆلە راستەقینەکان ئەم واقیعە پاڵمان پێوە دەنێت بۆ ئەوەی گومان بکەین کەوا لە دانیشتوانی ئەشکەوتە شاخاویەکانی کرێگرتە بن لە باوباپیرە سەرەتاییەکانی ئاشوورییەکان ـ لیڤییەکان، Levis واتە ئەو سەربازانەی کەوا بەکاردەهێنران وەك هێزی یارمەتیدەر بۆ فەوجەکانی مەغۆل([٢٣٥]).

ئەوانەئەگەرچی ناکۆکیان لە نێوان خۆیاندا دروست دەبوو لە بازنە تەسکەکاندا بەلام یەکگرتوو بوون لەگەڵ یەکتری بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشە جۆراوجۆرەکانی موسڵمانان.

## پەرش و بلاویان بووە هۆی پەیدا بوونی ئەو رووداوانە لە ساڵی ١٢٩٠ دا.

ئێمە ئەوە دەزانین کەوا بەردبارانی ئاهەنگگێڕانەکان لە ساڵی ١٢٧٤ کران بەلام ئەو ناخۆشیانە وەك دەیبینین دووبارە دەبۆوە و بۆ چەند جارێك و کۆتایی دەهات بە خەسارەتکردنی زۆر لە ئەنجامی هاوپەیمانی لەگەڵ داگیرکەرەکاندا پاساوەکەشیان ئەوە بوو(بۆ داخوازی پاراستنیان) هەروەها باری حاکمە مەسیحییەکان(هاوکاریکەرەکان) لەم قاوغە دەرناچێت. ئەمە لە هەمان کاتدا نموونەی بەرچاون. باری ئەو جۆرە فەرمانڕەوایانە بووە هۆی زۆرێك لە سەرئێشە بۆ مەسیحییەکان. لە ساڵی ١٢٦٤ مەغۆلەکان

مەسیحیەکی هەولێری(ئەربیل) ی تەنسیب کرد بە ناوی(زەکی الاربیلی ـ زەکی هەولێری) بە حاکم لە شاری موسڵ. دوای ئەویش(رازی ئەلیمبابا) کە حوکمی مردنی بە سەر سەپێنرا([٢٣٦]).

ئەو فەرمانڕەوایە مەسیحیەی کە زۆر بەناوبانگ بووە(مەسعود کوڕی ئەعلام الدین یعقوب) لە(بێت قەوتا) گوندێکە دەکەوێتە ناوچەی ئەربیل([٢٣٧]).

مەسعود فەرمانڕەوای موسڵ و ئەربیل بووە لە ساڵی ١٢٧٥ بە فەرمانی(ئەبەکا)([٢٣٨]).

فرت و فێڵ و ئاژاوە زۆرەکانی مەسعود و هەڵگەڕاوەکانی([٢٣٩]). زۆر زیانی گەورەی بە مەسیحی موسڵ و ئەربیل گەیاند.

## کۆتایی سەدەی سێزدەهەم:

لەو سەردەمەی کە دنحا بەتریك بوو، لە ئەربیل دوو کەسایەتی بەناوبانگ دەرکەوتن ناویان لە مێژووی کەنیسەی رۆژهەڵات تۆمار کراوە. ئەو دوو کەسایەتیە رەبەن بوون لە(ویخۆر) وە یا لە تورکەکانی رۆژهەلات. یەکێکیان پەتریکی داهاتووە کە ناسراوە بە(یەهولاهای سێیەم) وە دووەمیان رەبەن(سۆما)یە.

مێژووی ئەو دوو رەبەنە بابەتی لێکۆڵینەوەی زۆرە وە وەرگێڕاوەتەوە بۆ ژمارەیەك زمان([٢٤٠]).

لەو لێکۆڵینەوەیەماندا تەنها ئەو بەشە تایبەتەی ئەربیل باس دەکەین. لەگەڵ رێچکەی رووداوەکان و زنجیرە مێژووییەکان دەڵێن لە ساڵی ١٢٨٣ ئەربیل میتراپۆلیتی هەبوو لەلایەن(یەهولاها)([٢٤١]).

مەراسیمی بۆ کراوە و ناوی(موشێ، موسا) بووە. لە ساڵی ١٢٨٥ گروپێك لە سەربازەکانی سریان دوکانەکانی بازاڕی موسڵیان تالان کردووە بەرامبەر بەوە ژمارەیەك لە مەسیحی ئەربیل کوژراوە([٢٤٢]).

لە ساڵی ١٢٨٩ میر(بۆکا) رووخاوە، پارێزەری فەرمانڕەواکانی مەسیحییەکان بەرامبەر بە فەرمانڕەوایی ئەربیل(تاج الدین المختص) بۆ موسڵ نێردراوە وەك بەرپەرچدانەوەیەك بە لابردنی مەسعود وە دەرکردنی لە فەرمانڕەوایەتی دواتر گیراوە و ئەشکەنجە دراوە و ماڵەکەشی بردراوە و تالان کراوە، ئینجا فڕێیان داوەتە ناو رووباری دیجلە. وە کاتێك ئەم توانایەی نەبووە بۆ بەرگریکردن لە ئازارەکانی لەوانەیە تاج الدین بە خنکاندن مردبێت بەڵام مەسعود گەڕێنرایەوە بۆ ئەربیل بە بەندکراوی و دوایش فەرمانی لە سێدارەدانی بەسەر جێبەجێکراوە لە رۆژی چوارەمی مانگی نیسان([٢٤٣]).

لە هاوینی ساڵی دواتـر، مەغۆڵـەکان لـە موسـڵ و هـەولێر کشانەوە، کوردەکان لـە شـاخەکان هاتنە خوارەوە و مەسیحییەکانی قەلآیان گەمارۆدا، ئەو کاتە زۆر شت روویدا کە پێشبینی نەدەکرا، وە ئەمە هۆکارێك بـوو لـە سـەر ئـەم رووداوە دەنگی گـەورەی دایـەوە لـە مێـژووی ئـەورووپادا. هۆکـاری ئـەم هـەرا و هۆریایـە گەورەیـە ئـەوە بـوو بەسـتنی ئـەرگان لەگـەڵ فەرهەنگەکان ـ راستیەکەی رۆڵەکانی جەنوە ـ بـۆ دروسـتکردنی سـەفینەکان لـە بەسـرا بـۆ هێرشکردنە سەر میسر، هەندێك هێز هەبوون بەرەو باشوور دەچوون لەوانـە(٢٠٠) سـەرباز لەگەڵ رێـرەوی دیجلە بـەرەو موسـڵ دەچـوو وە(٧٠٠) تـر بـە پیادە دەهـاتن، تـاوەکو نزیـك ئـەربیل بوونـەوە. کوردەکـان کـە گوێیـان لـە گەیشـتنی ئـەو هێـزە بـوو، ناچـار بـوون گەمارۆکـەیان شـکاند و کۆتـایی هێنـا. ئـارەزوو کـردن بـۆ پتـەوکردنی متمانـە کـردن، دانیشتوانی قـەلآ هەڵسان بـە ناردنی کۆمـەڵێك لـە سـوارە(٢٠٠) سـواری چیایی بـۆ گونـدی دراوسێ ناسراو بە (بێت سەیادێ) بۆ ئـەوەی دانیشتوانەکە رازی بکـەن، کـەوا بەرژەوەندییـە هاوبەشەکە ئەوە دەخوازێت بێنەوە ناو قەلآی ئەربیل. لە گەڕانـەوەی کۆمەڵـە سـوراەکە، بێ باکانە بلآوەیان کرد، رووبەڕوی هێرشێکی کوردی چاوەڕوان نـەکراو بـوون، ژمارەیـەکیان لـێ کوژرا، وە ژمارەیەکی زۆریشیان لێ بەدیل گیرا، وە کەلوپەلـەکان و خۆراکەکانیشیان بـەتاڵان برد. دوای ماوەیەکی کورت پاڵەوانیەتییەکی گاڵتـەجاڕی روویـدا ورەی گـەمارۆدراوەکانی پـێ بـەرز ببـۆوە و ژمارەیـەك لـە سـریانەکان نزیکـەی(٢٠٠) کـەس دەبـوون بـۆ یارمەتیـدانی کوردەکانی ئەربیل بەو هیوایەی بەشێکیان بەرکەوێت لەو کێکە تـاڵان کـراوە، بـەڵام ئـەنجام پێچەوانە دەرچوو گـەمارۆدراوەکان هێرشـیان کـردە سـەر ئـەو بـەکرێ گیراوانـە بەشـێك لـە سەنگەرەکانیان تاڵان کرا. دواتر بارەکە گۆڕا، ململانێیەکـە خەتـەرناکتر و گـەرموگوڕتر بـوو کەنیسەکان کەوتنە بەر هەڕوگیف لەو ماوەیەی کەوا(بیدۆ) بوو بـە ئیسلام. بـەڵام یارمـەتی هەیسەم شای ئەرمەنەکان گەیشت([٢٤٤]).

ئێستاکە ئێمـە لـە سـاڵی ١٢٩٥ دایـن دەبیـنین کـەوا چەوسـانەوەکان بـە شـێوەیەکی ئاشـکرا دەکرێت وە لە شوێنی هێرش بەری بە هۆی ئەو یارمەتیەی کـەوا نـەورۆز دەیکـرد وە(بیـدۆ) ی کوشت لەوانەیـە ئەمـە بـە پشـتگیری قـازان بووبێـت، کەنیسـەکانی موسـڵ بـە پارەیـەکی خەیاڵی پێشکەش کران کە نرخەکانیان بەرامبەر زێڕ بوو مەسیحییەکانی ئـەربیل دەسـتیان کرد بە پێشکەشکردنی ئەوەی کە لە لایەن داگیرکەرەکان لـە سـەریان دابـوون بـە رادەیـەکی زۆر قـورس ناچـار بـوو میتراپۆلیـت واز لـە بینایـەکان بهـێنێ و کاولیـان کـرد. لـە رۆژی ١٢٩٥/٩/٢٨ سێ کەنیسـەی زۆر جـوان وە زۆر بەداخـەوە ناوەکانیـان نـازانین بـە تـەواوەتی رووخێندران و لەگەڵ زەوی تەختیان کردن([٢٤٥]).

گەمارۆیەکی تر بە سەر قەلاَی ئەربیل سەپێنرا، لە کۆتایی سەدەکە، هۆکاری ئەو گەمارۆیە کەشتنی عەرەبێکە لەلایەن بەکرێگیراوێکی چیایی([246]).
ئەو پەردە پچڕا کە دەگەیشتە قەلاَکە، گەمارۆکە لە رۆژی دووەمی بەرۆژووی نەینەوایە(ماوەکە لە نێوان مانگی کانوونی دووەم و شوبات لە سالَدا ـ وەرگێڕ).
تاوەکو جەژنی خاچ(دەکاتە ناوەڕاستی مانگی ئەیلوول لە سالَدا ـ وەرگێڕ). باری مەسیحیەکانی دانیشتوانی شار لە ژێر قەلاَدا زۆر خراپ بوو لەبەرئەوەی قوربانی هەموو جۆرە کردەوەیەکی تووندو تیژی و تۆقاندن و تالاَن و برۆ و هەرەشەکردن دەبوونەوە([247]).
قازان پەشیمان ببۆوە لەو فەرمانە تووندو تیژەی دەرهەق بە مەسیحییەکان دەری کردبوو، وە بەزەیی پێهاتن و دلَی نەرم بووە لەبەر ئەو پاڕانەوەی کەوا لەلایەن(پەتریریك هوالاها) لێکرا جارێکی تر ئاشتیەکی کاتی بالَی بەسر ناوچەکە کێشا بە تایبەتی دوای بەرەلاَکردنی دیلەکان بەم شێوەیە قەلاَ بە مولَکی خۆیان مایەوە، بەلاَم ئەوە زۆری درێژە نەکێشا.

## کاتژمێری تووڕەیی لێدەدات

ئارامیەکی پڕ لە دلَەڕاوکێ بالَی بەسەر سالاَنی یەکەمی سەدەی چواردەهەم کێشا. لە سالَی ١٣٠٣، بەتریك یەهوالاها رۆژەکانی وەرزی زستانی وەك پیشەی هەمیشەیی خۆی لە بارەگای بەتریکی خۆی بەسەر دەبرد کە لە لایەن دنحاوە دروست کرابوو لە قەلاَی هەولێری تووندوتۆلَ. درێژەی کێشا ئەم رۆژانەی مانەوەی بەتریك لە زستانان تاوەکو سالَی ١٣٠٦ وە بە شێوەیەکی نائاسایی تاوەکو گەیشتە مانگی ئازاری سالَی ١٣٠٨، هۆکارەکان لە بەلَگە نامەکەدا پێمان نالَێن بە مانەوەی ناسروشتی بۆ ئەو ماوە درێژەیە، لەوانەیە هۆکارەکانی ئەوە بێت توانای نەبووە مەسروفاتی خەرجی سەفەرەکان و گواستنەوە بکا([248]).
لەلایەکی دیکە رەنگە بلَێن هۆکارەکان: هەژاری و نەداری بووە کەوا پەتریك تیایدا دەژیا لە ئەنجامی ئەو پارە زۆرەی کە لە دەرهێنانی(الخمر ـ شەراب) ی زۆر سەرف دەکرد کە پێشکەشی میرەکانی مەغۆلی دەکرد بۆ ئەوەی دۆستایەتییەکە بپارێزن و بەرگری پاراستنی بکەن.
بە شێوەیەکی فەرمی قەرزەکانی پەتریکی لە بودجەی سالَی ١٣٠٦ ـ ١٣٠٧ زۆر روون و ئاشکرایە بەلاَم هۆکارەکانیان دیاری نەکردووە. لە سالَی ١٣١٠ زەنگی کاتژمێری ترسناك لێیدا، وەك چەخماخە کاتێك تەقینەوەی گەورە روویدا و هات و هاواری مەسیحییەکانی بلاَودەبۆوە و وەك پەرش بوونەوەی ئاگر لە پووش و پەلاَشدا، هۆکاری رووداوەکەش،(وە یا

وەك راستی بیانگەیە) وە كۆتایی هاتن بە كاولكردنێكی تەواو كە بۆی نیە جارێكی تر بكرێتەوە. هات و هاواری هەندێ لە مەسیحیە خۆفرشەكان([249])، لە هەڵسوكەوتدا.

تۆپەكە كەوتە گۆڕەپانی عەرەبان دوای ئەوەی چەند كەسانێك لە خۆفرۆشە مەسیحییەكان ئەو كارەیان كرد لەلایەك، وە حاجی(دڵگۆندی) كە لە لایەن شێخ محەممەد حاكمی ئەربیل بە ئامادەباشی ساز كرابوونەوە براكەشی ئەحمەد لەلایەكی تردا.

ئەو دوانەی دوایی هاوپەیمانییەكیان هەبوو لە ناو قەلاَّكەدا دەژیان. ئەو هاوپەیمانە برای حاجی بوو، وە ناوی(ناسر) بوو، ئەو ئاگرەی هەڵیگیرساند بە هەڵچوونی میللی لە ساڵی ١٢٩٧ وە لە ئەنجامدا یەكێك لە تاوەرەكانی قەلاَّ نزیك لە دەرگا كەوتە بەر شالاَّوی هێرش كردن بووە هۆی كۆبوونەوەی خەڵكانێكی زۆر بۆ شەڕكردن بە چەك و تەقەمەنییەوە، سەرەڕای بانگەوازكردنی سەرباز و سوپای نیزامی پاڵەوانەكانی ئەم چیرۆكە لە ئاینی مەسیحی ئەمانە بوون: بەتریك یەهوالای كە جێگا و بارەگای لە ئەربیل بوو وە هەروەها سێ لە مەترانەكان ئەمانەن میترابۆلیتی موسڵ و میترابۆلیتی ئەربیل([250]).

وە مەتران حانیتا عەودویەشوع وە هەروەها رەبەن داود و رەبەن دنحا سەرۆكی دێری(ترعێل) فەرمان بەخۆفرۆشەكان درا، كە شوێنەكە جێبهێڵن، بە تەئكید ئەمانیش رەتیدەكەنەوە و فەرمانەكە جێبەجێ ناكەن، لە رۆژی ١٢ ی ئازار مەغۆلەكان پەتریكیان بەهێز دوورخستەوە بۆ(ترعێل) دوای ئەوەی كە ئاگاداریان كردەوە بارەكە بەرەو خراپتر دەڕوات لە سەر داخوازی و پێداگیری فەرماندە(سەوتی)بەتریك یەهوالاها داوای لە چیاییەكان كرد بۆ ئەوەی فەرمانەكە جێبەجێ بكەن بۆ چەند جارێك لە رێگای ناوبژیوانەكان كە بەكاری دەهێنان بۆ ئەوەی ئامۆژگاری چیاییەكان بكەن و پێیان بسەلمێنن بۆ ئەوەی بەدەنگ داخوازیەكە بێن و قەلاَّ بەجێبهێڵن. كاتێك فەرمانەكە جێبەجێكرا بە پێی داخوازیەكە ناسر خۆی ئامادە كرد بۆ قۆناغی هێرش بردن بەو بیانووەی كە دەورە دراوە و دەیانەوێت لە تاوەرەكەی خۆی دەربكرێت لە رۆژی دووشەممە رێكەوتی ١٦ ی مانگ بۆ جارێكی ترمیر بەتریكی ناچار كرد بەناردنی شاندێكی تر و بەكارهێنانی بەلاَّم ئەمجارەیان داخوازیەكە دیاری كرابوو: بە رێگەدان بۆ ناسر بە چۆڵكردنی تاوەرەكەی بە ئاشتیانە و ئارامی. نێردراوەكان بە هەندیان هەڵنەگرت و پەرتەوازە بوون و لێكترازان. رەبەن داود كوژرا و میترا پۆلیت ئیشوع سورەن توانی هەڵبێ بەرامبەر لێدانێكی زۆر بە دار و بەرچیغ ئازارەكانی بە هاسانی لەبیر ناكرێن چەند نووكە خەنجەرێك كە ئێش و ئازاری زۆرە و شوێنەواری لە جەستەی دیار بوو. لە كاتێكدا عەرەب و مەغۆلەكان خۆیان سازدا بۆ هێرشكردنە سەر قەلاَّ قەسابخانەكان لە بەشی خوارووی شار

دەکرا لە سەر قاچ و قول و بە خێرایی چوار کەنیسەکەی گەڕەکە نوێیەکان بەتەواوەتی تالآن و برۆ کران ئەمانەن: دوو کەنیسەی نەستۆرییەکان یەکێکیان بە ناوی ئیشۆعسورەن) ی شەهید ناونرابوو، وە ئەوەی تریان کەنیسەی مەعانیو(کەنیسەی سێیەمی پێ دەوترا.(کەنیسەی مارت مریەم) - وەرگێڕ) هی یەعقوبیەکان بوو.وە کەنیسەی چوارەم و دوایی هی ئەرمەنەکان بوو، کە تاکە کەنیسە ئەرمەن بوو لە ئەربیل([251]).
لەو کاتەوە قەلاّ گەمارۆی لە سەر توونـد کرا دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە عەرەب و کوردی چیایی هاتنە پاڵ هێزەکانی مەغۆل. گوندە مەسیحییەکانی دەوروبەر پێویست بوو لە سەریان باجێکی زۆر و گران بدەن بەرامبەر مانەوەیان لە سەر ئاینەکەیان وەك باجێکی دیاریکراو: خواردن و خۆراك و پارە و پوول و ئەمانە دەدرا بەو بانـد و تاقمە دز و جەردانەی داگیرکەران کە بەرەڵاگرابوون کاتێك دەچوونە سەردان و بە گوندەکانـدا دەسوڕانەوە ناوە ناوە. لەو ماوەیەی مێژوودا جاسلیق گواسترایەوە، لە(ترعێل) بۆ(بێت سەیادێ) بەبێ میتراپۆلیتی ئەربیل وە قەناعەتی پێ هێنا بۆ ئەوەی بچێتە بەغدا بە هاوڕێتی گەنجێك بۆ ئەوەی لەبەردەم پاشای بەغدا بپارێتەوە کە لە هەولێر چی روودەدات. (سەوتی) فەرمانـدە لە بەرامبەردا راپۆرتێکی لەسەر بارودۆخەکە بۆ بەغدا نارد بەلاّم بەبێ ئەوەی ئامـاژە بەو قەسابخانەیەی کە دەرهەق بە مەسیحییەکان دەکرێت. وەلاّمی ئۆلجیتۆ داخوازیەك بوو بۆ میر بۆ روونکردنەوەی ئەم رووداوانە. دوای گەیشتنی داخوازیەکە میر تورەبوو دڵی پڕ بوو لە رق و قینە و چوو بۆ هێرش و هەڕەشەکردنی پەتریك و بێزارکردنی بە قسەی ناشیرین و بریندار تا وای لێهات بەتریك دەستی لە خۆی بەردا و هەموو داخوازیەکانی میری جێبەجێ کرد، کە ئەمانە بوون: بەڵگەنامەیەك بە دەست خەتی خۆی بنووسێت بۆ شا و تێیدا کەوا دانیشتوانی قەلاّ بریتییە لە کۆمەڵە کەسانێکی چەتەو کاتێك حاجی دلکەنـدی ئەم بەڵگەنامەیەی کەوتە دەست خۆی بردیە لای شا. بەلاّم لە سەر ئەوەشەوە حاجی سەرنەکەوت و شکستی هێنا، بە دەرچوونی مەرسومێکی شاهانە گەیشتە ئەربیل لە رۆژی ٢٤ ی نیسان .... فەرماندەدادت بەلباوبوونەوەی ئاشتی و گەڕانەوەی بارودۆخەکە بۆ جاری جاران کە چۆن بووە.
بەهۆی داواکردنی لە(سەوتی) بۆ پارێزگای خۆی، دیار بەکر بە هۆی ئەو هەڕوگیفەی کە دوژمنەکان دەیانکرد ئەربیلی بەجێهێشت بەلاّم نەیدەویست ئەربیل بەجێبهێڵێت بەبێ ئەوەی سەرکۆنەی بەتریك بکات کە لە ناو قەلاّدابوو. کە بۆ جاری دووەم گەمارۆ خرایە سەر و دیسان قەتل و عامەکە دەستی پێکردەوە. ئەو کاتە دەنگوباسە نوێیەکان گەیشتنە دیوانی پاشایەتی باس لە خراپی وەزعی گەمارۆدراوەکان دەکات. ئەنجامی ئەو هەواڵە شا

فەرمانی دا بە دابینکردنی پارەو پولی لەبار بۆ چاککردنەوەی قەڵا و ئاگادارکردنەوە و سەرنجڕاکێشانی بەتریك بەهۆی ئەوەی کەمتەرخەمی و دەست یەکلاوکردنە لەگەڵ نەیاراندا لەو ماوەیەدا و لەگەڵ گۆڕانکاری ڕووداوەکان میتراپۆلیتی ئەربیل باوەڕی وابوو کەوا کارەکانی تەواو بووە، وە ئاشتی باڵی بەسەر ئەربیل کێشاوەتەوە و ڕووی کردە بێت سەیادێ دوای گەیشتنی، وە دۆزینەوەی ڕاستییەکان بارودۆخی ناوچەکە زوو هەڵچوو تووڕە بوو بڕیاری گەڕانەوەی دا ڕاستەوخۆ سەرەڕای زەحمەتی ڕێگا و بان و خەترناکییەوە، ڕووی کردە دیوانی پاشایەتی کە گواسترابۆوە بۆ بەری ڕۆژهەلات لە ولاتدا لە ڕۆژی ١٦ ی ئایار گەیشتە هەمەدان کە شا لە شار دەرچوو بوو.میتراپۆلیت لەوە گەیشتبوو کەوا خەترناکی هەیە لە ئەنجامی هەوڵەکانیدا کە چارەنووس و ژیانی جاسلیقی پێوە گرێدراوە، ئەم ڕاستیە ڕووناکە پاڵی پێوە نا بۆ ئەوەی هەوڵەکان بە جدی بکات و جورئەت بە خۆی بدات چوو بۆ ئەوەی داوای یارمەتی بکات لە فەرمانڕەواکان و بۆیان ڕوونبکاتەوە کەوا وەزعی بەتریك لە چیدایە. ئەمە کاری کردە سەر فەرمانڕەواکان و قسەکانیان گەیاندە شا یەکسەر شا بڕیاری دا بە تەکلیفکردنی گەورەی فەرماندەکان(تشۆبان) بایەخ بە بابەتەکە بدات. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو هەوڵانەی بە(تشۆبان) گەیشتبوون پێچەوانە بوو لە ڕێگەی برا بچووکی میتراپۆلیت کە لە دەستی تاوانباران ڕزگاری بوو، توانرا ڕفێندراوەکە ڕزگار بکرێت لەلایەك دواتر چەند نامەیەکی پێبدرێت و مۆری گەورەی لێبدرێت بە مۆرەکانی فەرماندەکان کەوا فەرمان دەدەن بە پارێزگاری مەسیحییەکان. لەو کاتەدا وە لە ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی ٢٦ ی حوزەیران عەرەبەکان بەتریکیان بۆ جاری دووەم قەناعەت پێ هێنا کەوا پێویستە بڕیاری چۆلکردنی قەلا جێبەجێ بکات. کاتێك دانیشتوان فەرمانەکەیان جێبەجێ دەکرد بۆ خۆئامادەکردن بە چۆلکردنی قەلا کۆمەڵی یەکەم کەوا ژمارەیان ١٥٠ پیاو و ژن و منداڵ بوون بۆ چوونە خوارەوە بێزکاریان پێکردن و ژمارەیەکیان لێ کوشتن وە ژمارەیەکیان ڕفێنران کاتێك بەتریکی یەهوالاها ئەم کۆتاییە مەترسیدارە بە ڕۆڵەکانی دەکرێت بڕیاری هاتنە خوارەوەی داو مەترانەکان و هەندێك لە ڕەبەنەکان و قەشەکان بەشداریان کرد بە کۆمەڵ لەگەڵ چارەنووسی گەلەکەیان و چوونە ڕێزی شەهیدە بێتاوانەکان. ڕەنگە ئەو چارەنووسە کۆتایی بێت بۆ ژیانی هەموو ئەوانە ئەگەر پەلە کردن نەبووایە لەلایەن میتراپۆلیت لە داواکردن لەبەرپرسی پاسەوانەکان کە یاوەریان بوون فەرمانەکانی مۆرکراویان بەرز کردبۆوە لە هەموو لایەك بە دابینکردنی پاسەوان بۆیان ئەم خێراییە لە داواکردن لە ئەنجامی دڵەڕاوکێ بوو، کە ڕەنگە کارێکی خوێناوی ڕوویدات، وە لەوانەیە لە ڕێگا تووشی ببێت بەڵام داواکارییەکە دیاریکراو بوو بە

نـاردنی نێردراوێـك كـە پێیـان بڵێـت دەربـارەی فەرمانـەكانی شـا كـە فـەرمانی داوە بـە پاسەوانیكردنی مەسیحییەكان. گەیشتنی نێردراوی بەرپرسی پاسەوانەكان لـە رۆژی شـەممە پێش رۆژئاوابوون بوو، هەواڵەكەیان پێڕاگەیاند. ئەو كاتە چەوساوەكان ناچار بـوون رێگەی بەتریك و گروپەكەی بگرن بە چۆڵ كـردن و رۆیشـتن بـەرەو عـەنكاوە بۆ ئێـوارەی هـەمان رۆژ لە رۆژی یەكشەممە واتە ٢٨ ی حوزەیران میترا‌پۆلیت گەیشت بـە یـاوەری پاسـەوانەكانی مەغۆل بە فەرمانە مۆركراوەكان لەگەڵیاندا، بووە هـۆی خۆشحاڵی و رەوینـەوەی دڵەڕاوكێ. سـەرەڕای فەرمانـەكانی شـا گـەمارۆدراوەكان لـە سـەر كەللـەڕەقی خۆیـان مانـەوە و هـیچ سەریان دانەنوانـد بەرامبـەر ئـەو توونـد و تیـژی و تۆقاندنانـەوە. برسـیتی گـەمارۆدراوەكان لەلایـەك و ئـەو بەڵێنانـەی كـە ناسـر دابـووی لەلایـەكی تـرەوە ناچـاركران كـەوا باوەڕیـان بەچۆڵكردن پێ بهێنن ئەو كۆمەڵە چەتە و رێگـرە بـەخۆیان و خێزانـەكانیان یەكـەم بـوون لـە هاتنـە خـوارەوە. وە رێگـەیان دان بـڕۆن بـەرەو عـەنكاوە بـە ئاشـتی. بـۆ رۆژی دواتـر بـە زۆرداری دەریان كردن و پاكتـاوی تـەواویان كـردن بـە دانـانی قەسـابخانەیەكی مەترسـیدار و هـەموویان كوشـتن. ئەمـە رۆژی چـوار شـەممە بـوو لـە یـەكی تـەمموزی سـاڵی ١٣١٠ رۆژی فـەرمی بـە كۆتـایی هێنـان بـە هێرشـكردنە سـەر قـەڵا دوای ئـەوەی كـە دوژمنـە سـەر سەختەكان كردیان و هەرچی مابوونەوە كوشـتیان و گیانلەبـەریان نەهێشت. ماڵـەكان تـالان كران و موڵك و سامانەكانیان هەموو برد و دەستیان بەسەردا گرت و ئەوەی كـە شـاردرابۆوە ئەویشیان تالان و برۆ كرد و چیاییەكان هەموو ئەو كەسانەی زینـدوو بـوون لـە سـەر قـەڵاو شوورەكان دا فڕێیان دانە خوارەوە وە لە خوارەوە بە شـیرەكانیانەوە پێشوازیان لێـدەكردن و كۆتاییان بە ژیانیان دەهێنـا بـە دڕنـدەترین شـێوە و ئـەتك كردنیـان. ئـەو زوڵـم و زۆرداریـە ناچـاری كـردن كـە هەنـدێكیان ژن و كچـە لاوە جوانـەكانیان بفرۆشـن وە یـا ببیەخشـن بـۆ هەرچـی كەسـێك كـە رووی تێكردبـان وەك دیـاری. لـەم واقیعـە تفـت و تاڵـە و كۆتاییـە مەترسیدارە دەتوانین لـە وتـەی بـەتریك پـەهوالای تێبگـەین لـە دوای بێهیـوایی كـە تووشـی هاتبوو هـاواری كـرد بـە دڵ سـووتاوی داخـەوە(مـن زۆر داخ دەخـۆم لەبـەر ئـەوەی خزمـەتی مەغۆلم كردا).

## لە دوای گەردەلوول:

بـەتریك لـە(بێـت سـەیادی) مایـەوە هـەموو كاتـەكانی لـە پێنـاو كۆكردنـەوەی زێـڕ بـوو بـۆ ئـەوەی پێشكەشـی بكـات وەك دیـاری بـۆ هـەر كەسـێك كـە یاریـدەی بـدات هـەروەك باسـی دەكات. دواتر بە تەواوەتی ئەربیلی بەجێهێشت و لە رۆژی ٨ ی مانگی تەمووز لـە سـاڵی ١٣١٧

کۆچی دوایی کرد لەو دێرەی کە دروستی کردبوو لە(مەراغا) کە ئەم دێرەش کەوتە بەر شالآو و رووخاندن. ئێسك و پروسکی یەهوالاها گواسترایەوە بۆ گۆڕێك لە نزیك دێری(ترعێل) نزیك ئەربیل لەناو جەرگەی ئەو مەسیحیەتەی کە خۆی لە پێناودا بەخت کرد بە هەموو ئازارەکانیەوە.

لە دوای ئەو ئەبرەهام یووسف هاتە شوێنی لە دوای گواستنەوەی لە کورسی میترابۆلیتی موسڵ بۆ کورسی میترابۆلیتی ئەربیل بە نازناوێك نازانین ئەومیە وە یا ئەویترە لەوانەیە یەك لە یاریکەرەکان بێت لە رووداوە ناخۆشەکانی ساڵی ١٣١٠.

بوو بە بەتریك لە ساڵی ١٣١٨([٢٥٢]). پێدەچێت رۆڵی ئەو لانەچووبێت، وە ئەو ناوەی کە هەڵیبژاردووە بە تایبەتی لەو کاتەدا، بە درێژی بۆمان باس دەکات وە دەنگوباسی زۆرمان پێدەبەخشێت کە ئەوەی کرد بە یووسف ـ تیماتیۆس دووەم پێشەنگی بوو(مەبەستی لەمە تیماتیۆسی یەکەم) ە.

لە تواناماندایە باوەڕ بکەین هەمان میترۆپۆلیتی بەتوانایە کە چووە ناو ئەو خەتەرناکە زۆرە و غیرەتی بەخۆی دا کاتێك لەبەردەم پیاوانی دەوڵەت وەستایەوە لە هەوڵی رزگارکردنی پەتریك و گەلەکەی. کەواتە بە پێویست دەزانرێ کەوا یووسف میترابۆلیت بووە لە ساڵی ١٣١٠ وە بەمە دەردەکەوێ ئیشووعسورەن لە دوای ئەو هاتۆتە سەر کورسی موسڵ([٢٥٣]).

باس لە هەڵبژاردنەکانی یووسف دەکرێت لە دانیشتنی لە سەر کورسی بەتریکی زۆر مەدحی دەکرێت لە فراوانی ژمارەیەکی زۆر لە زمانەکان وە بۆ کاتەکان و زانیاری و زانستی زۆرەوە دوای هەڵبژاردنی بە بەتریك تیماتیۆسی دووەم لە هەولێر مایەوە و کورسیەکەی تیا جێگیر کرد تا کۆچی دوایی لە ساڵی ١٣٣٢([٢٥٤]).

ئەوەی بەدواداچوون و باس لێوە دەکات لە نووسینەوەی مێژوو(ابن العبری) بە ناوی ئەربیل بۆ سێ جاری تر هاتووە کاتێك باس لەو ماوەیە دا دەکات، نیوەی دووەم لە سەدەی چواردەهەم. لە ساڵی ١٣٦٩، شاری ئەربیل لەلایەن مەفرەیان ئەبرەهام ئەسناس سەردان کراوە کە لە بەغدا گەڕاوەتەوە کۆمەڵێك یاوەری هەبووە. سەرکەوتووە بۆ قەلا بۆ سەردانی فەرماندە میر یەحیا بە پێی نەریتەکان کەنیسەی یەعقوبییەکان لە قەلا کە بە ناوی ماربەهنام ناونرا، ئاوەدانکراوە و چاککراوەتەوە، مەفرەیان ماوەتەوە تیایدا تا وەکو جەژنی گەورە(عید الفصح ـ جەژنی هەڵسانەوە)([٢٥٥]).

دواتر میر یەحیا کۆچی دوایی کردووە و کوڕەکەی بەدرەدین محەمەد) شوێنی گۆتۆتەوە. مەفرمیان داوای لە بەدرەدین محەمەد کردووە کە لە ئەربیل بێت لە دوای ناچارکردنی بەجێهێشتنی کەرەملێس([256]).

بۆ بەدواچوونی ئەو بابەتە تکایە تێبینی بکە کەوا جاسلیق دنحای دووەم ۱۳۳۲ تا دوای ساڵی ۱۳٦٤ ئەویش ئەربیلی بەجێهێشتووە وە بارەگای لە کەرملێس جێگیر کردووە لە ساڵی ۱۳۷٥ کەنیسەی گەورەی یەعقوبییەکانیان تێك و پێك دا و کاول کرا([257]).

وەك لە پێشەوە باسمان کرد یەعقوبییەکان تەنها کەنیسەیەکیان هەبوو بە ناوی مارپەهنام لەناو قەڵا. وە کەنیسەیەکی تر بە ناوی پاکیزە ـ العذراء) لە گەڕەکی خوارەوە. ئەو کەنیسەیە لە ساڵی ۱۳۱۰ وێران کراوە ئێمە نازانین کامیان گەورەتر بووە لەو دوو کەنیسەیە کە وێران کراون([258]).

لە سەدەی چواردەهەم وە لە مێژوویەکی دیارینەکراو لە سەر کورسی میتراپۆلیتی تایبەت بە شارەکە دانیشت بە ناوی(یۆحەنان کوڕی یاك) باس دەکرێت کەوا خەڵکی ئەربیل(هەولێر) بووە، واتە ئەربیلی هیچ شتێك دەربارەی نازانرێت تەنها وەك دانەرێك بۆ سەردولکەی ئاینی نەبێت([259]).

## کۆتایی:

لێرە بە دواوە، رۆژی هەولێر دەبینین لە رووی مێژووییەوە روو لە رۆژئاوابوون دەکات وە هیچ نابێت تەنها هەندێك ناو نەبێت کە دیارن و دەردەکەون بە گەشاوەیی لە ناو هەورەکان کە ئاسمانەکەی داپۆشیوە و قسەی خۆمانی لە سەر دەکەین لە سەر ئەو رووداوە گرنگانە و چیرۆکەکان کە گوێمان لێ دەبێت یەك بۆ یەکی گێڕاوەتەوە وەك تۆمارگە. بەختەوەر دەبین ئەگەر پەیوەندیەك هەبێت لە نێوان ناوەکان و رووداوەکاندا. زۆر بە داخەوە دەڵێین: پێویستە لە سەرمان رازی بین بەو زانستە کەمە و وشکی سەرچاوەکان مادام ئەو جۆرە واقیعە هەیە. لە ساڵی ۱٤۲٤(میر ئەسبەهان) هێرشێکی بۆ سەر موسڵ و ئەربیل کرد بەشێك لەم رووداوە بە درێژی نووسراوە لەلایەن یەکێك لە نووسەرەکانی ئەکلیرۆس([260]).

دەقەکانی ئەم دەستنووسە کەڵکی زۆری هەیە بۆ مەسیحییەکان لەبەر ئەوە زانیاری تیایە. لە سەدەی پازدەهەم، رێزمان نووس و نووسەری ئەربیل بەناوبانگ ئیشۆعیاب کوڕی موقەدەم(دەرکەوت)([261]).

ئەو بەڕێزە مەترانی(داسن) بوو لە ساڵی ١٤٢٦ ـ ١٤٢٧ دواتر میتراپۆلیتی ئەربیل لە ساڵی ١٤٤٣، وە هەروەها لە ساڵی ١٤٥٢. وەك دەردەکەوێ بە تۆما بانگ دەکرا. جا لە کاتی لە ناوهەڵکێشانا وە یا ئەو کاتەی میتراپۆلیت بووە. ئیشوعیاوێکی تریش هەیە و نازناوی(برماما) یەو بەڵێنی پێدراوە سەرکەوێت بۆ کورسی بەتریکی دوای ئەوەی کە لە سەر کورسی میتراپۆلیتی ئەربیل کاری کردووە، لە ژێر ناوی(شەمعوونی هەشتەم)([٢٦٢]).
لە دوای ئەو کوڕی خوشکی وە یا برای ئەم کورسیەی گرتۆتەوە. بۆیە دنجا برماما دەبێتە دوژمنێکی سەرسەختی(سولاقا) یەکەم بەتریکی کاسۆلیکییە، هەندێك برماما تاوانبار دەکەن کەوا هاندەر بووە بۆ کوشتنی سولاقە. میتراپۆلیتی ئەربیل ئەو کات یەکێك لەو سێیانە کەوا لە سەر کورسی میتراپۆلیتی ئەربیل دانیشتن وە لە سەر مەزهەبی نەستۆری مانەوە، وە لەوانە بەشداریان کردووە لە هەڵبژاردنی بەتریك. لە ساڵی ١٥٥٢ سۆلاقە هەڵبژێردرا بۆ بەتریکی. لەو پرسیارە: ئەم میتراپۆلیتە چ ناوێکی هەبوو؟ دەبینین کەوا([٢٦٣]).
Ander Masius بە(ئادەم) ناوی دەبات بە پێی ئەو نامەیەی بۆ Lequien ناردووە، بە پێی ئەو بەڵگەنامانەی لە سەر ئەو هەڵبژاردنە هەیە([٢٦٤]).
گومان دەکرێت کەوا ئەو ناوەی ئادەم کە نووسراوە لە دەقەکاندا دەگەڕێتەوەبۆ پیاوێکی عەلمانی لە دەوڵەمەندەکان، دیاری کراوە بۆ هاوڕێیەتی کردنی هەڵبژێردراوەکە بەرەو رۆما. میتراپۆلیتی ئەربیل دوو یاریدەدەری هەبوو یەکەمیان ئەسقەفیەی سیراوە، ئەوی تریان هی(عەنکاوە) ناوی لە زنجیرەکانی دا هاتووە ـ کە رەنگە لاوەکی بێت لە گرنگیدا ـ تایبەت بە ئەبرەشییەکانی بۆ ساڵی ١٥٦٢ بە پێی ئەو لیستەی کە لەلایەن عەودیشی چوارەم ماڕون داندراوە، بەتریکی موسڵ و نەیارەکەی بەتریکی دێری رەبەن هورمز(دێری رەبەن هورمز بارەگای سەرەکی بەتریکی بووە بۆ ماوەیەك ئەو ماوەیە بە ناکۆکیەکی تاڵ و تفت لە نێوان ئەو دوو بەتریکە دەردەکەوێت ـ وەرگێڕ. دواتر دەبینین ئەوەی کە گومانمان لێیەتی لەو لیستە([٢٦٥]).
ئەو کات باری مەسیحییەکانی ئەربیل گەشاوە نەبوون لەبەرئەوەی کۆچکردنی بەردەوام هەبوو، هەندێك خێزانی ئەربیلی لە مەسیحییەکان گەیشتنە(جزیرەی بن عومەڕ) ساڵی ١٥٦٦([٢٦٦]).
وە یا بۆ ناوچەی(سوما)([٢٦٧]).
لێرەدا پێویستە ئاماژە بکەین بۆ ئەو ئامارەی کەوا بڵاونەکراوەتەوە([٢٦٨]).

دەقەکەی ئەمەیە: ئەربیل مەترانێکی هەبووە بە ناوی ئیسرائیل بە رەچەڵەك خەڵکی جەزیرە بووە لە ژێر دەسەلاتی دا چەند قەشە و شەماشەیەك هەبووە ژمارەیان پێویستییەکانی پڕ کردووە وە دوو کەنیسەی هەبووە یەکەمیان ناسراوە بە(كنيسة الشهداء) کەنیسەی شەهیدان.

بەلام دووەمیان لە سەر ناوی(مارئیسحاق) ناونراوە. ژمارەی باوەڕدارانی دەگەیشتە ۱۲۰۰ خێزانی نەستوری، ئەمە لە سەردەمی بەتریك(مەتی) لە ساڵی ١٦١٠.

ئەگەر بەو ئامارە کەمە باوەڕ بهێنین، ئەوە بە چاکە بۆمان دەگەڕێتەوە. داخمان زۆرە لەبەرئەوەی ئێمە نازانین ئەو مێژوو نووسە بەڕێزە لە کوێ ناوی بەتریك(مەتی) دۆزیوەتەوە بۆ ئەوەی تۆماری بکات لە ساڵ ١٦٠٠؟ بەلام ژمارەکانی ئەو ژمارانە باوەڕیان پێ ناکرێت راست بن ئەو حوکمەکان لە سەر بەشی دووەمی دەقەکەش چەسپ دەبێت کە دەڵێت بۆ نموونە:

(لە حیلە ۲۳۰۰ خێزانی مەسیحی هەبوو)([٢٦٩]).

لە ساڵی ١٦١٥؟ لە سەردەمی بەتریك(داوود سوور)(؟) هەموو ئەو قسەوباسانەی ئێمە تووشی بێتاقەتی دەکات وە یا خەرفایی مێشکی هەندێك لە ئەکلیرنووسەکان کە خۆیان بەزل زانیوە زۆر نەزان بوون).

چ روون دەبێتەوە کەوا خەلافەت لە سەر کورسی میترا پۆلیتی ئەربیل بە شەمعوون کۆتایی دێت لە ساڵی ١٦٠٧ دا هاتووە([٢٧٠]).

بەترکی رەبەن هورمز(ئیلیای هەشتەم) لە لیستەکەیدا ئاماژەی پێنەداوە کە بۆ پاپای ناردووە لە ساڵی ١٦١٠ بە ئەبرەشیەی ئەربیل. ئەوەی ئامازەی پێ کردووە ئەبرەشیە خۆی بووە(ئەبرەشیەی بەتریکی) درێژ دەبێتەوە تا ئەو شارە([٢٧١]).

هەروەها باسی ئەو کورسیە ناکات لە لیستەکەیدا، لیستی هەمان پەتریکی تایبەت بە ئەبرەشیەکانی برادەرەکانیدا بەبەتریك شەمعوونی دەیەم لە قۆجانۆس. دوا ناو بۆ مەسیحی ئەربیل کە ناسراوە(عەسکەر کوڕی کوچکوچ) بووە کە قەشەی ئەربیل بووە. ناوی ئەو قەشە دەدۆزینەوە لە دەستنووسی پارێزراو لە(کەمبرج) مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٦٧٧([٢٧٢]).

ناوی هیچ مەسیحیەك وە یا کەنیسەیەك دوای ئەوە لە ئەربیل نەهاتووە لە سەدەی ١٨ و ١٩ەدا جگە لە گوندێکی بچووك و دراوسێ پێی دەڵێن(عەنکاوە). ئەم گوندە ئێستا شارۆچکەیەکی گەورەیە و ژمارەی مەسیحییەکان لە گەشەکردندایە ـ وەرگێڕ).

جگە لە عەنکاوە هیچ مەسیحیەکی تر لە حدیابی ناوەراست نادۆزینەوە کۆمەڵەی بچوك بچوك لە مەسیحی نەستووری و کلدانی کە لە ناوچە شاخاویەکان نیشتەجێن لە باکووری خۆرهەلات واتە لە: باتاس و حەریر(زۆر بەداخەوە ئێستا هیچ مەسیحیەك لەو دوو شوێنە نەماوە و نیشتەجێ نیە بەڵکو لەبەر بارودۆخی ناوچەکە کۆچیان کردووە ـ وەرگێڕ).
وە لە شەقلاوە و کۆیە(تاکە گوندی مەسیحی کە لە رۆژهەلاتی ئەربیل(هەولێر) هەبێت گوندی هەرمۆتەیە(ئەرمۆتە) ئێستا زیاتر لە ١٥٠ خێزانی مەسیحی تێدا نیشتەجێیە ـ وەرگێڕ).
هەموو ئەوانەی تر لە سالاخ وەیا لە ئەبرەشیەکانی سنوورەکاندا.
لە سەدەی بیستەم گەشەکردنێك لە ناو مەسیحییەکانی نوێ دەردەکەوێت کە خۆی لە فەرمانبەر کۆچەر و ئاوارەکانی عەنکاوە دەبینێتەوە. رەنگە هەندێك نووسین و شوێنەوار مابێت دەستی کاولکاری و فەوتاندن نەیگەیشتبێت کە گوێمان لێی دەبێت کە تاوەکو ئێستا دەبینرێت(بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ) پێیان وتم کەوا شوێنەواری دێرێك هەیە لەلای راستی منارەی موزەفەریە. وە هەروەها پێیان وتم کە لە شارەکەدا جگە لەو کەنیسانەی بینیمانن، قسەمان کرد لە سەر دوو کەنیسە دەگەڕێنەوە بۆ(مارشەلیتا - مارشلێتا) وە(مارگۆرکیس)؟. Victorcuinet([٢٧٣]).
فیکتورکوینت دەڵێ: لە کۆتایی سەدەی ١٩ هەم نووسنی سریانی لە سەر بینایە کۆنەکان دەبینرا، وەك بنکەی سەربازی بەکاردەهێنرا ئەمڕۆ هەمووی بزر بوو. پێشتر رای خۆم لە سەر دا روون کردبۆوە کە وتبووم شوێنەواری لەو جۆرە چاوەڕێی سەردان دەکات ئەوانەی بایەخ دەدەن و پسپۆڕن بۆ ئەوەی بێن پێش ئەوەی لەناو بچن. بەشێکی تر دەڵێ کەوا کەنیسەیەکی نەستووری(مریەمی پاکیزە) داگیرکراوەو مزگەوتی قەڵا. ئەمە کارێکی زەحمەت نیە هەرگیز بەلام دەتوانرێ شوێنەواری ئەو کەنیسەیە ببینرێ وە یا مێژووی چاککردنی دوایی کە لە ساڵی ١٩٥٨ کراوە لام وایە ئەم قسەیە وە یا بوختانە وە یا قسەلۆکی سادەیە.
باس لە(مارقەرداخ)([٢٧٤]). دەکرێت. لەبەرامبەر دەرگای قەلا دروست کراوە بەبێ ئەوەی ئاماژە بەوە بکات بەلای تاوەرکە بووە کەوا لەلایەن(ناسر) بەکار دەهێنرا. شارەوانی هەولێر هەڵسا بە کردنەوەی رێگەیەکی شەقامێکی فراوان دوای ئەوەی دەرگای سەرەکی قەلای تێکدا و بەناویدا تێپەڕ بوو. ئێمە وەك مێژوونووس داخی بۆ دەخۆین کە کارێکی لەم جۆرە رێگامان پێ نادا بۆ بەردەوام بوون لە لێکۆڵینەوەی باسەکەمان دا . لە کۆتاییدا

ئاماژە بۆ ئەو شوێنەی ئێستای(محطة - شەمەندەفەر) دەکەین ئەویش ئەماوە لە سەردەمی رژێمی گۆڕبەگۆڕ کراوە بە بەندیخانە وە تاوەکو ئێستا - (وەرگێڕ).
لە نزیک ئەوێدا پەرستگەیەکی بچوك هەیە و گومەتێکی بچوکی هەیە بەناوی (یەزداندوخت) ناونراوە، ئەگەر بپرسین ئایا ئەم بەشە لە پەرتووکەکەدا کۆتایی هەیە؟ وەلأم ئەمەیە:(رووداوەکان پێمان دەڵێن لە سەر خۆیاند ا شاری ئەربیل بەردەوامە لە رێچکەی مێژوویی کەوا کۆنترین شارە لە جیهان دا) قەلأیەکی دەورە دراوە بە خانووی نوێ و پێدەکەنی بە باخچەی زۆرو زەوەند بەلأم خۆی وەك خۆیەتی دەبینرێت وەك ژنێکی گەورە و بە هەیبەت دانیشتووە سەرپەرشتی دەوروپشتی خۆی دەکات لە دەشتی فراوان و کاکی بە کاکی لە هەموو لایەکدا بەلأم دەمینێینەوە بە بزرکردنی خاچ(الصلیب) لە بەرزی ئاسمانەکەیدا. وە بۆ ئەوەی ئامادەیی مێژوویی لەبیر نەکەین بۆ سەدەکانی داهاتوو هەڵساین بە نووسینی ئەو چەند لاپەڕەیە پڕشنگدارە لە هەندێکی وتارێکیش لە هەندێکی تردا. هەموو ئەوانە بۆ بەرز راگرتنی پاڵەوانەکانی و قوڵی و ئایین و باوەڕدارانی و شەهیدەکانی لەلایەك وە فێربوونی کولتوور و فەرهەنگ کە بۆمان بەجێماوە لەوانەوە بۆ ئێمە لەلایەکی تردا.

## دەشتی دیجلە رێگەی رۆژئاوا

لە حدیاب و دوو رێگەی لە باکوورەوە بۆ باشوور تێپەڕ دەبن. ئەو سەفەرچیەی کە لە نەینەوا بەرەو بابل دەچوو وە یا لە موسڵەوە بۆ بەغدا رێگای رۆژئاوای دەگرت بە لێواری رۆژهەلأتی رووباری دیجلە. بەلأم کاتێك سەفەرچی دەیویست بەناو خاکی حدیاب دا تێپەڕ بێت، سەرەتا دەبوو لە زێی گەورە بپەڕێتەوە. بەشی زۆری ئەو پەڕینەوەیە لە گوێڕ دەبوو، کە مەڵبەندی شارەکەیە بە دووری (١٥) کیلۆمەترە لە خاڵی بەیەکگەیشتنی دیجلە بەزێوە کە پێی دەڵێن(المخلط - تێکەڵبوون) لەو شوێنە قایەغێك هەبوو هی کارگێڕی گشتی حکوومەتی عێراقی بوو، بۆ گواستنەوەی ئۆتۆمبێل بۆ لایەکی تر بەکاردەهێنرا ئێستا پێویستە لە سەرمان جێگەی پردی شا دیاری بکەین کە لەو شوێنە بوو لە سەدەی چوارەمی پێش زاینی وە تاوەکو سەدەی هەشتەمی زاینی. بە تەئکید ئەو پردە - پردی شا، شایانە - دەکەوتە ناو رێگەی پاشایەتی. ئەو زانیاریانەی دەربارەی ئەو رێگەیەمان هەیە پێدەچێت ئەو نازناوەی(پاشایەتی) لە سەردەمی ساسانیەوە بووبێ، تایبەت بووە بەو رێگەیەی دەکەوێتە رۆژهەلأت، کەواتە پرسیاری لەبار ئەوەیە: ئایا هەمان خاسیەت دەدرێتە رێگەی رۆژئاوا؟ لێرەدا تەنها یەك ئاماژە هەیە بەباشی بەکەڵکمان دێت، سەرەڕای

ئەوە هەندێك جێگە هەبووە ناسراوە بە(تجوباد شولتانا - واتە ڕێگەی سولتانی) ئەم ڕێگەیە دەچووە ناو دەشتی نەینەواو بە زەویەكانی قەرەقوش و كەرەملێس تێپەڕ دەبوو([٢٧٥]).

دواتر شوێنەواری ڕێگەكە بزر دەبێت و هیچی لێ نابینرێت كە باسی بكەین. ئەوەی كە پەیوەندی بە پردەكە هەیە ئەوە ڕووندەكەمەوە: من بۆ چەند ساڵێك بە دوور و درێژی لێكۆڵینەوەم لە سەر شوێنی ئەو پردە كرد لەو ناوچەیە لە زێ، بەلأم هەموو ماندووبوونەكەم لەگەڵ با ڕۆیین شوێنەوارناسەكان پێش من لێكۆڵینەومیان لەسەر كردووە بێ سوود بووە. شوێنەوارناس(فیكتۆرلاس)([٢٧٦]).

پشتی بەستووە بە سەر ئەو تیۆرەی كە گریمان(بەرتلە) جێگەی(كۆكامیل) ی مێژوویییەوە، لەو باوەڕە دا بووە كە جێگەی پردەكەی دۆزیوەتەوە لە Lycos كە باس كراوە لە ڕووداوەكانی شەڕی Arbeles ئەو جێگەیەی دۆزرایەوە دەكەوێتە خوار خاز و دەڕژێتە زێی گەورە لە مێژوودا ناسراوە بە Bumados بە كردەوە، ئەوەی(بلاس) دیتبیتیەوە بریتیە لە: بینایەك لە بەردی پەیكەرسازی وە تەنها لەلایەكی ڕوبارەكە دا. لەگەڵ تێبینی كە ئەو بینایەیە ئاماژە بەوە دەكات كەوا بینایەی ئاشێكی ئاو بووە زیاتر نەوەكو بنكەی پردێك.

كونسوڵ ـ شوێنەوارناسی ناسراو، دەلیلێكی بەڵگە داری بۆ جێنەهێشتووین كەوا باوەڕ بكەی پرد بووە بەلأم ئەوەی بۆ بەجێهێشتووین كە تاوەكو ئێستاش زیندووە و دانیشتوانی گوندی ئەبو شیتایە دەیگوازنەوە(دەكەوێتە دە كیلۆمەتر باشوور - ڕۆژهەلأتی گوێڕ) كە تاوەكو ئێستا باوەڕیان وایە بە هەموو متمانەیەكەوە بە وتەكانی(بالیۆز) نازناوێكی خۆجێییە دانیشتوانی گوندەكە بۆ(قونسڵ) تا ئێستاش بەكاری دێنن - وەرگێڕ) كە پێی وتون باب و باپیرانتان لە كۆنەوە لەو جێگەیەوە پردێكیان هەبووە.

لە ڕاستیدا لە سەرمانە كەوا یەكلایی بكەینەوە و شوێنی ئەو پردە دیاری بكەین لەو جێگەیەی كە ئاماژەی بۆ كراوە([٢٧٧]).

J.C.Rich زۆربەی گەشتیاران لە سەدەی نۆزدەهەم پێیان باش بوو سەفەر بە ڕێگەی هەولێرەوە بكەن و بچن بۆ كەلك([٢٧٨]).

لەوێوە تێپەڕین. جگە لەمە، جەندرمەكانی توركیا گەروی(صفیا - سفەیا) بەكار دەهێنا كە دەكەوێتە باشووری ئەو شوێنەی ڕوباری خازر دەڕژێتە ناو ڕوباری دیجلەوە ڕاستەوخۆ بە پێی ڕای Felix Jones ئەمە شوێنی پردەكەیە بەبێ هیچ گومانێك([٢٧٩]).

وە لەوێوە دە هەزار چەكدار تێپەڕیوە هەر وەك(زمینەفون) ی مێژوونووس ئاماژەی پێ دەدا كاتێك كە لە زێ پەڕیوە. ئەم رایە زیاتر رێی تێدەچێ، لە سەر تەئكیدكردنەكەی كۆلۆنێل A.Boucher ساكارە([280]).

وە هیچ گومانێكی نەكەوتۆتە ناو لەو گریمانەی پەڕینەوەی یۆنانیەكان لە شوێنێكی نزیك لە رێژگەی زێی گەورە لە دیجلەوە، وە بەبێ ناچار بوون لە پەڕینەوەدا واز بێنن لە پێكهاتەی چوار قۆڵیەكەیان! دەڵێن، ئەگەر لێرەدا پردێك هەبووایە بۆ پەڕینەوە پێویستی دەكرد بە بوونی هێمایەك لە بابەتەكە لەلایەن زمینەفوونەوە لە واقیعدا لە رابردوو ئەو كاتەی زێ لە كەمترین ئاست بووە، تێپەڕینی راستەوخۆ هەبووە([281]).

لە خوار(كوشاف)([282]).

ئەوەی یەكەم جار دەیبینین لە نزیكەوە ئاوپرژەكە لە هەرێمی حەدیاب ئەوەیە: دێری(برقانا) دواتر دەگەینە(حەدیسە) ـ مەبەستی حەدیسەی موسڵە(وەرگێڕ). ئەو ژمارانەی كە بە سەفەر لە نێوان دوو زێیەكەی بە پێی بەكارهێنانی لای عەرەبەكان([283]).

بریتی بووە لە(١٢) فرسەخ(قۆناغ) مەبەستی(٩) كاتژمێر بە پیادەیە، لە سەر رێگەكە گوندێك هەیە بەناوی(ئیسترینیا) بەڵام دوا شار لە هەرێمی حدیاب(بەوازیج) ە كە مەڵبەندێكی سنووری هاتوچۆی تێدا بووە و دەكەوێتە ئەو ناوچەیەی پێش جێگەی تێپەڕبوونی زێی بچوك وە پێش قۆناغی(ئەسن ـ سن) كە مەڵبەندەكەی دەكەوێتە لای باكووری خۆرئاوای(بێت گەرمای ـ بێت گەرمیان)([284]).

ئێستا هەوڵ دەدەین باسی ئەو شوێنانە بكەین كە دەكەونە سەر ئەو رێگەیە و بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە مێژووی كەنەسییەوە هەیە.

٢ ـ دێری برقانە و دێری ئاجەر:

هەروەها پێی دەڵێن(بارقانا) وە یان(بارقا) بڕوانە سەرچاوە كلدانیەكان(بارقانا) وە یا(برقانا) لە سەرچاوە عەرەبیەكان([285]).

ئەم دێرە بەناوبانگە لە سەدەی هەشتەم زاینی لە سەر دەستی(حەننان ئیشۆع) ی حدیابی وە یا(عەننان ئیشۆع) دروست كراوە([286]).

ئەم بینایە دروست كراوە بۆ ئەوەی ببێت بە كەنیسە وە یا مەزارێك لە سەر ناوی(ماریۆحەنای ئینجیلی)([287]). (ماریۆحەننای ئەلحەبیب)، وەرگێڕ.

بەڵام ئەو ناسنامەی كە پێی ناسراوە بە بارقا بۆ یادكردنەوەیەتی لەلایەن خەڵكی ئەو گوندەی كە بەو ناوچەیەوە یارمەتی زۆریان داوە بۆ تەواوبوون و دروست كردنی ئەو دێرە ماڵداری ئەو دێرە تاوەكو نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی زاینی دەگەڕایەوە بۆ

ئەبرەشـیەی(حەدیسـە) دواتـر میتراپۆلیـت(مارنعـەمما) گواسـتیەوە بـۆ سـەر میلاکـی حەدیاب([288]) بە راسپتەوخۆیی.

پـێش سـاڵی ٧٩٠، هـەمان میتراپۆلیـت مـاران عـەمما هـات بـۆ چـاکبوونەوە لـە رووبـاری دیجلە([289]).

بەڵام هەستی بە چاك بوونـەوە نـەکرد، گەڕایـەوە بـۆ هـەولێر و لـە رێگـەدا کۆچی کـرد. لـە هەمان ماوەدا(ماران عەممانێکی تریش هەبوو لە(زینای) دواتر بوو بە سـەرۆکی دێـری بێـت قووقا. ئەم رەبەنە بەرپرسیارەتی رەبەنەکانی دێـری بارقـای وەرگـرت لـە دەسـتی پیرەمێـرد ئیشۆعەمما([290]).

لە رۆژی دوایی پیریەتیدا خۆی لەو مەیدانە کشاندەوە، وە لـە سوچێکی دێـرە سـەرەکیەکەی خۆی خەریکی خوا پەرستی بـوو، بـەڵام لـە کۆتاییـدا دەگەڕێتـەوە بـۆ دێـری(بێـت قووقـا) و لەوێ دەمرێت([291]).

دێری برقانا دەدۆزینەوە ئەو کاتەی کە پەرتوکی(المسالك) دەخوێنینەوە([292]).

هەرچەند وەکو نـازانین کـە ئـەو دێرەیـە لێکۆڵینـەوەی لـە سـەر دەکـەین تـاوەکو ناوەڕاسـتی سەدەی چواردەهەم هەر مابوو بە پێی ئەو باسەی کەوا(العمری) دەیکات. وە یـا دانـەر پشـتی بەسـتووە و باسـەکەی گواسـتۆتەوە کـە لـە سەرچـاوەی کـۆنتر باسـکراوە. بـەڵام لـە سـەر ئەوەشـەوە هەنـدێك رەوانبێـژی رێکخسـتنی شـیعری بـۆ ئێمـە گواسـتۆتەوە بـە ناونیشانی(الخباز ـ نان کەر) وە دەگەڕێتـەوە بـۆ دەوروپشـتی سـەدەی چوارەمی کۆچی واتـە سەدەی ١١ ەمـی ز. بـە پێـی رای(العمـری) بینایـەی دێرەکـە زۆر نایـاب بـووە لـە سـەر لێـواری رووبـاری دیجلـەدا بـووە بـە گـەورەیی و سـەربەرزییەوە وە بـە ژمارەیـەك لـە پەرسـتگە و باخچەی دەوڵەمەند دەورە دراوە، زیـاتریش دەڵێ: ماسـیەکانی روبـاری دیجلـە لـەو ناوچـەیە بە قەبارە گەورەترن لە ناوچەکانی تر. ئەگەر پرسیار بکەین کـە بـێ دەنگـی تـەواو لـە سـەر ئـەو دێـرەدا بـاڵی کێشاوە بـوو بـە قـەبر و ئارامگەیـەکی قەشـەنگ بـۆ سـوڵتان عەبـدوڵلا؟ وەلامەکە ئەوەیە کرداری سڕینەوە و شێواندن لە سـەدەی هەژدەهەمـەوە دەسـتی پێکـرد([293]) مێژوونووسـە موسـوڵمانەکانی دوایـی دان بـەوە دادەنـێن کـەوا ئـەو کەسـەی نێـژراوە لـەو مەزارە(ابن عومەر) بێت، چونکە ئەو گۆڕەکەی لە مەکە دایە. بۆیە ئێمە ناسنامەی سوڵتان عەبدوڵلا نازانین(٣٠٨)..

دێری(التین ـ هەنجیر) وە یا(دێری ئاجەر وە بە کلدانی بێت حالی) ئەو دێرە دروست کـراوە لـە سـەر روبـاری دیجلـە، نزیـك(حەدیسـە) لەوانەیـە بناسـرێ بـە ناسـنامەی دێـری بارقـا ئەگەرچی هیچ بەڵگەیـەك نیـە کـە ئەمـە بسـەلێنێ مەگـەر خـودا ئارەزوو بـۆ زۆر کردنـی

ژمارەی دێرەکان بێت. پێناسەی دێری ناوبراو بە ناسنامەی دێری ـ بێت حالی سەلمێندراوە بە تەواوی، وە ئەمە لەلایەن ابن العبری سەلمێندراوە([294]).

وە هەروەها پشتگیری کراوە لەلایەن(السمعانی)([295]).

بەلآم لێرەدا شتێك هەیە بۆ ئێوە ئامازەی پێ دەکەین کە پێویستە ئاگادار بین ئەگینا تووشی دودڵی دەبین و تێکەڵی دەکەین لە نێوان ئەو دێرە و دێری هەنجیردا. کە لە میسریشدا هەیە وە هەروەها دێرێکی تریش هەیە بە ناوی بێت حالی و ناوبانگی گەورەتری هەیە و دەکەوێتە ناو بیابانی(حیرە)([296]).

خاڵێکی گرنگ هەیە پەیوەندی بە دێری ئاجەر هەیە، کە دەکەوێتە(حەدیسە) پێویستە ئامازەی پێ بکەین. ئەو خاڵە جێگەی بەرزکردنی مەتران شلیمۆنە، کورتەکەی ئەوەیە: مەتران شلیمۆن سێ ساڵ بەند کراوە لەو دێرەدا ئەمە لە نزیکەی ساڵی ٧٥٤ بووە بە فەرمانی خەلیفە(مەنسور)([297]).

جگە لەمە پێویستە بڵێین کەوا میر(خەلیفە) خۆی فەرمانی داوە بە عەفوکردنی ئەو دێرە لە سەرەانەی باج) بە هۆی ئەوەی کە دێرەکەی بە چاوی خۆی بینیوە.

لە کۆتایی دەڵێین کە دوا باسکردنی ئەو دێرە لە دەقەکانی تایبەت بە رووداوەکانی سنهادسی غەمگین کە لە لایەن یاخیبوو(رۆستەم) بەستراوە و بڕیاری بێبەشکردنی بە ماڤ بەتریك تیماتیوسی یەکەم دەرکردوە لە ساڵی ٧٨٠([298]).

لەوانەیە ئەو ناوە لەوەوە هاتبێت بۆ ئەو دێرە وەرگیرابێت لەو کەرستەیەی کە بۆ دروستکردنی دێرەکە بەکار هاتووە، بە تایبەتی لە ساڵانی یەکەم دوای دروستکردنی دێرەکە. جێی سەرسوڕمانە لەمبارەیەوە لەبەر ئەوەی ئەو بارە لە دێری(الجص ـ گەچ) دا هەیە کە بینایەکە بە گەچ دروست کراوە وە یا دێر(الصخور ـ بەرد)(الصخور المنحوتە ـ دێری پەیکەرسازی) ئارەزوومەندانەبۆ سود وەرگرتن لەو دەرفەتە، کاتێك کە ئێمە لێکۆڵینەوە لە سەر بەشی دێرەکان دەکەین کە دەکەونە دەوروپشتی(حەدیسە) پێویستە ئامازە بە هەڵەیەك بدەین کەوا(عمرو) کردوویەتی لە نوسینی دەقەکانیا بە زمانی عەرەبی([299]).

(جیسمۆندی) ناوی(ملك یشوع) دێنی وەك دامەزرێنەری دێری حەدیسە لە سەردەمی بەتریك ماران عەمما لە نێوان ساڵانی ٦٤٤ ـ ٦٤٧ وە یا(٥٤٧ ـ ٦٥٠).

لە راستیدا، ئەو دێرەی کەوا(مەلك یشوع) دروستی کردووە ئەوە دێرێکی نوێیە کە دەکەوێتە عیلام(باشووری ئێران ـ وەرگێڕ). کەواتە ناکەوێتە حەدیسە([300]).

٣ ـ حەدیسەی شار:

شاری حەدیسە دەکەوێتە سەر رووباری دیجلە(حەدیسەی دیجلە) وە هەروەها ناسراوە بە حەدیسەی موسڵ. بە زمانی کلدانی پێی دەڵێن(حزاتا) دەکەوێتە خوار ڕێژگەی زێی گەورە لە سەر رووباری دیجلە. ئێستا جێگەی ئاماژەیە بە گوندی(تل الشعیر) خوارووی مەرقەدی سوڵتان عەبدوڵلا)([٢٠١]).

نەخشەکان([٢٠٢]). جێگەی ئەو شارە دەسەلێنن بە تەواوی بەڵام Le Strange لە پەرتووکەکەیدا([٢٠٣]).

Land Of The Eastern Caliphate جێگەکەی چەسپ دەکات بە هەڵە لە باکووری زێی گەورە ساسانیەکان ئەم شارەیان دروست کردووە و ناویان ناوە(ناوجێرد) ناوە عەرەبی و کلدانیەکە تەنها وەرگێڕانەکەیەتی لە فارسیەوە. هیچ زانیاریەکمان نیە بە درێژی بە بڵاوکردنەوەی موژدەی ئینجیل، بەڵام بۆتە مەڵبەندی کورسی مەتران لە ساڵی ٥٧٠. لە داگیرکردنی ئیسلامەکان لەم شارەدا دوو کەنیسە هەبووە بەڵام ناوەکانیان نازانین یەکێکیان لەوانەیە بەو پارەیە دروست کرابێت کە لە لایەن(یەزدین) پێشکەش کراوە و بڕەکەی سێسەد(٣٠٠) درهەم Dener بووە ئەو کاتەیکە بەوێدا تێپەڕ بووە لە ساڵی ٦٠٤([٢٠٤]).

ئەم کەنیسەیە ناسراوە بە کەنیسەی گەورە لە ساڵی ٦٩١ وە لەو کاتەی خەلیفەی ئەمەوی، عەبدولمەلیك کوڕی مەڕوان لە سەر فەرمانڕەوایەتی ولات بوو، والی جەزیرە محەممەدی کوڕی مەڕوان کوڕی حەکەم بوو، ئەم والیە هەڵسا بە نیشتەجێکردنی هەندێك عەرەب لە هۆزی(اسد) کە لە دەوروبەری بەسرا هاتبوون بۆ ئەو شارە. لە دوای پەنجا ساڵ لەو مێژووە خەلیفە مەڕوان ناسراوە بە(گوێدرێژ، گەمژە، الاحمق)(٧٤٤ ـ ٧٥٠) کە دوا خەلیفەی ئەمەویەکان بوو بە نوێکردنەوەی ئەو شارە لەو کاتەوە لەو شارە(حەدیسە) مزگەوت هەیە دەکەوێتە سەر رووباری دیجلە ناسراوە بە مزگەوتی جومعە(هەینی). بینای ئەو مزگەوتە بریتییە لە بەرد و گەچ بەڵام بینای خانووەکانی شارەکە لە کەرپووچ(تابوق) ی وشککراوە(قوڕ ـ وەرگێڕ) دروست کراون. وە شاری حەدیسەش بارەگای والی لێ بووە. لە حەدیسە هەندێك ئێسك و پروسکی شەهیدەکان هەبوو مەسیحیەکان کردبوویانن بە مەزار و سەردانیان دەکرد وە ئەمانە لە ناو سندوقێك داندرابوون و پارێزرابوون لە یەکێك لەو دوو کەنیسەیە. وە ئێمە نازانین ئەو ئێسك و پروسکانە بۆ کێ دەگەڕێتەوە. لە ساڵی ٧٨٦ خەلیفە موسا الهادی لە سەر تەختی خەلافەت دانیشت لە دوای مردنی خەلیفە(المهدی). لەو کاتەی خەلیفە موسا هادی بە شارەکە تێپەڕ دەبوو وە هۆکارەکەی نازانین. بڕیاریدا سندوقەکە فڕێ بدرێتە ناو رووباری دیجلە یەکسەر خەلیفە تووشی سەر ئێشەیەکی توونـد و قورس بوو، بۆیە لە بڕیارەکەی خۆی پەشیمان بۆوە وە بە تەواوی چاك بۆوە. لە دوای

چاك بوونەوە، فەرمانەکەی نویّ کردەوە، ئیّش و ئازارەکەی بۆ گەڕایەوە وە بە شیّوازێکی قورستر بەڵام ئەم جارەیان ئازارەکانی بووە هۆی مردنی خەلیفە، وە لە دوای(١٣) مانگ لە خەلافەت دا هیچ سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراومان نیە ئایا فەرمانی دووەمیان جێبەجیّ کرا یان نا(٢٠٥).

لە ساڵی ٩٤٦ شەڕێك لە نزیك حەدیسە روویدا، لەو شەڕە دا خەلیفە(ناصر الدولە) سەرکەوت بەسەر(تاکینسیرادی ـ Tak in lesiradite)(٢٠٦).

دوا ئاماژە کە دەیخوێنین لە سەر حەدیسە لە سەدەی چواردەهەمە. دواتر دەیبینین شارەکە بە تەواوی بزر دەبێت و هیچ شتێکی لیّ نەماوە کەوا باسی لێوە بکرێت. پێمان باشە خوێنەری خۆشەویست ئاگادار بێت و تێکەڵی نەکات لە نێوان شاری حەدیسەی کە لە سەرەوە باسمان کرد وە لەگەڵ شاری حەدیسەی تر کە دەکەوێتە سەر رووباری فوڕات کە ئەمڕۆ شوێنەکە بۆ تێپەڕبوونی بۆڕیەکانی نەوت، کە نەوتی عێراق دەگوازێتەوە بۆ لێواری دەریای سپی ناوەڕاسات، وە ئەمە بووە هۆی گەڕانەوەی ژیان تیایدا. وە هەروەها پێویستە تێکەڵی نەکەین لە نێوان حەدیسەی دیجلە و شاری(الحدث) لە لوبنان دا(٢٠٧).

شارێك بە هەمان ناو هەیە واتە(الحدث) کە دەکەوێتە(سیلیسیا)وە یا(کیلیکیا) کە باس کراوە لەلایەن میخائیل سریانی(٢٠٨). کە مەڵبەندی کورسی ئەسقەفی بووە بۆ ئەبرەشیەکی تایبەت بە یەعقوبیەکان(٢٠٩).

لە پیاوە بەناوبانگەکانی حەدیسە گەورەترینیان و بیّ ململانیّ(یۆحەننا دەیلەمی) یە(٢١٠).

کە لە کۆتایی سەدەی حەوتەمی زایینی ژیاوە. وە هەروەها مەلفان، مامۆستایەکی زۆر ناسراو لە رۆڵەکانی ئەم شارە بە ناوی(حەبیب) بەتریك تیماتیۆسی یەکەم دیاری کرد وەك میتراپۆلیت بۆ شاری(الری ـ رەی) لە نێوان ساڵانی ٧٩٩ ـ ٨٠٠(٢١١).

وە هەروەها کۆمەڵێك ناودار هەیە لە رۆڵەکانی حەدیسە بەناوبانگ بوون بە زانستەکانیان لە سەردەمی ئەوان دا قوتابخانەی شارەکە پێشکەوتوو و درەوشاوە بوو ئەمە لە نێوان ماوەی ١٠٦٤ ـ ١٠٧٢(٢١٢).

لە نێوان ئەمانە(ماری الحدیسی) کە مامۆستایەکی بەناوبانگ بوو لە قوتابخانەی(دار الروم) وە لە هەمان کاتدا(فنکایا) بوو(واتە خزمەتکاری کەنیسە ـ وەرگێڕ) بۆ کەنیسەکەی خۆی. دواتر بوو بە سکرتێری تایبەت بە نامەکانی سریانی کەوا بەتریك(سوریەشوعزەمبور) دەینارد لە دوای(ماری الحدیسی)(نەستۆرس شاحسا Shahseh) هات کە بوو بە متڕانی(نەعمانیە)(٢١٣).

دواتر رەبەن یۆحەنان حەدیسی ـ یۆحنان الحدیسی) کە بوو بە میتراپۆلیتی میسر.

لێرەوە پرسیارێك دەكەین، ئەگەر بەتریك ئیلیای سێیەم(ابو حلیم ١١٧٦ ـ ١١٩٠) بە رەچەڵك هی ئەو شارە بوو بێت؟(حەدیسەی دیجلە ـ وەرگێڕ).

وەلآم: ناوداریەكەی ـ ابن الحدیسی ـ بەو مانایە دێت([٣٤]).

مەگەر خوا حەدیسەیەكی تر هەبێت. وە یا هیچ یەكیان لێ نەمابێت لە پشتاوپشتی خێزانەكەیان بە هۆی بەجێهێشتنیان بۆ شارەكە لە ماوەیەكی دوور و درێژدا. ناوبانگی شاری حەدیسە نەوەستا بە تەنها لەوەی پیاوی زۆری لێ لە دایك بووە لە مێژوودا و ناودارن بەڵكو خاك و خۆڵی زەویەكەی بەرداویە كە دەهاڕدرێ و دەكرێت بە گەچ و بۆ بینای جوان قەشەنگ بەكاردێت بۆیە خەڵك دەهاتنە ئەوێ بۆ بردنی گەچە بەناوبانگەكە لە ناوچە دوورەكانەوە، وە هەندێك جار رەبەنەكانی دێری(بێت عاوی) رویان دەكرد بۆ بردنی گەچە بەناوبانگەكەی وە دیواری یەكەم كەنیسەیان پێ سواق دەدا([٣٥]).

كورسی ئەسقەفیەی حەدیسە:

Le Quien ([٣٦]) لیستێكی رێكخستووە بە ناوی دە مەتران لە حەدیسە، بەلآم وای دا نەناوە كە ژمارەیان تەواوە، بۆیە لە تواناماندایە چەند ناوێكی تر بخەینە سەر لیستەكە. لە خوارەوە ناوەكان تۆمار دەكەین وە بە بێی زنجیرەی مێژوویيان، ئەمانە لە خوارەوە ناوەكانیانە:

(١) ـ تیتۆس(طیطوس)

كورسی ئەسقەفیەی حەدیسە لە پێناو چاككردنی كاریگەری كەنیسە بووە لە رووبەڕووبوونەوەی مۆنۆفیزیەكان([٣٧]).

ئەگەر پرسیارێك بكەین كەی ئەمە بووە؟ وەلآم ئەوەیە وە بە پێی ئەوەی كە لە پەرتووكی(العفە) دا هاتووە، ئەمە لە سەردەمی بەتریك حسقیال بووە واتە لە نێوان سالآنی(٥٦٧ ـ ٥٨١). وە یا بە پێی ئەوەی لە مێژووی سعودی دا هاتووە دامەزراندنەكە لە سەردەمی بەتریك ئیشۆعیابی یەكەم بووە(٥٨٢ ـ ٥٩٥). بۆ زانیاری ئەو سەرچاوەی دوایی كە ئاماژەمان پێ دا پێمان دەڵێ كەوا دەستێوەردانی ناوەخۆیی هەبووە لەلایەن هەوادارانی سویریۆس(ئەنتاكی + ٥٣٨ ـ وەرگێڕ). لە ساڵی ٩٦٦ ی یۆنانی بەرامبەر بە ساڵی ٦٥٥ ی ز. وە یا بە پێی ئەو چاك كردنەوەی كەوا مەتران ئەدیشێر كردوویەتی([٣٨]).

مێژووەكەی كردۆتە ساڵی ٨٦٦ ی یۆنانی بەرامبەر بە ساڵی ٥٥٥ ی ز، واتە ئەو ساڵەی كەوا یەعقوبی بەرادعی مەزهەبەكەی خۆی بلآوكردەوە لە لێكۆڵینەوەمان دا بۆ هەموو ئەو زانیاریانە و بە وردی هەڵسەنگاندنیان، پرسیارێك لە مێشكماندا دەكرێت ئەمەیە: هۆكاری ئەو هەموو چاوەڕوانیە دوور و درێژە چیە كە لە سەر دەستی بەتریك وە یا میتراپۆلیت

جێبەجێکراوە واتە لە ماوەی دوای سالّی ٥٥٥ لە رووبەڕووبوونەوە پێ و پەنای یەعقوبییەکان؟ وەلاّم بۆ ئەوە خۆم دەبینم بە ناچاری بۆ چاك کردنەوەی لە مێژووی سعردی دا هاتووە کە لە جیاتی سالّی ٩٦٦ بیکەم بە سالّی ٩٠٦ پشت بەستن بە لابردنی برگەی(٦٠) لە دەستەواژەکەدا نۆسەد و شێست و شەش ٩٦٦([٣٩]).

ئەم چاك کردنەویە کۆتاییمان پێ دەهێنێ تاوەکو سالّی ٥٩٥، کە دوا سالّی دانیشتنی بەتریك ئیشۆعیا بە لەبەتریکایەتی وە هەروەها ئەو سالّەیە کە دەستپێکردنی نسکۆی چالاکیەکانی یەعقوبیەکانە کە بە چاو دەردەکەوێت لە دوای ئەو سالّە واتە ئەو مێژووە رووداوەکان یەك بە دوای یەك دێن: دامەزراندنی تیتۆس بە مەتران لە سالّی ٥٩٥ وە دامەزراندنی ئەبرەشیەکە حەدیسەشی گرتەوە لەگەلّ دەوربەری لەلایەن میتراپۆلیتی حەززە([٣٠]).

کە لەوانەیە یۆناداب بێت، لەبەر ئەوەی بەرپەرچدانەوەی جێبەجێکراو هەندێك لە جێپەنجەکانیەوە پێوە دیارە بە گەیشتنی شوانی نوێ(مەتران تیتۆس)([٣١]).(وەرگێڕ).

بۆ ئەو شارەی کە تەنها کەنیسەیەکی بچوك و کۆنی تیا بوو، وە باوەڕدارەکانی لە ژێر هەڕەشە دا بوون بە تاقیکردنەوەیەکی زۆر خەتەرناك کە گواستنەوەیە بۆ بتپەرستی و هەلّگەڕانەوەیە لە ئاینەکە. بە هۆی هێزی باوەڕداری چەسپاو و رێنماییکردنی بەردەوام هەندێك سەرسوڕمان عەجایب لە سەر دەستی ئەو روویدا، وە ئەمە وای کرد بارودۆخ و کەشی شارەکە پاك بێتەوە لە(سیخوڕییەکان) وە بتپەرستەکان) بەلاّم جولەکەکان لە ناو هەلّکێشانیان قبولّ کرد و پەسندنیان کرد. دوای جێگیر بوونی بارودۆخەکە و هێوربوونەوەی بارودۆخەکە لە ناوچەکەدا ئەم شوانە بەجەرگە هەلّسا بە بیرکردنەوە لە رازاندنەوەی پایەتەختی کورسیەکەی بە پەیکەرێکی گەورە و قەشەنگ.تێپەڕ بوونی یەزدین فەرمانبەرێکی مەسیحی گەورە لای دیوانی پاشایەتی بە شارەکەدا، کە یاوەری شای فارسی خەسرەوی دووەم بوو کە دەچووە شاری(دارا) دەرفەتێکی زێڕین بوو بۆ هاتنەوەی خەونەکانی مەتران تیتۆس. لە کاتی تێپەڕبوونیدا ئەو میرە مەسیحیە باوەڕدارە و خانەدانە کە بڕی ٣٠٠ دینار بە دیاری پێشکەش کرد بۆ دروستکردنی کاتدرائیە لە شارەکەدا. بینایەکە لە سالّی ٦٠٤ تەواو بوو. تیتۆس لە دوای مردنی تێیدا نێژرا([٣٢]).

(٢) ـ یەعقووب:

رەنگە ئەو مەترانە راستەوخۆ لە دوای تیتۆس هاتبێ. ئەو مەترانە تووشی نەخۆشیەکی کوشندەی درێژخایەن بووە بۆ ماوەی سێ سالّ دواتر لە سەر دەستی باوانی نسێبینی چاك بۆتەوە([٣٣]).

مێژوونووس(نو) مێژووی ئەو چاك بوونەوەمان بۆ تۆمار دەكات لە ساڵی ٥٩٠. بەلاَم گریمان حیسابەكەی من راستە كەواتە مێژووی چاك بوونەوە كە دەبێ شەش سەت و پێنج بێت، وە رووداوەكانی ژیانی باوای لەگەڵ ئەو مێژووە دژ بە یەك نینن لەبەر ئەوەی باوای ژیاوە تاوەكو سەردەمی(شیروە) وە ئیشۆعیابی دووەم واتە تاوەكو ساڵی ٦٢٨([٣٣٤]).

(٣) ـ یۆحەننان:

هیچ زانیارییەكمان دەربارەی ئەو مەترانە نیە تەنها ئەوە نەبێت كە لە سەردەمی بەتریك بسیۆن ژیاوە لە ساڵی ٧٣١ ـ ٧٤٠([٣٣٥]).

(٤) ـ مارزاخی:

دواتر مەتران(زاخی دێت كە ناسراوە بە(زەخا) كە لەلایەن ئیشۆعدناح ئەو ناوەی پێ دراوە([٣٣٦]).

لێرەدا پرسیار دەكەین ئایا ئەو مەترانە هەمان(مارانزەخا) یە كە لای تۆمای مەرگەیی(تۆمای مەرجی)؟([٣٣٧]) بووە.

هەردووكیان باس دەكرێن كەوا قوتابی(ئەبنی مارمن) ی گەورمن([٣٣٨]).

مارزاخی لە سەر كورسی مەترانی حەدیسە دانیشتووە لە سەردەمی میترابۆلیت مار(ئەحا) واتە دوای ساڵی ٧٤١ ی ز([٣٣٩]). ژیانی ئەو مەترانە نوێژكەرەی دوور و درێژ و ئەو ساڵانەی كە وەك مەتران بە سەری بردووە لە حەدیسە ساڵانێكی پڕ بەرهەم بووە پەرجووی زۆری تیا روویداوە لە ماوەی مەترانەتیدا پارێزگاری لە داب و نەریت و كاری رەبەنایەتی كرد لە ماوەی رۆژانی بەرۆژووبوونی ٤٠ رۆژەكە خۆی خەریكی وەرزشی روحی دەكرد و دوورە پەرێز لە ناو ئەشكەوتی ناو چیا. پەرتوكی سەرۆكایەتی(الرؤساء) ئەوەمان بۆ دەگێرێتەوە بە یەك گەیشتنی بە دوعاو پارانەوە بە یەكێك لە مەترانەكانی كۆن لە ناوچەی میسر كەوا خواپەرست و جوانی بوو(بە تەنهایی) ماوەی ٤٠ ساڵ لای عەرەبە كۆچەرەكان ئاهەنگ بەبیرهاتنەوەی دەكرێ بە پێی سروتی نەستۆریەكان لە رۆژی شەممە كە دەكەوێتە پێش یەكشەمەی ئۆشاعنا(السعانین)([٣٣٠]).

وە لە ماڵی شەهیدەكان نێژراوە لە كەنیسەی گەورە.

(A4 ) ـ مارحوداوی:

لە ناوراستی سەدەی هەشتەم لەلایەن یووسف حەززە(رائی) دەكرێت بە سەرۆك لە سەر مەرغانا(بڕوانە پەرتوكی ـ العفه ـ ژمارە ١٢٦).

(٥) ـ شلیمۆن:

ئەو مەترانە لە مەترانە زۆر ناسراوەکان دا دەنرێت بەڵکو لە مەترانە هەرە ناودارەکانی حەدیسە دەژمێردرێت. ژیانی قەدیس شلێمۆن ژیانێکی گۆڕانکاری بووە. مێژووی ژیانی کە لەلایەن قوتابیەکانی نووسراوە بزر بووە. بەلآم پێش ئەوەی بزر ببێت تۆما مەرگەیی و ماری بەکاریان هێناوە لەبەر زۆری ئەو زانیاریانەی کە تێیدا تۆمار کراوە([٣١]).

دانەری ناوەڕۆکی(عەودیەشوع) ی نهێنی بۆ مەتران نصێبینی(نصیبین) شلیمۆن دەگەڕێتەوە، نووسینی دانەر گرنگە لە سەر ژیانی رەبەن و پیاو چاکە دابڕاوەکان وە هەروەها نووسینەکە لە سەر باوڕداری و ژیانیان([٣٢]).

بەلآم تۆما دەڵێ: پەرجووەکانی بەسە بۆ ئەوەی بەناوبانگ بێ: ئەو شەیتانی دەردەکرد، وە بۆ چەند جارێك بە پیادە لە رووباری دیجلە پەڕیوەتەوە، وە نەفرەتی لە قەرداغی دڕندە کردووە قۆچی لە ناوچەوانی رووا وە بەلآم ململانێی لەگەڵ دەسەلآتی مەدەنی هەبووە، وە بەشدار بووە لە بەرەی نۆیۆزسیۆن دژ بە تیماتۆسی یەکەم، ئەو کارانە پێویستە مێژوو بایەخی پێ بدات وە ئەم کارانە بە کاری نەرێنی دادەنرێن زیاتر لە کرداری نەرێنی کە جێبەجێی کردووە([٣٣]). ئەو کێشانەی کەوا تووشی مەتران شلیمۆن ببوون بە هۆی ئەو زوڵم و ستەمکاریەی لەلایەن دەسەلآتدارانی مەدەنی دەکران وە لە سەرووی هەمووشیانەوە خەلیفە مەنسور کە زۆر و بەردەوام بوو لەبەر ئەوەی فەرمانڕەوایەتی ئەو خەلیفە لە نێوان سالآنی(٧٥٤ ـ ٧٧٣) بەردەوام بوو. وە ماوەی دانیشتنی بەتریك یەعقوبی دووەم(٧٥٤ ـ ٧٧٣) بووە. ئەو مەترانە زۆر بە غیرەتی باوەڕدارییەوە کاری کردووە وە بە سەرسوڕمانەوە بە جەسوورییەوە پارێزگاری و بەرگری لە باوەڕدارییەکەی دەکرد کە باس ناکرێت لەگەڵ بەکارهێنانی کەمێك لە سیاسەتدا لە هەمان کات دا ئەم پیاوە قەدیسە بەم شێوەیە کاری کرد، بووە هۆی پەیدا بوونی دوژمنی زۆر بۆی لە سەرەتادا لەگەڵ والی حەدیسە بوو وە ناوی ئیبراهیم کوڕی یەحیا بوو وە زۆر جار والی ئاگادار دەکردەوەو سەرنجی رادەکێشا بۆ ئەو دژایەتی کردنەی کە دەیکا. ئەم سەرنجراکێشانە بووە هۆی ئەوەی مەتران بکەوێتە ژێر ئەشکەنجەدان و(٤٢) قامچی لێ بدرێ و سەروریشی بتاشرێ. ئەمە دەخوێنینەوە لەو دەقەی کە لەلایەن(ماری) نووسراوە کە بە زمانی عەرەبی دەینووسی. کاتێك مێژوو نووس بە زمانی کلدانی دەینووسی بواری قسەکردن لە سەر راستیەکان زیاترە وە بە بێ ترس لە خوێنەرە نەناسراوەکان. تۆمای مەرگەیی(وەرگێڕ). یەکێکە لەو مێژوونووسانەی بۆیە لە نووسینی دەقەکانیدا هۆکارەکان بە روون و ئاشکرایی و وردەکارییەوە دەکات، بۆ نموونە: کاتێك هەمان رووداو باس دەکات دەبینین دەنووسی:(یەکێك لە بت پەرستەکان سەروریش تاشرا بە هۆی ئەو باوەڕداریەی کە لە سەر دەستی هاتۆتەدی لە نێوان بت پەرستەکان.

ئێستا ئەگەر وشەی بت پەرستەکان بگۆڕین بە وشەی موسڵمانەکان ئەو کاتە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت هۆکارەکانی کێشە و گرفتەکان تووشی مەتران شلیمۆن دەبوون. بەڵام ماری خێرایی دەکات و دەڵێ: والی لە کارەکەی پەشیمان بۆوە و تۆبەی کرد، وە لە گەڵ مەتران چاك بۆوە و باجەکانی لە سەر هەڵگرت جگە لە ئیبراهیمی والی دوژمنێکی خەتەرناکتر و زیاتر ئازاردەر، ئەویش دکتۆرێکی مەسیحی بوو بە ناوی عیسای کوڕی شەحلوپا. مەتران شلیمۆن زۆر بە دەستی ئەو دکتۆر عیسایە بێزار بوو بە ئاراستەکردنی سەرنجراکێشانێکی رەق و ناخۆش بۆی. بۆ زانیاری عیسا لای بەرپۆوەبەری کەنیسە تەنها شەماس بووە. بەڵام لە سەر ئەوەشەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئێکلیرۆس زۆر دژایەتیکردن و لە خۆبایی بوون بوو زمانی بەسەریاندا درێــژ دەکــرد و رەخنــەی خــراپ و پڕوپوچــی لــێ دەگــرتن و زمــان درێژیەکەی هێڵە سورەکانی بەزاند بە پلە یەك زمان درێژیەکەی لە شاندیی مەترانەکان کرد کە هاتبوون تکای لێ بکەن بۆ ئەوەی ناوبژیوان بێت لای خەلیفە مەنسوڕ بۆ کەمکردنەوەی باجەکان کە زۆر قوڕس بوون و بە سەر مەسیحیەکان سەپێندرابوون کە باری زۆر قوڕس کردبوون بۆیە زۆر لەوانە وازیان لە باوەڕداریان هێنا بەڵام عیسا ئامادەیی نیشان نەدا بۆ ناوبژیوانیکردنەکە کە تکایان لێ دەکرد وە هەر چۆن مەترانەکان ئومێدیان پێی هەبوو لەبەر ئەوەی عیسا یەکێك بوو لە کەسە سوودمەندەکانی وەرگری باجەکان کاتێك ئەو دکتۆرە بووە سەرۆکی مەسیحیەکان چاوی بڕیبووە یەکەم هەلی بۆ برەخسێ بۆ ئەوەی مەتران دووچاری ئەو سەرنجراکێشە بژێنێتەوە کە مەتران ئاراستەی کردبوو لەو ماوەیەدا کۆمەڵە کەسانێك هەبوون لە مەسیحیەکان کە پێشتر مەتران ئەوانیشی بێبەش کردبوو لەبەر هەندێك هۆی نالەبار. چوونە لای دکتۆر بۆ ئەوەی سکاڵا لە مەتران بکەن و هەندێ بوختانیان بەدرۆ بۆ هەڵبەست لە سەر دزی کردن، عیسا خۆی بە خزمەتکارێکی ئەمین دادەنا بۆ دەسەڵات و ئەم سکاڵایانەی گەیاندە خەلیفە مەنسوڕ ئەم قەدیسە سەرەڕای ئەوەی بێ تاوان بوو دەبینین حوکم دراوە بە جەڵدەکردنی بۆ جاری دووەم ئەم جارە لێدانی جەڵدە(قامچی) یەکان لە دێری مار شەمعوون لە(السن) جێبەجێکرا([٣٣٤]).

مەتران لەم سزادانە تێگەیی وە لە مەبەستەکانیدا، ئارام بۆوە و خۆی راگرت، بە پێچەوانەوە بەشداری کرد لە وەفدێك کە دەچوونە لای خەلیفە بۆ ئەوەی تکای لێ بکەن یەعقوب بەرەڵا بکات کە یەکێك لە سەرسەختترین دوژمنەکانی دکتۆر عیسا بوو. هەر کە مەنسوڕ مەتران شلیمۆنی بینی لە نێوان ئەندامانی وەفدەکە شێت و هار بوو پڕ بوو لە رق و قینە و ئەوەی بە بەرهەڵستیکردنێکی دیار دانا لە دژیدا. بۆیە فەرمانی دا یەکسەر بخرێتە بەندیخانە، وە لە پاش بەرەڵاکردنی دوور خرایەوە بۆ دێری(بێت حالێ ـ حالیە)

سێ ساڵی رەبەق لەوێ مایەوە وە بە هۆی ناوبژیوانی، مەتران شلیمۆنیان گەڕاندەوە بۆ سەر کورسیەکەی خۆی. لەوانەیە لە ماوی ئەو ساڵە کەمانەدا کە بارودۆخەکە ئارام بوو ئاشتی باڵی بە سەر ناوچەکەدا کێشا، گۆڕانکاریەك لە سنووری ئەبرەشییەکان لە سەر دەستی میتراپۆلیت(ماران عەمما) کرا([٣٥]).

هەر وەك لە سەرەوە ئاماژەمان پێی دا بە ناچاری شلیمۆن ناکۆکیەکانی لەگەڵ دەسەڵاتی مەدەنی کۆتایی هێنا دوای ئەوەی زۆر لە ئازار و ئەشکەنجە و سەرزەنشتی پێ بڕا، دەبینین ئێستا رووبەڕووی بەتریکەکەی دەبێتەوە لە کێشەیەکی زەحمەت کە خۆی دانی پیا داناوە. ئەگەر بپرسین چۆن شلیمۆن رێگەی بەخۆی دا تووشی ئەو هەڵەیە ببێ بەرامبەر بە سەرۆکەکەی؟ لە وەڵامدا هیچ پاساوێك نیە رێگا بەو پیاوە قەدیسە بدات کە لە نێوان ئەندامانی شاندەکە بێت وە یا ئەو کۆمەڵە کەسانە بێت کە بەشداریان کردووە لە کۆمکاری دزان(کە لە بێت حالیە) گرێدراوە لە ساڵی ٧٨٠ ـ ٧٨١ بۆ بەرهەڵستیکردنی پەتریك تیماتۆسی یەکەم. دوای مردنی رۆستەم سەرۆکی چەتەکان، مەتران شلیمۆن لە قوولی رەگەکانی ئەو هەڵەیە گەیشت، وە بووە هۆی ئەوەی گوڕ و گریان دای بگرێ بە درێژایی کۆتایی ژیانیدا، واتە بۆحەوت ساڵی تەواو وە تاوەکو کۆچی دوایی کرد کە لە دێری(مارئەهرۆن لە بەلەد) بوو([٣٦]).

لە مێژوودا و بە هۆکارێك نایزانین، ئێسك و پروسکەکانی(روفات) گواسترایەوە بۆدێری(ئەبنی مارن) ناسراوە بە دێری(زەعفەران) ئێستاکە روفاتی مەتران شلیمۆنی(گریان، زۆر گرینۆك) لە دێری زەعفەران نێژراوە. وە ئاهەنگی یادکردنەوەی بە پێی سرووتی نەستۆرییەکان لە ٣١ ی تەمووزدا([٣٧]).

(٦) ـ یۆحەننان حەدیسی:

وەك دەردەکەوێ، ئەو مەترانەیە کەوا لە دوای متران شلیمۆن راستەوخۆ هاتە سەر کار، زۆر زانیاریمان دەربارەیەوە نیە تەنها ئەوە نەبێت نامەگۆڕینەوەی لەگەڵ بەتریك تیماتۆسی یەکەم هەبووە. چەند نامەیەك هەیە کەوا پەتریك ئاراستەی مەترانی کردووە وەڵامدانەوەی تیایە دەربارەی پرسیارەکان لە سەر لە ناو هەڵکێشان بە تایبەتی نامە سەرەکیەکە بزر بووە. دەربارەی باسەکان دوو نامەمان لە بەر دەست دایە دەربارەی دیاری کردن و دانانی وەك مەتران لە سەر کورسی نسێبین، هەروەها باس لە پێشوازیکردنی گەرم کە لەلایەن گەلەوە لێی کراوە وەك میتراپۆلیت، رەنگە حەدیسەی بەجێهێشتبێت لە نێوان ساڵانی(٧٩٩ ـ ٨٠٤).

(٧) ـ ئەبرەهام مەرجی(مەرگەیی) ـ مەرگە:

ئەوە پەتریکی داهاتووە بۆ ساڵی ٨٣٧ ـ ئەبراهام لە سەرەتادا رەبەن بووە لە دێری(بێت عاوی) ئەو کاتەی سەرۆك تۆما مەرگەیی بووە، پێش ئەوەی ئەبراهام ببێتە مەترانی حەدیسە، سکرتێری تایبەت، زۆر نهێنی پارێزی بەتریك ئەبرەهام بووە.

لەبەر ئەوە زۆر دەبینرێ کەوا تۆما مەرگەیی بە شان و شەوکەتی بەتریك هەڵدەدات وە بەبەردەوامی، ئاماژە بە وتەکانی دەدات، هەر وەك سەرچاوە بێت بۆ فێربوون، وە یان چاکەکانی دەژمێرێ، باس دەکات و دەڵێ: (ئەبونا قەدیس مار ئەبراهام پێی راگەیاندم کەوا...) وە یا: (لەبەر ئەوەی کەوا خۆم پارێزەری نهێنیەکانی قەدیسی مەزن مار ئەبراهام بووم وە یا لە راستیدا پیاوێکی قەدیس بوو([٣٣٨]).

ئەگەرلایەنێك لە چاکەکانی بەجێبهێڵین تەماشا دەکرێ سەرچاوەی تر هەیە باسی دەکات بە رەقەکاری. لەوانە نووسینەکانی عەمرو بە زمانی عەرەبی([٣٣٩]).

دەربارەیەوە دەڵێ:(پیاوێکی وریا بووە، بەتوانا، سادە، دڵی پڕ لە میهرەبانی بووە، بەڵام کەم زانست و زانیاری هەبووە. ابن العبری([٣٤٠]).

پۆڵینی دەکات بە(پیاوێکی مەزن بووە کەسایەتی بەهێز بووە، بەڵام شکستی هێناوە لە بەڕێوەبردنی کەنیسە لەبەر کەمی زانیاری و بێ کارامەیی). لەو یاسایانەی کە بە مۆری ئەو مۆرکراون، کە بەرچاو روونیەکمان پێ دەدەن، ئەو یاسایە باس دەکەین کەوا هانی پیرەکان دەدات بە تایبەتی ئەوانەی کە تەمەنیان دەکەوێتە پشتی پێنجەم. لە خوێندنەوەی پەرتووکی(فردوس الاباء) وە پەرتووکەکانی قەشە ئەشەعیاواوە مارئیفاکریۆس وە نووسینەکانی قەشە رەبەنەکان. ئەگەر پرسیار بکەین ئەم پیاوە ئاین زادە و چاکە چی کردووە کاتێك بووە مەترانی حەدیسە. دەبینین ژیری و وریایی لە کارەکانیدا هەیە سەرەرای خۆشەویستی بۆ بێگانەکان([٣٤١]).

لەبەر ئەوەی هەڵبژێردراوە بۆ کورسی پەتریکی. ئەو رووداوانەی کەوا روویانداوە لەو سەردەمەی کە هاتۆتە سەر کورسی پەتریکی پەیوەندی بە لێکۆڵینەوەکەی ئێمەوە نیە راستەوخۆ.

(زەخیرە لە خۆیەتی) وە(دەستنووسی ئینجیل بۆ ساڵی ٧٣٦) بۆ ئەو دەگەرێتەوە کاتێك مەترانی حەدیسە بووە ئەمانە هەردووکیان ئێستا لە پەرتووکخانەی فاتیکانن([٣٤٢]).

(٨) ـ ئیشۆعدادی مەروی(خەڵکی مەرو):

ئەمە نووسەر و دانەرێکی بەناوبانگە([٣٤٣]). وەك دەردەکەوێ لە دوای ئەبراهام هاتۆتە سەر کورسی حەدیسە لە ساڵی ٨٣٧ وە هەروەها پاڵێوراو بووە بۆ ئەوەی لە دوای ئەو راستەوخۆ بچێتە سەر کورسی پەتریکی ساڵی ٨٥٠، ئەگەر دەست تێوەردان نەبووایە لە هەڵبژاردنی

پەتریك دا. كە لە سەر دەستی پزیشكە مەسیحیەكان روویدا ئەوانەی كە شوێنیان نایاب بوو لەلای خەلیفەكانی عەباسی لەو رۆژانەدا . ئەم واقیعە زۆر لەبار و ساكار بووە و روویداوە هەر ئەویش بووە دەرگاكانی داخستووە بە رووی مەتران بۆ ئەوەی نەگاتە كورسی پەتریكی لە سەرەتاوە. بەلام لە دوای دوو گێمی شكست و سەرنەكەوتوو لە هەڵبژاردنەكان، مەتران ئیبراهیم كوڕی نوح لە ئەنبار هەڵساو پێشنیازی كرد كەوا(بەتریك ئیشوعداد) ببێت، بە هۆی زۆری زانستەكانی و زیرەكی زۆری و شان و شەوكەتێكی لەبارەوە([٣٤٤]).

ئەو كاتەی بەختیشوع بەرپەرچی دایەوە بۆ ئەو پێشنیازە([٣٤٥]).

دواتر بەختیەشوع توانی پاڵێوراوی خۆی(تیۆدوس) جێگیر بكات بۆ پەتریك لە دوای وەرگرتنی رەزامەندی خەلیفە(المتوكل) تیۆدۆس كرا بە پەتریك لە ساڵی ٨٥٣ بەمە ئیشوعداد تووڕە بوو هەر دەم لە دژایەتیكردنی پەتریكی نوێ دابوو. مێژووی كۆچی دوایی لای ئێمە زانراو نیە.

(٩) ـ عەودیشۆع:

لە سەردەمی پەتریك یۆحەننانی چوارەم كوڕی ئەبجەر(٩٠٠ ـ ٩٠٥) كورسی مەترانی حەدیسە دانیشت([٣٤٦]).

بە هۆی ئەو سكالایەی، كەوا لەلایەن میترۆپۆلێتی مووسڵ پێشكەشكرا(یۆحەننان بەختیشۆع)، كەوا سەرۆكایەتی كورسی حەدیسەی دەكرد ناوەڕۆكەكەی ئەوە بوو فەرمانەكانی ئاڕاستەی دەكرا جێبەجێی نەدەكرد. پەتریكیش فەرمانی دا كەوا پابەند بێت بە تاعەت كردن و جێبەجێكردن، وە هەروەها گەفی ئەوەی لێ خوارد كەوا لە دەسەڵاتدا لای دەبات ئەگەر سوور بێت لە سەر رەفتارەكانی.

(١٠) ـ ئیشۆعیاب:

پێشتر ناوی ئەو مەترانەمان بینی لە لیستی میترابۆلیتەكانی موسڵ و ئەربیل(بڕوانە ژمارە ٤٢ لە لیستەكە) پێش ببێت بە میترابۆلیتی موسڵ و ئەربیل مەترانی حەدیسە بوو لە سەردەمی پەتریك ماری دووەم(٩٨٧ ـ ٩٩٩). دانەری ئاوازەكانی تایبەت بە سروتی مردن و ناشتن([٣٤٧]).

(١١) ـ داود(؟) لە ساڵی ١٠٧٥:

لەو ساڵەدا، ئامادەی دانانی بەتریك(عەودیەشۆع) كوڕی ئەرید بووە، دوو مەتران لە پێشتر دەست نیشان كرابوون بۆ پلەی ئەسقەفیە بەلام مەراسیمیان تەواو نەكرا بۆ دواتر. یەكێكیان بۆ حەدیسە وە ناوەكەی نەهاتووە و دیار نیە. پرسیارەكەمان ئەوەیە: ئایا ئەو

مەترانە داود بووە کە دانراوە پاش وە یەك لە سەر دەستی پەتریك عەودیەشۆعی دووەم واتە لە نێوان ساڵانی ١٠٧٥ - ١٠٩٠؟ Lequien ژمارەی(٧ ) ی دەداتێ لە لیستەکەدا کە دروستی کردووە بەبێ ئاماژە کردنی بۆ سەرچاوەکان کە پشتی پێ بەستووە من هیچ شوێنەوارێکم نەدۆزیەوە ئەوەی کە لە سەرچاوەکان بینیم. پێدەچێت ئەو(٥) پسوولەیەی کەوا لە لایەن دانەر رێکخراوە لە Oriens Christanus هەندێك لە پشێوی تێکەوتووە چونکە جۆرە دڵەڕاوکێیەکی تێدایە لە ئاماژە کردن بۆ ئەو مەترانانەی خوارەوە.

(١٢) - عەودیەشۆع)

ئامادە بوو لە دامەزراندنی پەتریك مەکیخای یەکەم ساڵی ١٠٩٢([٣٤٨]).

تایبەت بەو پەتریکە دەبینین Le Quien هەڵەیەکی مێژوویی دەکات چونکە دەڵێ ئامادەی دانانی پەتریك مەکیخای دووەم بووە لە ساڵی ١٢٥٧([٣٤٩]).

(١٣) - داود(؟):

ناوی ئەو مەترانە تەنها لە نووسینەکانی Le Quien([٣٥٠]).

دا هاتووە، وە بە بێ ئاماژە کردن بۆ هیچ سەرچاوەیەك. پەتریك عەودیەشۆعی سێیەم کوڕی مولکی بەڵێنی پێ دابوو بە گواستنەوەی لە کورسی مەترانی حەدیسە بۆ کورسی میتراپۆلیتی بێت گەرمای(گەرمیان) - وەرگێڕ.

کەواتە ئەبێ ئەمە لە نێوان ساڵانی ١١٣٩ - ١١٤٨ دا بوو بێت. من نەمتوانی هیچ سەرچاوەیەك بدۆزمەوە بۆ سەلماندنی ئەمە ئایا ئەمە لەلایەن Le Quien هەڵبەستراوە؟ ئەم کەسایەتییە لە داودی کوڕی ساحە - David Barsaha کە مەترانی Harbatglal دواتر دیاری کرا لەلایەن پەتریك عەودیەشۆعی دووەم([٣٥١]).

بۆ ئەوەی ببێت بە میتراپۆلیتی بێت گەرمای؟ لەوانەیە لە دەستکردی شەیتانی نەفرەت لێکراو بووبێت، کە شێواندنی ئاماژەکان دەکات کە برادەرەکەم ئاماژەی پێ کردووە بۆ سەرچاوەکانی. بێگومان لیستی مەترانەکانی حەدیسە تەواو نیە، مادام ناوی ئەبرەشیەی حەدیسەی تیایە تاوەکو سەرەتای سەدەی چواردەهەم([٣٥٢]).

٤ - ئیسترینیا:

ناوی ئەم دێرە لە سەرچاوەکانی مێژوودا نەهاتووە تەنها لای تۆما مەرگەیی نەبێت. وە تا ئێستاش زانیاری لە سەر نیە لەوانەیە لە ناوچەی حدیاب و لای باکووری رۆژئاوای بووبێت بە درێژایی ئەو رێگەیە روودەکاتە(سن) ئەمە ئەو کورتەیە کە لە دەقەکەدا هاتووە([٣٥٣]).

ئەو هەواڵەمان پێ رادەگەیەنن کەوا حاکمی حەدیسە هەڵساوە بە راوەدونانی رێگر و دز و جەردە کە ناوی(یەحیا بن حمران) بووەو کوشتوویەتی لە هۆزی بنی تیملا بووە و

دەستدرێژی کردووە بۆ سەر ژمارەیەك لە دێرەکان و دواتر هەڵاتووە بەرەو(سن) ئەم رووداوە لە ساڵی ٨٠٠ بووە لەم شوێنەدا میترابۆلیتی نوێی حدیاب ئیشۆعیاب دانیشتووە لە ساڵی ٧٨٠ و دژایەتی و بەرهەڵستی ئۆپۆزسیۆنی کردووە و چاوەڕێی ئامۆژگاریەکانی بەتریك تیماتوسی یەکەم بووە، پێش ئەوەی بچێتە ناو خاکی ئەبرەشیەکەیەوە([٢٥٤]).

جێگەی پێویستە کە لە سەرووی زێی بچوك بێت دووریەکی کەم لە نزیك بەوازیج کە وا دەزانین سەر بە ناوچەی بێت گەرمای بووە تاوەکو نیوەی سەدەی دەیەمەوە.

لەمەدا دەتوانین ئەوەمان دەست کەوێت کەوا ئیستربنیا دەکەوێتە حەدیاب لە رووی جوگرافیاییەوە وە سەر بە ناوچەی(بێت گەرمای) بووە لە رووی کارگێری کەنەسیەوە([٢٥٥]).

٥ ـ بەوازیج ـ بەوازیك ـ بەوازیخ ـ بێت وازیك ـ وەرگێر:

لە رووی جوگرافیا و مێژووەکەیەوە:

دوا شارە لە حەدیاب کە دەکەوێتە سەر رێگای رۆژئاوا پێش پەڕینەوە لە رێڕەوی رووباری زێی بچوك. بەوازیخ شوێنێکی زۆر ناسراوە سەرەڕای ئەوەی پاشماوەکەی نەدۆزراوەتەوە دواتر([٢٥٦]).

شوێنی بەوازیج پێویستە بە تەواوی دەست نیشان بکرێت بە هەموو وردەکاری پڕ بایەخەوە لەگەڵ رەچاوکردنی پەیوەندی ئەم شوێنە لەگەڵ شارەکانی تر وەك(السن ـ سین) و(ماحۆزی) کە لە رووی مێژووییەوە هەردەم بەستراونەتەوە بە بەوازیج. شاری(سن) یا(سین) دەکەوێتە لای دووەمی رووباری زێی بچووك، واتە لەو بەری باشووردا، کەواتە بەو پێیەی دەکەوێتە ناوچەی جوگرافی ناسراوە بە بێت گەرمای([٢٥٧]).

کە دەگەڕێتەوە بۆ کەرتی(باریما)، ئەوەی پەیوەندی هەیە بە ماحوزی وە یا چاك بڵێین(ماحۆزی ئەروان)([٢٥٨]).

ئەمەیە: ئەویش دەکەوێتە لای بەری باشوور لە زێی بچووك، رۆژهەلاتی شاری سین وە لە ناوەڕاستی ماوەی نێوان ئالتون کۆپری و رێژگەی زێی بچوك لە دجلەدا شوێنەکەی چەسپیوە بە تەواوی لە سەر نەخشەی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری گشتی عیراقی بە ناوی(ماحۆز)([٢٥٩]).

لە رووی مێژووییەوە بەوازیج هەبووە هەر لە سەردەمی ساسانیەکانەوە([٢٦٠]).

وە پێیان دەوت(خونیاشاپوور) واتە(سروودی شاپوور) مەسیحیەکان پێیان دەوت(بێت وازیك) واتە شوێن، جێگەی گومرگ. لەوانەیە ئەو ناوە ناونانێك بووبێت بۆ یادکردنەوەی شوێنی گومرگکردنی کۆن. عەرەبەکان پێیان دەوت(بوازیخ الملك ـ بەوازیخی شا)([٢٦١]).

گۆڕانکاری لە مەڵبەندی کورسیەکانی ئەسقەفیەکان بووە هۆ و لە سەر هەمان ڕێچکەی گۆڕانکارییەکان لە گرنگی شاری مووسڵ کە بوو بە شاری یەکەم بە تایبەتی عەرەبەکان لە دوای داگیرکردنیدا بایەخی زۆریان پێی دا، شوێنی بەماحۆزی شارە کۆنەکە لە گرنگی لەفکرد لە ماوەی سەدەکانی ناوڕاست دا، یەکێك لە گەشتیارە داخ لە دڵەکان هەڵسا بە تۆمارکردنی دەقێك بە ناوی(ابن الحوقل) بۆ ئاگادارکرنەوە لە دژی دانیشتوانی(ماحۆزی) بە(چەتە و ڕێگر) وە(رووتکردنەوەی کاروانەکان) وە یا(بەتالآنبردنی ماڵە دزراو و رووتکراوەکان)(لەوانەیە ئەو کەسە گەشتیارە هەمان کەس بێت کە زانیاری هاوشێوەی دابێت تایبەت بە(برقەعید).

## ئەبرەشیە

فەرهەنگی مێژووە، جوگرافیای کەنەسی ئەسقەفیەکانی تەواو کرد کە ڕێکی خستبوو([٣١٢]).
Le Quien کە نەیتوانیوە بە هۆی کەمی زانیاری وردی تۆبۆگرافیاوە بە قوڵی بچێتە ناو مێژووەوە وە بۆ دۆزینەوەی هۆکارەکانی گۆڕانکاری لە شوێنەکانی مەڵبەندەکانی کورسیەکانی مەترانەکان ئەمە و لە هەمان کاتدا دەبینین لە ناو لیستەکاندا روون و ئاشکرایە وە دەیوێت قسە بکات. ئەبرەشیەی(ماحۆزی ئەروان) لە ساڵی ٤١٠ دامەزراوە دواتر کورسی ئەبرەشیە گواستراوەتەوە بۆ(بێت وازیك) لە نێوان ساڵانی ٦٦١ ـ ٦٨٠ واتە لەو ماوەیەی کە داگیرکردنی عەرەبی بۆی کراوە. ئەم رووداوە گرنگە وای کردووە شارەکە گرنگی زیاتری پێ بدرێت بە هۆی ئەو گرنگیەی کە دراوە بە ڕێگەی رۆژئاوا و هەڵبژاردنی لە سەر ڕێگەی پاشایەتی([٣١٣]).
لە سەدەی(٧) ەمی ز تاوەکو(١٠ )یەم، بەوازیك تاکە شار بووە کەوا ناوی داوە بۆ ئەبرەشیە و بەو ناوە ناسراوە. لەگەڵ سین یەکتری گرتۆتەوە لە سەدەی یازدەهەم، دواتر لە سەدەی(١٢) ەهەم جیاکراونەتەوە وە بە درێژایی دوو سەدەی سێزدە و چواردەهەمەوە بەجیا بوون. با هەندێك باس لە مێژووی تایبەت بە خەلافەتی ئەسقەفیەکە بکەین.
(سەهدۆنا) پیاوێکی زانا و لێهاتوو، دانەرێکی بەناوبانگ بووە لە باس کردن نایەت. چالاکیەکانی بڕواداری و چاو پێکەوتنەکانی روبەڕو کە بەشدار دەبوو(گرنگی هەبوو بۆ ئەو کاتە و دواتریش) دەکەوێتە دەرەوەی باسەکەمان.
رەنگە پرسیار بکەین، ئایا سەهدۆنا یەکەم کەس بووە ئەم کارەی کردووە کەوا ناوی(مەحۆزی) بە(بێت وازیك ببەستێتەوە؟([٣١٤]).

ئەوەی سەرنج راکێشەرە لای خوێنەری سەرچاوەکان کە بایەخی پێ دەدەن ئینجا ئەو سەرچاوانە کە نووسراون لەلایەن تۆما مەرگەیی وە یا لە پەرتووکی(العفە) تۆمار کراون([٣٦٥]).
وە یا ئەو نامانەی لەلایەن(ئیشۆعیابی حدیابی)([٣٦٦]).
نووسراون کە تایبەتن بەویەوە. هەموو ئەو بەڵگانە، جا ئەگەر نوێ بن وە یا زۆر نزیك بن لێی لەو ماوەیەی کە تیای ژیاوە باس دەکات بە(مەترانی ماحوزی) بە تەنها و بەس.
دەقە نوێیەکان تەنها باس لە(مەترانی بەوازیك) دەکەن، کە دەقەکانی مێژوویی(سعرد) یە([٣٦٧]).
لەمەدا دەردەکەوێ کەوا جیاوازیەکی مێژوویی هەیە، وە وا دەخوازێت کەوا سەهدۆنا نەخرێتە ناو مەترانەکانی بەوازیك، وە هەروەها(مارساوا) ش بە خەلیفەی سەهدۆنا دانانرێ. دوای ئەوەی دووەمیان لە سەر کورسی دایانگرتووە لە ساڵی(٦٥٠)([٣٦٨]).
لیستی ئەسقەفیەکانی بەوازیك زۆری لێ دابڕێنراوە، ناوی شاری بەوازیك نایەت بۆ یەك جاریش لە Synodicon Oriental وە نە لە پەرتووکی(العفە). تەنها یەك جار دەیدۆزینەوە لای تۆما مەرگەیی. سەرچاوەکانی زانیاری کە لە لامان هەیە ئەمانە بە تەنها ماری و عمرو تۆماریان کردووە وە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ژیانی مەترانەکانمان بە درێژی لەلا نیە. مەگەر خوا هەندێك ئاماژەی ساکار نەبێت کە ئاماژە بە پەتریکەکان دەدات لە سەردەمی ئەوان دا ئەو مەترانانە دەژیان، وە یا لە سروتەکانی دامەزراندنی پەتریکەکان ئامادە دەبوون:
(١) ـ یۆحەننانی پزیشك:
یەکەم مەترانی بەوازیك بووە کە ناسراوە لامان لە سەردەمی جاسلیق کیورگیسی یەکەم(٦٦١ ـ ٦٨٠) دا ژیاوە بە گەواهی(ابن العبری) ئەم مەترانە پیشەی پزیشکی کردووە تۆمەتبار کراوە بە بەدڕەوشتی و داوێن پیسی. بە پێی ئەمە حوکم دراوە و لە سەر کورسی و کارەکەی لادراوە([٣٦٩]).
(٢) ـ یۆحەننانی کیمیاوی:
لە کەسایەتیە بەناوبانگەکانی سەردەمی پەتریك بسیۆن بووە(٧٣١ ـ ٧٤٠)، ئەم یۆحەنانە یەکێك لەو دوو مەترانە ناودارانەیە لەو کاتەدا بەهۆی فراوانی یان لە فێربوون بە زانستی کیمیا([٣٧٠]).
بەڵام باشتر وایە بڵێین(الخیمیاء) ئەگەر ئەو دوو مەترانە بایەخیان بە(السحر الخیمیائي)، بەڵام نەیانتوانی بە هیچ شێوەیەك بگەنە ئەو نهێنیە بۆ گۆڕینی کانزا

هەرزانەکان بۆ پڕ بەها وە نەزانینی پێکهاتەی(بەردی فەیلەسوفەکان) بەلای کەم(فێری بوون) وە بۆ ئەوان بەخێر گەڕایەوە بۆ ناوبانگ وەرگرتن لەو سەردەمەدا کەوا خەڵك خۆی بەو جۆرە یاریانە خەریك دەکرد بۆ رابواردن. لە توانامانداید کەواتە بیخەملێنین کە ئەبرەشیەی بەوازیك لەو سەردەمەدا زۆر بە هێمنی و ئارامی بووە.

(٣) ـ ئیلیزی(ئیلیشیاع) لە بێت عاوی:

یەکێك لەو ژمارە مەترانانەیە کە لەو دێرە بەناوبانگە دەرچوون، تەنها تۆما مەرگەیی ناوی هێناوە([٣٧١]).

بە پێی قسەکانی M.Chanoine Van Lantschoot مێژووەکەی ئەبێ لە ساڵی ٧٥٠ بووبێ.

(٤) ـ جۆرج، کۆرکیس لە بێت عاوی:

لە دەوربەری ساڵی ٨٠٠([٣٧٢]).

هەر وەك لە سەرەوە باسمان کرد لە کۆتایی سەدەی دەیەم وە لەو کاتەی لە سەر کورسی پەتریکی دادەنیشی(عەویەشوعی یەکەم)(٩٦٣ ـ ٩٨٦) گۆڕانکاریە لە رێکخستنی ئەبرەشیەکان کرا، بەم شێوەیە بەوازیك بە هەرێمی(بێت گەرمای بەسترایەوە([٣٧٣]).

ئەو کاتە شارەکە لە بن دەسەلاتی میتراپۆلیتی حدیاب نەبوو، بەڵکو راستەوخۆ بەسترابۆوە بە ئەبرەشیەی جاسلیقی.

(٥) ـ سووریەشۆع:

لە سەردەمی بەتریك ماری دووەم ئەم مەترانە لە سەر کورسی بەوازیك دانیشتووە لە نێوان ساڵی ٩٨٧ ـ ٩٩٩([٣٧٤]).

(٦) ـ س:

ئەو مەترانە ناوی نەزانراوە بەلاّم لە دامەزراندنی پەتریك ئیلیای یەکەم لە ساڵی ١٠٢٨ دا ئامادە بووە([٣٧٥]).

(٧) ـ رەبەن ئیستیفان:

یەکەم مەترانە کە ناسراوە بە وەرگرتنی نازناوی دوو قۆڵی بۆ سین و بەوازیك. دوای ئەوەی کە بەیك بەسترانەوە لە بن دەسەلاتی یەك مەتران دا. ئەم بەستنەوەیە لە نێوان ئەو دوو جێگەیە لە سەر دەمی پەتریك سوور یەشۆع زەمبور روویدا(واتە لە ماوەی نێوان ساڵانی(١٠٦٤ ـ ١٠٧٢) وە مەتران ئیستیفان یەکەم مەترانە ئەو نازناوە وەردەگرێ([٣٧٦]).

لە ساڵی ١٠٧٥ ئەم مەترانە ئامادەی دامەزراندنی بەتریك عەود یەشوعی دووەم بووە([٣٧٧]).

(٨) ـ عبدالمسیح ـ عەبدولەسیح:

لە دوای کۆچی دوایی رەبەن ئیستیفان بوو بە مەترانی بەوازیك وە ئەمە لە سەردەمی پەتریك عەودیەشوعی دووەم کوری ئەرید بووە لە(١٠٧٤ - ١٠٩٠) دا وە مەتران عبدالمسیح([٣٧٨]).

برای مەتران جۆرج میتراپۆلیتی بەسرا بووە. دەستی لە پایەکەی کێشایەوە لەبەر چەند هۆیەك ئێمە نایزانین. ئەم دەست لە کارکێشانەوەیە لە سەردەمی هەمان پەتریك بووە کە پێشتر دایاننـاوە.

(٩) ـ ئەبو عەلی کوری تاهیر:

ئەمە لە(دار الروم) بووە، وە لەلایەن هەمان عەودیەشوعی دووەم کە پێشتر باسمان کرد کە لە سەرەوە داندراوە بە مەترانی بەوازیك لە پێش ساڵی ١٠٩٠ بۆ ئەوەی شوێنی عەبدولەسیح بگرێت([٣٧٩]).

وە نازناوی(مەترانی سین و بەوازیك) ی وەرگرتووە. لە یاساکانی بەتریك ئیلیاسی سێیەم ئەبی حەلیم(١١٧٦ ـ ١١٩٠)، دەردەکەوێت بەوازیك وەك(قەوارەیەکی سەربەخۆ) وە جیاواز لە(سین) لە سەر هەمان لیست و لە شوێنێکی دوورتر دەبینین کەوا(مەترانی سین) هەیە وە یەکێکی تر بۆ(باریمۆن)([٣٨٠]).

(١٠) ـ نرساي:

ئەم مەترانەیە کەوا دیاریەکی پێشکەش کراوە لەلایەن(شلیمۆن) مەتران دا لە(برات میسشان) پەرتووکەکەی بەناونیشانی(النحلة).

لە دەوروبەری ساڵی ١٢٢٥، ئەم دیاریە بریتیە لە هەندێك رستەی ناسك و جوان باس لە پێشکەشکردنی دیارییەکە دەکات، لەوانە:(تۆ گۆچانی پیری منی) وە(کوری روحی منی)... تاد، بە پێی زانیارییەکان ئەو مەترانە بووە، کە لە سەر کورسی بە وازیکی لادراوە([٣٨١]).

(١١) ـ شەمعوون:

هەمان نازناوی پێش خۆی وەرگرتووە، وە لە دامەزراندنی مەراسیمی بەتریك مەکیخای دووەم لە ساڵی ١٢٧٥ ئامادە بوو([٣٨٢]).

(١٢) ـ بریخیشۆع:

ئەمەشیان نەناسراوە تەنها ئەوە نەبێت ئامادەی مەراسیمی دانانی بەتریك دنحای یەکەم بووە بۆ پایەی بەتریکی لە ساڵی ١٢٦٥([٣٨٣]).

کرداری هێرشکردن و تالآن و برۆی روویداوە لە بەوزیك لەلایەن کوردەکانەوە: لەوانەیە لە سەردەمی ئەو دا بوو بێت لە ساڵی ١٢٨٥([٣٨٤]).

لەم رووداوانەدا ژمارمیەکی زۆر مەسیحی بەوازیك ژیانیان لە دەست دا بەهۆی ئەو دەستدرێژیە زۆرداریە و هێرشە درندانەیەوە.

(١٣) ـ یۆحەننان:

دوا مەترانە کەوا مێژوو تۆماری کردووە وە یادی دەکرێت، لە کۆمکاری تیماتۆسی دووەم بەشدار بووە لە دەوروبەری ساڵی ١٣١٨([٢٨٥]).

دواتر بەوازیکی مەسیحی بە ماوەیەکی کەم بزر بووە، وە هەروەها شارەکەش بزر بوو، وە هیچ پاشماوەیەکی نەماوە، شوێنی شارەکە بەتەواوەتی نەناسراوە تاوەکو ئەمڕۆ.

ئەبرەشیەی بەوازیکی یەعقوبیەکان

لە نێوان ئەو ئەسقەفیانەی رۆژهەڵات تایبەت بە یەعقوبیەکان ژمارەیان ١٠ ئەبرەشیە بووە، و سەر بە(ماروسا) بووە لە ساڵی ٦٢٩ ئەسقەفیەکان ناوی(بەوازیك) بووە([٢٨٦]).

سێ مێژوونووسمان هەیە لیستی ناوی مەترانی یەعقوبیەکانیان تێدایە، بەڵام ئەم لیستانە جیاوازیان لە نێوان دا هەیە لە نوسینەکانی(ابن العبری) دا([٢٨٧]).

دەبینین ئەبرەشیەی شەشەم دەکەوێتە دوای ئەبرەشیەی(مەفریان) بە ناوی(بێت زەمان) وە یا(بێت وازیك) ئەمە لە مێژووی سعردیش دا هاتووە([٢٨٨]).

بەڵام دەبینین(ماری)([٢٨٩]).

باسی(بێت زەمان) دەکات، کە(بێت ریما) وە ئیکۆنیا، ئیقۆنیایە. رەنگە ناوی دوایی شێواندن بێت بۆ ناوی شارە کۆنەکە، کە ناوی(خونیا)(شاپوور) بوو([٢٩٠]).

بەڵام ماری دان بەو شارە دانانێت و بەوازیك بە پلەی هەشتەم دێت و بە جمکە ناوی داناوە ـ بە شێوەیەکی سەیر ـ بۆ(جەزیرە و بەحرێن) بەڵام(ابن العبری) باس لە(کزرتا لە کۆردۆ) دەکات بە تاك و تەنها و هاوشێوەی ئەوی کردووە، بەڵام مێژووی سعردی دەڵێ: جەزیرە و بەحرێن هەر دووکیان لە کۆتایی دا بوارێکی فراوانیان بۆ تێڕامانی پڕ دەنگ و هەرا دا. با هەڵوەستەیەك بکەین لە سەر ئەم دووانە، کە ئاماژەمان پێیان دا لە ژمارە شەش و بیپارێزین لە بەر ئەوەی بەوازیك لە نسێبین دەردەکەوێ لە سێ دەقدا، واتە دەقی(ماری) ژمارە(٨) کە رەنگە باوەڕپێکراو نەبێت بۆ ئەوەی ببێت بە هێمایەك پشتی پێ ببەستین([٢٩١]).

خوا لێخۆش بوو بەتریك(برسۆم) وە یا(برسۆما) باس لە شەش مەتران دەکات لە(بێت ریما ـ بێت ریمان) و بەوازیك([٢٩٢]).

یەکەم لەوانە ناوی(مازینا) بووە(لە جیاتی مارزینا) لە دەوروبەری ساڵی ٦٢٠ دا ژیاوە وە ئەوی تریان ناوی(میخائیل موخلیس) بووە لە ساڵی ١٢٧٢ رەسامەتی بۆ کراوە بەڵام ئەو

چوارەی تریان ئەو بەتریکە زانایە باسی نەکردوون. لەوانە ئێمە بە درێژی لە سەر سێیانیان دەزانین: ئەمانەن گریگۆریۆس لەو سەردەمەدا ژیاوە کەوا رێکخستنی مۆنۆفیزی تیا روویداوە لە ساڵی ٦٢٩([٣٩٣]).

دواتر موسا(برکێفا) لە ساڵی ٩٠٣ کۆچی دوایی کردووە([٣٩٤]).

وە ئیوانیس کە لە مەراسیمی دامەزراندنی میخائیل سریانی لە ساڵی ١١٦٦ ئامادە بووە([٣٩٥]).

٦ ـ دێری مەرگانا ـ دێری مەرگە

دەقێك هاتووە لە نووسینەکانی عومەر، تایبەت بەو دێرە، رەنگە یارمەتیمان بدات بۆ ئەوەی بڵێم کەوا درێری(مەرگە) دەکەوێتە سنووری ئەبرەشیەی حەدیسە، وە هەر وەك دازانین ئەو دێرە دەکەوێتە دامێنی(چیای زێنای)(لە بەشی داهاتوودا دەربارەی ئەو دێرە و شوێنەکەی دەزانین) لە نزیك گوندێك بزر بووە کە پێی دەگوترا(زێنای) ئەو جێگەیە دەبێتە هۆی ئەوەی شوێنی گوندەکەی دوایی بدۆزینەوە کە ئاماژەمان پێ دا لە نزیك شاری(مەخمور) ی ئێستا.

دێری(مرعی) ـ مەرعا دامەزراوە ـ وە ئەمە واتای دێری سەرووە ـ لە سەر دەستی مار(بەختیشۆع) لە سەر دەمی پیریەتیدا([٣٩٦]).

لە جیاتی(مەرگە)([٣٩٧]).

وە یا(مەرگانا)([٣٩٨]).

ئەم دێرە، پێشتر لەلایەن قەدیس مارنیحا) نیشتەجێ بووە([٣٩٩]).

بە پێی ئەوەی کە لە دەقەکانی عمرودا تۆمار کراوە، دامەزرێنەری ئەو دێرە ژیاوە لە سەردەمی بەتریك سلێومزەخا(٧١٤ ـ ٧٢٨) لە واقیعدا لە ناو ئەو دێرەدا نووسەری بەناوبانگ(یووسف حەزە) ی تیای ژیاوە([٤٠٠]).

لەگەڵ براکەی خۆی بەناوی(عەودیەشۆع) کە لە ژێرەوە ناوی براکەی نووسیوە. پێشتر(ماران عەمما) مەترانی زینای و سەرۆکی دێری(بێت قوقا یەکێك لە مردووەکانی لە دێری مەرگە زیندوو کردۆتەوە([٤٠١]).

لە نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەم ئەم دێرە وێران و خاپوور کرا لە ساڵ ٨٠٠ ئەم کارە بە دەستی(یە عەلی کوڕی حەمران) کراوە لە(بنی تیملا) ـ بەنی تیملا) لە داگیر کردن و شەڕێکی خوێناوی. دواتر هەوڵ دەدەین بە درێژی لە ناوەڕۆکەکەی بدوێین([٤٠٢]).

٧ ـ گوندی زینای

هیچ شتێك دەربارەی ئەو گوندە نازانین تەنها ئەوە نەبێت کەنیسەیەکی تیا بووە وەك مەڵبەندێك بووە بۆ خواپەرستی و خەڵوەتکەرەکان، کە لە چیاکانی دەوروپشتیدا ژیاون، ئەو پیاوە خەڵوەتکەرانە دەچوونە ئەو کەنیسەیە بۆ وەرگرتنی نهێنیەکان(الاسرار)([٤٠٣]).
لە سەر دەستی(ماران عەمما) ئەم کەنیسە کاری چاکردنەوە و ئاوەدانکردنەوەی تیا کراوە ماران عەمما خەڵکی ئەو گوندە بووە. ئەمە لە نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەم([٤٠٤]).
بۆ زانینی شوێنی گوندەکە و پەیوەندی بە مەخمور و چیای زینای لە بەشەکانی دوایی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەین.
(٣) ـ دەشتی نێوان دوو چیا
دەشتی دیجلە لە رۆژهەڵاتەوە بە زنجیرە چیای قەرەچوغ دەبەسترێتەوە ئەم ناو نانە تورکیە بە رەسەن([٤٠٥]).
وە لە بەکارهێنان دا نوێیە، بۆیە دەبێت هەوڵی ئەوە بدەین ناوە کۆنەکە بدۆزینەوە. لە دووری ئەو زنجیرەیە، دۆڵێکی فراوانی کاکی بە کاکی هەیە ئەم دەشتە لەلای تر بە زنجیرە چیایەکی تر و نزمتر دەبەسترێتەوە، وە تەریبی زنجیرە چیای یەکەمە ئێستا پێی دەڵێین چیای(ئۆینا) بە ناوی ئەو گوندەی لە تەنیشتیەوەیەتی ئەوەی تایبەت بێ بە دۆڵەکە، ناوە بەکارهێنراوەکەی تاکە و ئاڵۆز نیە بە: (دەشتی کەندێناوە) واتاکەی(دۆڵ لە نێوان دووانـدا)(دوو چیا ـ وەرگێڕ) وە چیایەکی تریش هەیە، سێیەم چیایە بریتیە لە کەپکە شاخێکی بەرزی لووتکەکانی مام ناوەندیە و هاوتەریبە لەگەڵ کۆتاییەکانی چیای ئۆیناداخ وە بە ئاراستەی باکووری ـ خۆرئاوا.
ناوی ئەم چیایەی ئەمرۆ(دەمیرداخ) ە. کۆتایی ئەم چیایە لێژ دەبێتەوە بۆ نزیك زێی گەورە. لێرەدا دێرە بەناوبانگەکەی ناسراو بە(بێت قوقا) دەدۆزینەوە، وە لە ناوچەیەکی بچوك بەرامبەر بە زێی ئەم ناوچەیە بازنەی بەیەکگەیاندن بووە لە نێوان بانی هەولێر و ئەو دۆڵەی دەکەوێتە نێوان ئەو دوانە، لەبەر ئەوەی پەیوەندی مێژوویی لە نێوان دێری(بێت قوقا) و دۆڵەکە هەبووە. زۆر گرنگترە لەوەی کە لە نێوانی نێوان بانەکە هەیە بۆیە باسەکەمان چڕ دەکەینەوە لە سەری.
١ ـ چیای(زینای) و(زامێر)
زۆر جاران ناوی زینای و زامێر دووبارە دەبێتەوە لە دەقەکانی تایبەت بە شاری حەدیسە کە پێویستە بەدوای بگەڕێین لە ناوچە دراوسێیەکان لەبەر ئەوە زۆر لەبار و مەنتیقە.
هەر لەبەر ئەوەشە دەبینین مێژوونووسەکان جێگەکەی رێك بەرامبەر بە ناوچەکە دیاری دەکەن. مەتران شیر شوێنی چیای(زینای) لە (مەرگە) دادەنێ([٤٠٦]).

بەلآم(مەنکنا) شوێنی چیای زینای لە ناوچەی(زومار) نزیك(عەین زالە) دادەنێ، کە دەکەوێتە دووری هەشت سەعات بە پیادە وە بەلای باکووری خۆرئاوای موسڵ([٤٠٧]).
لە واقیعدا دەبێ شوێنی ئەو چیایە لەو ناوچەیە بێت نزیك بە دێری(بێت قوقا)([٤٠٨]).
کە پەیوەندی بەردەوامی هەبووە لەگەڵ شاری حەدیسە کە زۆر دوور نیە لێی لەبەر ئەوەی مەتران(مارانزەخا) بەردەوام وەرزشی روحی لە ماوەی بەرۆژووبوونی ٤٠ رۆژەکە لەو دێرەدا دەکرد. وە هەروەها بانگەوازی خەڵکەکەشی دەکرد بۆ ئەوێ، وە بە ئاسانی بۆ هەلگرتنی روفاتی مەتران چەلەنگ(الجمال)([٤٠٩]). سەرەرای ئەوەش نزیك بووە لە(برقانا) کە مەتران(ماران عەمما) توانی لەو دێرەوە رابکات بە شەو([٤١٠]).
کەواتە Budge لە سەر هەق بووە کە دەبێ بە دوای(زینای) و (زامیر) بگەرێین لە نزیك حەدیسە باشوور زێی گەورە لە حدیاب([٤١١]).
ئەگەر چاوێك بە نەخشە دابکێشین، تێبینی دەکەین و بەرچاومان دەکەوێت بە روونی کە وا دوو چیای زینای و زامیر تەنها زنجیرەیەکن لە چیای قەرەچوغ کە تەنیشت دەشتی دیجلەیە لە رۆژهەلآت ئەم زنجیرە چیایە پێك دێت لە دوو چیای یەك لە دوای یەك و لێك جیاواز لە دەربەندێکی چیایی کە لە رێگایەوە دەپەرینەوە لە دۆڵەکە لە(نێو ئەو دووانەدا) بۆ دەشتی دیجلە. ئەو دوو چیایە پێی دەڵێن قەرەچوغی باکوور و قەرەچوغی باشوور.
بەلآم ئایا لە تواناماندا هەیە ناوەکان بە وردی تەواوی دیاری بکەین، واتە کام لەم دوو چیایە(زینای) و ئەوەی تریان(زامیر) ە؟
لە سەر نەخشە نوێیەکە بەلگە و دەلیل لە سەر ئەمە هەیە. لە خاڵی کۆتایی دووری باکوور ـ رۆژئاوای زنجیرەکە، کە دەکەوێتە نزیك زێی گەورە([٤١٢]).
گوندێك هەیە بە ناوی(زومارا) کەواتە لە تواناماندایە کەوا زنجیرە چیای باکوور بە چیای(زامیر) دابنێین. جگە لەمە دەقێکی(ابن الحوقل) هەیە([٤١٣]).
تیشك دەخاتە سەر ئەو بابەتەز ئەگەر لە(چیای حەمرین هەلکشێین(لە باریما) بەرەو هەوارز، واتە تێپەربوون بەرەو باکووری رووباری زێی بچوك، دەبینین کەوا جوگرافیای عەرەبی لە رۆژهەلآتی شاری حەدیسە دەبینرێتەوە وە ئەمە سەلماندێکی ترە لە راستی جێگەی شاری حەدیسە لەو شوێنەدا. لە بەرزاییەکانی چیای زیناو زامێر با بەردەوام بین لە رۆیشتن و لەگەلمان دەبێت هەر وەك دەردەکەوێت واتە بەم پێیە نەخشەکان خوێندراونەتەوە، لە رۆژهەلآتەوە بۆ رۆژئاوا چیای زینایە، ئەمەیان یەکەمە و بەرامبەر قەرەچوغی خواروەوە. بەلآم چیای زامێر دووەمە بەرامبەر قەرەچوغی باکوور داندراوە.

سەرچاوەکانی مێژوونووسانی عەرەب باس لەو دوو چیایە دەکەن، بەڵام(موفلح) لە ساڵی ٩٠٤([٤٤]).

دەبینین دوای چەند ساڵێکی کەم باسی دەکات([٤٥]).

تەنها چیای زینایە. بەڵام هەندێك لە دەقە مەسیحیەکان کە باسی ئەو بابەتە دەکەن دەبینین هەندێك تێکەڵاوی شێواندن و دڵەڕاوکێی تیایە تێیدا دەخوێنن([٤٦]).

چونکە لێرەدا رەبەن و خواپەرست هاتوونەتە چیای زینای وە لەوێ پەرستگایان دروست کردووە لە چیای زامێر. ئەمە ئەو دەقانەیە بەبێ ئەوەی هیچ ئاماژەیەك بکات، کە ئەو کەس و رەبەنانە پێشتریش لە چیایەك بۆ چیایەکی تر گواستراونەتەوە. رەنگە سەرکەوتوو بووین لەو باسکردنە درێژەدا ئەگەر ئەوە ئەنجام بوو‌بێت بە هاوشێوەی ئەو بارەوە هاتووە لە بەکارهێنانی نسێبین، بۆ نموونە ناوی شەنگاڵ جارێك بەکار دێت وەك ناوێك بۆ هەر دوو پارچەی پێکهاتەی چیایەکە، وە ئەوی تریان وەك ناوێك بۆ یەکێك لە زنجیرەکان و بەس([٤٧]).

لێرەدا دووبارە ناوی زینای ئاماژە بە پارچە چیایەکە دەکات بە تەواوی، وە هەندێك جار تەنها بۆ زنجیرەی باشوور. بەڵام بوونی گوندێك لە ناوچەی زینای وە بە هەمان ناوی زینایە لە دامێنی چیایەکە لەوانەیە بیدۆزینەوە بەرامبەر بە گەرووی چیایەکە بۆ جیاکردنەوەی هەر دوو زنجیرە چیاکە بە تەواوی. لە سەرەوە وتمان دەکەوێتە لای حەدیسە، کەواتە ئاسانە بۆ ئێمە شوێنی ئەو گوندە بدۆزینەوە بە بەڵگەی گوندی مەخموری بچوك کە ناوەکەی زۆر کۆن نیە.

## ئەو رەبەنانەی لە زینای نیشتەجێ بوون

زۆر بەردەوام نەبوو دێری(مار حەبیب) کە لە سەر چیای زامێر دروستکرابوو([٤٨]).

حەبیب و سێ پیاوی تری لەگەڵ دابوو لەو شوێنە ئەمانە لە نەینەوا هاتبوونە ئەوێ بە هۆکاری سادەیی، پاش گیرسانەوەیان لە چیایەکە(ناوچەکە) هەڵسان بە دروستکردنی ئەو دێرە بە شێوازێکی دیار و بەناوبانگ ئەو کۆمەڵە کەسە لەو دێرە دا نیشتەجێ بوون بۆ ماوەیەك دواتر دامەزرێنەری ئەو دێرە رووی کردە(کفرتوسا) دێرەکەی خۆی بەجێهێشت کە دەکەوێتە نزیك ماردین بۆ ئەوەی دێرێکی تر دروست بکات. لەم دێرەدا رەبەن(بسیما) بەسیما دەژیا کە بە دامەزرینەرەکە گەیشت([٤٩]).

دواتر هیچ دێرێکی تر لە سەر چیای زینای نەبووە. ئەوەی لەوێ ژیاوە دوای ئەوە هەندێك لە رەبەنەکان: ئەوانەی کە خەریکی زگهەلکوشین و دابڕاو تاك و تەنها دەژین و خۆیان لە

لەزەتی ژیان و خۆشی سادەیی حەرام کردووە وە یا خەڵوەتکەرە نوێژکەرە پڕ لە سیمایەکان لەو چەشنانە ناوی ئەوانە دێن کە دوور کەوتبوونەوە و ئەو جۆرە ژیانە دابڕاوانەیان هەڵبژاردبوو، ئارەزوویان بوو دوور بکەونەوە لە پلەو پایەی سەرۆکایەتی بەڵام هەندێکیان خۆیان پێگەیاند بۆ ئەوەی بگەنە ئەو پلەیە هەندێك لەو ناوانە لە بیر ناکرێن، لەوانە: هورمزد وە(ختهاوی) وە(ماربەختیەشوّع) کە دامەزرێنەری دێری(ماکانا) دەبێت لە دواییدا([420]).

وە قەشە(یووسف حەزایا) کە دواتر دەبێتە سەرۆکی ئەو دێرە([421]).

وە(ئەمۆیونۆس) کە بزنەکێوی لە نەخۆشیدا چاك دەکردەوە([422]).

وە قەشە(لیۆنتیۆس) لە زیناى(واتە گوندی زیناى ـ وەرگێڕ) کە لە کۆن دا لە دێری(بێت عاوی) بووە([423]). وە رەبەن یووسف لە(کابیشا) وە براکەی ئەبراهام([424]).

وە یۆحەننان کە دواتر دەبێـە سەرۆکی دێری بێت قۆقا لە کۆتایی سەدەی حەوتەم([425]).

وە ماران عەمما کە لە گوندی زیناى رایکرد([426]).

وە لە کۆتایی مەتران(الجمال) کە بە(ماران زەخا) گەیشت([427]).

پێشتر ئاماژەمان بە سەرەوە دا، بەهۆی نەبوونی هیچ دێرێك لەم چیایەدا ناچار بوون ئەو رەبەنە لە خوا ترس و دابڕاوانە لە ئەشکەوتەکان دا بۆ هاتنە خوارەوەیان بۆ کەنیسەی گوندی زیناى بۆ وەرگرتنی قوربانی پیرۆز.

٢ ـ چیای خان

دەکەوێتە سەر سنووری رۆژهەڵات بۆ(دۆڵی نێوان هەر دووکیان) ـ واتە دەشتی کەندێناوە ـ وەرگێڕ) زنجیرە چیایەکی درێژ و کەم بەرازایی، هێڵی درێژن و پێیان دەڵێن(ئۆینـاداخ) ئەم ناونانە وەرگیراوە لە گوندێکی بچوك بەم ناوەوە کە دەکەوێتە کلکەی باکووری خۆرئاوای زنجیرە چیایەکە. لە بەری دووەم لە زنجیرەکە بەرزاییەکان بەرەو لێژبوونەوە رێڕەو دەگرن و دەبنە قۆڵاییەك و دەبێتە رێچکەی تێپەڕبوونی ئاوی زێی بچوك، لە دوای رێڕەوی زێ زەویەکە تەخت دەبێت و درێژ دەبێتەوە بەرەو کەرکوك.

جیۆلۆجیەکان ئەم هێڵە درێژە باش دەزانن لەبەر ئەوەی دەبێتە هۆی پێکهاتنی هەیکەلی ناوچەی کەرکوکی دەوڵەمەند بە چاڵە نەوتی زۆرەوە. بیرە نەوتەکانیان دۆزیەوە بەهۆی ئەو گڕەی لە هەوا دەسووتا لە ئەنجامی ئەو غازانەی لە نەوتەکە بەرز دەبۆوە بە هۆی وێستگەی تایبەتی کە بۆ ئەو مەبەستە دروست کراوە. لە کاتی فڕیندا بە سەر ناوچەکە و گەیشتن بۆ نیوەی ماوەکە لە نێوان هەر دوو زێدا ئەم گڕە دەست پێدەکات بە دەرکەوتن و هێڵی فرۆکەکانی ئاسمانی عێراقی رۆناك دەکاتەوە کە نێوان موسڵ و کەرکوك بە یەك

دەبەستێتەوە لە ئاسماندا بە تێپەڕبوون بـە سـەر دۆڵـی کەنـدێناوە. نـاوی(ئۆێنـاداخ) نـاوێکی نوێیە بە تەئکید وە هەروەها پەیوەندی هەیە لە نێـوان ئـەو نـاوە نوێیـە و دارشـتنی(ئۆێنـا ـ ئـەوینا ـ وەرگێـڕ) ی کـۆنی ناسـراوە بۆیـە ئەگـەر سـەرنجێکی نەخشـەیەکی کـۆن بکـەین و زانیارییە چەسپاوەکانی بخوێنین تایبـەت بـە ڕێگـاو بـانی کـۆن کە لـە سـەدەکانی رابـردوودا ناسرابوون وە پێش وەبەرهێنان و دەرهێنانی نـەوت و دروسـتکردنی ڕێگـەی نـوێی پێویـست بـۆ درێـژکردن و گەیانـدنی بۆڕیـەکانی نـەوت و گواسـتنەوەی نـەوت و بەرهەمـەکانی لـە سەرچاوەکەیان بۆ بەندەرەکانی ناردنە دەرەوە لـە سـەر ئـەو نەخشانە هێڵی ڕێگـە کۆنـەکان دەبینین وە بۆمان ڕووندەبێتەوە کـەوا ئـەو ڕێگـە ڕاسـتەوخۆیەی نێـوان مووسـڵ و کـەرکوك بـە گـوێڕدا تێپـەڕیوە(وە بـەو دۆڵـەی نێـوان ئـەو دووانـەدا نـەبوو) ـ (واتـە کەنـدێناوە ـ وەرگێـــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــــڕ).

ئەگەرچی ئەو ڕێگایە کورتتریش بووە. ئەو کات پـردی دووبـز (دبـس) ی نـوێ نـەبوو، بۆیـە پێویست بووە ڕێگە کۆنەکە بەرەو پردی کۆنی دروست کـراوە لـە سـەر ڕووبـاری زێـی بچوك لە ئاڵتوون کۆپری(پردێ) ـ وەرگێڕ.

بۆ گەیشـتن بـە ڕێگـەی هـەولێر لـە جیـاتی ئـەوەی ئـەو ڕێگەیـەی بـەرەو باشـووری خۆرئـاوا زنجیرەی(ئوینـا ـ ئـەوینا) درێژبوونـەوەی ڕێگەکـە تـەریب بـووە لەگـەڵ بـەرزایی بـاکووری خۆرهـەڵات. کـاتی گەیشـتن بـە ناوەڕاسـتی ماوەکـە لـە نێـوان هـەردوو زێـدا دەبینـین لێـرەدا قۆناغێك هەیە ئاماژەی پێکراوە بە ناوی(خان) وە ئـەم خانـە ناوەکـەی دراوە بـە چیاکە کـە ناسـراوە بـە چیـای خـان وە لـە کلدانیـدا ناوەکە: (خـان تـوری ـ وشـەی تـور ـ واتـە ـ چیـا ـ وەرگێڕ).

شوێنی ئەو خانە نیشانە کراوە ئەمڕۆ بە گوندی(دوو جیرت خان)(واتە دوو گردکان ـ خان) ـ (وەرگێڕ). واتە خانی دوو گردەکە. ناوە کلدانیەکە:(خان توڕێ) بۆ چەند جارێـك لـە دەقـە مێـژووە تایبەتەکانـدا دووبـارە کراوەتـەوە بـە تایبـەتی بـۆ(دێـری بێـت قوقـا) وە چیایە لـە تەنیشتیەوە، ئەمانە بۆتە هۆی ئەوەی مێژوو نووسەکان بـە دوای ئـەو دێـرە نەگـەڕێن بۆیـە دەیانبینین دەیگوازنـەوە و دەیکەن بـە شـوێنی خـان تـور لـە نزیـك زاخـۆ، واتـە لـە خـاڵێکی دوورتـر لە سنووری باکوور بۆ(بانۆهەدار)([٤٢٨]).

بە کـردەوەی ڕۆڵـەکانی مارسـۆر یەشـۆع پێویسـتیان بـە کـاتێکی درێـژ نـەبوو بـۆ ئـەوەی بـە پیـادە بچـن بـۆ گەیشـتن بـە رەبـەن(برانسـیا) ئەمـە سـەلماندنێکی تـرە بـۆ چەسـپاندن و ڕوونکردنەوەکـە دا ئـەو چـیایە کـەوا زۆر نزیـك بـووە لـە دێـری(بێـت قوقـا) کـەوا باسـی دەکەین.

لەلایەکی ترەوە دەبێ تێبینی ئەوە بکەین کەوا(منکنا)([٤٢٩]).

کەوتۆتە هەڵەوە لە وەرگێڕانەکەیدا، لەبەر ئەوەی کاتێ وتوویەتی ماران عەمما سەرۆکی شەشەمی دێری بێت قوقا ڕۆیشتووە بۆ دێری مارسۆر یەشوّع کەوا لە(خان تور) مەوجود بوو. نازانین چۆن دانەر توانیویەتی وا دابنێت([٤٣٠]).

وە یا بیسەلێنێت ئەو بابەتە واتە دێری سۆر یەشوّع لە نۆهەدرایە کەوا نووسەری(العفە) باسی دەکات([٤٣١]).

لە واقیعدا و بە روونی دەقەکانی کلدانی ئاماژە بەوە دەکەن و دەڵێن کەوا: ماران عەمما(لە دێرەکەی خۆی، واتە دێری مارسۆر یەشوّع) لە بێت قوقا چووبووە چیای خان کە زۆر نزیکە لە شوێنی دێرەکە. لە کاتی بەڕێگاوە بۆ ئەوێ لای دایە گوندی(ئوبێت) کە ئێستاش پێی دەڵێن سوڵتان ئوبێد([٤٣٢]).

کە دەکەوێتە ناو چیاوە. کات هێشتا زووە بۆ ئەوەی زۆرترین نموونە لە شێوەی ئەم گوندە بدۆزینەوە لە چوارچێوەی مێژووی تایبەت بە دێری بێت قوقا.

## بێت قوقا

دێری مارسۆ یەشوّع ناسراو هەروەها بە دێری(بێت قوقا) دێرێکە تایبەتمەندی خۆی هەیە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ دێرەکانی تری کوردستان و باکووری عێراق کە هەیە. درێژەی مێژووی سەرەتاکانی دێرەکان و شوێنەواری پاشماوەکانیان بە کۆتایی هاتنی سەدەی سێزدەهەم بە درێژی لەبەردەستمان دا هەیە. ئەوەی تێبینی ئەم نووسینانە بە درێژی بکات لە سەر دێرەکان، بەڵام ئەم دێرە زیاتری لە سەر وتراوە و وردەکاری تیایە.

گەشەکردنی ژیانی رەبەنایەتی و گۆشەگیریان لە ماوەی ١٠٠٠ ساڵ بە پێی زنجیرەی ڕووداوەکانی مێژوویی وە بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی بەو دێرەوە هەیە(لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەداخەوە زۆربەیان دەبینین مێژووە دووردرێژەکانیان پارچە پارچە کراوە و زەحمەتی دیتنەوەیان بۆ بەستنەوەی پارچەکانیان هەیە) ئاسۆیەکی فراوان بۆمان دەکرێتەوە. ناوبانگی دێر و درێژەدان بە ژیان لە سەر زەوی واقیعدا، هەورەها بە ئاسانی تێپەڕ نەبووە لەبەرچاوی مێژوونووسەکان و نووسەرە کۆنەکان، ئەوانەی کۆششیان کرد، بۆ مەستبوونی ئارەزووەکانیان، بۆ دۆزینەوەی پەیوەندیەکان هەر لە سەرەتاوە لە نێوان ڕووداوەکاندا.(سەمعانی) هیچ جیاوازیەکی نەکردووە - کە ناتوانین پێوانەی بۆ بکەین بەهەڵگوتنەکانی، ئەگەرچی ئەو دەرگای ژیانی بۆ ئەم باسە نەکردۆتەوە - لە نێوان

سوریەشۆع دامەزرێنەری(بێت قوقا) لە حدیاب و سۆریەشۆع دامەزرێنەری دێری(بێت عاوا) شبیرە لە(بانۆهەدار)([٤٣٣]).

وە هەروەها جیاوازی نەکردووە لە نێوان دێری بێت قوقا و(دێری حسقیال، عذقیال) لە داقووقا ـ (مەبەستی داقوق داقوقە لە باشووری شاری کەرکوك ـ وەرگێڕ).

ئەوەی پەیوەندی بەو دوو دێرە هەیە، مەتران(ئەدیشێر)([٤٣٤]).

لە ماوەیەکی دوور و درێژ خەریکی ئەوە بووە بۆ جیاکردنەوەی ئەو دوو دێرە، بەڵام هەندێك لە نووسەرەکانی ئەم دواییە ئەوەیان لە نووسینەکانیاندا رەچاو نەکردووە([٤٣٥]).

وا دەردەکەوێت، کە زۆر پێویست نەبووە بۆ ناسین و جیاکردنەوەیان بە پێی ئەو پێشنیازەی قەشە(نو Nau)([٤٣٦]).

کردوویەتی بۆ نموونە جیاوازی لە نێوان بێت قوقا و گوندی بێت قوقی) کەوا مارۆسای تکریتی قوتابخانەیەکی بۆ یەعقوبیەکان تیا دامەزراند. ئەم گوندە لە دواییدا دەبینین دەبێت بە(باق) ی ئێستا کە دەکەوێتە سەر رێگای نێوان مووسڵ و زاخۆ، کە لە ژێر دەسەڵاتی ئەبرەشیەی یەعقوبیەکان بووە و ناسراوە بە(مەعلسا). لە واقیع و راستیدا، ئەو دێرەی کە ئێمە قسەی لە سەر دەکەین ئەو دێرەیە کە لە لایەن رەبەن سوریەشۆع دامەزرێنراوە کە خەڵکی(ئەوانا)یە، دواتر ناوەکەی کراوە بە(بێت قوقا) بە ناوی ئەو کەسەی کە لە نێوان ساڵانی ٦٥٠ ـ ٦٦٣ سەرۆکایەتی ئەم دێرەی کردووە بەهۆی کۆچی دوایی کردنی دامەزرێنەرەکەی لە ساڵی ٦٥٠ و بووە بە خەلیفەی ئەو([٤٣٧]).

پێشتر خەلیفەی دامەزرێنەر لە نەخۆشی گروێتی چاکبۆتەوە کە تووشی هاتبوو لەو ئاوەی کە لەناو دێرەکەدایە. دواتر چۆتە دێرەکە و بووە بە رەبەن، وە هەموو کێڵگە و سامانەی کە هەیبووە پێشکەشی دێرەکەی کردووە. لەلایەکی تر، پێمان باشە ئەوەش بخەینە سەر: ئەم دێرە لە نیوەی یەکەمی سەدەی(٧) ەم دامەزراوە. وە ئەمە کارێکی بەدواوە بووە بۆ دامەزراندنی دێرێك پێش ئەمە کە لەلایەن سوریەشۆع دروست کراوە، وە شوێنەوارەکەی ناسراوە بەدێری(الشهداء ـ شەهیدان) لە دواتر دا باسی دەکەین.

## سەرچاوەکان:

زانیارییەکانمان لە سەر مێژووی ئەو دێرە پشت بە دوو سەرچاوە دەبەستێ گرنگیەکانیان جیاوازن. یەکەمیان بێناوە بەڵام دەلیلی رەسەنایەتی کۆنی هەیە مێژووی ئەم سەرچاوەیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٨٢٠. بڵاوکراوەتەوە لەگەڵ وەرگێڕانە فەرەنسیەکەی لە سەر دەستی(منکنا) لە ساڵی ١٩٠٧([٤٣٨]).

دەقێکی کورت لە سەر ئەمە لەلایەن مەتران ئەدیشێر نووسراوە بە ماوەیەکی کورت پێش بڵاوکردنەوەکەی منکنا([٤٣٩]).

تێبینیەکانی هاتووە لەلایەن تۆما مەرگەیی زۆر نزیکە لە دەقەکانی پەرتووکی یەکەم وە هەوەرها ئەوەی کە(ئیشۆع دناح) بەسەری نووسیویەتی. لەمەدا ئەمەمان بۆ دەست دەکەوێت کەوا مەتران شێر لە سەر هەق بوو کە وای بیرکردۆتەوە هەر سێ دارنەرە یەکەمەکان، وە بە پێی ئەوەی یەکێکیان لە سەر ئەوەی تریان نووسیبێ وە یا گواستبێتەوە، هەمان سەرچاوەیان بەکارهێناوە. بەڵام دانەری مێژووی سعردی([٤٤٠]).

هەروەك دەزانین لە مێژوونووسە کۆنەکانە(ناوەڕاستی سەدەی یازدەهەم؟) وا دەردەکەوێت هیچ دیکۆمێنتێکی تایبەت بە رۆڵی مێژوویی دێرێ بێت قوقای لا نەبێت. ئەو زانیاریانەی کەوا تۆماری کردووە دیاریکراوە بە تێبینی دامەزرێنەر بەجێیهێشتووە. سەرەڕای ئەو دەقانەی کە نووسیویەتی، زۆر جار ئاڵۆزە، دەبینین دەنووسی، وە بۆ نموونە: لە نزیك ئەشکەوتەکە کە دێرێك تیایدا دەژیان(دێرێکی کۆن). بەبێ ئەوەی ئاشکرای بکات بە وردی کام دێرە ئەو دێرە؟ وە یا دەنووسی: (١٢ ساڵ لەگەڵ رەبەنەکان ژیاوە)... تاد. بەڵام ئەمە پێچەوانەیە، کاتێك دەیوێت وردەکاری بدات بە شڵەژاوی تۆماری دەکات لە نووسینی ناوەکان بۆ نموونە(ئیشۆع برنۆن) لە جیاتی ناوی(ئیشۆع سورەن). سەرچاوەی دووەم کە تایبەتەب بە بێت قوقا بریتیە لە هەندێك دەقی زێدەڕۆیی لە مەدحکردن و بە شان شەوکەت هەلگوتنی دامەزرێنەرەکەی کە دەگەڕێتەوە بۆ(گبریئیل قەمسا) میتراپۆلیتی مووسڵ کە لە کۆتاییەکانی سەدەی سێزدەهەم ژیاوە. ئەو شیعرانەی کە وتراوە لە ناو ئەو دەقانەدا هەیە، وە زۆربەی مێژوونووسەکان ئامازەیان پێی داوە کە لای ئێمە دیار نیە. وە من سوپاسی تایبەتی(قەشە شەمۆئیل جەمیل شوریز) دەکەم کە ئەو کاتە سەرۆکی دێری رەبەنەکانی کلدان بوو کە رێگەی پێدام بۆ ئەوەی بتوانم بەو دەقەکانی یەکێك لە دەستنووسەکان تایبەت بە دێری(السيدة حافظة الزروع)([٤٤١]).

پێدابچمەوە. دەقەکە زۆر ئاڵۆز و بێسەروبەرە: بۆ لێکۆڵەر پێویستە بۆ خوێندنەوەی(٦٤) لاپەڕە بە تەواوەتی بۆ ئەوە بۆ یەکەم جار ناوی قەدیس بدۆزیتەوە، وە پاش

خوێندنەوەیەکی دوور و درێژ و بێتام دەست دەکات بە هەڵبەستن، جگە لەمە هەموو ئەو دەستەواژانەی کە پیا هەڵگوتنە بەکەڵکمان نایەت بۆ زانینی ناوی دامەزرێنەرەکە. دەقەکە بە تەواوی بەکەڵکی بلاوکردنەوە نایەت، مەگەر خوا بۆ هەڵسەنگاندنی مێژوویی و بەس سەرچاوەکانی تر کە بەدرێژی باسیان دەکەین لە کاتی خۆیدا باسی دەکەین([٤٤٢]).

## دیاریکردنی شوێن و باری ئێستا

هیچ مێژوونووسێك نیە ناوی نزیکمان پێ بدات بۆ ئەوەی بەڵگەیەك بێت بۆ زانینی شوێنی دێرەکە، بەلام(منکنا)([٤٤٣]).
وە(ئەدیشێر) یش([٤٤٤]).
تەئکید لە سەر ئەوە دەکەنەوە کەوا وشێنەواری دێرێك هەیە دەکەوێتە نزیك زێی گەورە وە بە دووری ماوەی ٧ کاتژمێر بە پیادە لە رۆژئاوای هەولێر، وە دەتوانین بیبینین تاوەکو ئێستاش. مانای ئەو وتەیە بۆ کەسێکی لێکۆڵەر قسەیەکی ئاڵۆزە. ئەوەی باوە و زانراوە لەلای موسڵمانەکان وە هەروەها لای مەسیحیەکانیش([٤٤٥]).
شوێنەواری دێرەکە بەتەواوی بزربووە بەلام رۆژهەلاتناسەکان خۆیان ماندوو دەکەن و بەدوای ئەو دێرە دەگەرێن بە پێی وردترین نەخشەکە([٤٤٦]).
بە کورتی دەڵێین لە سەرمانە لەدوای بگەرێین بە پێی ئەوەی لە دەقەکان دا هاتووە. ئەوەی گومانی تێدا نیە: هۆکاری گرنگ بۆ زانینی شوێنی دێرەکە ئەو پەیوەندیەیە کە لە نێوان دێرەکە و زێی گەورە هەیە. دێرەکە پێویستە لە نزیك زێ بێت بۆ ئەوەی رەبەن برانسیا بتوانێت ئاو بە ئاسانی رابکێشی لە رووبارەکەدا([٤٤٧]).
لەوانەشە ئەگەر نۆکەرێکی بچوك هەبووبێت هەندێك دوور بووبێت، ئەو کۆمپانیایە ئارەزوومەند بووە بۆ هەڵکەندنی بە ماندووبوونێکی زۆر بۆ ئەوەی ناوی بۆ مێژوو تۆمار بکرێت! ناوی کانیاوە ناسراوەکە بە(صخرة الغربان) مەبەستەکەمان پێ نادات لەبەر ئەوە وشك بووە لە سەدەی هەشتەمەوە([٤٤٨]).
ناوی گوندەکان کە رەبەنەکان مامەڵەیان لەگەڵ دەکردن ئەوەمان پێ دەبەخشێ کەوا دێرەکە دەکەوێتە لای باکووری رۆژئاوای حدیاب، وە لەوانەشە لەنێوان(ئەسکی کەڵەك) درێژیەکەی زێی گەورە بە رووباری دیجلە بێت. نزیکترین گوند لە ناوچەی گوندی(بێت حەنیق) ە([٤٤٩]).
وە لەوانەشە ئەو گوندە زیاتر نزیکمان بکاتەوە لە گەیشتن بە ئامانج. واتە(بێت حەنیق) دەکاتە(مکان المخنوق ـ شوێنی خنکاو) نیشانەی روودانی خنکانێك بووە لەو شوێنە لە

مێژوودا بەڵام ناگرێت ئەمە بەو مانایە بێت بۆ شوێنی جوگرافیایی؟ هاوجووت بۆ مانا عەرەبییەکەی بۆ تاك(خنوقا)(خنکاو)(خنکێنراو) ئاماژە بۆ ڕێڕەوی ڕووباریدیجلە بەناوچەکە لە شوێنی ناسراو بە(الفتحە) دیجلە وەك خنکاو دەبینرێ. فەتحە دەکەوێتە نێوان دوو زنجیرە چیای(حەمرین و مەکحول) وە ئەگەر بمانەوێت زانیاریمان لە سەر بەشێکی ئەو ڕووبارە بزانین کە لە شێوەی خنکاو دەردەکەوێتن پێویستە لە کەپکە چیایەکە نزیك ببینەوە(دەمیرداغ) کە زۆر نزیکە لە زێی گەورە و تەریبە بۆ ڕێڕەوی زێ بەتەواوی. ئەوە تاکە ناوچەیە ڕاستەوخۆ دەکەوێتە سەر ڕووبارەکە و مەبەستی ناوەکە دەپێکێت. ئەگەر چاوێك بە نەخشە دا بخشێنین دوو گوند هەیە ئەو مەرجانەیان تیایە: شمادوبز(شمادبس) دەکەوێتە دووری چوار کیلۆمەتر بەلای سەرەوەی ئەم شوێنەی ئاماژەمان پێی دا وە ڕێگەی نوێی نێوان موسڵ و هەولێر پێیدا تێپەڕ دەبێت بە ڕووباری زێی گەورە بە سەر پردی(ئەسکی کەڵەك) نزیك گوندی مەلا عومەر، کە ١٥٠٠ مەتر لە ئەسکی کەڵەك دوورە بەلای خوارووی ناوی ئەو گوندە سەرنجمان ڕادەکێشێ، ناوی(عومەر) ئێستا، بەڵام بۆی هەیە ناوەکی شێوێندرابێت بۆ ناوی ئەومر ـ ئومرا) بەواتای دێر؟([٤٥٠]).
(ئەومەر ـ ئومرا ـ بە زمانی سریانی) ـ وەرگێڕ.

ئەگەر بەڵگەیەکی باوەڕپێکراومان دەست بکەوێت بەوەی ئەگەر بتوانین کانیاوەکە بدۆزینەوە لەو ناوچەیە کە ئاوەکەی بۆگەنیە وە ناوەکەی بە گوندێکەوە نووساوە لە واقیعدا ئەم گوندە پێی دەڵێن(عیناسریتا)([٤٥١]).

واتە(کانی بۆگەن)(وەرگێڕ). بەداخەوە ئەو جۆرە نەخشانەمان نیە بۆ ئەوەی شوێنەکانمان پێ بدات کە شوێنی دەرکردنی گازەکانی هایدرۆکاربۆنیە وە بە تایبەتی لە چیای(دەمرداغ). کەواتە دەبێ خۆمان بەدوای ئەو شوێنە بگەڕێین بە دووری چەند لە گوندی مەلائۆمەر ئەم کانیاوە دەدۆزینەوە؟ ئەوەی دەیزانین خەڵکی گوندی عێناسریتا بەردەوام لە ناکۆکی دابوون لەگەڵ ڕەبەنەکان بەهۆی ناکۆکی لە سەر سنووری جیاکردنەوەی زەویەکانی سەر بە گوندەکە و دانیشتوانەکەی و زەویەکانی سەر بە دێرەکە، چونکە ڕەبەنەکان بە هی خۆیان دەزانن، واتە سەر بە دێرەکە بوون. با دوور بکەوینەوە لە ڕووباری زێی گەورە بە دووری دوو وە یا سێ کیلۆمەترەوە بە ئاراستەی ڕۆژهەڵات وە یا بەرەو گوندەکە یا دێرەکە ئەو کاتە کانیە بۆگەنەکە دەدۆزینەوە. ئەو کانیاوە بە دووری پێنج بۆ شەش کیلۆمەتر لە زێ دوورە بە پێی ئەو نەخشەیەی لەبەردەستماندایە شوێنێکی جێگیری لە سەرە بەناوی(دێرە بیشبرماغ) ئایا ئەو ناوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گوندەی کە کانیاوەکەی بۆگەن و تاڵ بووە؟ لە هەوڵەکانمدا بۆ زانینی شوێنەکە خۆم

هەڵسام بەم کارە بۆ ئەوەی بیدۆزمەوە هەموو زانیارییەکانم خستە بەردەمی خۆم، وە بۆم دەرکەوت کەوا ئەو کانیاوە ناسازە و هەیە و دەکەوێـە نزیـك گونـدی(دارا) شـوێنەوارە چوارلایەکەی دێرەکەی(بێت قوقا) دەکەوێتە دووری چەند مەترێك بەلای باشووری رۆژهەلاتی گوندی(مەلانۆمەر) کە ڕێگایەکی تەریب بە رووباری زێ جیای دەکاتەوە و ئێستا جۆگەیەکی ئاودێری نوێ بە نزیکی دا تێپەڕ دەبێت. جۆگە ئاودێرە کۆنەکە پێی دەڵێین(نهر بهلول) نزیك بە شوێنەکە. ئایا بەهۆی ئەوەوە ئاو ڕاکێشراوە بۆ دێرەکە؟ وە یا جۆگەیەکی تر هەبووە بۆ ماوەی ٤٠٠ مەتر ڕاکێشراوە، بۆ گەیشتن بەزێ ؟ هەموو ئەوەی کە لە دەوری دێرەکەدا بووە بەرز کراوە و هیچ شوێنەوارێکی لێ نەماوە بەهۆی بلاوبوونەوەی کشتوکاڵ لە هەموو ناوچەکە. بینایەی دێرەکە بەتایبەتی، بە وێنەیەکی چوارگۆشە بۆمان دەردەکەوێ درێژی هەر لایەکی ٦٠ مەترە دیوارەکانی بەبەردی گەورە و گەچ دروست کراوە. سەرەڕای ئەوەی دێرەکە چۆڵ نەکراوە تەنها پێش ٣٠٠ ساڵ بەرزی دیوارەکانی لە ئاستی زەویەکە بەرزتر نیە بەدەووری بیناکە، وە ئەمە زۆر سروشتیە بەهۆی نزیکی بیناکە لە سنووری گوندەکە. پیاوە پیرەکانی گوندەکە دەیانوت کەوا دیوارەکانیان بینیوە بەرزتر بووە جێگەی حەوانەوەی مەڕومالآت بووە بە شەو وە یا بۆ ئاخینی کا(کادین) بەکاریانهێناوە.

زۆر ئاساییە کەوا خەڵکی گوندەکە لە کوردەکان هیچ لەوبارەیەوە نەزانن، ئەو بینایە چیە؟ وە ئاشکرێ کەوا پێیان بڵێین ئەوان بە شوێنەوارەکە دەڵێن(القصر - کۆشك).

بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری عێراقی، شوێنەکەی پۆلین کردووە بە شوێنەوار) بەبێ دیاریکردنی ناسنامەکەی. وە هەروەها قەدەغەی دەرهێنانی کەرپوچەکەی کردووە کەوا دیوارە ناوەخۆییەکانی پێ دروست کراوە. لە دەرەوەی چوار گۆشەی کۆتایی بیناکە چوارگۆشەیەکی بچوك هەیە کە بینایەی دێرەکەیە دوای بچوککردنەوەی قەبارەکەی کە تاوەکو سەدەی حەڤدەهەم هەبوو. لێرەوە لەسەر ئاستی زەویەکە لەلای رۆژهەلاتی دێرەکە شوێنەوارێکی کۆنتر هەیە وەك بینایەکی کۆن کە پێش ماوەیەکی زیاتر چۆل کراوە. وە هەروەها کانیاوەکەش دەدۆزینەوە لەوانەیە ئەو کانیاوە بێت کە(بێت قۆقا) پێی چاکبۆتەوە(رەبەن و سەرۆکی) دێرەکە لە دوا رۆژدا - وەرگێر).

ئەم کانیاوە تاوەکو ئێستاش ئاوی لەبەر دەڕوات لەلای باشووری دێرەکە.

ئێستا، ئایا لە تواناماندا هەیە شوێنی حەوانەوەی سەرۆکی دێرەکە(ماریۆحەننان) دیار بکەین(٦٧٥ - ٦٩٢) کە بە دووری ١٠٠٠ شەقاو(هەنگاو) دوورە لە بینایەی کۆمەڵی رەبەنەکان، کە پێشتر وێنەی باوك و باپیری لە سەر دیوارەکە کێشابوو؟([٤٥٣]).

بە تەریبی زێ و بە ئاراستەی باشووری خۆرئاوا بەردەوام بین وە پاش دە خولەك بە پیادە گردێکی بچوك دەبینین دەڕوانێتە زەویەکانی دەوروپشتی خۆی بە سەرکەشی و شۆخیەوە. لە تەپری سەریدا کۆمەڵێك گاشەبەرد هەیە و خڕ کراوەتەوە لە کێڵگەکانی دەوروپشتیدا وە هەروەها هەندێك کەرپوچەکان جیادەکەینەوە و دەناسرێن. شوێنەکە پێی دەگوتریٚ(جیرد المؤمن) واتە(گردی باوڕداران) وە یا(تل الشموع ـ گردی مۆم) مکان ـ (وەرگێڕ).

جا ئایا ئەمە نیشانەی سروتی ئەو کاتەی مەسیحیەکان بووە وە بەکاریان هێناوە، وە رەبەنەکانی درەنگ و کۆتاییەکان ئەوانەی کە لە دوای پێش خۆیان هاتن؟ نەوەکان ئەمانە نازانن. هیچمان نەماوە تەنها زانینی شوێنی گوندی(بێت حەنیق) واتە(بێت خنکاو) وە دیاریکردنی بە وردی. لەوانەیە شوێنەکە گوندی(شامەدیبیس) بێ کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێی دا، لەبەرئەوەی هیچ بەلگەیەکمان نیە بەبوونی گوندێك لە تەنیشت دێرەکە، واتە هەلکەوتنی گوندی مەلائۆمەری ئێستا.

دوای تەواوبوونم لەسەر ئەرزی واقیعدا ئینجا بە دوای قولآیی ناو جەرگی سەرچاوەکان دەگەڕێم. یەکسەر رۆژمێرێکی نەستوریم دۆزیەوە، لەگەڵ پەرتوکێکی تایبەت بە مندالآن(ئاشوریەکان) ئەم رۆژمێرەی ئاماژەمان پێی کرد لیستێکی جەژنەکان و یادگاریەکانی تیایە وە بە پێی زنجیرەی رۆژانی سالدا.(زانا قەشە یووسف قلێتا)([٤٥٣]).

هەڵساوە بە بلآوکردنەوەی ئەم رۆژژمێرە، وە دەڵێ ئەو گواستیتیەوە لە رۆژژمێرێکی کۆنتر و پێش ئەوە بلآوکراوەتەوە(لە ئورمێ سالی ١٨٩٤، پشت بەستن بە دەستنووسێکی کۆن تەمەنی نزیکەی ٥٥٠ سالٚ بووە. کەواتە ئەو نووسراوە لە سەدەی چواردەهەم وە یا پازدەهەم. واتە لەو کاتەی کە دێرەکەمان بابەتی لێکۆڵینەوە بووە. وە چالاکیەکانی بە گەرم و گوڕی بەرچاو بووە. کەواتە ئەو سەرچاوانەی کە پشتی پێ دەبەستین سەرچاوەی راستگۆ و روونن وەك ئەوەی تیشکی خۆر لێی بدات ئاشکرایە وە یا نووسینی رەش لە سەر لاپەڕەی سپیدا: لە رۆژی یەکشەممە یەکەم رۆژی مانگی تشرینی یەکەم لە هەموو سالێکدا ئاهەنگگێڕان بووە بۆ یادکردنەوەی رەبەن(مارسۆریەشۆع) لە دێری(بێتقۆقا) کە دەکەوێتە ناوچەی هەولێر و پێی دەڵێن(پێشبرماغ)(پێشبەرماغ) ـ (وەرگێڕ)([٤٥٤]).

پێشتر گۆڕانکاری لە ناوی(عیناسریتا) لە سەدەی(دەی) ز کرابوو، وە کرابوو بە دارا. شمشاتی([٤٥٥]).کەوا لە سەر سنووری زەوی بێت قوقا بووە تورکومانەکانی هاتوو نیشتەجێ ناوەکەیان دواتر کردووە بە(بێشبیرماغ) واتە(پێنج پەنجە) ئاماژەی بۆ ئەو پێنج گردەی لەناوچەکەدا هەیە ئەمڕۆ ناوی گوندەکە ناوێکی دوو بڕگەیە لە هەر دوو ناوەکە

هاتووە(دارا ـ بێشبیرماغ) وەرگێرانەکەی(دۆڵی پێنج پەنجەیە) لە کاتی ئاخاوتندا ناوەکە کورت دەکرێتەوە بۆ(دارا) و بەس.

## سۆریەشوع لە بێت قوقا

دامەزرێنەری ئەو دێرە(ئەوانە) ـ(ئەوینا)([٤٥٦]).

لەدایك بووی ناوچەی(تیرهانا) وە لە قوتابخانەکەی ئاینی گوندەکەیدا پەروەردە کراوە. سەرەتای دەستپێکردنی باوەڕی ئاینی بووە کاتێك زیارەتی شەهیدی دوا رۆژی کردووە(ئیشۆع سورەن) کە لە هەولێر بەند کرابوو لە ساڵی ٦٠٥ بۆ ساڵی ٦٢٠. پەرتوکی(العفە) بۆ دوورتر لەمە دەچێت و دەڵێ: سوریەشوع جلکی رەبەنی لە دەستی ئیشۆع سورەن خۆی وەرگرتووە([٤٥٧]).

لە مێژووی سعردیدا هاتووە ناوی رەبەن ئیشۆع سورەن گۆڕاوە و کراوە بە(ئیشۆع برنوون)([٤٥٨]).

کەوا حاکمی موسڵ بووە وە شا(خوسرەوی فارسی) فەرمانی کوشتنی بۆ دەرکردووە. بەهۆی هاتنە سەر ئاینی مەسیحیەوە مەتران شێر لە سەر ئەم بابەتە تێبینی هەیە و تایبەت بەم بابەتە دەڵێت هیچ زانیارییەکی لە سەر ئەم کەسایەتیە نەدۆزیەوەتەوە لە رووداوە مێژووییەکانی تردا. ئەم واقیعە نامۆ نیە تەنها نموونەیەکی زیندوو نەبێت بۆ زێدە گوتنی مێژوونووسەکانی قەدیسەکانی دوایی کەوا نەیانتوانیوە ئەوە رەچاو بکەن کەوا شەهیدێك رەبەن بێت و لە هەمان کات دا میر یان حاکم بووبێت ئەو پارچە شیعرەی کەوا(گبرئیل قەمصا) رێکی خستبوو ئەوەمان پێ دەدات کەوا سور یەشوع هاتۆتە هەولێر بەبێ دیاریکردنی هۆی هاتنەکەی لە هەولێرەوە ئەم لاوە بەردەوام بووە بە رێگە بەرەو رۆژئاوا تاوەکو گەیشتۆتە رۆخ رووباری زێی گەورە. لەوێ بارەگای لێ داکوتاوە و ماوەتەوە بەبەردەوامی لەوێدا پەرستگای وە یا شوێنی ئاینی رەبەنێك دۆزیوەتەوە بەناوی(هورمزد ئارامی)([٤٥٩]).

کە دەکەوێە نزیك دێرێکی کۆن دروست کراوە بەناوی شەهیدان. ئەمە یارمەتیمان دەدات بۆ دۆزینەوەی ئەو پەیوەندیە کە ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کەوا ژیانێکی خێڵەکی سەرسام هەبووە لە ئەشکەوتی(پەرستگای سور یەشۆع) دەردەکەوێت بە هەبوونی قاپێکی دروست کراو لە باسکی دارخورما و بە قیر و زفت چەور کراوە، بەکاری هێناوە بۆ تێکدانی تێکەڵاوکردنی سرکە. ئەم جۆرە قاپە وە یا کۆتکە تاوەکو ئێستاش لەلایەن عەرەبەکانی ناوچەی هیت بەکاردێت و پێی دەڵێن(المنشل). بوونی ئەم جۆرە قاپە و لەو شوێنەدا و لەو

کاتەشدا زۆر دەبەخشی، لەبەر ئەوەی، وە بۆ ماوەیەك و قۆناغێك لە ژیانی رەبەنایەتی کە لە باشووری عێراق چالاك بووە([٦٠]).

سور یەشوع جلی رەبەنایەتی لە دەستی رەبەنی خوا پەرست و تاکو تەنها وەرگرت، هەروەها بوکلەی سەر(واتە تاجی سەر) ـ وەرگێڕ. وە لەوێ جێگیر بوو مایەوە، هەر لەو کاتەوە، ئەو کات، خەڵکێکی زۆر لە دەوری ئەو پیاوە قەدیسە کۆبوونەوە و پێوەی پابەند بوون لە کاتی بەجێهێشتنیان و دەرچووندا. بینایەکانی دێری شەهیدان کاول کرا وە ئەو کاتەی کە(قەمصا) ئەگەر بە جددی وەریبگرین، دەڵێین لە کاتی هاتنی سور یەشوع تەنها سێ رەبەن مانەوە و بەس. دواتر ژمارەی رەبەنەکان بەرەو زۆربوون چوو دوای ئەوەی یەکەم کۆمەڵی بچووکی رەبەنەکان پێکهێنرا، داواکاریەکمان بۆ دەرکەوت ئەومیە بڕیاریان دابوو کەوا سور یەشوع سەرۆکیان بێت لە سەرەتا دا ئەم داخوازیەی رەتکردەوە، سەرەڕای سور بوون و جەختکردنی رەبەنی پیر و بەساڵاچوو رەبەن هورمزد و ئیلحاحکردنی بەبەجێهێشتنی خەڵوەتگەکەی دەرچوون لێی بۆ ئەوەی ببێتە باوکێك بۆ ژمارەیەکی زۆر لە رەبەنەکان. وەرەی سۆر یەشوع نەرم نەبۆوە و بۆ ئەوەی لە کەللە رەقی بێتە خوارەوە تەنها ئەو کاتەی کە میتراپۆلیتی هەولێر ئیشوعیاب کە ئەو دایمەزراند بە پەتریك لە دوا رۆژدا ساڵی ٦٥٠ ئەو کاتە بەمە رانەوەستا(سۆر یەشوع) کە هەر وەك سەرۆك بەڵکو زیاتر بۆی چوو بۆ ناونانی باشتر کە ئەویش چاکسازیکار - مصلح)، دواتر کۆتایی هات بە(دامەزرێنەر) دێرەکەی کرد ماڵێکی نموونەیی بۆ رەبەنەکان بە پێی ئەوەی کە(ئیشوع دنحا) نووسیویەتی ژمارەی رەبەنەکان بوو بە پەنجا لەگەڵ ئەوانەشدا شێخە ناودار و چاکەکەمان هورمزد ئارامیدایە.

## ساڵەکانی یەکەم لە ژیانی دێرەکە

دەتوانین ژمێریاری مێژووی دامەزراندنی دێرەکە بکەین بە تەئکید دامەزراندنەکەی، پێش داگیرکردنی ئیسلامی بێت(داگیرکردنی موسڵ لە ساڵی ٦٧٣) بووە، ئەمە بە پێی ئەو زانیاریە زۆرانەی هەیە، بووە هۆی پەیدا بوونی دوبەرەکی لە نێوان رەبەنەکان و داگیرکەرەکان. ئەمە لەلایەك و بەلام لەلایەکی تردا، سور یەشوع هەڵسا بە سەردانی ئیشوع سورەن لە هەولێر لە نێوان ساڵانی ٦٠٥ ـ ٦٢٠ دواتر بۆ(١٢) ساڵ لەلای مامۆستا و باوروحی هورمزد وەك قوتابی مایەوە، کەواتە مێژووی دامەزراندنی دێرەکە لە ساڵی ٦١٧ بوو بێت وەك(کۆنترین مێژوو) بۆمان هەیە تۆماری بکەین وە یا ساڵی ٦٣٢ وەك نوێترین مێژوو ئەو مێژووەی کەوا ئیشوعیاب لە قوبلانە بوو بە میتراپۆلیتی هەولێر، رەنگە یارمەتی دەرمان

بێت بۆ دەستنیشانکردنی وردتر بۆ مێژووی کە لێکۆڵینەوەی لە سەر دەکەین. بەڵام ئەم مێژووە ناسراو نیە لەلامان. بە پێچەوانەی ئەمە ئەو دەقەی لەبەردەستمان دایە زیاتر یارمەتیمان دەدات مادام ئاماژە بەوە دەکات تەئکید دەکات کەوا ئیشۆعیاب لە هەولێر بووە پێش ساڵی ٦٣٢.

بە رەچاوکردنی کارا بەوەی کە لە نووسینەکانی عمر و دا هاتووە وەك وتەی راست و ورد([٤٦١]).

ئەگەر سور یەشۆع ژیا بێ لە سەردەمی ئیشۆعیابی جدالی ٦٢٨ ـ ٦٤٤، کەواتە دامەزراندنی دێرەکە لە ماوەیەکی کورتتترە و دەکەوێتە نێوان ساڵانی(٦٢٨ و ٦٣٢). لە ساڵی ٦٣٧ هەندێك لە چەکدارەکانی سوپای داگیر کەر گەیشتنە دەوروبەری دێرەکە و بڵاوبوونەوە بەهۆی ئەو داگیر کردنەوە بە پێی ئەوەی کە تۆمار کراوە لە پەرتووکێك بەناونیشانی بێت قوقا وە لە مێژووی سعردی([٤٦٢]).

رەبەنەکان روویان کردە گوندێکی نزیك، واتە گوندی(بێت حەنیق)، کە نازانین کێ ئەو ناوەی لێناوە هەر لە ساڵی ٨٢٠ زانیاریمان لە سەر شوێنەکە نیە کە تیایا خۆیان قایم کردووە وە هەروەها نازانین ئەگەر لە قەڵاکە خۆیان بزر کردووە وە یا لە کەنیسە؟ تەنها ئەوەی دەیزانین وە لە چیرۆکێکی شیعریدا ئەمانە لە پشت شورەکانی بینایە روخاوەکاندا بوون، وە دوو(پەرچوو) روویداوە و رزگاریان بووە یەکەمیان هاتۆتەدی لە جەرگەیەکی(شەربە) ئاو کە هەموویان خواردوویانەتەوە وە پێی تێر بوون لە ماوەی ئەو چەند رۆژەی گەمارۆکە بەڵام دووەمیان لە کاتی شەڕ دا روویداوە هەر جارێك کە تیرێك لەلایەن هێرشبەرەکان بۆیان دەهات لەبەرامبەردا تیرێك لە ئاگری سووتێنەر وە یا بەردێکی گرگرتوو دەکەوتە سەر سەری دوژمنەکان و ریزەکانیان پێ پەرتەوازە بوو هەڵدەهاتن و ترس و دڵەڕاوکێ تۆقاندبوونی، ئەو کاتە دوژمنەکان یەکسەر تێگەیشتن مانای موعجیزە چیە و کشانەوە بۆ دواوە بە سەر شۆڕی گەمارۆکەیان شکاند کە بە زوڵم زۆرداری بەسەریاندا سەپێندرابوو بە شێوەیەکی دوژمنانە. داگیرکەرەکان تەنها بۆ دواوە نەکشانەوە و بەس، بەڵکو حەوت رەبەنیان بەدیل گرتبوو رادەستی سەرۆکی دێرەکەیان کردن کە لە دێرەکانی تر بەدیل گیرابوون. زۆر چیرۆك هەیە و دەگێڕدرێتەوە بۆ گەواهی ئەو موعجیزانە کە لە سەر دەستی دامەزرێنەری دێرە قەدیسەکە هاتۆتەدی لەوانە: ئەو موعجیزەیەی کە جوتیارەکانی رزگار کرد لە هێرشێکی گەورە بۆیان هات وەك لافاوێکی بەربڵاو ناچار بوون روویان کردە دوورگەیەك لە ناوەڕاستی رووباری زێدا لە ترسی زوڵم و ستەمی عەرەبەکان([٤٦٣]).

لێرەدا باس لە ئاخاوتنێك دەكرێت بە شێوەیەكی سادە و هێمنانە لە نێوان سەرۆكی دێر و دامەزرێنەرەكەی لەگەڵ نەیارەكەی بۆ دروستكردنی موعجیزە و جیناس واتە لە نێوان ئەو و نێوان میترابۆلیتی سۆر یشوٚع لە كەرخ دەبیت سلۆخئەم بەربەرەكانیە روویداوە لەو ماوەی دەكەوێتە دوای داگیركردنەكانی عەرەبی، مادام روداوە مێژوویەكان سودیان هەیە كەوا رێورەسمی بوونی ئەو میترابۆلیتە لە ساڵی ٦٤٤ بووە([٤٦٤]).

لە دوای رووانەدنی تەمامی رەبەنایەتی كەوا ئەو رەبەنە چاندویەتی و سەرپەرشتی كردووە بە شەو بە رۆژ ئەنجام گەورە بووە و گەشەی كردووە و سێبەری پەیدا كردووە و لە ژێریدا ژیاون لە قەشە و رۆڵەكان و نەوەكانیان بە ژمارەیەكی زۆر. رەبەن سۆر یشوٚع هەستی بەوە كردووە كەوا ئەو كاتژمێرە هات بۆ ئەوەی ئەو جیهانە بە ئاشتی و دڵنیاییەوە بەجێ بهێڵێ، ئەگەرچی تەمەنی گەورە نەبوو. بۆیە ئەوە دەڵێین لەبەر ئارەزووی بەتریكی نوێ: ئیشوٚعیابی حدیابی كە لە هاوڕێ دێرینیەكانیەتی، بۆ ئەوەی بیكات بە میترابۆلیتی حدیابی لە دوای خۆی. ئەم پەتریكە هاتە سەر كورسی جاسلیقی لە ماوەی نێوان ساڵانی ٦٤٧ وەیا ـ ٦٥٠ ٤٩٠ لە دوای ٢٥ رۆژ گەیشتنی بە پەتریكی نوێ كۆچی دوایی كردووە لە ئابی ساڵی ٦٥٠ كە دوورترین مێژووە دیاری دەكەین. لە دوای كۆچی دوایی سور یشوٚع هیچ كەسێك جورئەتی ئەوەی نەبووە دابنیشێت لە سەر كورسی سەرۆكایەتی دێرەكە بۆ ئەوەی لە دوای ئەو كارگێڕیەكەی بكات([٤٦٥]).

كورسی سەرۆكی دێرەكە بۆ ماوەی(١٣) ساڵ بە بەتاڵی مایەوە، بۆیە كۆمەڵی رەبەنەكان جۆش و خرۆشی كونیان نەما، رەبەنەكان پەرت و بڵاومیان لێكرد لەو ماوە سەختەی بەسەر مێژووی دێرەكەدا(قوقا) دەركەوت، بەهۆی چاككردنی شیفای وەكو سەرسوڕهێنەر، چووە ناو دێرەكە و تۆقاندنی لە كاتی ئەوەی سەرۆكی دێرەكە نازناوەكەی(قوقا) ی دێرەكە و موڵك و ماڵ و زەویەكانی وەرگرت. گبریەئیل قمصا ـ قەمسا ـ باسی قوقا دەكات بە(پاشا) وە باسی دێرەكە دەكات و دەڵێ بینایەكی زۆر گەورە و جوان بووە و چەند باخچەیەكی دەوڵەمەند و ژمارەیەك گوندی هەبووە. لە راستیدا لەوانەیە كەمتر لەو باسە بووبێت. ئەگەر ماوەكەی نێوان دێرەكە و(عێناسریتا) وەربگرین دەبینین ئەو زەویانەی ئاماژەی پێ كراوە زۆر دوور هەڵناكشێ لەو رۆژانەدا ئەو نازناوە(پاشا) لای نەستۆریەكان بووە، زۆربەی زیاتر لەوە نەبووە بێتە سەرۆكی گوند تەنها ئەوە بووە.

## مارمیخائیل ترعێلی قوتابی سۆر یشۆعە:

ئەگەر بەدوای کەسایەتیەك بگەڕێین کە جێگەی ڕێز و شانازیە لە ناو ڕەبەنەکاندا لە دێری بێت قوقا ڕۆڵەکانی دامەزرێنەر سور یشۆع، ئێمە هیچ ڕەبەنێك نادۆزینەوە چاکتر لە(مارمیخائیل) دامەزرێنەری دێری(ترعیل) دەکەوێتە نزیك(عوزائیل) - (عوزیل - وەرگێڕ). جێگەی سەرسوڕمانە کەوا ناوی میخائیل لە ناو لیستی ڕۆڵەکانی ڕوحانی سۆریشوع دا نیە([٤٦٦]). وە نە لە لیستی هەڵەسەنگێراوە بەناوبانگەکاندا([٤٦٧]).

وە نە لە کۆتایی لە ناو تۆمارگەی دوا ناوەکانی پیاوە مەزنەکانی ئەم دێرە([٤٦٨]) دا.

ئەوەی تێیدا دەبینینوێنەیەك هێمایە بۆ کۆمەڵی ڕەبەنەکان وەك خێزانێکی تایبەت بەو دێرە، وە لە وێنەکەدا وێنەی جەستەی دامەزرێنەر ئاماژەی پێ کراوە وەك ڕۆناکیەك بە چواردەورەیا، لە وێنەکەدا دامەزرێنە سۆر یشوع نیشانەی سەرە، وە ئەو روناکیانەی لێی دەردەچێت: لە کەپوو، گوێچکەکان، دەستەکان، سینگ. سەرجەم قوتابیەکان لە بەردەم قاچیەوە دەبینرێن، وە بە هەر دووکیان ڕێبازەکە جێبەجێ دەبێت بەرەو خودای ئاسمان دا. دوای تێڕامان ڕەنگە بپرسین:(لەبەرچی لەو وێنەیەدا میخائیل دوور خراوەتەوە لە نێوان ڕەبەنەکان دا کە ناسنامەیان دیار نیە، بە بێ ئەوەی هیچ ڕێزێك بۆی دانرابێت ئەگەرچی دامەزرێنەر بووە؟). مێژووی ئەم دێرە تەنها بۆ جارێك ناوی(دێری ترعیل) ی هێناوە([٤٦٩]).

کاتێك باسی(دناح مارن) مەترانی(حبتۆن) دەکات، دەربارەی دەڵێ:(ئەویش هەروەها ڕۆڵەی ئەو دێرەیە کەوا لەلایەن(ئەبونا - قەشە - وەرگێڕ) دروست کراوە لە تەرعیل) ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەوا سەرۆکایەتی هەر دوو دێرەکە و خاوەنداریەتی بۆ(سۆر یشوع) بە شێوەیەکی لاوەکی وە یا ناڕاستەوخۆ گەڕاوەتەوە. لەبەرچی ئەم هەڵسوکەوتە نالەبارە لەگەڵ میخائیلەوە وەلاوە نانی بەم شێوەیە؟ ئایا حەسودیەکی شاردراوە هەبووە لە نێوان دێری بێت قوقا و ترعیل؟ وە ئایا هەستیاری تاوەکو ساڵی ٨٢٠ هەبووە بەردەوام بووە،کاتێك ئەو نووسەرە نەناسراوە مێژووی تایبەتی(بێت قوقا) نانووسیوە؟ ئەگەر دەقەکانی پەرتووکی(العفە) بە هێواشی و وردی بخوێنین، تێبینی ئەوە دەکەین کەوا لێکتێنەگەیشتنێك هەیە، سەرەتایەکەی بریتیە لە ناکۆکیەك روویداوە لە نێوان میخائیل و مامۆستایەکەی(سۆر یشوع).

(ئیشوع دناح) هەر دەم ناوبژیوانی چاکە بووە لە نێوانیان و ڕابەری بەجێ بووە بۆ هەردوو لا. وا دەردەکەوێ کەوا زۆر جەختی لە سەر کردووە بۆ ئەوەی بەخێر بچێت قوتابیەکە دێرەکە بەجێ بهێڵێ پاش ماوەیەك لە ئاشتبوونەوە([٤٧٠]).

ئێمە پێویستیمان بەومیە و ناچارمان دەکات بۆ ئەوەی بەدیاری بخەین ئەو ئاشتیەی کە ئاماژەمان پێکرد کۆتایی هات بەکتوپڕی و بەبێ پێشەکی. وە هۆکارەکەشی بۆ ئەو رووداوە هاتنی دۆستێکی نوێ بۆ ئەو دێرە و ئامادەکردنی ژمارەیەکی زۆر لە پەرتووك و کەلوپەلی رازاندنەوە و خێراتی تر. لە هەمان کات دا ئەو کەسە نەناسراوە رووداوەکانی دێرە سەرەکیەکەی(دێری دایك) تۆمار دەکرد، کەوا دڵی پێ ئارام نابێت بەم تیمار کردنە. لەمەدا تێدەگەین کەوا چاکە بە بێ دەنگی و دان بەخۆنانەوە ئەوە لە بیر بکەین ناوی سەربازە هەڵاتوەکەمان لە دەستی دوژمن.

سەردەمی سۆر یشۆع: یووسف لە کابیساو ئەبراهامی برای

برایان(یووسف و ئەبراهام) خەڵکی(کابیسا) ن لە دەقەکانی پەرتووکی مێژووی دێری بێت قوقا ناسراون، باسیان دەکات کەوا تیمی یەکەمن و رۆڵەی راستەقینەی سۆر یشۆعی روحی بوون. هەروەها لە وێنەکەدا(وێنە روناکەکە) دیارن و جیا دەکرێنەوە کە لە پێشتر باسمان کردووە([٤٧١]).

ژیانیان پڕ بووە لە خوا پەرستی و نوێژو سك هەڵکوشین بە پلەیەکی سەرسوڕهێنەر کە بڕوا ناکەیت، ئەمە سەرەڕای ئەو پەرچووانەی کردویانن کە پاڵپشتی بەهێزی ئەم دوانە بوون لەلایەن مێژوو نووسانەوە بۆ ئەوەی مێژووی ژیانیان تۆمار بکەن. ئەو دوانەش ئەمانە:

رەبەن(ئەبنی مارەن) کە لە سەردەمی ئەوانە بە یەکەوە بوون، وە رەبەن(سۆر یشۆع رۆستەم) کە لە دواتر باسی دەکەین([٤٧٢]).

پەرتووکی(العفة) و پەرتووکی(الرؤساء) ئاماژەیان پێ دەدەن([٤٧٣]).

شوێنی لە دایك بوونیان(کابیسا) یە، لە ناوچەی(مەرگە) بە پێی نووسینی تۆما مەرگەیی) شوێنەکەی دەکەوێتە باکوری(بێت عاوی) وە بە دووری چوار کیلۆمەتر، ئەمڕۆ لەوێ، کرباد نهلە ـ گۆباد نەهلە)(جب نەهلە ـ نەهلە)([٤٧٤]).

جلکی رەبەنایەتیان لە دێری بێت عاوی لەبەر کردووە([٤٧٥]).

لەو دێرەدا ژیاون تاوەکو کۆچی دوایی کردنی(مار یەعقوب) دامەزرێنەری دێرەکە. لەوانەیە ئەوە لە نێوان ساڵانی ٦١٥ و ٦٢٥ روویدا بێت([٤٧٦]).

دواتر لە دێرەکە کشاونەتەوە بۆ چیای زینای بۆماوەی(١٥ ساڵ) لە ناو ئەشکەوتان دا خەریکی نوێژ و رۆژوگرتن و تاعەتی خودا بوون لە کاتی دابڕانیان لە جیهان، گوێبیستی ناوبانگی سۆر یشۆع بە گوێیانا چڕپاندوویەتی و چوون بۆ لای و بوونەتە قوتابی ئەو. یووسف مردووە پێش مامۆستا روحیە نوێیەکەی، وە لە(بیت الشهداء ـماڵی شەهیدان)

نێژراوەکە تایبەتە بە دێرەکە. دەڵێن هەر لەو ڕۆژەی جلکی ڕەبەنایەتی لەبەر کردووە تاوەکو کۆچی دوایی کردنی هیچ چێشتێکی کوڵاوی نەخواردووە. سۆر یشوع ژمارەیەك ڕۆڵەی روحی هەبوو. لەبەر درێژی ماوە مێژووەکە بۆ بەدواچوونیاندا، بۆیە وام پێ باشە بیانکەم بە چەند کۆمەڵێك لە دوای لیستەکەدا وە بەپێی زنجیرەیی مێژووی نزیك لە واقیع دا. سەرۆکەکانی دێرەکە لێرەوپاش دەناسرێن بە ناوی دێری(بێت قوقا) نەك بە ناوی دامەزرێنەری دێرەکە هەروەك لە پێشوودا ئاماژەی پێ کردووە.

## سەرۆکەکانی دێری بێت قوقا

هیچ سوودێکی نیە بۆ چاوخشاندن بە درێژی لە سەر ژیانی سەرۆکەکان، بەڵکو ئێمە تەنها باس لە ڕووداوەکان دەکەین کە گرنگە بۆ مێژوو و جوگرافیای خۆجێیی و لەوانە و بەس:

(١) ـ مارِ حەننان ئیشوع:

کاتێك بەتریك جۆرج گۆرگیسی یەکەم(٦٦١ ـ ٦٨٠) سەردانی دێرەکەی کردووە. چاوی بە دێرەکە کەوتووە کە سەرۆکی نیە، بۆیە ڕەبەن حەننان ئیشوعی کردووە بە سەرۆك([٤٧٧]).

بە ڕچەڵەك خەڵکی(نەحشیروان) لە حدیاب([٤٧٨]).

تاجە گوڵێنەی لە دەستی دامەزرێنەرەکە وەرگرتووە. لەو پەرچوانەی کە کردوویەتی زۆرن یەکێ: لەمانە پیاوێك لە نەخۆشیدا چاکردۆتەوە کە لەگەڵ ڕەبەنێك دا هاتووە کە لە نزیك پردی زێی گەورە دەژیان، هەروەها موعجیزەی نەخۆشێك لە(قنائی ـ قەنائی)([٤٧٩]).

(منکنا) ماوەی سەرۆکایەتی حەننان ئیشوع دەئاخنێتە ساڵانی نێوان(٦٦٣ ـ ٦٧٥) لە دوای کۆچکردنی لە(ماڵی شەهیدان) نێژراوە.

(٢ ) ـ مار یۆحەننان

لە(حەززە) لە دایك بووە، لە لاوێتیدا ژیانێکی ناجێگیری هەبوو. لە سەرەتادا لە دەستی چاودێرانی سەربازی سەر بە خەسرەوی دووەم پەرویز هەڵاتووە. دواتر بۆ جاری دووەم لە کاتی هێرشی دیلمانیەکان، دوای لەبەرکردنی جلکی ڕەبەنایەتی لە دێری بێت قوقا زۆریش لەوێ نەمایەوە، بۆیە بەگەڕانێکدا سەری هەلگرت بۆ بەدواچوونی ڕێگایەکی سەخت زەحمەتە بە وردی دیاری بکرێت، لەمانە قۆناغێکی تایبەت بە ڕووباری دیجلە و پەڕینەوەی بە پیادە لە سەر ئاوەکە و بە شێوەیەکی سروشتی لە گەڕانەوەیدا برایەکەی یاوەری بوو بە ناوی(کاوسیشوع) خۆی خەریکی نوێژ و ڕۆژ و خەریك کرد لە ئەشکەوتێکی چیای زامیر کە زۆر دوور نیە لە دێری بێت قوقا. لەوێدا، ڕۆڵەکانی سۆر یشوع سەردانیان

کرد و داوایان لێ کرد بۆ ئەوەی ببێتە سەرۆکیان، رەنگە ئەو رووداوە لە نێوان ساڵانی ٦٧٥ ـ ٦٩٢، وە یان ٦٩٣ بووبێت([٤٨٠]).

دەقەکانی تۆمارکراو لە سەر ژیانیدا باسی دەکات بە(تێرامانی گەورە)([٤٨١]).

(بەهۆی خۆشەویستی زۆر بۆ تێرامان) بۆ باری روحی ئەو ناوەیان دا پێی و گواستراوەتەوە بۆ نووسینەکانی یەعقوب حەزایا([٤٨٢]).

(الرائي) پێشبینی مردنی کراوە لەلایەن قەشە شەمعون لە دێری(سین)([٤٨٣]).

(٣) ـ شوحالمارەن

ئەم سەرۆکە بە پێی رای منکنا، سەرۆکی دێری بێت قوقا بووە لە ساڵی ٦٩٣ بۆ ساڵی ٧٢٩، وە جێگای رێز لێنانە بە هۆی ئەو ئاماژەیەی کە لە پەرتووکی(العفە) دا هاتووە([٤٨٤]).

لەبەر ئەوەی مێژووی ژیانی نووسراوە لەلایەن(یوزاداق) بۆیە ناوی هاتووە لە لیستی رۆڵەکانی روحی سۆر یشۆع([٤٨٥]).

رەچەڵەکی(شوێنی لە دایك بوونی) شەوحالمارن لە(شیشۆح) ە([٤٨٦]).

شوێنەکەی نزیك(مەعلتایە). دوای بەسەربردنی سی ساڵ بە وەرزشی روحی بەردەوام دیاریکرا بۆ ئەوەی ببێ بە سەرۆکی دێرەکەوە لەو شوێنە مایەوە بۆ ماوەی ٣٥ ساڵ. بەناوبانگە بۆ دروستکردنی (پەرچووەکان) Moreapostolorum بەناوبانگترین موعجیزەکانی ئەو موعجیزە تایبەتەیە: دزەکان کە دەهاتن کوێر دەبوون، وە ئەوەی تایبەتە بە کافری بەد رەوشت کە گۆرانیە بەدڕەوشتەکەی لە بیر کردووە، وە دوای موعجیزەی ئەو حاکمەی کە هێوری کردەوە. لەو شوێنانەی کەوا موعجیزەکانی تێدا روویان داوە ئەمانەن:(هیکالا، وە(خەربات شبلیا)([٤٨٧]).

لە دوای ژیانێکی پڕ لە خێر و بەرەکەتی روحی، شوحالمارن گەیشتە کاروانی پێش خۆی و لەگەڵ وان نێژرا لە ماڵی شەهیدان کە لە بێت قوقایە.

(٤ ) ـ رەبەن برانسیە

بڕانسیە دوا سەرۆکی بێت قوقایە لە کۆمەڵی یەکەم. ژیاننامەی لەلایەن میترابۆلیت (شوحالمارن) نووسراوە (لە سەدەی هەشتەمی ز). گواستنەوەکانی زۆر ناوەڕۆك و سەرچاوە مەسیحیەکانی لە زانستە جوگرافی گرنگ و بەکەڵك لەو ماوەدا دەوڵەمەند کردووە ([٤٨٨]). لە دایك بووە لە(حریم)([٤٨٩]). لە کەرتی حدیاب دا. جلکی رەبەنی لە دێری(مار ئەیوب) لەبەر کردووە. دواتر گواستراوەتەوە بۆ دێری بێت قوقا. وە بۆتە قوتابی سەرۆك(شوحالمارن) دواتر بۆتە خەلیفەی ئەو لە سەرۆکایەتی کردنی دێرەکە. لێرەدا پێویستە لە سەرەم ئاماژە بۆ ئەوە بکەم، کەوا سەرۆك شوحالمارن پێشتر دیاریکردنی رەبەن برانسیا بۆ سەرۆکایەتی

دێــری مارنەســتۆرس رەتکــردووە ســەرەڕای جــەختکردنی پۆحــەننان میتراپــرۆلیتی ئەربیل([490]).

دوای کۆچــکردنی(شــوحالمارن) لــە دەوری ســاڵی ٧٣٩ بــە پێــی نووســینی منکنا.هــەر کــە رەبەنەکانی دێری بێت قوقا ویستیان رەبەن برانسیا ببێتە سەرۆکی دێرەکە، بەمە رازی نەبوو هەڵات بۆ دێری مارحسقیال لە سەرەتادا([491]).

بەڵام بە هۆی سۆزی بۆ نیشتمانی دایك، وە بەو خەیاڵەی کەوا خەتەرناکیەکەی لە سەر لاچووە بە هۆی کردنی رەبەنێکی تر بۆ سەرۆکی دێرەکە برانسیا گەڕایەوە دەوروبەری نزیك بە دێرە رەسەنەکەی، لە چیای خان نیشتەجێ بوو و مایەوە. خوا نوێژەکانی رۆڵەکانی سۆر یشۆعی قبوڵ کردو گەڕایەوە لایان و بوو بە سەرۆکیان هەر وەك دەیانویست. برانسیا سەرۆکایەتیەکەی وەرگرت و خەریکی کاروباری کارگێڕی بوو بە هۆی تواناو زیرەکییەوە. ماوەی سەرۆکایەتی کردنی بەبەرهەمترین ماوە دادەنرێت. بۆ جێبەجێکردنی خۆشگوزەرانی رەبەنەکان ئەم سەرۆکە هەڵسا بە گۆڕینی ڕێڕەوی رووباری زێ، وە وای کرد کە بە نزیك دێیەکەدا تێپەڕ بێت لە کارە گرنگەکانی برانسیا کە لە ماوەی سەرۆکایەتی کردنی جێبەجێ کرا ئەمانەن: کۆتایی هاتنی دوژمنایەتی لەگەڵ خێڵی(عەنزە)([492]).

بە هۆی ئاشێکەوە. لەبەر ئەوەی هی دێرەکە بوو هەڵسا بە وشککردنەوەی جۆگەی ئاوەکە(جدول صخرة الغربان) واتە(جۆگەی بەردی نامۆیان) کە ئەو ئاشە دەکەوتە سەریەوە، دوای بڕینی ئاوی جۆگەکە تاعەتیان کرد. بەم شێوەیە(رۆڵەکانی خێڵی عەنزە) سەرچاوەی ئاوەکەیان لە دەست دا کە ئاویان لێ دەخواردەوە، وە پێویستیان بە خواردنەوە و ئاودانی ئاژەڵەکانیان و پێداویستیەکانی ناو ماڵ بوون. لەوانەی کە لەناوچەکە نیشتەجێ بوون، دەست بە سەرگرەکان بوون بە سەر زەویەکان بەردەوام هێرشیان دەکردە سەر رەبەنەکانی دێرەکە و زەویەکانیان، ناوی ئەو گوندانەی سوودمەند بوون لە موعجیزەکانی برانسیان زانراوە، ئەم گوندانە لە هەموو حدیاب بلاّوبوونەتەوە، تاوەکو ناوچە دورەکانیش. بەڵام شوێنەکانیان زۆربەیان تاوەکو ئێستاش نەزانراوە. نوێژەکانی یارمەتی پیاوێکی نەزۆکی دا(لەوانەی ناسراون بە ریبینەکان) Rebeen([493]).

کوڕێکی بوو کە چاوەڕوانی درێژی بۆ دەکرد. وە هەروەها بینینی ناو ماڵ لە(بێت قەسری)([494]). گەڕان بە دوای شوێنەواری بینایەکە کە پێی دەڵێن(کەلاوەکان).. تاد. هەروەها هەندێك گوند هەیە ناوەکانیان: (بێت کزای)(بێت مازای) وە(بێت زەگای) وە

(بێت بوعەی) تاوەکو ئێستا شوێنەکانیان نادیارە بۆ لێکۆڵەر لەبەر ئەوەی زانیاریان لە سەر نیە([495]).

بەردەوام بوونمان لەگەڵ رەبەن برانسیە و پەرچووەکانی کە دروستی دەکرد دەمانگەیەنێتە ناوچەیەکی ناسراو و بەناوبانگ لەوێ رەبەن برانسیا راوەستاندنی هێرشی نەخۆشی گرانەتای راگرتووە کە لە گوندی(قازان) بڵاوببۆوە. کە تاوەکو ئێستا شوێنەکەی لەلامان بزرە. بەڵام دەزانین کە دەکەوێتە ناوچەی(حبتۆن) لەوانەیە کۆچی دوایی رەبەن براسیا لە ساڵی ٧٤٨ ـ ٧٥١ بووبێت([496]).

(٥ ) ـ ماوەی چۆڵبوونی کورسی سەرۆکایەتی

ئەم ماوەیەی دێت ماوەیەکی تایبەتیە بە سەرۆکە کاتیەکان لە سەریان بووە بەرهەڵستی داگیرکەرەکان بکەن کە لە زەویەکانی تەنیشت دێرەکە نیشتەجێ بوون. زۆر جار ئەو داگیر کەرە زۆردارانە هەڵدەستان بە داگیر کردنی زەویەکانی دێرەکە و ناوە ناوە هێرشیان بۆ دەهێنان. وە یا ماڵەکان و کەلوپەلەکانیان تاڵان دەکرد. سەرۆکەکانی دێرەکان بەرامبەر بەو دوژمنکاریە و ستەمکاریانە رادەوستان و هەندێ جار دەستەوەستان رادەوەستان، هەندێ لەو سەرۆکانە هەوڵی بەرهەڵستی ئەو ستەمکاریانەیان نەدەکرد. وە کاتێك هەستیان بە پێویستی هێنانی هێز دەکرد مەیدانەکەیان چۆڵ دەکرد و بۆ ناوچەیەکی دوور هەڵدەهاتن. کێ بوون ئەو(درندانە) کە ببوونە ماندووبوون و سەرئێشەی زۆر بۆ ئەو رەبەنە هەژارانە؟ کە هیچ شتێکیان لەو دونیایە نەدەویست تەنها خواپەرستی نەبێت و خزمەتکردنی رۆڵەکانیان نەبێت لە ناوچەکەیان، لەوانەیە ئەو دوژمنانە لە خێڵی(بنی ئەسەد) بووبن. وە داگیرکەرەکانی زەویەکان کە لە پێشەوە ئاماژەمان پێ دا وە لەوانەیە لەگەڵ ئەمانەش هەندێك لە عەرەبەکان(مەعاد) و (تەعالب) وە یا(تەئالب ـ Taleb کە برسێتی تەنگی پێ هەڵچنی بوون، لە ناوچەکانی خۆیان دەرچوون وەك داگیرکەر. نموونەی ئەمانە رووداوەکانی ساڵی ٧٢٢ باس دەکەین.

لە ئەنجامی داگیرکردنیان بووە هۆی بڵاوبوونەوەیان و نیشتەجێبوونیان لەو زەویانەی دەکەونە کوردستانی عێراق لەگەڵ حوشتر و مەڕ و ماڵاتەکانیان. بە پێی سروشتی ئەم کردەوانە دێری بێت قوقا ناوچەکەی لە دەرەوەی ئەم داگیر کردنە نەبوو، بەڵکو زەویەکانیان داگیر کرد و تیایدا نیشتەجێ بوون بە شیر و زوڵم و دوژمنکاری و ستەم و زۆرداریەوە([497]).

هەندێك لەو سەرکردەی داگیرکەرەکان کە لە گوندی(عێنا سریتا) نیشتەجێ بوون. دواتر وە زۆر بە داخەوە بەناوبانگ بوون و مێژوو باسیان دەکات. کەچی سەرۆکی دێرەکان لەبەر

بەدبەختی خۆیان نە مێژوو باسیان دەکات هیچی تر دەربارەیانەوە تەنها یەکێکیان نەبێت ئەویش(مارقنوبایا)([498]).
ئەم سەرۆکە هەوڵیداوە سنوورێك بۆ ئەم دوژمنکارانە دابنێت، وە جێگیری سنووری زەوی و زاری دێرەکە بکات بە دادپەروەری وە هەروەها هەوڵی داوە ڕێز لە دێرەکە بگرێت لەلایەن دراوسێکانەوە لە گوندی(عێناسریتا) وە قەدەغەی کردن کەوا دەست درێژی بکەنە سەر بینایەکە و تاڵانی بکەن، کەچی تیایە، بەلاّم ئەوەیان بۆ نەچووە سەر کوشتیان بە بەردباران کردن لە ساڵی ٧٥٠. ئەوەی لەیادمانە کەوا(عێناسریتا) گوندی(دێر بێشبەرماغ) بوو، ئەو دەقەکەی کەوا(شمشانی) نووسیویەتی لە دوای ٢٠٠ ساڵ نیشانەی ڕووداني کارەساتی بێهودە بووە لەبەر ئەوەی دەیخوێنین: (بە تێپەڕ بوونمان گوندی(دارا) مان بینی کە دەکەوێتە سنووری زەویەکانی دێری قوقا).
لەو سەرۆکانەی کە سەرۆکایەتی کورسی دێرەکەیان کردووە لەوانە(قەدیسی مازنتنائیل) مێژووی دێری بێت قوقا هیچ دەقێکی تایبەت بەمەی بۆ بەجێنەهێشتووین([499]).
زۆر بەداخەوە ئەو دەقەی کەوا(ئیشوّع دناح) نووسیومتی تایبەتە بە(نتنائیل) بڕ بڕ کراوە: ئەوەی کە دەیزانین خەڵکی(مەرگە) بە ڕەچەڵەك بەناوی گوندە بزرەکەیە. ئەو تێبینیانەی کە پەیوەندی بە نتنائیل هەیە بە پارچە پارچەیەوە لە دوا دەقی پەرتووکی(العفە) باسی ڕووداوەکانی دێری بێت قوقا دەکا. وە لەوانەیە پرسیار بکەین ئەگەر دەقی تەواو زانیاری تەواوی تیا نەبێ، وەلاّم نیە بە تەئکید دەتوانین شتێکمان دەست بکەوێت لە سەر ئەو کێشەیە مادام دەقە ڕەسەنەکە نەدۆزراوەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بە پێی تێبینینم، هیچ کەموکورتیەك لە دەقەکەدا نیە تەنها ئەوەی لە کۆتاییەکەدا هەیە لە تێبینی ژمارە(٦٦) وە بە پێی ڕای(شابۆ) کۆتاییەکەی یەکسەر تێبینیەکەی تری تایبەت بە نتنائیل هەیە.
ئەوەوی باوە، دەقەکان لەولاو لەولا کۆدەکرێتەوە لە نووسیندا لە نێوان ناوەکانی هاوشێوەدا، بە پێی باری ئەو کاتە، دەبینین لە توانامانذا نیە مێژووی سەرۆکایەتی نتنائیل دیاری بکەین کە لە سەری دەنووسین، تاوەکو بە شێوەیەکی نزیکیش بێت.
(٦ ) ـ ماران عەممە لەزینای
ژیانی ئەم سەرۆکە تۆمار کراوە، کەوا مەتران(پۆڵس)([500]).
ماران عەمما لە دایك بووی گوندی(زینای) یە هەلی بۆ ڕەخساوە لە منداڵیەوە تێکەڵ بە ژیانی ڕەبەنایەتی ببێت کە لە ناو ئەشکەوت و شوێنەکانی خۆیان دادەبەزین لە چیاکان بۆ وەرگرتنی نهێنی قوربان لە کەنیسەی گوندەکە.

ماوەی تەمەنی(١١٥ ساڵ) ژیاوە، (٨٥ ساڵ) بە ژیانی رەبەنایەتی بە سەر بردووە. کەواتە لە توانایدا بووە کە دەستمان بگرێت بۆ ئەوەی لە چوار لای حدیاب بگەڕێ، بە خۆراکی هەنجیری کیوی بۆ پڕ کردنی سکمان، دێری(برقانا) لانکەی ژیانی بووە لە رەبەنایەتی وە ئەو کاتەی سەرۆکی ئەو دێرە بووە(شێخی گەورە)(ئیشوع عەمما) دوای ئەوەی کە لە دێری قەشە یووسف بووە کە دەکەوێتە بەرامبەر(بەلەد). وە لەوێدا سەری تاشیوە بە شێوەی تاجە گوڵینە، گەڕایەوە دێری یەکەم(برقانا) بۆ ئەوەی بچێتە خەڵوەتگەیەکی تەنهایی تایبەت بە خۆی.

لێرەدا دەست پێدەکات ماوەی کرداره سەرسوڕهێنەرەکانی(عجائب) - پەرچووەکان - لەوانە باس لە چاکردنی گروێك دەکات لە ناوچەی(بێت نوهدار) کە(شاریکان) تێیدا نیشتەجێ بوو([٥٠١]).

وە شیفاکردنی کچێك داخوازی کرابوو لە کیژەکانی(حەدیسە) بە موعجیزەکانی دەست ئەو رەبەنە کە هاتە جێبەجێکردن لە هەموو پڕوپاگەندەیەك بە دوور گیرا، لەبەر ئەوەی ناوبانگی موعجیزەکانی بە خێرایی بڵاوبۆوە، خەڵکێکی زۆر سەردانیان دەکرد بۆ وەرگرتنی بەرەکەت(تبرك) کاتێك ئەو رەبەنە نوێژکەرە هەستی بەوە کرد ئەو هێمن و ئارامیەی کە دەیەوێت پێی بژێت شڵەژاوە شەو هەڵات و رووی کردە چیای زینایی. کە نزیکترین چیایە لە دێرەکە، دێری(برقانا) ئەوانەی لە سەردانەکاندا بەدواوەی بڕۆن شوێنە نوێیەکەیان زانی لە کوێیە و چوونەوە لای. ئەو کاتە لە چیایەکە هاتە خوارەوە شوێنێکی لە پشت دیواری دێرەکە(دێری مەرکانە) بۆ ئەوەی تێیدا دابنیشی. لێرەدا نەیتوانی کەوا قەدەغەی بکات لە زیندووکردنەوەی مردوویێك. ئەو موعجیزەیە کە لە سەر دەستی ئەو تەواو ببوو بوە هۆی نوێبوونەوەی شڵەژانی و تێکچوونی بارە کۆنەکە بە هۆی زۆربوونی ژمارەی موریدەکان و سەردانەکانیان. بۆ ئەوەی ماوەیەکی لەبار لە نێوان خۆی و ئەوانەدا بدۆزێتەوە و دوور بکەوێتەوە. لەو کارە لابەلایانە، بڕیاری دا بۆ جاری دووەم رابکات، بەڵام ئەم جارەیان ئامانجی دێری بێت شمونا، ابو([٥٠٢]).

کە دەکەوێتە کۆتایی دوور لە سنووری باکور لە(بێت عەرەبایی) واتە نزیکەی لە(بێت زبدای) دا. بەهۆی ناچار بوونیەوە بۆ جارێکی تر رایکرد و چووە(مەرگە) ەوە لە دێری(ریشە) نیشتەجێ بوو کە دەکەوێتە سەر چایایەکی زۆر بڵند. دواتر چووە شوێنێکی تر دەکەوێتە نزیك گوندی(کەوکەب)([٥٠٣]).

وە دوا جار ناوچەی لەدایك بوونی - حدیاب، لەوێ مایەوە، وە کۆتایی بە گواستنەوەکانی شوێنەکەی هێنا و لەوێ نیشتەجێ بوو.(ماران عەممە) سوودی لە شوێنێکی نوێ بینی

ئەویش دێری(مەرکانە) بوو، هەڵسا بە چاککردنەوەی دروستکردنی کەنیسەی گوندی زینایی کە لێی لە دایك بووە نزیکە لە دێرەکە، وە هەروەها، لە کاتی تێپەڕبوونی بەوێدا هەڵسا بە چارەسەرکردنی(شیفا) بۆ پیاوێك لە کۆمەڵەی(دەهقان)([504]). Dahqan هێنابوویان لە(بێت بەغاش). وە ئارەزووی بوو بژیت بە ژیانێکی بێدەنگی تەواو، رووی کردە دێری(ئەبینا سۆر یشۆ) برایانی ئەو دێرە پێشوازی گەرمیان لێ کرد بە هۆی ئەوەی قەدیس بووە. وە وەکو باوك و بەڕێوەبەریان سەیریان کردووە. ئەو مێژوونووسانەی کە لە سەریان نووسیوە پێشکەشیان کردووە(نوێکردنەوەی دێرەکە وەکو کۆنەکانی تر).

بە هەموو تەئکید کردنێك کاری سەرۆکایەتی رێگر نەبووە لەبەردەوام بوون و لە دروستکردنی عەجایب و موعجیزە کە زمان ناتوانێت باسی بکات. دوو موعجیزە و عەجایب لە بەختی خەڵکی حەدیسە دا بوو. یەکێکیان بۆ بت پەرستێك تەمەنی گەورەی ئەو پیاوە(١٠٠ ساڵ) بوو هیچ ماندوو نەدەبوو کە سەر دەکەوتە سەر چیای خان. لەناو کۆمەڵی خەڵك دەبینرا پیاوێك دەستی دەگرێ لە(بێت راوی) شیفای بۆ دێنێ دوای دەرکردنی ئەو شەیتانەی بە سەریدا زاڵ ببوو. وە هەروەها زیندووکردنەوەی قەشەیەکی خنکاو لەلایەن شێتانەوە. وە هەروەها ژنێك شیفا دەکات کە نەخۆش بووە لە(بێت سەیادی) هاتبوو کە دەکەوێتە ناوچەیەکی دوورتر لە هەولێر. دەڵێن لە ناو خەڵوەتگەکەی خۆی(کونە ئەشکەوت) وێنەیەکی عیسای هەبووە قسەی لەگەڵ کردووە. گەشتی دوایی لە دێرەکە کۆتایی دێت کە ماوەی رەبەنایەتی تێدا بەسەر برد لەو پەڕی لاوێتیدا. دێری برقانا دەکەوێتە لێواری رووباری دیجلە. لێرە لە ناو ئەو دێرەدا کۆچی دوایی کرد شێخ(ماران عەممە) کوڕی گوندی(زینای) وە سەرۆکی دێری(بێت قوقا) دوای ئەوەی رووی تێکرد بۆ ئەوەی کاتی خۆی لێ بە سەر ببات.

(٧) ـ مار یۆحەننان زۆدیقایا

لە دوای ماران عەممە زۆر گرفت و کێشەی گەورەی بەدواوە بوو. رەنگە هۆکارەکەی دەرکەوتنی کێشەنانەوەی دەرەکی لە ئاسۆدا، هیچ کەسێك ئامادە نەبوو سەرۆکایەتی بکات و بەرپرسیاریەتیەکە لە ئەستۆی خۆی دا بکات و خەتەرناکەکانی دواوەی. چارەسەرەکەی تەواو نەبوو تەنها بە هاتنە ناوەوەی میتراپۆلیتی ئەربیل(ماران عەممە)([505]).

کە یەکێك لە رەبەنەکانی ناچار کرد ببێت بە سەرۆك. ئەو رەبەنەی کەوا دیاریکرا بۆ سەرۆکایەتیکردن ناوی(یۆحەننان زودیقی) بوو([506]).

قوتابی مامۆستای کۆچکردوو بوو، سەرەڕای ئەوەی زۆر نوێژکەرو لە خواترس بوو، وە پشتگیری دەکرا لەلایەن هاوڕێکانی. پێشتر دە ساڵ بە سك هەڵگوشین ماوەی بەسەربردبوو. خواردنەکەی نەدەخوارد تەنها بە ئاوابوونی رۆژ نەبووایە بە رۆژ هیچی نەدەخوارد.
لە سەرەتادا یۆحەننان زۆر غەمبارو پرکێشە بوو وەك سەرۆك کێشەی زۆر بوو بۆیە وەك نەریتێك لای سەرۆکەکانی ئەوکاتە، وازی لە بەرپرسیاریەتی هێنا، وە لە دێرەکە رایکرد، چووە دێری رەبەن(ئەهرۆن) کە لە(بەلەد) بوو.
بەلام(نەستۆرۆس) میترۆپۆلیتی ئەربیل فەرمانی پێدا بگەڕێتەوە. سەرچاوە رەسەنەکان بە درێژی پێماننالێن لە سەر ئەو سەرۆکە، دەقەکان کۆتاییان دێت بە باسێکی جوان و وشەی ناسك بەلام بە شێوازێکی پڕ لە قسەی نادیار و شاراوە. کۆششێکی بێوچانی دەکرد و... وە بە رێز و گەورەییەوە ماڵئاوایی کرد.
(٨) ـ مارسوریشۆع کوڕی ئیسرائیل
لە دوای یۆحەننان بوو بە سەرۆکی دێرەکە کە هیچ شتێك دەربارەی نازانین تەنها ناوەکەی نەبێت. کۆچی دوایی کرد دوای ئەوەی کە خۆی ئامادە کرد لەبەر قاپی خودای ئاسمانی بە تەواوترین شێوە ژیانی بەجێهێشت بە هێمنی و ئارامییەوە.

## کرداری کاولکاری و دووبارە دروستکردنەوە

دوای کۆچی دوایی سۆریشۆع کوڕی ئیسرائیل، دەستی کاولکاری گەیشتە دێرەکە و وێرانیان کرد و بە هۆی پەرتەوازەبوونی رەبەنەکان([٥٠٧]).
ئەم وێرانکردن و کاولکاری و تێکدانە لەلایەن(یەعلی کوڕی حەمران) بوو کە هێرشی هێنایە سەر دەشتی نێوان چیای زینایی و خان لە ساڵی ٨٠٠.
وەك دەردەکەوێت سەرنەکەوتووە بۆ دێری بێت قوقا، بەلام هەوڵی داوە دەرباز بێت لە کێشەکەی لە تێپەڕبوونیدا بە گەرووی نێوان قەرەلاوغی باکور و باشور. لە گەروی دێری(مارکانا) بە وێرانکاری کۆتایی هات دواتر هاتە خوارەوە بەرەو زێی بچوك و تووشی دوژمنەکەی بوو. بە پێی ئەو بەرەوپێشچوونە. مێژووی وێرانکردن و کاولکردنی دێری بێت قوقا لە ساڵی ٨٠٠ تێپەڕ ناکات. دوای ئەوە بە ماوەیەك دێرەکە چاکرایەوە لە سەر دەستی هەندێك لە خێرخوازان و خوا پەرستان لەوانە مەتران(کبرئیل لە سالاخ)([٥٠٨]).
کە لە رەبەنە کۆنەکانی ئەم دێرە بوو، وە گەڕایەوە ئەوێ بۆ ئەوەی رۆژەکانی دوایی تێدا بە سەر ببات. کۆچی دوایی کرد لە تەمەنی(١٢٠) ساڵیدا. هەشت ساڵ بە ژیانی رەبەنایەتی

بە سەر بردووە. لە ماڵی شەهیدان نێژراوە لەو دێرە کە هاوڕێکانی تری پێش خۆی لەوێ نێژراون هەر وەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێدا.

## ئاوارەکانی تر

لە دەستنووسێکی بۆ سەردەمی نوێ دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٧٦٨، وە لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ ماوەیەك پێش وێرانکردنی دێرەکە کە ئێستا لە مۆزەخانەی بەریتانیانە([٥٠٩]).

ئاماژەیەك بۆ سەرۆکی دێرەکە کراوە کەوا پێویست بوو ناوەکەی بهاتایە لە لیستەکانی دێری بێت قوقا. ناوی ئەم سەرۆکە(مەلیك سدیق) ە.

لە ژێر سەرۆکایەتیەکەدا، رەبەن سور داوای کرد لە رەبەن(ئیشۆعزخا) ئەو دەستنووسە لە ناو ببات. بینی کەوا کەموکورتی تیایا لە تەواو کردنی ناوەکە، بەلام لە سەر ئەوەشەوە لە توانامانداییە ناوەکە تەواو بکەین بۆ ئەوەی ببێتە(سۆریشۆع) بۆیە دەبینین رێکخەری ناوەڕۆکەکە پرسیار دەکات([٥١٠]).

رەنگە ئەو کەسایەتیە قەشە(سۆریشۆع) نەبێت ناسراو بە(کافیا) واتە(کوڕە) کە لە سەردەمی مارکبرائیل ژیاوە؟ بە پێی ئەوەی تۆما مەرگەیی نووسیویەتی بە مەرجی ئەمە لە نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی ز بووبێت([٥١١]).

مێژووەکان مەنتقین و ماقوڵن و لەبارە. بەلام پرسیارێك دێتە خەیاڵ ئەوەیە: لەبەرچی مێژوونووسی دێری بێت قوقا بزرە و دیار نیە دەبینین تێپەڕ دەبێت نەك تەنها بە سەر ناوی(مەلیك سدیق) کە لەوانەیە بە ناوێکی زۆر گرنگ دانەنێت بەڵکو هەروەها بە سەر ناوی کافیفاش بەبێ دەنگی؟ بەلام دەخوێنین ئەوەی لە سەر کافیفا نووسراوە لە نووسینەکانی(تۆمای مەرگەیی):(ئەو ناوبانگی دەرکردبوو قەدیسە وە لە راستیدا رەبەنێکی تەواو و خوا پەرستێکی راستەقینە بووە). هەروەها ئەوەی مێژووی بێت قوقای نووسیوە و لە هەمان کات دا قەشە عەودیشۆعە) لە(کرتاو) ئەویش ناوی نەهێناوە، بەلام تۆما مەرگەیی لەو لە بیرکراوەییە رزگاری کردووە و لە نووسینەکانی باسی دەکات. بەلام، بە خێرایی هەست بەوە دەکەین مێژوو نووسە بزرەکەمان هەڵە دەکات لە دانانەکەی([٥١٢]).

(نووسینەکانی مێژووی دێری بێت قوقا ـ وەرگێڕ) دەست پێ دەکات بە کۆمەڵێك ناوی دیار لە رەبەنەکان ئەوانەی کە رۆڵەی روحی سۆریشۆع بوون وە بۆ چەند جارێك لێرە و لەوێ لە نووسینەکانی لێرەدا ناتوانێت تەنها لیستی ناوەکان بە خێرایی تۆمار بکات وە بەبێ ئاماژە کردن بۆ ئەوانەی کە لە پێشتر پێیان گەیشتین.

لەوانە شێخەکان:(حبیب المستسقي) شیفا کەرەوەی زۆر کەس تەنها خۆی نەبێت وە(حنین المتقشف) وە(سۆریشۆع) ی پشت چەماوە، وە(زاونارسی) کە هیچ کردەوە و بەرهەمێکی دیاری نیە، وە هەروەها(ئەهرۆن) کە دواتر بوو بە میترابۆلیتی(رازیق)([513]).
دواتر نووسەرەکان باس دەکەین / سێ دانەرەکان: سۆریشۆع رۆستەم خەڵکی حرێم کە ژیاننامە(سۆریشۆعی) گەورەی نووسیوە([514]).
وە(داود) مەترانی(قەرتوایی ـ قرطـواي) دانەری پەرتوکی(الفـردوس الصـغير / بەهەشتی بچوک) ئەو مەترانە ژیاوە لە سەردەمی بەتریك تیماتیۆسی یەکەم(٧٨٠ ـ ٨٢٣)([515]).
وە رەبەنی بەناوبانگ(یۆزاداق) ناوی هات لەو کاتەی کە باسی ژیانی سەرۆك(شوحالمارن) مان کرد. دەمانەوێت ئەوانەی کە لە پێشەوە ناومان هێناون: حەبیب لە سین وە براگەی یووسف، وە شلیطا: شەلیتا خاوەن پەرچووەکان، وە رەبەن پەترۆس خاوەن کردەوەی سەرسوڕهێنەر.

## کاغەزە پەرتەوازەکان

کاتژمێری کاری دانەرە بزرەکەمان ئاماژە بە کۆتایی دەدات، وە هەروەها ئەو زانیاریانەی کەوا تۆماری دەکات پەرش و بڵاوەیە. دەبینین لە دێرەکە، لە سەدەی دەیەم، لە سەردەمی رەبەن موشێ لە(بێت سیادی)([516]) دا.
لە دۆخێکی ناجێگیردا. بۆیە ئەو رەبەنە هاتووە بۆ ئەوەی دوبەرەکیەکە ئارام کاتەوە هەڵسەنگاندنی بۆ نووسینە تایبەتیەکانی لە سەر نوێژکردنی تایبەت بە رەبەنەکانی دێری بێت قوقا دەهاتنە لای ناوە ناوە بۆ وەرگرتنی ئامۆژگاری لە بەر ئەوەی مامۆستای رێزداری ئەوان بووە وە هەتاوەکو هەندێك جاریش بەو کارانە سەرقاڵ بووە لەگەڵ هەندێکیان لە دروستکردنی ئاشێك بۆ دێرەکە، کە دەکەوێتە سەر جۆگەی(سبنا)([517]).
دوای ماوەیەك لە کۆچی دوایی کردنی دامەزرێنەری دێرەکە، رەبەنەکان دێرەکەیان چۆڵ کرد ـ(بێت سیاری) دواتر بوو بە بیابانێکی چۆڵ([518]).
دواتر بەهۆی پەیدا بوونی کۆمەڵە رەبەنێکی دێری بێت قوقای خۆبەختکەر ژیان گەڕایەوە بۆ دێری(بێت صیاری) بۆ جاری دووەم وە قەرەباڵغ بۆوە بە رەبەنەکان.
لە سەدەی دەیەم نووسەری ناسراو(ئەبو حوسێن محەمەدی کوڕی موئمین) سەردانی ئەو دێرەی کردووە و تامی شەرابەکەی کردووە ـ شەرابی مەسیحیەکان ـ لە زەتی لە تامەکەی

وەرگرتووە و بەم بۆنەیەوە پارچە شیعرێکی داناوە و ئاڕاستەی(شمشاتی) /(الشمشـاطي) کردووە([519]).

دانەری پەرتووکەکە باس لە دێرەکان دەکات). ئەم شیعرە لە پەرتووکی(مسالك الابصار) دا هاتووە([520]).

لەگەڵ ئاماژەیەك کەوا دەقە شیعرەکەی لە پەرتووکی(مێژووی ئەربیل) ابن المستوفي دا هاتووە کە بەشێکی زۆری بزرە(دەستنووسی ساڵی ١٣٤٩)

(ابن فضل الله العمري) شوێنی دێرەکەی ناسیوە و دەیخاتە پشت زێی گەورە و بە دووری حەوت فرسەخ Parasanges لە موسڵ([521]).

تەیتۆس یەکێ لە سەرۆکە ناسراوەکانی ئەو دێرەیە، دواتر بۆتە مەترانی موسڵ([522]).

لە سەردەمی بەتریك(ئێلیا) ی سێیەم ئەبو حەلیم(١١٧٦ - ١١٩٠) لە کۆتایی سەدەی دوازدەهەم ئەم دێرە ناوبانگی دەرکرد بە دەرکەوتنی رێزماننووس(یۆحنابرزوعبی) کە سریانەکان زۆری هەڵدەسەنگێنن وە هەروەها مەترانی دوا رۆژی یەعقوبیەکان(ساوریۆس یەعقوب برشابۆ) کە ئەویش لە قوتابیانی ئەو دێرەیە وە دواتر بوو بە میترابۆلیتی دێری(شێخ مەتی).(١٢٤١؟) وە هەروەها شەمعون شەقلاوی پەرتوکێکی مێژوویی تایبەت بەو دێرەی پێشکەش کردن([523]).

مانگی تشرینی دووەم لە ساڵی ١٢٣٥ کاتژمێری سفر دەستی پێکرد بە وێران و تێکدانی دێری بێت قوقا لە سەر دەستی کۆمەڵێك لە مەغۆلەکان کە بەناوبانگ بوون بە تالآنچی لە ناوچەکانی تر هاتبوون کە لە شوێنی تر نەیانتوانی هیچ کارێك بکەن تەنها تالآن و دزین و راوروتی ئەو ماڵانەی کە دەکەونە ژێر قەلاکە وە یا کوشتنی هەندێك لە میرەکان وە فرێدانی سوارەکان بۆ ناو بیرەکان.

دوای گەیشتنی ئەو کۆمەڵە لە داگیرکەرەکان بۆ دێرەکە دەستیان کرد بە کوشتنی رەبەنە بەتەمەنەکان بە شێوەیەکی درندانە کە باس ناکرێت، دواتر ئەوانە کە سەرەتایی بوون جلەکانیان پێ لەبەر کردنەوە، وە بەکاریان هێنان بۆ رابواردن ماوەیەك پێش ئەوەی بیانکوژن. کەنیسەکەیان پیس و گلاو کرد و لاشەی مردووەکانیان فرێ دایە چۆڵایی مەزبەحیان چەپەڵ کرد بە پیسایی و قاپ و کەرستە پیرۆزەکانیان دزی([524]).

دوای گەڕانەوەی ئاشتی و ئارامی بۆ ناوچەکە، ژیان گەڕایەوە بۆ دێرەکە بۆ جارێکی تر. لە ساڵی ١٢٥٢ دەستنووسی تایبەت بەو دێرە کۆپی کرایەوە کە باس لە مەزموورەکاندا دەکات([525]).

ئەم دەستنووسە لە ساڵی ١٩١٥ بزر بوو لەگەڵ ناوەرۆکەکانی پەرتووکخانەی سعرت، کە لەوێ پارێزراو بوو.
ئەو دوو کەسایەتیەی تر لە دێری بێت قوقا کە مافی خۆیانە ڕێزیان لێبگیرێت و ناوەکانیان ئەمانە: بەتریك دنحای یەکەم(١٢٦٥ ـ ١٢٨١) کە لە سەرەتادا رەبەن بوو([٥٢٦]).
وە گبریئیل قەمصا ـ واتە کلۆ ـ کوللە / الجرادە) میترابۆلیتی موسڵ لە دەوروبەری ساڵی ١٢٨١. ئەو بوو وتارێکی ڕێکخستبوو بۆ شان و شەوکەت کردن کە لە پەراوێزی کۆتایی ئاماژەمان پێ دا([٥٢٧]).
لەو ماوەیەدا، ئەو دێرە سەردان کرا لەلایەن میوانێکی پایەبەرز ئەویش پەترێکی دوا ڕۆژە کە بە ڕچەڵەك مەغۆلە و ناوی(یەهوالاها) ی سێیەمە کە بەترێکی پێش خۆی دنحای یەکەم کردی بە مەترانی(تانکۆت).
ئەو سەردانە کرا کاتێك مەترانی نوێ(یەهوالاها) لە ڕێگادا بوو بەرەو بارەگای ئەبرەشیەکەی، وە لە دێری(بێت قوقا) بۆ چەند کاتێك مایەوە([٥٢٨]).
لێرە، وە لەو دێرە رەبەنی خواپەرست و ناسك تاك و تەنها(سولاقە) پێشبینی کرد کەوا مەترانی نوێ وەزعەکە دەگۆڕێ و وە ڕێگەکەی دەگۆڕێ و دەگەڕێتەوە بەغدا و دەبینی کەوا پەتریکی سەر کورسی کۆچی دوایی کردووە و لە سەر کورسیەکەی دادەنیشێ. بە راستی ئەم کۆچکردنەی بەتریك دنحا روویدا لە شوباتی ساڵی ١٢٨١. دواتر یەهوالاها بوو بە بەتریك لە سەر کورسیەکەی بەتریکی دانیشت لە ساڵی ١٢٨٣. لە مێژوویێکدا نایزانین وە لەوانەیە لە سەدەی چوارەم بێت، دێری بێت قوقا سەرۆکێکی هەبوو پێیان دەوت رەبەن(بریخ ئشوع) وە نازناوەکەی(برشکابیە)(کوڕی پنەدۆز، برخ ئیشوع نووسەرێکی کارامە و ڕێکخەری سروتی ئاینی بووە([٥٢٩]).
وە هەروەها بە دانانی شیعر ناودار بووە لە سەر(البحر الاثني عشري) شیعری لە سەر ژیانی روحی داناوە بۆ مامۆستاکەی(شملی)([٥٣٠]).
لەو قەسیدەیەدا باس دەکات کە چۆن کاری سك هەڵکوشین و گریان چۆن لە نێو موجاهیدەکان بڵاو دەبۆوە لە دژی تاقیکردنەوەکانی شەیتان و فرت و فێڵەکانی بۆ ماوەیەکی درێژ. دەقە شیعرەکە هیچ زانیارییەکی مێژووی تیا نیە کە رەنگە سوودی هەبێت سەرەرای ئەوەی نووسەرەکە ئاماژە بەوە دەکات کەوا لە سەر دێری(بێت قوقا) دەنووسێت بە هیچ شێوەیەك پێدا تێپەڕ نەبووە نە(شملی) و نە مامۆستاکەی یووسف([٥٣١]).
وە هەروەها لە دەستنووسی(فردەوس عودیشۆع) نهێنی ئاماژەیەك هەیە لە دەقەکانیدا دەربارەی ئەم دێرە ئاماژەیە بۆ نووسینەکانی ئەم دەقانە و تەواو کراوە لە دێری

مارسۆیشۆع لە بێت قوقا کە دەکەوێتە سەر زێی گەورە لە ساڵی ١٤٦١. ئەم دەستنووسە ئێستا لە(کەمبردج) ە[٥٣٢].

بە دوا زەخیرە دادەنرێت کە ماوەتەوە دێری قوقا و مێژووەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە. پێشتر باسی دەستنووسێکی نوێترمان کرد لە سعرد. بزر بووە لە رۆژانی نیگبەتی گەورەدا کە بەسەر شارەکە و دانیشتوانەکەیدا هاتووە. ئەو دەستنووسە سروتی بۆ مێژووی نووسینەکەی دەگەڕایەوە بۆ ساڵی ١٤٩١[٥٣٣].

پرسیارێکی گرنگمان هەیە پەیوەندی بەو دێرەوە هەیە لەگەڵ رۆڵەکانی لە رەبەنەکان ئەوەیە ئایا سولاقە(یۆحەننان ـ وەرگێڕ) بەتریکی کلدانی لە دوا رۆژ لە ساڵی ١٥٥١ ئەویش لە رۆڵەکانی دێری بێت قوقا بوو؟ ئەمە لە شیعرێکی عەودیشۆع دا هاتووە لە وتەکانی شیعری کە لەلایەن فۆستییەوە وەرگێڕاوە[٥٣٤].

وەرگێڕەکە لەلایەن خۆیەوە ئاماژە بە هەموو سەرچاوەکانی تر دەکات زۆر بە روونی و دەڵێ سولاقە رەبەن بووە لە رەبەنەکانی دێری رەبەن هورمز.

ئەم دێرە تاوەکو کۆتایی سەدەی شازدەهەم ـ سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم مابوو. بەتریك ئیلیای هەشتەم باسی ئەو تاوانە دڕندانە و بێزکاریانە دەکات کە لەلایەن تیرۆریست و داخ لە دڵەکان دا کراوە، پەیوەندی بەو ماوەیە هەیە کە خۆی تیایدا ژیاوە[٥٣٥].

دەڵێ: (ئەوانە سەرۆکی دێری مارسۆریشۆعیان گرت و دایانە بەر چەقۆی تیژکراو تاوەکو دادڕبەدادڕیان کرد، بەلام هەر سوور بوو لە سەر ئاین و باوەڕداریەکەی خۆی و هەڵنەگەڕایەوە لێی. دواتر دەستیان کرد بە بڕینەوەی ئەندامانی جەستەکەی بە تەور و مشار وە خوێنەکەیان خواردەوە. بەلام ئەو هەموو ئازارانە دڕندەییە سوودیان لێ وەرنەگرت و وەك پاڵەوان سوور بوو بانگەوازی خودای دەکرد و بۆ ئەوەی یارمەتی بدات و شەهید بوو بە سەرفرازی و تاجە گوڵینەی نایە سەر خۆی لە ئاسمانی بەریندا[٥٣٦].

ئەو ئازارانەی کە شەهیدە بزرەکەمان بینیویەتی کۆتایی بە ژیانی ئەو دێرە نایەنێ، لە بەر ئەوەی بەتریك ئیلیای هەشتەم خۆی ئەو دێرە بە دێرێکی زیندوو دادەنێ بە دێرێکی گرنگی دادەنێ کاتێك کە راپۆرتەکەی بۆ پاپا پۆڵسی پێنجەم دەنووسێ لە ساڵی ١٦١٠.

ئەگەرچی ئێمە پاش کۆششی زۆر بۆ باسکردنی لە لیستی دێرەکانی ساڵی ١٦٠٧ نەماندۆزیەوە و ماندووبوونەکەمان بە خۆڕایی بوو. ئیلیای هەشتەم لە راپۆرتەکەیدا هاتووە[٥٣٧].

(لە ناوچەی هەولێر دێرمان هەیە بەناوی(مارسۆریشۆع) وە لەو دێرە مەزاری(بیست و هەشت) قەدیسی هەیە لە ماڵی شەهیدان وە هەر یەکێك لەو قەدیسانە رابەری هەزاران

ڕەبەن و خواپەرست بووە. وە ئەو عەجایب و موعجیزانەی کە دروستیان کردووە دەڵێ زۆر زۆر بووە. شای شاکانی تورکەکان لە نامەکانیدا باسی ئەو بەرهەمە زۆرانە دەکات کە لێیان کردۆتەوە(٥٣٨).

لە کۆندا شوێنە تایبەتیەکانی(ئەشکەوتەکان) ی ئەو ڕەبەنە بە تاك و تەنهایانە درێژ دەبۆوە بۆ ڕۆژمرێگایەك بە پیادە. بەڵام ئەمڕۆ وە بەهۆی زەحمەتی و دەست بە سەرداگرتنی دەبینی ڕەبەنەکان تەنها لە ڕۆخ دێرەکان دا دەژین و نان دەدەن بە برسیەکانی گەشتەکان.

٤ ـ دێری مارئەبراهام نەسفری وە یا دێری مارئەیوبی فارسی

شوێن:

شوێنی ئەو دێرە زۆر دوور نیە لە دێری بێت قوقا. لە خوێندنەوەی مێژوویی مارسۆریشۆع، پیاوێکی نەخوێندەوار هاتووە و لە نزیك قەدیسەکەی ئێمە نیشتەجێ بووە لە دێری ئەبراهامی گەورە خەڵکی(نەسفار) وە خۆی دەگۆڕێ بەوەی توانای پێشبینی هەیە و بووە هۆی ڕاکێشانی زۆرێك لە موریدەکان لەو برایانەی کە بینینی چاویان لە دەست دابوو. پیاوە مەزنەکەمان زۆر بارگرانی هەڵگرت بە هەڵگەڕانەوەی براکان بە سەبر و پشوو درێژی و بێ ئەوەی لۆمەی هیچ کەس بکات بە وشەیەك(٥٣٩).

دواتر بە شێوەیەکی سانایی بیروڕاکانی سەرکەوتن کەوا هەردەم چاکە بەسەر دەکەوێت، میتراپۆلیتی ئەربیل(ئیشۆعیاب) لە(قوبلانە) تاوانباری دوورخستەوە، زۆر بە شان و شەوکەتی پێداهەڵگوتن سۆریشۆعی کرد.

گریمان ڕەبەن برانسیا دەستی بە گەشت نەکردووە لە تەمەنی لاوێتیدا کە بووە هۆی هۆی ژیانی قەدیسی کە دواتر تیایدا ژیاوە، ئەو کاتە دەتوانین بڵێین کە جلی ڕەبەنایەتی لەبەر کردووە(٥٤٠).

لە دێری نزیك بە گوندەکەی و شوێنی لە دایك بوونیەوە. ئەمە پاڵمان پێوە دەنێت بۆ ئەوەی بە دوای دێرێك بگەڕێین کە دەکەوێتە نزیك(حەریم)، وە ئەگەر ئەو گوندە وە هەر وەکو لە پێشەوە دەرکەوت(تل الخیام) بێت ئەو کاتە دێری مارئەبرەهام دەکەوتە لای باکوری ڕۆژئاوا لە(دۆڵی نێوان دووانە ـ دوو چیایەکە) واتە لە جێگایەك زۆر دوور نیە لە لوتکەی چیای(خان) جگە لەمە، دەڵێن لە سەر شوێنی خەڵوەتگەی ئەبراهام دێرەکە دروست کراوە کە بە دوو فرسەخ واتە دوو قۆناغ لە نسفارەوە، ئەو گوندەی کە لێی لە دایك بووە، کە دەکەوێتە سەر ئەو ڕوبارە کە پێشتر ڕەنگە ئاوەکەی سور هەڵگەڕاوە بە

خوێنی شەهیدەکان، کە لە لایەن شاپوورەوە کوژران، خوێنەکەیان جۆگەلەی بەستووە و چووە ناو ئاوەکە([541]).

بە تەئکید هەموو ئەو شتانە زۆر وردەکاری تێدا نیە. بۆ نموونە کاتێک مێژوونووسێک ژیانی قەدیسەکان باس دەکات وشەی(روبار) باس دەکات ئەوە مەبەستی ئەومیە جۆگەلەیەکی بچووك وە یا جۆگەلەیەکی ئاوی سازگار، بەلام ئەگەر مەبەستی روبارێکی راستەقینە بێت دەبێ ئەو روبارە زێ بێت و بەس. سەرەرای ئەمەش، پێویستە لە بیرمان نەچێت ماوەی دوو فرسەخ کە ئاماژەمان پێی دا هاتووە لە نوسینەکانی(ئیشۆع دناح) وەك تێبینیمان کرد و ورد نیە لە نووسینەکانی دەربارەی باری تۆبۆگرافیایی. لە سەر ئەم خواستانە پێویستە لە سەرمان بەدوای دێرەکەدا بگەرێین لە شوێنێکی تر و بە دووریەکی گونجاو دەکەوێتە رۆژهەلاتی(نەسفار) لە سەر رۆخی زێ، واتە لە شوێنێك بە ئاراستەی حەریم - تل الخیام)کەواتە لە کوێ(نەسفرا) دەدۆزینەوە بە پێی ئامۆژگاری زمان زانە دیارەکان نموونەی ئەوانە(خودی بەترۆس سابا) وەرگێرانی وشەی نەسفار کە بەر چاومان دەکەوێت وا باشترە بلێین شێوێندراوە لە وشەی نەفتار لەم وشەیەدا رەگی وشەی(نەفت - نەوت) دەدۆزینەوە. ئەم واقیعە ئەوەمان پێ دەبەخشێت بە پەیوەندیەك لەگەل ئەو ناوچەیە کە نەوتی لێیە.

ئێستا با ناوی گوندەکانی سەر لێواری زێ بێنین، لە دەوروبەری دۆلەکە لە نێو دوانەکە یەك بە دوای یەك: لێرەدا یەکەم مەلبەندی شارۆچکەی گوێر، کە سەرنجمان رادەکێشێت، ناوەکە ئەوەی لە ئامێزدایە شێوێندراوە بۆ لەفزی پاف و کاف عەرەبی، ئەگەر کاف بگۆرین(گوێر) بۆ قاف ئەوە ناوەکە دەبێتە قیر کە واتاکەی ناسراوە.

لە واقیعدا لە ناوچەکەدا سەرچاوەی دەرچوونی نەوت هەیە لە جۆری قورس دەردەچێ و تێکەل بە زێ دەبێت. کەواتە شوێنی نەسفار بەو شێوەیە بێت شارۆچکەی(گوێر) نوێیە و لەبارە. باسەکەم لە سەر دێری مارئەبراهام - مار ئەیوب لەو ناوچانەیە دەکەونە دوای گوێر بۆ ماوەیەکی کەم بەلکو ماوەیەکی کورت بە هۆی باری ئەو کاتە. بۆیە نەمتوانی بگەمە ئەنجام جا بە ئەرێنی بێ، یان بە نەرێنی.

ئەبراهام نەسفری

رەبەنێکی نوێژکەر و خواپەرست و دانەرێکی زۆر ناسراوە([542]).

لای یەعقوبیەکان بە قەدیس دادەنرێت([543]).

کردەوەکانی زوو بە زوویی ناوبانگیان دەرکرد، بەلام زۆر بە دوودلی و سەرسورمانەوە لەگەل کار و کردەوەکانی هاوچەرخی خۆی(ئەبراهام کەشکەری) کە بە تەمەن لەو گچکە

تـر بـووە. لەبـەر ئـەوە دەبیـنین تۆمارکـەرەکان(وە یـا مێـژوو نووسـی پـەرتووکی) Liber Turris کـە(مـاری) یـە کـورتی کردۆتـەوە(٥٤٤). دەقـەکانی ژیـانی ئـەبراهام نەسـفری لـە پەرتووکێکدا بە ناوی ئەبراهام کەشکری(٥٧١).

ئەو دڵەڕاوکێیەو ژاوە ژاوەیە پێشتر لەلایەن دانەری مێژووی سعردی پشتگیری کراوە(٥٤٥).
کـە هـەر دوو کەسـەکە بـەناوی ئـەبراهام کـراوە و بەشـدارن لـە چـالاکیەکانی(پێناسـە بـە یاسـاکان و دامودەزگاکـانی ژیـانی رەبەنایـەتی لـە وڵاتـی فـارس) وە هـەروەها هەڵسـا بـە گۆڕانکـاری لـە جۆرەکـانی جلـی رەبەنـەکان و نەخشـەی بینایـەی دێرەکـان. لـەو کێشـەیەدا، ئەوە دەبینرێ کەوا هەموو سەرچاوەکان(٥٤٦).

ئاماژە بە ئیبراهیم نسفری دەکەن کەوا چۆتە حـەج بـۆ ئۆرشـلیم و میسـر بـە تایبـەتی، کـە بـەبێ ئـەو حەجـە رەبـەن نابێـت بـە رەبـەنێکی راستەقینە. درەختی خێزانـی تایبـەت بـە سەرجەلەکەی یەکتری دەگێڕێتـەوە لەگـەڵ زنجیرەی پەیوەنـدیدار بـە ئـەبراهامی گـەورە لـە دێری ئیزلا(٥٤٧).

لێرە بەدواوە ئـەبراهام نەسـفاری لـە نـاو خەڵوەتگـەی خۆیـدا دەژی بـۆ مـاوەی سـی سـاڵ بـە خـەریك بـوونی دانـانی ژمارەیـەك پـەرتوك کـە بـە مـۆری خـۆی مـۆر کـراون نیشـانەی رەبەنایەتی نیشان دەدەن. لێرەدا پرسیارێك دەکەین ئایا بەراستی لـەو ماوەیـەدا سـەردان و گەشتێکی بڵاوکردنـەوەی ئـاینی کـردووە بـە ئاراسـتەی ناوچـەکانی بـاکور تـاوەکو گەیشـتۆتە ئازربێجان؟ پـەرتووکی(العفـە) لـە دەوروبـەری سـاڵی ٨٠٠ ئەمـە بـاس ناکـات. بـەڵام مێـژووی سـعردی سـەدەی یازدەهـەم و مـاری سـەدەی دوازدەهـەم ئـەوە بـاس دەکـەن. ژیاننامـەی لـە سـەدەی چواردەهەم نووسـراوە بـە تـەنها بـاس لـەو گەشـتە دەکـات لەگـەلج باسـێکی دوور و درێـژ بـە کۆتـایی هـاتنی ژیـانی ئـەو رەبەنـە بـە شـەهید بـوون وەك دەردەکـەوێت ئـەو لـە خەڵوەتگەکەی خۆی کۆچی دوایـی کـردووە وە دواتـر لـە کەنیسـەی گوندەکـەی نێـژراوە کـە تێیدا لە دایك بووە(٥٤٨).

ئەیوبی فارسی

بـە چـاکەی ئـەیوب دەتـوانین مامۆسـتاکەی ئـەبراهامی نەسـفری بناسـین لەبـەر ئـەوەی ژیاننامەی یەکەمیان نوسراوە لەلایەن(سۆریشۆع رۆستەم) لە دێری بێت قۆقا(٥٤٩).

تۆما مەرگەیی بە دەقەکەدا چۆتەوە.بەڵام ئەمرۆکە بزرە، مێژوونووسەکانی تر(٥٥٠).

زۆریان لە دەقەکە وەرگرتووە بەڵام هـەر یـەکێکیان بـە کـەیفی خـۆی ئـەوەی لا خـۆش بـووە ئـەوەی وەرگرتـووە. کەواتــە هــەموو نووســینەکان یــەك بنچــینەیان هەیــە(ئــەیۆ) لــە میتراپۆلیتەوە(سەرۆکایەتی ئەسقەفیە) وڵاتی فارس ناسراوە بە(رێواردەشێر)(٥٥١).

باوکی پیاوێکی دەوڵەمەند بووە و لە بازرگانی لۆلۆ ـ مراواری ـ کاری کردووە. ژمارەیەکی زۆری کۆیلە هەبووە، بەڵام لە سەر ئەوەشەوە پیاوێکی دڵ باش بووە و حەزی بە خێر و خێرات هەبووە بۆیە نەخۆشخانەیەکی دروست کردووە. لە سەر دەمی شا خوسرەوەی یەکەم(ئەنۆ شێروان) ژیاوە(٥١٣ ـ ٥٧٩).

بە هۆی نەخۆشیەك کە تووشی(ئەیۆ) هات، بە هۆی ئەوەی کە لە گەشت گەڕابۆوە ئەم نەخۆشیەی گرتبوو روی کردو ژیانی رەبەنایەتی. ئەبراهام نتفاری سەری بۆ تاشیوە بە شێوە تاجەگوڵینە(هەر وەك باوە لای رەبەنەکان). دوای مردنی ئەبراهام ئەیوب بەردەوام بوو لە ژیانی خۆی لە ناو خەڵوەتگەکەی نزیك بە مامۆستاکەیەوە. لە سەردەمی ئەبرەهام دا ئەیوب هەڵساوە بە سەردانی دێری(ئیزل) کە پێویست بووە بۆ ئەوەی بچێتە سەر رێچکەی ـ زنجیرە ـ مامۆستاکەی ئەبراهامی گەورە([٥٥٢]).

زۆر رەبەنی تر بەدواوەی بوون و چوونە لای. ئەیوب بینایەکی لە سەر خەڵوەتگەی رەبەن ئەبراهام دروست کردووە هەروەها مەلەوانگەیەك و پەرستگەیەك و دێرەکە بە هەر دوو ناوەکەوە ناسراوە(دێری ئەبرەهام نەسفری و ئەیوبی فارسی) دوای تێپەڕ بوونی ماوەیەك وە بە چاکە و کاریگەری دنحای کوڕی سامریا، میری گەورە و حاکمی هەموو حدیاب، توانرا جەستەی ئەبراهام لە کەنیسەی گوندی نسفار بگوازێتەوە بۆ دێری ئەیوب بە مەراسیمێکی پڕ شکۆوە دوای مردنی ئەیوب لەبەردەم مەلەوانگەکە نێژرا کە لە پەرستگەکەدا دروستی کردبوو لە سەر خەڵوەتگەکە. ئێستا رادەوەستین لە بەردەم دەقە جیاوازەکان کە پەیوەندیان بە رۆڵی دوو کەسایەتی هەیە پێیان دەڵێین ئەشعیا وە ئیلیشیع دەقە عەرەبییەکەی ماری([٥٥٣]).

چارەسەری باشتری بۆ ئێمە دۆزیوەتەوە لە دەقە لاتینیەکەی هاتووەئەشعیا و ئیلیەشیع قوتابی ئەبرەهام بوون وە کۆنتر هاتوونەتە رێزی رەبەنایەتی لە ئەیوبەوە. ئەو دووانە ئەیوبیان فێری رەبەنایەتی کردووە. بۆیە بە مامۆستای ئەیوب دادەنرێن. لەگەڵیا ژیاون دوای کۆچکردنی مامۆستا هاوبەشەکەیان(ئەبرەهام) بەڵام دروستکردنی دێرەکە دەستپێشخەری ئەیوب بووە. دواتر بۆتە سەرۆکی دێرەکە([٥٥٤]).

بەم شێوەیە ئەیوب بۆتە سەرۆکی سەرۆکەکانی. وە ئەوانەی سەرۆکی بوون پێشتر بوون بە قوتابی ئەو ئەیوب نووسەرێکی بەناوبانگ بووە بە هۆی وەرگێڕانی زۆرەوە بۆ سەر زمانی فارسی لەوانە: وتار و گوتارەکانی ئەبراهام لە نسفار و هەروەها یاساکانی ئەبرەهام کەشکەری. یادگاری ئەیوب ئاهەنگی پێدەگێڕدرێ و بە پێی رۆژمێری نەستۆری لە رۆژی ١٨ ی ئاب.

## مێژووی دێرەکان

زانیاریمان زۆرە لەلایەن براکانەوە کە لە سەر ئەیوبی فارسی کۆیان کردۆتەوە و هەروەها مامۆستاکانی دامەزرێنەری دێرەکە ئەشعیا و ئیلیشیع دەڵێن پاش ماوەیەك لە دامەزراندنی دێرەکە قوتابییەك لە دێرەکە دەرکەوت و دوایی ناوبانگی گەورەی دەرکرد ناوی ئەو قوتابیە ئیشۆعیاب برقوسری بووە، ماوەی ١٥ ساڵ رەبەن بووە دواتر دابڕاوە لە وەرزشی روحیدا بە تاك و تەنهایی لە سەر چیای مەقلوب بەسەری بردووە.

لە دوای دەرکردنی لەلایەن یەعقوبیەکانەوە لە ساڵی ٥٧٠ چۆتە مووسڵ و لەوێ دێرێکی دروست کردووە([٥٥٥]).

هیچ زانیاریمان نیە لە سەر ژیانی دێری مارئەیوب لە سەدەی ١٧ ههەم. لە سەرەتای سەدەی ١٨ دەبینین رەبەن برانیسە دێتە ئەو دێرە بۆ وەرگرتنی جلی رەبەنایەتی و دەبێتە رەبەن لەوێ دواتریش سەرۆکی دێری بێت قوقا لە دوا رۆژدا دەستی تێکدان و کاولکردن گەیشتە مارئەیوب لە هەمان ماوەدا کەوا ژمارەیەکی تر لە دێرەکان وێران کران.

ئەم کردەوانە لەلایەن(یەعلی) کوڕی حەمران دەکران لە سەردەمی مەتران مارنرسای مەترانی سین واتە ساڵی ٨٠٠([٥٥٦]).

ئایا دواتر دروست کراوەتەوە؟ بڕگەیەك هەیە لە دەقەکانی مێژووی سعردی یارمەتیمان دەدات، گریمان ئەوە بووە([٥٥٧]).

دەڵێ: (ئەم دێرە تا ئێستا ناسراوە لای ئێمە) ئەم بڕگەیە هەیە بەبێ ئەوەی بڵێ دێر(دێری رەبەن ئەیوب)([٥٥٨]).

ئەگەر نووسینەکانی کارتنیال تیسران([٥٥٩]).

رەچاو بکەین کەواتە تۆمارکردنەکانی مێژووی سعردی لە ساڵی ١٠٦٣ بووە بە ماوەیەکی کەم. واتای ئەوەیە دێری ئەبراهام زیندوو بووە تاوەکو سەدەی یازدەهەم([٥٦٠]).

٥ ـ دێری بێت نەستۆریۆس

دامەزرێنەری ئەم دێرە پیاوێك بووە لە دەوروبەری داسن([٥٦١]).

سەرەتا قوتابی رەبەنێك بووە لە دەوروبەری حانیتا نیشتەجێ بووە. دواتر، ئارەزووی هەڵاتنی هەبووە لە بەناوبانگی میللیدا کە بە قەداسەت دادەنرێ، چۆتە ناوچەی حدیاب لەوێ ژمارەیەکی زۆر لە برایان پێی گەیشتوون. دێرێکی دروست کردووە لە نزیك گوندی(دارساب) کە نەتوانراوە بدۆزرێتەوە و شوێنەکەی بزانین. بەڵام ئەوەی یارمەتیمان دەدات بۆ دۆزینەوەی شوێنەکەی بە تەواوی دژ بە یەکە. پەرتووکی(العفە) پێمان دەڵێ نەستۆریۆس لەگەڵ(باوای) نسێبینی بەیەکگەیشتن کاتێك ئەوەی دوایی لە چیاکانی حدیاب

دەژیا، وە هەردووکیان بەردەوام باسی خوایان دەکرد، ئەم زانیاریانە پێمان دەڵێن بۆ ئەوەی بگەڕێین بۆ دۆزینەوەی بێت نەستۆریۆس بە دوورترین شوێن لە دەشتی هەولێر، لە سەر چیاکە، ئەم ئاماژەیە و هێمایە بە تەواوی رێک دەکەوێ لەگەڵ هێڵی رێژکە گرتنەبەری(یەعلی) وێرانکەری دێرەکان و کاولکردنیان کە بەدوای دەکەوت پاش بڕیاروەرگرتنی دێری نەستۆریۆسیش لە لیستی ئەو دێرانەیە کە دەیویست کاولیان بکات. ئەگەر ئەو خشتەیەی کەوا تۆما مەرگەیی دایناوە([٥٦٢]).

کە زۆر ئاسراوە بە وردەکاری لەگەڵ زنجیرەی رووداوەکان یەکتر بگرێتەوە سەرەتای کردارە وێرانکاریەکانی ئەم تاوانبارە خوێنڕێژە دەبێ لە دێری مار ئەیوب بێ کە دەکەوێتە باکوری نێوان(دۆڵی نێوان ئەو دووانە) بۆ ئەوەی کۆتایی بێت بە دێری(مارکانا) کە وای بە پێویست زانیوە بە دۆڵەکەدا بەرەو باشوور بڕوات. دواتر دەربچێت لە گەرووی بەستراو لە نێوان(زینای) و(زامیر). دواتر کاتی بەدەستەوە نامێنێت بۆ ئەوەی کارێکی دیکە بکات تەنها راکردن نەبێت بەرەو سین. دوای دابەزین بەرەو دەشتی دیجلە و پێداڕۆیشتن. لەبەرئەوەی رووداوەکانی کاولکردنی دێری بێت نەستۆریۆس روویداوە لە نێوان رووداوەکانی دوو دێری تردا. بۆیە وا پێویست دەکات بە دوای دێرەکەدا بگەڕێین لە نێوان دۆڵەکە(واتە دێری نەستۆریۆس) لەو ناوچەیە دەکەوێتە نێوان گردی خیام(تل الخیام)، و گەرووی مەخموور، لەوانەیە ئەو ناوچەیە، ئەوەی بە دەوری(جیرتکومیا - گردی گۆما، یان کیزابارکا - کۆزەپانکە - وەرگێڕ).

ئەوەی پەیوەندی بە گفتوگۆی نێوان ئەو دووانەوە هەبووە(نەستۆرس و باوای) دەڵێن: پێویستە مێژووەکەی ئەو ماوەیە بێت کەوا نەستۆرۆس لە(حانیسا) نیشتەجێ بووە، وە یا ئەو کاتەی نەستۆرۆس لە رێگا بوو بەرەو بڕینی چیای حدیاب بۆ ئەوەی بچێت و دێرە بەناوبانگەکەی دروست بکات. ئەگەر وا دابنێین دەقەکانی پەرتووکی(العفە) بێ کەڵکی بۆ دۆزینەوەی شوێنی دێرەکە دێری(بێت نەستۆرۆس) سەرەڕای ئەوەش رێگەمان دەدات بەلای کەمەوە مێژووی دامەزراندنی دێرەکە جێگیر بکەین کە دەکەوێتە نێو ئەو ماوەیەی کە تیای ژیاوە(باوای) واتە دەوروبەری ساڵی ٦٠٠. پاش ئەو ماوەیە هیچ شتێک دەربارەیەوە نازانین، دەبینین دێرەکە دەردەکەوێت لە ماوەی نیوەی یەکەم لە سەدەی ١٨ هەم، کاتێک ماریۆحەننان میتراپۆلیتی ئەربیل([٥٦٣]). ویستوویەتی رەبەن برانسیا دەستنیشان بکات بۆ سەرۆکایەتی([٥٦٤]).

بەلام سەرۆکی دێری بین فوقا(شوحالماران) فەرمانی داوە بە رەتکردنەوەی دەستنیشان کردنەکە. کاولکردنی دێرەکە لە دەوروبەری ساڵی ٨٠٠ بووە.

٦ ـ دێرکی ئاریان

وەك دەردەکەوێ، هیچ پاشماوەیەکی مەسیحی لە دەوروبەری باشووری(دۆڵی نێوان ئەو دوانە نەماوە). سێ گوند هەیە سەرنجمان رادەکێشن ئەمانەن(دێریکا گرد) واتە گردی کەنیسە وە یا دێر(دێریکا گچکا) گردی سەرسوڕهێنەر دواتر(دێریکە ئاریان)([٥٦٥]).

ئەو ناوەی دوایی بە روونی پارێزراوە بە ناوی هەموو ناوچەکەدا(ماحوزی ئەریوان) مەڵبەند و بارەگای کورسی ئەسقەفیە بووە تاوەکو ماوەی نێوان ساڵانی ٦٦٠ ـ ٦٨٠. کەواتە ئەو گوندە دەکەوێتە بەری راستی زێی بچوك(٥٩٣)، بەڵام دەبینین ماحوزی دەکەوێتە لای چەپیەوە. لەبەر ئەوەی هیچ هێمایەك نیە ئەوە بسەلمێنێ کەوا روبارەکە رێچکەی خۆی گۆڕیوە. کەواتە پێویستە لە سەرمان ئەوە بە دەست بێنین کەوا ناوچەی حدیاب باڵا دەست بووە بۆ هەر دوو بەری زێی بچووك. بەشێکی درێژ بۆتەوە بۆ دوای روبارەکە ناسراوە بە ئەریوان دەعەبرا([٥٦٦]).

سەلماندنی ئەم واقیعە هەر وەك پێتر روونمان کردۆتەوە کەوا روبارەکان هەموو کاتێك کۆسپ نەبوون بۆ هێڵی سنووری کارگێڕی.

٧ ـ قوبلانە

پێش ئەوەی دۆڵی(کەندێناوە) بەجێ بهێڵین پێویستە وتەیەك بڵێین خواحافیزی بۆ نیشتمانی بەتریك ئیشۆعیابی حدیابی([٥٦٧]). گوندەکە تا ئێستا ماوە و ناوەکەی(قوبلان) ە بە دووری ٢٥ کیلۆمەتر لە(ئاڵتوون کۆپری ـ پردێ)([٥٦٨]). ئیشۆعیاب قوتابخانەیەکی تێدا دامەزراند کە بە سەر برا رەبەنەکانی دێری بێت عاوی سەپاند([٥٦٩]).

بەڵام لەوانەیە لەگەڵ نەمانی دامەزرێنەرەکەی قوتابخانەکەش بزر کراوە، ئەمە ئەنجامی سروشتیە بۆ هەموو کارێکی دروست کراو جێگەی سەرسوڕمان نیە کە ئێمە بە سەر ناوچەکەدا دەفڕین هەست بە سۆزێکی باب و باپرانمان دەکەین بۆ ئەو نیشتمانە کە تێیدا لە دایك بوون و لە ژێر ئاسمانەکەیدا گەورە بوون و لە بەرهەمەکەیدا خواردنیان بوو لە ئاوەکەیدا مەست بوون(ئاوی روبارەکان) بە جوانترین شێوە و ئەمانەتەوە بە دڵسۆزیەوە خزمەتیان کرد و تێیدا مانەوە بە وەفاداریەوە بۆ خاك و باوەڕ و باوەڕداریانەوە، وە ئەمە بە گران لە سەریان وەستا بە خوێنڕشتن لە پێناو باوەڕیانەوە کە لە ناوچەکەدا بڵاوبۆوە. وە هەروەها ئێمە ئەو کۆریتانەی(قوبلان) دەبینین کە لە خشت و قوڕ دروست کراوە، باوکی بەتریکی گەورە و پیاو چاك(باستۆماغ) کە لە پیاوە عەلمانیە دەگمەنەکان دەژمێردرێ. تۆما مەرگەیی بە درێژی باسی کردووە لە بەشێکی تەواو لە پەرتوکەکەیدا بە ناوی(سەرۆکەکان)([٥٧٠])(الرؤساء)(٥٩٨)..

باسی دەکات: بە پیاوی خاوەن خێزانی ناندەر، وە پیاوی خێر کەر و خێرخـواز و بـەرێز کـە پێویستە بە چاکە یادی بکرێتەوە. زۆر جاران ئەو پیاوە چاکە دەهاتە دێری(بێت عـاوی) بـۆ ئەوەی بەرەکـەت لـە دەسـتی رەبـەن(یـەعقوب وەربگـرێ). زۆر زەحمـەت بـوو بـۆ ئـەو پیـاوە ئاوداره کەوا ئاوازەکـانی شـەیتانی لـە بـیر بچێتەوە کـەوا لـە لایـەن سحربازەکانی پـردی زێ دەگوترا.

(٤)

## زەوییەکانی حەزەی سەروو

وەك دەردەکەوێ چارەنووسی خراپی پڕ کارەسات کە مەسیحیەکانی حدیاب کۆتاییان پێ هات زاتر کاریگەری هەیە کاتێك دەمانەوێت باس لەو لێکۆڵینەوەیە بکەین لە مەڵبەندەکانی مەسیحی زەویەکانی چیایی لە دەوروبەری رۆژهەڵاتیدا. ئەوەی ماوەتەوە لەو هەموو گوندانە(تەنها گوندی عەنکاوەیە ـ ئێستا شارۆچکەیەکی گەورەیە ـ وەرگێڕ).

هەروەها گوندێکی تر هەیە مەسیحی بووە بەڵام ئێستاکە گشت دانیشتوانەکەی موسڵمانن، پێی دەڵێن حەزا ـ حەزە، گوندەکانی تر کە دانیشتوانیان مەسیحی بوون ئەمانەن:

(بێت سەیادی) و (کەفر عوزێل) ئەم دوو گوندە بە تەواوی بزر بوون. هەروەها(دێری مارمیخائیل) لە ترعێل بزر بوو جگە لەوە، نەخشە هەیە تا ئێستا ناوەکان دەخوێننەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گوندانە بەڵام شوێنەکانیان نەناسراوە تاوەکو ئێستا بەڵام دەنگدانەوەی لە گێچکەدا بە مەسیحی دەمێنێتەوە. لەمانە:(باقرتە) کە پێنج کیلۆمەتر دوورە لە(دیوگرخان) ـ (دوو گردکان ـ وەرگێڕ).

بەلای باشووری خۆرئاوا بەڵام بەلای باشووری خۆرهەڵات، گردێکی بەرز هەیە، دەردەکەوێ هی سەردەمی مەسیحیەکانە، هەروەها(باڵەبان) وە(بەردەبۆر) وە(بحیرکە ـ بەحرکە)... تاد پێویستە ئەماژە بۆ دوو گوندی تر بکەین: دێرە وە (کیلیسیا). دۆسیەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری عێراق لە بەغدا ژمارە ناوێکی هەیە بەڵام جێگیر نەکراون لە سەر نەخشەکەدا، هەندێکیان دەکەونە دەوروبەری قەزای قوشتەپە وەك: گوندی خرمبات کیلیسا([٥٧١]).

وە(گردی کلیە([٥٧٢]).

وە(قەڵای سوریش)([٥٧٣]).

کە دەگەڕێتەوە بەرەو یادەوەریمان بە شێوەیەکی لاوەکی، بۆ حاکمی حدیاب و ئاشووردا(القادر باذن الله)([٥٧٤]).

ناسراو بە(سۆریشۆع) کە کوڕێکی دیار و بە توانای هەبوو، تۆما مەرگەیی لە بەرگی سێیەم لە پەرتووکی(الرؤساء) لە سەری نووسیوە: ئەم پیاوە چاکە ناودار بووە بە ناوی مارئیحسان Mar Hassan .

١٠. حەزە(حزا)

ناوی حـزه بـەکاردێت، ئامـاژە بـۆ دوو شـت، یەکـەمیان ئامـاژە بـۆ ناوچـەیەکی جـوگرافی وە دووەمیان هێمایە بۆ شارێك([٥٧٥]).

لە کاتی هێماکردن بەو ناوە بۆ ناوچەیەکی جوگرافی، کەواتە موورادیفی(ئامـاژە) یـە بـۆ نـاوی حدیاب([٥٧٦]).

بـە پێـی ئـەو تێگەیشتنە(ئیشـۆعیاب) ی حـدیابی واتـە هـەروەها(ئیشـۆعیابی حـزە) واتـە خەڵکی حەزە([٥٧٧]).

پایتەختی ئەو ناوچەیە لـە هـەر دوو سـەدەی ز (٦ )ەم و(٧) ەم(کـەفر عوزێـل) بـووە. بـەڵام ئـەو نـاوە بـەکاردەهێنرێ بـۆ ناونـانی جێگەیـەکی دیـاریکراو. هـەروەك بـەکارهێنانی ناوی(حـەزە) واتـە گونـدێکی نـوێ لـە دوای گونـدە مێژوویـە بچوکەکە مـاوە کـە دەکەوێتـە دووری(١٢) کیلۆمەتر باشووری رۆژئاوای(ئەربیل ـ هەولێر)([٥٧٨]).

ئـەم گونـدە لەلایـەن(ئەردەشـێر) ی یەکـەم کـوڕی بابـك دامـەزراوە، وە بـە نـاوی(بـوز ئەردەشێر)([٥٧٩]).

لـەو گونـدە نیشـتەجێی مەسـیحی و کـەمێك جولەکـە بـووە لـە سـەدەی هەشـتەم. رەبـەن برانسیا جولەکەیەکی شیفا کردووە لەو کەمینەیەدا([٥٨٠]).

وە هەروەها ناوی ئەسقەفیەشـی وەرگرتـووە بـەڵام خراوەتـە سـەر نـاوی ئـەربیل. بـەڵام ئایا میتراپۆلیتی حدیاب لە سەرەتای دامەزراندنیەوە کورسی ئەسقەفیە لـە حـەزە بـووە؟ دیـارە، هۆیـەك هەیـە لـە دانـانی نـاوی گونـدێکی سـاکار و نـەدار و نیمچـەنەزانراو لـە تـەك دا وە یەکسان بە شارێکی کۆنی ناوداری وەك هەولێر، ئەمە پاڵمان پێوە دەنێت بـۆ ئـەوەی پرسـیار بکەین ئایا ئەگەری ئەوە هەیە کە ئـەو شـارە بچوکە پێـوەر بـە ئـەربیل، مەسـیحیەتی قبـوڵ کـردووە و پـەرەی سـەندووە تیایـدا پـێش پایتـەختی گـەورە(ئـەربیل)؟داب و نـەریتێکی خۆجێیی لای خـەڵکی عـەنکاوە هەیـە وە ئەمـە پەسـند دەکات و دەڵێـت کـەوا مەترانـەکانی سەرەتایی و یەکەمەکان لە سەر کورسیەکەیان لە(حەزە) دانیشتوون. ئەوەی ئـەو رایـە پشت راست دەکاتەوە هـەبوونی گۆڕسـتانێکی تایبەتـە بـە مـەتران و رەبەنـەکان لـە گـردی عـەزە ـ عەبدولعەزیز نزیك بە حەزە. زۆر زەحمەتە رێکخستنی لیستێك بـە نـاوی خـەڵکی رەسـەنی حەزە و ناودارەکانیـان. رەچـەڵەك بۆ(حـەزە) واتـە سیفەتی(حـەزە ـ حزایـا ـ حـزێ) رەنگـە واتـای(حـدیابی) ش بـدات هـەروەها، وە زیـاد لـەوەی ئـەو رەسـەنایەتیە بـە رەچـەڵەك وەردەگرێت ئەوە خەڵکی حەزەیە، جگە لەمە ئەو سیفەتە بەواتای(الرائی) دێت.

با هەوڵ دەین ئەگەرەکان بزانین کە بۆی هەیە ئەو ناسنامە باس کردنە وەربگرێت مەنکا لە باسەکەیدا تێبینی ئەوە دەکات([٥٨١]).
ماریۆحەننان سەرۆکی دێری بێت قوقا لە ساڵی ٦٧٥ بۆ ٦٩٢ لە دایك بووی حەزەیە بەلآم لەو دەقانە(بڕوانە مێژووی بێت قۆقا لاپەڕە ٢٤٩) باسی دەکات بە(ابن الرائیین) بەلآم ئەوەی دەیبینین رەسەنایەتی بۆ رەچەڵەك خۆی دەسەپێنێت. لە کاتی باسکردنی بابەتەکە لە گۆشەیەکی تردا دەبینین کەوا بەکارهێنانی نەریتی بۆ خاسیەتی الرائی سەپێنراوە کاتێك باسی(یووسف حەزەیی) دەکەین - (یوسف الرائی) مادام ئەو ئەگەرە هەیە کە لە هەمان جێگە لە دایك نەبووە کە برایەکەی لێی لە دایك بووە. مەبەستمان لەمەدا لە نەمرود([٥٨٢]).
ئەوەی لای ئێمە دڵنیایە کەوا رەبەن زەکای بە رەسەن خەڵکی حەزەیە ئەو رەبەنە لە سەردەمانی(برعێتە)(لە سەدەی شەش و هاوڕێی لە دێرەکەدا)([٥٨٣]).
(دێری رەبەن برعێتە) لە رۆڵەکانی حەزەی زۆر بەناوبانگە کوڕی یەکێك لە خێزانەکانە لە دەوڵەمەندەکان و دەسەلآتدارەکان کە تیماتیوسی یەکەم(٧٨٠ ـ ٨٢٣)، هەروەها بە گەورەش ناسراوە(بڕوانە نووسینەکانی عەمر و لە لاپەڕە ٥٤).
هیچ شتێك دەربارەی مێژووی مەسیحیەکان لە حەزە نازانین وە هەروەها هیچ زانیاریەکی ئەوتۆمان نیە لە سەر مێژووی راوەستانی مەسیحیەت لە سەر ژیان لەو شارەدا.

٢ - عەنکاوە

عەنکاوە تەنها ٥ کیلۆمەتر لە هەولێر دوورە، دەکەوێتە باکوری خۆرئاوایەوە بە پێی دەرکەوتن، شارێکی زۆر کۆنە. بە پێی رای بێجان(بڕوانە ئەو تێبینیەی تۆمار کراوە لە ل XII لە پەرتووکی مێژوو کە بێجان نووسیویەتی لە سەر ژیانی یاوالاها لە ساڵی ١٨٨٨ بلآوی کردۆتەوە بە زمانی کلدانی)، ناوی ئەو گوندە(عەمك ئاباد) بووە لە سەردەمەکانی فارسیدا([٥٨٤]).
دواتر ناوەکە لە وەرگێڕاندا شێوێندراوە و ناوەکە بۆتە عەمکاوە کە لە سەدەی چواردەهەم بەکارهاتووە. هەندێك جار ناوەکە کورت کراوەتەوە بۆتە(عەمکۆ) ئەمەیان لە سەدەی دەیەم بەکارهێنراوە. دواتلا گۆڕانکاریەکی تر بە سەر ناوەکە هاتووە لە سەدەی چواردەهەم وە بۆتە عانیکاوا.دوایی ناوەکەی گەشەی کردووە و بەم شێوەیەی ئێستا پێی دەوترێ(عەین کاوە - عەنکاوە)([٥٨٥]).
کۆنترین شوێنەوار کە پارێزراو بێت لەو گوندە دیتنی گۆڕێکە کە لە بەرد نێژراوە لە تەنیشت شوێنی لە ناو هەڵکێشان لە ناو کەنیسەی مارگۆرگیس دا.

ئەم گەواهیە تاوەکو ئێستا لە باری سروشتی خۆیەتی و بەبێ هەڵکەندراوی وە یا دەستکاریەوە بۆ پەیکەرەکەی، نووسینی لە سەر هەڵکەندراوە نووسینەکە ورد و رێکوپێکە. نووسینەکە ئاماژە بە قەشەیەك دەکات ناوی هورمزد بووە خەڵکی گوندی عەمکۆیە. لە رۆژی چوارەمی مانگی تشرینی یەکەم ساڵی ٩٢٥ مەسیحی کۆچی دوایی کردووە. زۆر گۆڕی تری لەو شێوەیە دۆزرانەوە لە کاتی کارکردن بۆ چاکردنەوەی کەنیسەکە بەم دواییە زۆر بەداخەوە هەموو ئەو گەواهیانە لەگەڵ بناغە و قولاّییەکان نێژرانەوە دوای ئەوەی بە گەچ پرکراونەتەوە. ناوی(عەمکاوە) لە زۆر چیرۆك دا دەردەکەوێ بە تایبەتی لە گەمارۆدانەکەی قەلاّی هەولێر ئەربیل (٦٣٠)، ساڵی ١٣١٠. لە کاتی گەمارۆدانەکە عەرەبە داگیرکەرەکان لە نێوان ئەربیل و عەنکاوە دەهاتن و دەچوون بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی خۆبەدەستەوە دان و رادەستکردنی قەلاّ. جیاییە بەکرێ گیراوەکان کە گرنگی پاراستنی رێگەی نێوان ئەربیل و عەنکاویان پێ سپێردرابوو بۆ هات و چۆکردن، دوای کەمێك خۆبەدەستەوەدان کوژران گوندەکەش رزگاری نەبوو لە هێرشکردنی تاوانبارەکان و داگیرکەران بە چەقۆ تیژەکانیانەوە تەنها بە بەرتیل و پارەی زۆر نەبێت بۆ کورد و عەرەبەکان ئەگەر پرسیار بکەین ئایا عەنکاوە مەڵبەندی کورسی ئەسقەفیە بووە لە سەدەی شازدەهەم دان پێنانی باوەڕداری و یاسایی کە لەلایەن بەتریك(٦١٥)(عەودیشۆع) چوارەم مارون راگەیەندراوە لە ساڵی ١٥٦٢ رەنگە باوەڕمان پێ بهێنی. بەلاّم ئەوەی لە لیستی ناوەکان دا بۆ ئەسقەفیەکان هاتووە لە هیچ سەرچاوەیەك نایدۆزینەوە، رەنگە پاڵمان پێوە بنێ بۆ ئەوەی ئەو مەبەستەمان دەست کەوێ لەمەدا بۆ ئەوە بووە تیشکێك بخەینە سەر دەسەلاّت و هەیبەتی و لە ناوچوو و کۆتایی پێ هاتنی فەرمانەکانیان وەیا بە تەنها بۆ ئەوە بووە بە ساکاری و رازاندنەوە قەبە کردنی سەرۆکایەتیەکانی ئەسقەفیە و ئەبرەشیەکان کە دەکەوتە بەو دەسەلاّتی ئەو بۆ ئەوەی لای پاپا پێویستی چوارەم بناسرێ و گرنگی خۆی بەدەربخات بەبەراورد لەگەڵ گرنگی دوژمنەکەی کە لە دێری رەبەن هورمزد نیشتەجێیە. پرسیارەکەمان ئێستا ئەوەیە چۆن عەنکاوە توانیویەتی لە سەر ژیانی خۆی بمێنێتەوە بەبێ گوندەکانی تری مەسیحی. تەنها گوندی مەسیحی لە هەموو ناوچەکە دا ماوەتەوە رەنگە هۆکارەکەشی نزیکی لە شارە گەورەکە بێ واتە دانیشتوانەکەی دەیانوت و ئاگادار دەکرانەوە گوندەکەیان لە ژێر پاسەوانی حاکمی ناوچەکەیە پاش ئەوەی موڵك و ماڵێکی زۆریان پێ داوە و سۆز و بایەخی بەلای خۆیدا راکێشاوە و گرنگی پێدان. ئەوەی گرنگە گوندەکە ماوە و پارێزگاری بە باوەڕداری و ئاینی مەسیحی خۆی کردووە. سەربەرز و پایەدارە. ناوداری خۆی هەیە، لەوانە یەکێکیان لە رۆڵەکانیدا لە کۆتایی سەدەی

هەژدەهەم لە سەرەتای نووسینەکانی دەخوێنینەوە. سڵاوی گەرم بۆ دانیشتوانی عەنکاوە کە باسیان دەکات بە(دایکی زانستەکانی کلدانی). بێشك وا چاکە کەوا بە شان و شەوکەتی زۆریان هەڵبدات([٥٨٦]).

بەڵام دەبینین هەر زوو هاوڕێمان وریا دەبێتەوە و دەگەڕێتەوە بە ناسنامەی ئەربیلی کە لە بیری چووبۆوە دواتر بەراورد دەکات لە نێوان ئەربیل و شاری رەحبوت کە لە پەرتووکی پیرۆز دا ناوی هاتووە(رەحبوت شارێکی پیشەسازیە دەکەوێتە دۆڵی یەهودیا لە خاکی پیرۆز - وەرگێڕ).

دانەری ئەو قەسیدە خەیاڵیە قەشە(یوسف عەنکاوی) یە کوڕی ئەبراهام و سارا، ژیانی دوایی لە کەرکوك بووە. کردەوەکانی تایبەت بووە بە وەرگێڕانی: پەرتووکێك باس لە خۆراکی قەشەکان دەکات، وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کلدانی ساڵی ١٧٩٥([٥٨٧]).

(تکایە ئاگادار بە بۆ تێبینی کردن لە خوێندنەوەی پەراوێزی خوارەوە) دواتر پەرتووکی(قلادة اللؤلؤ) ی قەشەکان لە زمانی عەرەبی وەرگێراوە بۆ سەر زمانی سریانی لە ساڵی ١٧٩٨([٥٨٨]).

هەروەها فەرهەنگێکی داناوە بۆ وشەکانی سریانی و هەندێك وشەی یۆنانی لە کەرکوك تەواو بووە لە ساڵی ١٨٠٧([٥٨٩]).

لە ساڵی ١٨٤١([٥٩٠]).

وە ساڵی ١٨٤٤([٥٩١]).

شەماسی عەلمانی داود کوڕی یۆحەنانی نیسان کوڕی کورکو لە خێزانی(قەرەداحی) لە عەنکاوە دانیشتووە. نووسەرێکی ناودار بوو بۆ دەستنووسەکان لە بارزان هاتبوو کە دەکەوێتە(زێبار) بۆ تەواوکردنی دەستنووسەکان کە نووسیبوویەوە ئەو نووسەر و شاعیرە توانیمان لێی بڕوانین و لە شێوازەکەی بزانین کە بە پێی ئەمە ژیانی دوایی دروست بوو لە بارزان بووە لە ساڵی ١٨٣٧ لەو ساڵەدا نەخۆشی گرانەتا بڵاوببۆوە لە ناوچەی زێبار. قەشە حوزمیران یەکێك لەوانە بووە کەوا ئەو نەخۆشیە کوشندەیە لەناوی بردوون([٥٩٢]).

وە لە ساڵی ١٨٣٢([٥٩٣]).

لەو گوندەدا دەژیا کە لێی لە دایك بووە. لە ساڵی ١٨٣٣ (٦٢٤) گواستراوەتەوە بۆ عەنکاوە، ئێمە هۆکاری گواستنەوەکە و نیشتەجێ بوونەکە نازانین. لە کاتی گەڕانەوەی بۆ گوندەکەی لە کەنار زێی تووشی ماریووسف مەترانی گەورە بووە(رەنگە ئەمە یووسف ئۆدۆ بووبێت پێش ئەوەی ببێت بە پەتریك بەنازناوی یووسفی شەشەم ئۆدۆ کەوا مەترانی عەمادیە(ئامێدی) بووە لە ساڵی(١٨٣٢ تا وەکو ساڵی ١٨٤٧).

بردی لەگەڵ خۆی بۆ ئیکلیریکی گەڕۆك بۆ چەند مانگێك. دوای چەند رۆژێکی کەم لە ئەلقۆش بەسەری بردووە شەماس بە مەترانی دهۆك گەیشتووە. لەوێ مەراسیمی قەشایەتی بۆ کراوە، لەگەڵ مەتران ئۆدۆ لە گەشت و گەڕان دابووە لە گوندەکانی زاخۆدا. ئەو جێگەیەی کە درێژترین ماوەی تێدا بە سەر بردووە گوندی بێدارۆ بووە وە ئەو ماوەیەش پێنج مانگ بووە لە ساڵی ١٨٤٦. هاوڕێکانی لە ئیکلیریکی دا کە لەگەڵ ئەودا رێورەسمیان بۆ کرا دوو کەس بوون بە ناوەکانی: موشێ و شەمعون.

ناوی گوندەکانی لێوەی هاتوون دیاری نەکراوە. ئەوەی پەیوەندی بە بابەتی باسەکەوە هەیە، پێدەچێت لە ئاستی داواکاری نیە لە بابەتی فەلسەفە و لاهوت. ئەوەی تۆماری کردووە لە یەکێك لە دەستنووسەکانی دایە لە ساڵی ١٨٦٧ دەردەکەوێ هەر وەکو سکاڵایەك بڵاوی دەکاتەوە لە نێوانیاندا گەشتی دەکرد و دەیوت:(مەتران سروتەکانمان پێ دەدات) ئەو دەستنووسە ئێستا لە پەرتوکخانەی باوکانی دۆمنیکانە لە موسڵ([594]).

لە دوای تێپەڕبوونی هەشت رۆژ بەسەر مەراسیمی بوونی بە قەشە بەتریك بڕیاری دا قەشە نوێیەکان رەوانە بکات بۆ ناو کەس و کاری خۆیان. لەو کاتەوە کێشە بۆ قەشە داود دروست دەبێت و ناچاری دەکات لە گوندێکەوە رابکات بۆ گوندێکی تر. ئەو قەشەیە لە سەر ئەمە دەڵێت:(لە هەر گوندێك کوڕێکی خۆم ناشت) بەڵام ئەو دەردەسەریانە نەبووە هۆی بەردەوام نەبوونی لە نووسینی ژمارەیەك دەستنووس. لەوانە دوازدەیان گەیشتووەتە ئێمە([595]).

لەو گوندەی لێی لە دایك بووە ـ بارزان ـ ئاغای زێبارییەکان لێی داوە بە خراپترین شێوە لەگەڵ رێگە نەدان بە منداڵەکانی بگرییێن. لەوێوە ماریوسف(مەترانی مەزن) گواستیەوە بۆ(خاردیس) بەهۆی بیستنی بەو رووداوە سەرکوتکردنە کە بەسەر قەشەکەی دا هاتووە بوونی لە گوندی خاردیس کە سەر بە(سەبسەبا) یە ساڵی ١٨٥٤ بووە بە دڵنیایەوە([596]).

هەروەها ساڵی ١٨٥٨([597]).

بە کردار نۆ ساڵ لەوێ مایەوە لەو ماوەیەدا نۆ منداڵی مردن. سەر ئێشەی نوێی بەرەنگار بۆتەوە و چووە بۆ(خربە) وە لەوێش سێ لە منداڵەکانی مردن بە یەکەوە. گرفت و نیگبەتی سەر ئێشە ماوە و بە دوای قەشە(داود) کەوتبوو ناچار رای کرد بەرەو(صانایا) کە دەکەوێتە(نەهلە) لەوێش دوو کوڕی تری مردن لە صانایا ناچار بوون بەجێی بهێڵی لەگەڵ هەموو مەسیحیەکان لە ئەنجامی نوێ بوونەوەی ناکۆکی و هەراوهۆریاکانی ئەو کاتە ناچار بوو زێبار بەجێبهێڵی، بە هەموو ئەو موڵك و ماڵ و سامانەی هەیبوو. لە دوای لە ساڵی ١٨٦٣([598]).

ئاسایش و ئاسوودەیی گەڕایەوە بۆ گوندی(کانیا فەلان) ئەو ئاسایشەی کە بۆی ڕەخسا ئەوە ناگەیەنێت کەوا کۆتایی بە ئازارەکانی دێت و کامەرانی و خێر و بەرەکەت باڵی بە سەر دا دەکێشێ. لە گوندی کانی فەلان دایکی منداڵەکانی مرد، وە بە تەنهایی مایەوە و بەربەرەکانێی ژیان دەکات. قەشە هەژار و بێکەسەکەمان هیچ کەسێکی لەگەڵ نەمایەوە بۆ ئەوەی خواردەمەنی بۆ بکات وە یا جلەکانی بۆ پینە بکات لە هەموو خێزانەکەی تەنها کوڕێکی مابوو بە ناوی ئەنتۆن کە هەندێك یارمەتی ناوە ناوەی پێ دەبەخشی. بەلام مردن ئەو کورشەشی برد لە ڕۆژی نۆی ئابی ساڵی ١٨٦٥. ئەو بە سەرهاتەی دوایی بۆ ئەو قەشەیە پاڵی پێوەنا بۆ ئەوەی سێ سکالا بنووسی([٥٩٩]).

(سەردولکەی ئاینی) چیرۆکی ڕووداوی مردنی کوڕەکەیەتی ئەمە لە ساڵی ١٨٦٧ بەلای کەمترین خەملاندنەوە. قەشە داود لە کانیا فەلان خەریکی نووسین و دانان بوو بۆ دەربڕینی ئەو خەم و پەژارەیە لە قولایی دڵیەوە ژمارەیەك سەردولکەی بە زمانی کلدانی وە یا سورەت وە یا بە کوردی نووسی. وە هەروەها دەستنووسی نوێژکردنی فەرزی نووسی بۆ(ئادیخ) Adekh لە ساڵی ١٨٧١([٦٠٠]).

ئەم دەستنووسە دوا گەواهی چالاکیەکانیەتی، وە هەروەها دوا مێژووی ژیانی خۆی نووسیوە. ئێستا با بگەڕێینەوە بۆ سەر بابەتەکەمان کە ئێمە دەمانەوێ لە سەری بنووسین واتە(عەنکاوە) ئەم گوندە بوو بە گوندێکی کلدانی کاسۆلیکی پێش کۆتایی سەدەی هەژدەهەم، وە بەسترایەوە بە پێی ڕێکخستنی کارگێڕی کەنەسی بە ئەبرەشیەی کەرکوك. لە ساڵی ١٨٥٨ قەشەی بەڕێز G.P.Badger لە سەر عەنکاوە نووسیویەتی([٦٠١]).

لە یادگاریەکانیدا بەم شێوەیە: گوندێکە(٥٥) خێزانی تێدا نیشتەجێیە، یەك کەنیسەی تێدایە لەگەڵ دوو قەشە بۆ خزمەتکردنی باوەڕداران. کەنیسەی ناوبراو بە ناوی(مارگۆرگیس) نراوە. کەنیسەیەکی کۆنە هەر وەك پێشتر ڕوونمان کردۆتەوە بە دەلیلی دۆزینەوەی ئەو گۆڕەی کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دەیەم باسی کراوە لە دەستنووسێکدا لە ساڵی ١٧٠١([٦٠٢]).

بەلام لە ژێر ناوی دێری مارگۆرگیس و بەس تکایە ئەو ناوە بە پێی پیتەکانی دا دامەنێن لەبەر ئەوەی مانای ڕاستەقینەی کەنیسەی مارگۆرگیسە و بەس. بە پێی ئەوەی لە خوارەوە باسی دەکەم دەبینین قەشە داود کە کۆتاییمان بە باسکردنی هێنا پێش کەمێك دەینووسی ئەو کاتەی لە کانی فەلان بوو دەربارەیەوە دەڵێ: دەکەوێتە نزیك دێری(مارئەحا) واتە کەنیسەی مار ئەحا. وە نموونەی تر دووبارە دەکاتەوە بۆ بەکارهێنانی هاوشێوە، وشەی دێر تەنا بۆ کەنیسەی بەکارهێناوە بینایەی ئێستای

کەنیسەی مارگۆرگیس ئەنجامی دووبارە کردنەوەی چاکردنە نوێیەکانە بەڵام هەندێك(تاق) هەیە لە(بێت سلوتا ـ ماڵی نوێژ کردن) دیارە کۆنە. وە هەروەها دەبینرێت لەو جێگەیەدا دەلاقەیەکی هەڵکەندراو هەیە(دەلاقەی ناودیوار) بەڵام پەنجەرەی نیە بەڵکو پەیکەر و گوڵدانی لێ دادەندرێ ـ وەرگێڕ. دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی جەلیلیەکان سەدەی هەژدەهەم. لە کاتی سەردانەکەم بۆ ئەو کەنیسەیە لە ساڵی ١٩٥٩ لە حەوشەی کەنیسەکە بەردێکی نەخشکراوم بینی بە هەڵکەندراوی بۆ هەمان ماوە دەگەڕایەوە. شوێنی تایبەت بە نوێژی لە ناوهەڵکێشان دەکەوێتە ئەوپەڕی کۆتایی رۆژئاوای کەنیسەکە(ئەم شێوازە سروتیە جیاوازە بۆ ئەندازەی کەنیسەی رۆژهەڵاتی رەسەن) لە سەر ناوی ماریۆحەنان ناو نراوە(ئەو مەترانەی کەوا بیناى ئەو شوێنەی نوێژی دروست کردووەو مێژووی دیار نیە). لە سەر کەڵەکە بەردەکانی ناو حەوشەکە وێنەی شێر و خەنجەری تێدا هەڵکەندراوە، دوای کەمێك باسی گۆڕستانە پەیکەرتاشەکانی ناو کەنیسەکە دەدوێین.

پاشماوەی هەر دوو کەنیسەکە کە بە ناوی(مارتشمۆنی) و(مارتمەریەم) نراون تا ئێستاش دیارن وە دەتوانین لە دەوری عەنکاوە بیبینین. دووەمیان تاوەکو ئێستاش باوەڕداران بۆ حەجکردن سەردانی دەکەن لە رۆژی جەژنی گواستنەوەی مریەمی پاکیزە. رۆژانی شەممە مۆمی تێدا هەڵدەگیرسێندرێ.

جێگیربوونی رۆڵەکانی عەنکاوە لە سەردەمە یەك لە دوای یەکەکاندا بۆ باوەڕداری و پابەند بوونیان بە ئاینەکەیانەوە روون و ئاشکرایە وە هەروەها سەردەمەکانی ئەو رۆڵانەی گوندە مەسیحیەکانی تری سەر بە(ئەربیل) وە دەرچوونمان لە عەنکاوە گۆڕێك دەبینین دەگەڕێتەوە بۆ شەهیدێك بە ناوی(ئیلیا) ناوی ئەو شەهیدە لە رۆڵەکانی ئەو شارۆچکەیە پێشتر لە ئاین هەڵگەڕابوو دواتر گەڕایەوە و باوەڕی نوێ کردەوە بۆیە(پاشای گۆرە) ی رواندوزی حوکمی مردنی بە سەر دا سەپاند وە ئەو حوکمە لە مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٨٣١ جێبەجێ کراوە(٦٣٤). ناوی کەسەکە(ئیلیا عەبدۆکەیە).

٣ ـ بێت سەیادی(صیادی)

سیاسەتی دنحای ئەربیلی لە هەوڵی نزیك بوونەوە لە یەعقوبیەکان لە سەدەی سێزدەهەم باس لە بێت سەیادی وە یا لە بێت صەیدا بکەین. ئەو کات پێشنیازێك کراوە بۆ روونکردنەوە لە سەر ناوی دوو قۆڵی تایبەت بە ئەبرەشیەی نوێی یەعقوبیەکان کە لە ساڵی ١٢٧٧ دامەزراوە بۆ کۆکردنەوەی نێوان(بێت سەیادی) وە (بێت تەکشور) لەگەڵ یەکتریدا. شوێنی بێت سەیادی تا ئێستا نەزانراوە، وا باوە لە عەنکاوە کەوا ئەو شوێنە(بنەصلاوە) بنی سڵێوا) یە کە بە سەعات و نیوێك بە پیادە لە هەولێر دوورە بەلای

باشووری خۆرهەلاَت(ئێستا ئەو شوێنە وەك گەڕەكێك لەگەلّ هەولێر یەكتری گرتۆتەوە، وەك شارۆچكەیەكی كارگێڕیە - وەرگێڕ).
هیچ سەلماندنێكمان نیە تاوەكو ئێستا بۆ ئەوەی ئەمە پشت راست كاتەوە وە یا نكوّلّی لیّ بكات. بە دلّنیاییەوە بێت سەیادی گوندێكی نەستۆری بووە ناوەكەی واتە گوندی راوكەران وە هەروەها گوندی راوكردنی ماسی بەلاّم بە داخەوە هیچ جۆگە ئاوێكمان نەدۆزیەوە بۆ ئەوەی دانیشتوانی ئەو گوندە توانیبێتیان راوە ماسی بكەن.
یەكەم مێژوو كە باسی ئەو گوندە دەكات لە سەرچاوەكان لە نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەم دا دۆزراوەتەوە. لە سەر ژنێك دەخوێنینەوە لەو گوندە كە لە سەردەستی ماران عەمما شیفا و چاكبوونەوەی وەرگرتووە لە زینای كە سەرۆكی دێری بێت قوقا بوو([٦٠٣]).
سەدەی سێزدەهەم بە چەرخی زێرینی بۆ(بێت سەیادی) دادەنرێت. لەو ماوەیەدا یەعقوبیەكان كەنیسەی نوێیان دروست كرد لە سالّی ١٢٦٥، ئەمە لەو كاتەی كەوا مەترانیّ ئازربێجانی نویّ(یۆحەننان)(پێشتر ناوی دنحا) كوڕی حەفرا بوو لە بەغداوە دەهات([٦٠٤]).
بەو گوندە دا تێپەڕ بوو، لەویّ كۆچی دوایی كرد و نێژراوە. دەستنووسێكمان پێگەیشتووە لەو گوندەدا نووسراوەتەوە مێژووەكەی دەگەڕێتەوە بۆ سالّی ١٢٦٧، بابەتەكەی لە سەر نوێژكردنی فەرزیە لەلایەن گۆرگیس ئەربیلی نووسراوە لە سەر داوای قەشەیەك نووسراوە بە ناوی پەترۆس كوڕی یۆحەننان كوڕی داود كوڕی نەسری وە بۆ بەكارهێنانی كەسێتی([٦٠٥]).
لە سالّی ١٢٧٧ جێگیربوونێك بۆ مەترانیەی یەعقوبیەكان روویدا ئەو بارمتەیەی كەوا دنحا گرتیەبەر بووە هۆی بەهێزبوون و پشتگیری بۆ مەسیحیەكان. لە سالّی ١٢٨٥ یەكەم پێكدادان دروست بوو، هەندێك دانیشتووان بە دەستی كوردەكان كوژران([٦٠٦]).
لە سالّی ١٢٩٠ خەلّكی ئەربیل هەندێك یارمەتی بۆ خەلّكی گوندی(سەیادی) یان كرد، هاتن بۆ وەرگرتن بەلاّم لە رێگەدا هەموویان لەناوبردن بە قەسابخانەیەكی ترسناك و دڕندانە([٦٠٧]).
گوندەكە بە گشتی توانی رزگاری بێت لە رووداوەكان و مەترسیەكانی سالّی ١٣١٠ وە بە ساغ و سەلامەتی مایەوە([٦٠٨]).
رزگاربووەكانی قەسابخانەی سالّی ١٣١٠ لە دانیشتوانی ئەربیل لە مەسیحیەكانەوە بە تایبەتی لەوانە: جاسلیقی یاوالاهای سێیەم و میتراپۆلیتی ئەربیل یووسف توانیان جێگایەك بۆ خۆیان بدۆزنەوە. گەمارۆدارانی قەلاّ بۆ چەند جارێك سەردانی گوندەكەیان

کردووە وە هەروەها بەتریکیان بۆ جاری دووەم گەڕاندەوە. ئەو دەقانەی کە نووسراون لەو ماوەیەدا باس لە هیچ قەسابخانەیەك ناکات.

دوا جار ناوی گوندی بێت سەیادی دەدۆزینەوە لە ماوەی یەعقوبیەکان لە ساڵی ١٣١٧ان لە هەمان ئەو ساڵە دا سەرۆکی گوندی بێت سەیادی رۆڵێکی گەورەی گێڕا لە هەڵبژاردنی رەبەن مەتی(لە بەرتلە) واتە خەڵکی بەرتلە بۆ ئەوەی ببێتە مەفریانی نوێ([٦٠٩]).

باوەڕم بەوەی ئاماژەم پێدا جێگیرە مەگەر خودا ئەگەر گوندێك هەبێت بۆ یەعقوبیەکان پێی بڵێن(بێت سەیاری) کە تاوەکو ئێستا شوێنەکەی دیار نیە. لە بارێکدا لەو جۆرە بە پێویستی دەزانم ناوەکەی چاکبکرێتەوە(بێت سەیادی) بە دڵنیایەوە خوێنەرە وریاکان ئەو جیاوازیە دەزانن لە زمانی سریانیدا کە روون و ئاشکرایە بەلاّم زۆر هەستی پێ ناکەی لە کاتی ئاخافتندا لەو دوو پیتەدا راو، دال(ر، د).

٤ ـ کفرعوزێل

لە لێکۆڵینەوەدا لە سەرچاوەکانی عەرەبی دەربارەی ناوی(کفر عزا ـ کفر عەزا) وە(کفر عازی) شارێك دەدۆزینەوە بەناوی کفر عوزێل وە باس دەکرێت بە مەڵبەندی ناوچەی(حزا ـ حەزە)([٦١٠]).

تەنها ئاماژەکە بۆ ئەو ناوە دەبینینەوە هەروەك لە سەرەوە روونکردنەوە هەیە لە(مصادر الاطلاع)([٦١١]).

وە لەلایەن(یاقوت الحموي)([٦١٢]).

دەبینین شوێنەکە لە نزیك هەولێر دیاری کراوە وە دەکەوێتە نێوان هەولێر و زێی بچوك کەواتە پێویستە بەدوای بگەڕێین لەلای رۆژهەلاّتی هەولێر وە بە دوورییەکی کەم لێیەوە([٦١٣]).

وە هەروەها(کفر عوزێل)(٦٤١) دوور نەبووە لە(بێت سەیادی) لە چیرۆکی(باوای) لەکویلتای موسیقای بەناوبانگ دەخوێنین: ئەو کاتێك لە قوتابخانەکەی کفر عوزێل مامۆستایەتی دەکرد ژنێك لە بێت سەیادی هاتە لای لەگەڵ منداڵێك دا داوای لێکرد نوێژی لە سەر بخوێنێت(٦٤٧) ئەو منداڵە دواتر بوو بە(مار ئەبراهام ـ بارڕشنداد) ناسراو بە(شەلە).

دەوروبەری ساڵی ٧٢٠ ئەوەی گرنگە لەلامان بە درێژی رووداوەکە هاتنی ئەو ژنەیە لە بێت سەیادی و کفرعوزێل بە سەردانێکی چاوەڕوان نەکراو وە بە پیاوە، وە ماوەیەکی بەرچاو دەبڕێت بە پێی ئەوەی تۆما مەرگەیی دەڵێت. دوای کەمێك دەبینین کەوا دێری گەورە لە سەر ناوی مارمیخائیل لە ترعێل کراوە کە بە دووری یەك میل دەبێت لە کفرعوزێل وە

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ئەگەر شوێنی یەکێک لەمانەمان دۆزیەوە ئەو کات شوێنی ئەوەی ترمان پێ دەدۆزرێتەوە.

بەڵام تاوەکو ئێستا و ئەمڕۆ نەگەیشتوومەتە ئەوە. زانیارییەکانمان لە سەر کفرعوزێل زۆر کەمە کەنیسەکەی بە ناوی(مارئەدای نێردراو) نوێکراوەتەوە پێش ساڵی ١٢٦٥ لە سەر دەستی دنحای هەولێری([٦١٤]).

قوتابخانەی کفرعوزێل ناسراوە بە گەورەیی قەبارەی و ناوبانگە بەفراوانیدا(٦٤٩).

وە یەکەم قوتابخانە بووە لە نێوان شەست قوتابخانە کە باوای کویلتا دایمەزراندووە(٦٥٠).

لە ناوچەی مەرگە وە حدیاب ئەو قوتابخانانە دامەزراون لە سەردەمی بەتریك سلێوە زخا ـ (٧١٤ ـ ٧٢٨) دامەزرێنەر خۆی قوتابخانەکەی بەڕێوەدەبرد کە خەلیفەی(ماران عەمما) بوو([٦١٥]).

کە دواتر بووە بە مەترانی سالاخ دواتریش میترابۆلیتی حدیاب لە سەردەمی بەتریك یوسفی دووەم(٧٥٣ ـ ٧٧٣). لە قوتابیە بەناوبانگەکانی باوای، لەوانە:(لە کۆریا لە کفرعوزێل)([٦١٦]).

کە دواتر بوو بە مامۆستای مەترانی(بلد ـ بەلەد) کە ناوی مار قریاقۆز) بوو([٦١٧]).

وا دەردەکەوێ کەوا ئەو قوتابخانەیە لە خەوێکی قوڵ دا بوو لە ماوەی سەدەکانی دواتردا.

بەڵام پەتریکی دواڕۆژ(دنحای یەکەم) لە خەوی هەڵستاند و چالاکیەکانی تێدا گەڕاندەوە.

ئەو کاتەی کە بەردەوام لە میترابۆلیتی هەولێر بوو واتە لە دەوروبەری ناوەڕاستی سەدەی سێزدەهەم([٦١٨]).

کفرعوزێل یەکێك لە گەورەترین مەڵبەندەکانی شەهریکان دادەنرێت([٦١٩]).

کە باوەڕیان بە مەسیحیەت هێناوە وە لەگەڵیشیان دا هەڵگەڕاوە کافرەکان([٦٢٠]).

شەهریکان بریتی بوو لە کۆمەڵێك لە دەرەبەگ و چاوچنۆك کە لە سەر هەژارەکان دەژیان([٦٢١]).

وایان بڵاوکردەوە کەوا ئەوان توانای خۆیان دەسەپێنن بۆ دەستنیشانکردنی میترابۆلیت بۆ حدیاب([٦٢٢]).

بە پێی ئەوەی تێدەگەین لەو دەقانە کەوا مەتران ماران عەمما پێشبینی ئەوەی کردبوو کەوا ئەو نەتەوەیە بەخێرایی دەروخێ، ماران عەمما ناسراوە بە خواپەرستی. وە ئەمەش لە سەر دەستی(حاتەمی کوڕی ساڵح) هاتەدی کە هەمووانی چەوساندەوە و دەربەدەری کردن لە وڵاتدا.

٥ ـ دێری مارمیخائیل لە ترعێل

ڕێگاکانی دیاریکردنی شوێنەکەی:

بۆ دۆزینەوەی شوێنی ئەو دێرە لە سەرمانە ئەوەی بخەینە سەر ئەوەی پێشتر وتمان بۆ زانینی(کفرعوزێل) هەندێك لە دەرهاوێشتەی نوێ لەبەر ئەوەی شوێنی ئەو دێرە بە یەك میل دوورە لە شوێنی کفرعوزێل([٦٣٣]).

پەرتووکی(العفه) باس دەکات([٦٣٤]).

ماوەی نێوان ئەو دێرە و دێری بێت قوقا(٥) فرسەخە(پێنج قۆناغ وە یا پێنج سەعات ڕۆیشتن بە پیادە).

ماوەی دیاریکراو دیاری بە وردی دیاریکراوە. ئەمە پاڵمان پێوە دەنێت بۆ ئەوەی بە توندی وریابینەوە بەرامبەر بەو ماوەیەی دیاریکراوە لەلایەن(ئیشۆع دناح).

ئیشۆع دناح شوێنەکەی دیاریکردووە واتە شوێنی ترعێل لەلای ڕۆژئاوا وە یا باشووری ڕۆژئاوای هەولێر.

دواتر دەڵێ ماوەی نێوانیان و دێری بێت قوقا حەوت سەعات ڕۆیشتنی بە پیادەیە، دیاریکردنی شوێنەکە بەم شێوەیە دەمانخاتە بەردەم جیاوازیەك بۆ دەقەکەی(یاقوت الحموي) کە شوێنی کفرعوزێل دیاری دەکات لە نێوان هەولێر و زێی بچووك، بەلام لە هەمان کاتدا یەکتری دەگرێتەوە لەگەڵ پێشنیازەکەی(ابن العبري) کە دەڵێ ترعێل دەکەوێتە نێوان ڕێگەی موسڵ و هەولێر کە بە باکوری چیای خان دا تێپەڕ دەبێت جگە لەمە لێکۆڵینەوەی مێژووی ترعێل کاردەکاتە سەرمان بۆ گەیشتن بە پیاوچاکی گەورەی دێرەکە، وە ناوەکەی(سۆریشۆع کوڕی ناخوار) ە لە شاری کفرعوزێل([٦٣٥]).

پێشتریش مەتران ئەدیشێر بڵاوی کردۆتەوەو هەمان بۆچوونی(منکنا) کە زۆر ئەگەری هەیە([٦٣٦]).

ئەگەرەکە دەڵێ: سوریشۆع کوڕی ناخور حاکمی حدیاب بووە وە(ابو الحسن) داوای لە تۆما مەرگەیی کردووە کەوا پەرتووکی(الرؤساء) بۆ بنووسێتەوە لە دەوروبەری ساڵی ٨٤٠.

وە هەروەها لەوانەشە خاوەنی کۆشکەکە بێت کە ناوی سۆریش بووە(پێشتر ئاماژەمان پێداوە وەرگێڕ).

ئەو هۆکارانەی کە لەلامانە دەمانخاتە خاڵی بەیەك گەیشتنی ڕاوبۆچوونەکان و کار کردن بۆ ئاراستەکردنی بایەخدان بەرەو لای باشووری خۆرئاوای هەولێر. کاتێك بارودۆخەکە ئەو دەرفەتە دەڕەخسێنێت ئاماژە بۆ ئەوە دەکەم کەوا پێویستە باس لە ترعێل بکرێت لە جیاتی(کلێسا) کە دەکەوێتە دوور بیست کیلۆمەتر لە باشووری خۆرئاوای هەولێر وە بە دووری دە کیلۆمەتر لە(حەزە). ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەوا شوێنی کفرعوزێل وە یا

کفرعازێ پێویستە شوێنی ئێستای(سورباش عەزیز) بێت کە بە دووری ۱۵۰۰ مەتر وە یا یەك میل لە کیلیسا وە بە ئاراستەی باکوری خۆرهەلآت. دیاریکردنی ئەو شوێنە بەو شێوەیە یەکتری دەگرێتەوە لەگەڵ دەقەکانی مێژووی یاوالاهای سێیەم([٦٢٧]).

دەقە تۆمراکراوەکان دەڵێن: رەبەنەکانی دێری ترعێل دێرەکەیان بەجێدەهێشت بە شەو وە بەرە بەری بەیانی دەگەیشتنە هەولێر. ئەمە ئەوە دەسەلمێنی کەوا ئەو ماوەیەیان بە چوار کاتژمێر دەبری بۆ زانینی شوێنی دێرەکە بە تەواوی، پێویستە بە درێژی لە سەر تۆبۆگرافیای ناوچەکە تایبەت بە دێرەکە بکۆڵینەوە کە لە پەرتووکی(المسالك) دا هەیە([٦٢٨]).

بە پێی نووسینەکانی(المستوفی) دەخوێنین: (لە سەردەمی گەشەکردنی دێرەکە و چالاکیەکانیدا، جۆگەیەك ئاو هەبوو بە پێش دێرەکەدا تێپەڕ دەبوو)(پێش دەرگای دێرەکە)، وە بەلای رۆژهەلآتەوە باخچەی زۆری هەبوو لەگەڵ باخچەی مێو و ئاشێك. ئاشەکە لە شوێنێك بوو نزمتر لە ئاستی زەوی دێرەکە بەلای دوووەم لە جۆگەکە گردێك هەیە بەناوی دێرێکی کۆن هیچ زانیارییەکمان دەربارەی ئەو دێرە نیە تەنها ئەوە نەبێت پێی دەڵێن(دێری زاراغ) لە وەرزی بەهاری رەنگین بینەر لە سەر گردەکە هەموو زەویەکانی سەر بە کەرتی(حەزە) دەبینێت. پێشتر محەمەد کوڕی ئەحمەدی کوڕی عاسی سروودی نووسیوە بۆ گوڵەکانی بەهار کە کێلگەکانی دەوروبەری دێرەکەی دەرازاندەوە، بەلآم لە سەردەمی مستەوفی، واتە پێش سالی ۱۳٤۰ ئەو جۆگەیەی کەوا ئاشەکەی پێدەسوڕا پێشتر، رێڕەوی گۆڕی و دوورکەوتەوە لە دێرەکە. جۆگە کۆنەکە وشك بۆوە و دارودرەختەکان و سەوزایی نەما کە پێشتر سێبەری دەکرد. ئەو ئاشەی پێشتر کاری دەکرد ئەمڕۆ بێ سوود ماوەتەوە. کەنیسە تەنها بەشێکە لە بینایەی دێرەکە چاککردنەوەی تێدا دەکرێت رۆژی ئاهەنگگێڕان بە جەژنی شەفیعی دێرەکە فێستیڤاڵێکی گەورە ساز دەکرا بۆ ماوەی دوو رۆژ و زیاتر. لەو ئاهەنگە خەڵکی هەولێر و ناوچەکانی دەوروبەری دەهاتنە ئەو دێرە بۆ سەردان و وەرگرتنی بەرەکەت ئەمە هەموو ئەوانەیە کە دەتوانین بیڵێین ئێستا دەربارەی ئەو دێرە بەلآم ئەوەندە بەسە بۆ هەوڵدان لە دیاری کردنی شوێنی دێرەکە لە جێگەی تردا چونکە دڵنیا نین لەو شوێنانە(بودەج)([٦٢٩]).

شوێنی دێرەکە دیاری دەکات کە زۆر دوور نیە لە موسڵ لە سەر رێگەی هەولێر، بەلآم شابۆ لە سەر نەخشە هەوڵی داوە بۆ دیاریکردنی لەو جێگەیەی بە ناوی(ترجێلد)،(ترکیلە)، کە دەکەوێتە باکوری کرملێس وە پێش خازر بۆ بەرەو موسڵ ناوەکە نزیکە لە ناوی ترعێل بە دووری سی کیلۆمەتر لە موسڵ وە ٥٥ کیلۆمەتر لە هەولێر([٦٣٠]).

رەنگە هەڵەیەك لە یەکچوونەکەدا هەبێت لەوانە یەکەم دێری مارمیخائیل هاوڕێی فریشتەکانە، ئەم دێرە دەکەوێتە سەر ڕۆخی ڕووباری دیجلە نزیك موسڵ بە هۆی هەڵە کردن لە دیاریکردنی وردیدا، ڕەنگە بکەوینە هەمان هەڵەوە، چونکە ناوەکان لێك دەچن بۆیە لە ڕووداوەکانیش تووشی ئەمە دەبین ئەگەر هی دێری مارمیخائیل بێت. بۆیە پرسیار دەکەین هی کام دێرە ئەو ڕووداوە بۆ نموونە دەڵێین(کاتێك خەڵکی موسڵ مەفریانگرگۆریۆس یەعقوبی دووەم، کوڕی برای بەتریك میخائیلی گەورە(١١٨٩) قەدەغە بکەن بەهۆی هاوکاری کردن و یارمەتیدان و دەخالەتکردنی کەریم کوڕی مەسیح لە دێری شێخ مەتی، ناچار لە دێری مارمیخائیل مایەوە پێش گەڕانەوەی بۆ تکریت([٦٣١]).
لێرەدا پرسیارێك هەیە ئەوەیە: نووسەر مەبەستی کام دێری مارمیخائیلە؟ وە ئەگەر بگوازینەوە بۆ باسەکەمان لە سەر دێری مارمیخائیل ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ سریانیەکان وە لێرەدا دێرێك هەیە بەو ناوەوە و دەکەوێتە نزیك ماردین([٦٣٢]).
لە کۆتاییدا دەمانەوێت بڵێین:(مادام چەند دێرێك بەهەمان ناوەوە هەیە واتە ناوی مارمیخائیلی لێنراوە) کەواتە بۆی هەیە چەند شوێنێك هەبێت بە ناوی دێری(ترعێل) ی هەیە. بەلام بەناوبانگەکەیان دێری ترعێلە کە دەکەوێتە گوندی(تل عد ـ تەل عەدا) نزیك حەلەب و هی یەعقوبیەکانە([٦٣٣]).

## مێژووی دێرەکە

لە کاتی باسکردنی قوتابیەکانی مارسۆریەشوع لە بێت قوقا هەوڵمان دا هۆیەکانی دیار بکەین کە پاڵی بە مارمیخائیل ناوە بۆ بەجێهێشتنی دێرە ڕەسەنەکەی خۆی، وە دامەزراندنی دێرێکی نوێ لە شوێنێکی تردا. ئێستا دەمانەوێت ئەوە بخەینە سەر کردەوەکانی دروستکردنی دێری نوێ و پۆشاککردنی بە پێویستیەکانی لە کەل و پەل و پێداویستیە تایبەتیەکان کە لەلایەن سۆریشوع کوڕی ناخوار جێبەجێکران، وە ئەو کەسە هەمان کەسە کەوا سەردانی ماڕان عەممەی کردووە لە(زێنای) وە لە ڕۆڵەکانی نیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمە([٦٣٤]).
گەشەکردنی دێرەکە دوای(١٦٠) ساڵ بوو لە دوای دامەزراندنی. مارمیخائیل دێرەکەی لە ساڵی ٦٥٠ دامەزراندووە وە حاکمی وڵات یارمەتی پێشکەش کردووە لە ساڵی ٨٢٠. لە ترعێل کەلوپەل و زەخیرەی گرنگ هەیە بەرەبەرەکانی ڕووداوەکانی سەدەکانیان کردووە و تاوەکو ئێستاش مۆرەکانیان ماوە و سەلماندنی کۆنە مێژوویان دەکات وە تاوەکو ئێستاش ماوە.

هەروەها دەستنووسە کۆن و گرنگەکەی(پەیمانی نوێ، ئینجیلی پیرۆز) پارێزراوە ئێستا لە پەرتووکخانەی سەرۆکایەتی ئەسقەفیەی کەرکوك([١٣٥]).
ئەم دەستنووسە لە ساڵی ١٢٨٧ نووسراوە لە دێری سەرەوە کە دەکەوێتە گوندی کفرعوزێل زۆر بەداخەوە تەواوکەرەکەی ناتەواوە.
لە کۆتایی سەدەی سێزدەهەم و سەرەتای سەدەی چواردەهەم باس لە ترعێل دەکرێت چەند جارێك لە مێژووی یاوالاهادا.
سەرۆکی دێرەکە ئەو کات رەبەن(دنحا) بووە([١٣٦]).
یاوالاها خۆی لە دێری مارمیخائیل بۆ دوو ساڵ ژیاوە دوای ئەوەی کە خەڵوەتگەیەکی بۆ خۆی و هاورێکەی رەبەن(سۆما) کڕیوە([١٣٧]).
وە بۆ جارێکی تریش یاوالاها بەو دێرەدا تێپەڕ دەبێت لە ساڵی ١٢٨٣ کاتێك بە رێگەوە بووە بۆ بارەگای کارگێڕی مەغۆلەکان بۆ وەرگرتنی قەوالەی(سند) ی فەرمی بۆ وەرگرتنی پۆستی جاسلیقی.
لە کاتی نسکۆ گەورەکەی ساڵی ١٣١٠ سەربازەکان هێنایانە ئەو دێرە بۆ ئەوەی کاتی بەناچاری تێدا بەسەر ببات و بمێنێتەوە([١٣٨]).
دوو هۆ هەبوو بۆ چەسپاندنی ئەو مانەوەیە بە ناچاری و زۆرزۆرداریە لەوێدا:
١ ـ پاراستنی لەوەی ئاسانی ئەگەری کوشتنیدا وە بەبێ ترس لەوێ دووچاری تەنگژە بوون وە یا لێپێچینەوە لەلایەن دەسڵاتدارانی مەغۆل، کە خۆی بە رەچەڵەك مەغۆل بووە.
٢ ـ بۆ دوورخستنەوەی لە گۆڕەپانی کوشتارگەکان بۆ ئەوەی نەبێتە گەواهی سەلماندن دا و ببێتە رێگر لە بەردەم جێبەجێکردنی نەخشە کێشراوەکە.
لە کۆتایی دا یاوالاها گەڕایەوە ئەو دێرە پاش مردنی بەڵام وەکو ئێسك و پروسك گواستیانەوە لە دێرێك لە(مەراغە) دا([١٣٩]).
ئەم کردارە تەواو بوو بەهۆی تێکچوونی بارودۆخ و کێشەکان و داگیرکردنی دێرەکە لە مەسیحیەکان و دەستبەسەرداگرتنی([١٤٠]).
لەوانەیە دوا جار ئێسك و پروسکەکانی لە ترعێل دا جێگیر کرابن چونکە رەنگە روفاتەکانی بۆ جاری دووەم گواسترابنەوە بۆ جێیەکی تر بە هۆی لەناوچوونی دێری ترعێل لە رۆژانی داهاتوودا.
ئەگەر وا دابنێین ئەو دەقە راستە کەوا رەبەن(رامیشۆ) پێمان دەدات ئەوە بە چانس بووە(بەڵام ئایا بەڕاستی خاوەن بەخت بووە). وە دەتوانین باوەڕ بکەین پێی([١٤١]).

ئەو کاتە پێویست بووە جارێکی تر ناوی ترعێل بێت وە ناوی رەبەن(یووسف) یغر بێت ساڵی ١٤٥١(سەرۆکی دێرەکە) هەروەك دەزانین ناوی دوایبە کە سەرۆکی ئەو دێرە بێت.

٦ - رێگەی پاشا وە پردی پاشا

سەرەرای رێگەی رۆژئاوا کە لەگەڵ رێرەوی رووباری دیجلە دەروات رێگەیەکی تر هەیە بەناو خاکی حدیاب تێپەڕ دەبێت و دەکەوێتە رۆژهەلآت ناوی ئەو رێگەیە لە سەردەمی ساسانیەکان رێگەی پاشای گەورەیە([٦٤٢]).

ئەو رێگەیە لە دوورگەی کوڕی عومەر دێت ئینجا بە ناو گەروی زاخۆ تێپەڕ دەبێت وە بە یەکتر دەگەن لەگەڵ ئەو رێگەیەی لە نسێبین دێتن ئینجا بە تەریبی لەگەڵ چیای ئەلقۆش دەروات تاوەکو دەگاتە رووباری کۆمەڵ و بە سەر پرددا تێپەڕ دەبێت کە دواتر پێی دەگوترا پردی کۆمەڵ([٦٤٣]).

لە تەنیشت ئەو پردە جێگەیەك هەیە پێی دەڵێن(کۆکامیلا). ئەم شوێنە ئەمڕۆ بە(تلکومل، گردی کۆمەڵ) ئاماژەی پێکراوە. دواتر رێگەکە بە رووباری خازر تێپەڕ دەبێت بە موخازا دەکەوێتە لای باکوری بەیەکگەیشتنی خازر بە کۆمەڵ بە دووریەکی کەم. لێرەوە دەست پێدەکات کە ئەو رێگەیە دەچێتە ناو زەویەکانی ناوچەی مەرگە بەلای رۆژئاوای - رۆژهەلآتی بە تەریبی لەگەڵ دامێنی باکوری زنجیرە چیایەکانی نزم ناسراوە بە(بەردەرەش)([٦٤٤]).

بەم شێوەیە دەگەینە رووباری زێی گەورە کە تێپەڕ دەبین بەهۆی پردێك لە سەری دروست کراوە. ئەم پردە پێی دەڵێن پردی پاشا، دۆکیۆمێنت کراوە لە سەردەمی شەڕی ئەربیل - هەولێر بە ناوبانگ لە ساڵی ٣٣١ پ. ز.

ئەو دەقە جیاوازانەی کەوا مێژوونووسەکان نووسیویانە دەربارەی ئەو پردە لە سەری کۆك نین(پێچەوانەیە)([٦٤٥]).

دڵێن(داریۆس) لە رووباری Lycos لە سەر پردێك پەڕیەوە، لەوانەیە ئەسکەندەر بەدوای چووبێ. هەروەها لە سەدەی چوارەمی زاینی ئەو پردە مابوو. وە لە تەنیشتیەوە دێرێك هەبوو بە پێی زانیاری ناوی دێرەکە نیە تەنها ناوی دێری پردەکەیە([٦٤٦]).

ئەم دێرە دروست کراوە لە پێش دێری(برعیتا)، سەرۆکی ئەو دێرە لە ساڵی ٥٦٢ مارحەننانیا بووە.

باسێکی دیکەش هەیە لە سەر ئەو دێرە لە رووداوێکدا کە رەبەنەکانی ئەو دێرە دەیگێڕنەوە نەخۆشێکیان هێنایە لای(حەننان یشوع) سەرۆکی دێری بێت قوقا ئەمە لە ساڵی ٦٧٠ بووە([٦٤٧]).

رۆژێك هەندێك لە رەبەنەكانی برعێتە ئەم چیرۆكەیان گێڕایەوە پەیوەندی بە پردەكەوە هەبوو([٦٤٨]).
چیرۆكەكە بریتیە لە:(پێشتر هەندێك ئاگرپەرست - واتە لە بتپەرستە زەردەشتیەكان هاتن بۆ ئەوەی بەهێز كچێكی مەسیحی وەربگرن لە(بێت مارۆس) بۆ ئەوەی ببێت بە ژنی یەكێكیان، كاری خواپاراستنی زۆرداره غەسبكارەكانیش فرێیانـدا نـاو زێ كه لـه پردەكه دەیانویست بپەڕنەوە و هەموویان خنكان.
زۆربەی جاران پیاوی دەوڵەمەند و چاك(بستۆماغ - خەڵكی قوبلانه) وە باوكی جاسلیق ئیشۆعیابی سێیەم(٦٤٤ - ٦٥٨) له روباری زێی(زاب) بە سەر پردی شا(ئەو پرده(دەپەڕیەوە بۆ ئەوەی بچێتە دێری(بێت عاوی) بۆ سەردانی هاوڕێكەی(رەبەن یەعقوب) بۆ چوونە ناوچەی(مەرگە) بۆ بەسەركردنەوەی زەوی و موڵكەكانی لەوێدا([٦٤٩]).
جارێكیان كە دەیویست بەسەر ئەو پردە دا تێپەڕ ببێت رووداوێكی ناخۆشی تووش هات كە پێشتر ئاماژەمان پێیدا ئەوەیە: لە رۆخ پردەكە كە دەیویست بپەڕێتەوە ژمارەیەك لە ژنی سحر باز هەبوون جلەكانیان دەشووشت. ئەوانە بە گۆرانی و ئاوازی شەیتانی بەیەكتریان هەڵدەگوت. ئەوەی لە دەوروپشتیان بوو سەمای دەكرد و خۆی لار دەكردەوە لەگەڵ ئاوازەكان. گێڕانەوەی گۆرانیەكان زۆر سادە و ساكار بوون بۆ لەبەركردن، برادەرە چاك و سادەكەمان(بستۆماغ) ئەوەی لەبەركرد و بەبێ گوێدان دەیگوتەوە. پێش كۆتایی هاتنی لە گێڕانەوە و وشەكانی سیحربازەكان، یەكسەر شەیتانی بۆ دەركەوت و هاوڕێیەتی رێگەی كرد پێی وت: هەر فەرمانێكت دەوێ پێمان بدە، وە ئێمە یەكسەر بۆت جێبەجێ دەكەین.
دوای ئەوەی بە سەر ترسەكە دا زاڵ بوو بستۆماغ فرمانی بە شەیتانەكە دا و وتی:(هەموو ئەو بەردانەی كە دەیبینین كۆیبكەنەوە و بیكەنە یەك كۆمەڵی بەرد(تۆما دەڵێ: كۆمەڵە بەردەكە تا ئێستاش لە شوێنی خۆیەتی و بەدوام بكەون چۆن بڕوم؟ پیاوچاك(بستۆماغ) ئەسپەكەی تاودا و گەیشتە دێرەكە و چووە ئەشكەوتە خەڵوەتگەكەی رەبەن یەعقوب، ئەسپەكەی لای شەیتانەكان بەجێهێشت لەبەر دەرگای دێرەكە و فەرمانی پێدان پاسەوانی بكەن تا دەگەڕێتەوە. رەبەن یەعقوب گۆرانیەكەی لەبیر بردەوە(سیحراویەكە) وە بە پێكەنینەوە فرمانی پێ دا:(هەستە، خێراكە و بە راكردن بگە بە ئەسپەكەت پێش ئەوەی رابكەی لەبەرئەوەی شەیتانەكان رۆیشتن و ئەسپەكەیان بە بەرەڵایی بەجێهێشت. لە لای سەرووی رووبارەكە تەنكاوێك هەبوو(شوێنێك لە رووبارەكە ئاوەكەی كەمە و بە تەوژم ناڕوات و دەتوانی لە رووبار بپەڕیتەوە لەو شوێنە بە پیادە).
دەكەوێتە بەرامبەر گوندی(ئەستووان دەمرگە)([٦٥٠]).

پێدەچێت رێگەکە لەو تەنکاوەدا پەڕینەوە کورتترە لەو کاتەی کە ئاستی ئاوەکە زۆر نزمە(واتە لەو وەرزە ئاستی ئاو کە لە نزمترین کاتدایە ـ وەرگێڕ).
بە پێی سەرچاوەکان: ئەو کاروانانەی کە دەیانویست لە حەدیسەی موسڵ بپەڕنەوە ـ وەرگێڕ).
بە ئاراستەی مەرگە لەو تەنکاوە لە رووباری زێیێ دەپەڕینەوە، واتە تەنکاوی ئەستوان([٦٥١]).
لە راستیدا تەنکاوێك هەیە لە باکووری گوندی مەنداو، وە دەکەوێتە سەر هێڵێکی راست لەگەڵ ئەربیل و بێت عاوی.
Herz Feld جێگەی پردی شا دیاری دەکات لە(گردەمامك) وە ئەمە راستە و لە راستیدا هەندێك شوێنەوار هەیە تاوەکو ئێستا باڵەخانەکانی دیارە لە هەردوو دیودا. هەروەها لە رێڕەوی رووبارەکەدا. باشووری شوێنەکە لە لای سەریەوە بە کەمێك، واتە لە(شیوەڕەش)، کە بە بیست کیلۆمەتر لە مامك دوورە.
لە باکووری(ئاسکی کەلك) ستوونێکی پرد هەیە بە کردەوە وەك دەردەکەوێت ستوونەکە یەکێك لە بەربەستەکانی ئاو بووە([٦٥٢]).
کە بەدەردەکەوێت سەرەتاکانی نۆکەندی کشتوکاڵیە بە تەریبی لەگەڵ زێدا دەڕوات و درێژ دەبێتەوە تا پشت دێری بێت قوقا. کوردەکان بەم کارە دەڵێن(شوێنەوار) رووباری بەهلول هەیە بەو پێیەی ناوی نۆکەندەکە دەگەڕێتەوە بۆ کەسێك بە ناوی(بەهلول).
٧ ـ ئاڵتوون کۆپری ـ پردێ
کاتێك جێگەی پردەکە دیاری دەکەین گەشتەکەمان بە رێگەی شا سانا دەبێت بۆ دۆزینەوە چونکە درێژ دەبێتەوە بە هێلێکی راست بە ئاراستەی هەولێر بە(خەزنە ـ گەزنە) و عەنکاوە تێپەڕ دەبێت و ماوەکە نزیکەی 30 کیلۆمەترە واتە رۆژەڕێیەك بە پێیان رۆیشتن. بەشەکەی دیکەی رێکە لە هەولێرەوە تاوەکو زێی بچوك بە ئاراستەی کەرکوك گۆڕانکاری بە سەردا نەهاتووە ئەگەرچی چەند سەدەیەکی بە سەردا تێپەڕوە. ئەو پردەی کە ئەو رێگەیە کۆتایی پێ دێنێت لە هەمان شوێنی کۆنی خۆیەتی و پێی دەڵێت:(پردی ئاڵتون کۆپری)(پردێ).
ئاشووریەکانن ئەم پردەیان بە(شیمیرۆن) ناودەبرد، بەلام ناوی گوندەکە لە سەردەمی مەسیحیەتدا تاوەکو کۆتایی سەدەی هەشتەم(قەتەرتادەزاوا) ـ پردی زێ([٦٥٣]).
رچەڵەکی(بەختیشۆع) دامەزرێنەری(مەرگانە) هی ئەو گوندەیە، لە سەردەمی عەرەبی ناوی کراوە بە(قنطرة الزاب) ئەمە بە گەواهی(ابن الفوطي)(لە سەرەتای سەدەی سێزدەهەم دا([٦٥٤]).

لە سەدەی یازدەهەم([٦٥٥]).

ناوەکە گۆڕدراوە و بۆتە ئالتون کۆپری بە زمانی تورکی، کە تاوەکو ئێستاش ئەم ناوە بەکاردێت. بە پێی چیرۆکەکە هۆکاری ئەو ناو نانە کە واتاکەی(پردی زێرین) ە ئەو پارە زۆرەیەی لێ بەکارهێنراوە بۆ دووبارە دروستکردنەوەی لە سەردەمی سوڵتان مرادی عوسمانی چوارەم لە ساڵی ١٨٣٨، کە برەکەی نزیکەی ومزنەیەك زێڕ بووە([٦٥٦]).

ئەم رایە پێچەوانەی رای([٦٥٧]).

S.j.Bukingham کە دەڵێ ئەم ناونانە کورتکراوەی تەواوی ئەو دەقەیە ئالتون سۆ کۆبری، واتە پردی رووباری زێرین - بۆ زانیاری پەستی زێڕ لە هەندێك کاتدا بەکارهێنراوە لە رابردوودا بۆ باسکردنی زێی بچوك.

لە دەستنووسێك دا بە ناونیشانی:(سەرگوزشتەی قۆناغەکانی کاری نێردراوەکانی سوڵتان سلێمان لە دوو عێراقدا). وێنەیەك هەیە هێمایە بۆ(ئالتون کۆپری) لە سەرەتای سەدەی شازدەهەم. وێنەکە لەلایەن(نصوص السیلاحي ـ الصلاحي) کە مردووە لە ساڵی ١٥٣٧ ـ ١٥٣٨، کێشراوە([٦٥٨]).

لەم وێنەیەدا شارێك هەیە لە ناو دورگەیەکدا لە قەلایەکی تێدایە دوو باڵی هەیە خۆیان درێژکردۆتەوە بە سەر دوو رێ و بۆ یەك رووبار. لە سەر رووی وێنەکەدا نووسینێك هەیە بە ئالتوون کۆپری دەخوێنرێتەوە. دواتر حەسەن پاشا پردەکەی نوێکردەوە.

لە ساڵی ١٧٢٣ ز([٦٥٩]).

وە ئەمە بە پێەوانەی وتەکانی E.IVES([٦٦٠]).

کە دەڵێ ئەو کارانە مەسیحیە کۆنەکان کردوویانە، کە لە شارەکەدا دادەنیشتن. ئەو دوو پردەی کە لە هەردوو شارەکە درێژبوونەتەوە، ئەو دوو پردەیە کەوا رۆژنامەی بەغدا باسیان دەکات([٦٦١]).

(بە دوو پردی سەرنجڕاکێش و سەرسوڕهێنەر دادەنێت لەبەر بەرزی باڵایان) جگە لەمە باسێکی تر هەیە بە درێژی Herzfeld نووسیویەتی([٦٦٢]).

باس دەکات کەوا جەندرمەکانی تورك ئەو پردیان تەقاندەوە لە کاتی کشانەوەیان لە ساڵی ١٩١٨([٦٦٣]).

ئالتون کۆپری شارێکە لە گرنگیدا لەبەر شوێنی جوگرافی هەردەم بۆتە بابەتی ناکۆکی لە نێوان دەسەڵاتدارەکان(داگیرکەر کاتیەکان) بۆ شارەکە، جا ئەگەر لەم بەری زێی بچوك بن، یان لەوبەر. دەبێتە مەیدانی شەڕ و پێکدادان لە نێوان جەنگاوەراندا ئەمە بەبەردەوامی روویدەدا. دوای سەرکەوتنی تورکەکان و جێگیربوونیان لە ساڵی ١٥٥٤([٦٦٤]).

هەندێك جار پێویستی كردووە ئەفسەرەكانی سوڵتان خۆیان بشارنەوە و شارەكە بەجێبێڵن ئەمە لە ساڵی ١٨٠٥ روویدا، كاتێك(عەبدولڕەحمان پاشای بابان زاڵ بوو بە سەر سوپایەك پێكهاتبوون لە چەند فەوجێك سەرباز لە موسڵەوە هاتبوون و بەشێك لە دەوربەریەوە بۆ شەڕ كردن لەگەڵیدا بە هاندانی(عەلی پاشا) والی بەغدا([٦٦٥]).

لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٨٢٦ ـ ١٨٣٣ هەولێر و كۆیەی لە بن دەسەڵاتی بەگی رواندزی پاشای كۆرە بووە. دوای ئەوەی هەلی بۆ رەخسا داگیریان بكات، و هەندێك هێزی خۆی تێدا دانا دوای دەركردنی هێزە سەر بە بابانیەكان([٦٦٦]).

بە كشانەوەی هێزەكانی سەر بە پاشای كۆرەی رواندزی لەوێ پێش ساڵی ١٨٣٧ ئەفسەرە توركەكان گەڕانەوە شوێنە كۆنەكانی خۆیان لەوێ([٦٦٧]).

بەڵام ئەو كاتە ئامادەیی مەسیحیەكان بزر بوو و نەما لە ئاڵتون كۆپری بە تەواوی تا ماوەیەكی درێژ. ئەمڕۆ دانیشتوانی كۆپری كورد و توركمانن و شارەكە نیمچە داخراوە بەسەریاندا.

٨ ـ ناوچەكانی دەوروبەری زێی بچوك

لەو بڕگەیە هەموو ئەو زانیاریانە كۆدەكەمەوە كە تایبەت بە هەندێك لە شوێنەكان كە تا ئێستا نەزانراون، یان شوێنەكانیان تاوەكو ئێستا دیارینەكراون لەمانە(دێریكا ئاریان)، یان (دێریكا كت كت)، كە پێشتر ناومان هێناون. ئەمە دەمانەوێ جەختی لە سەر بكەینەوە، چونكە دەزانین لە سەر ئەو هەموو شوێنانە ئەمان نزیك زێی بچوك بوون.

## دێری چنارێ

وا پێویست دەكات، كەوا دێری چنار دوور نەبێت لە پردی زێ، چونكە رەبەن بەخت یشوع خەڵكی ئاڵتوون كۆپری بووە، جلكی رەبەنایەتی لەوێ وەرگرتووە([٦٦٨]).

بەڵام ئەوە نازانرێت كەوا شوێنەكەی لە حدیاب بووە، یان لە بەری دووەمی رووبارەكە لە ناوچەی بێت گەرمای ـ گەرمیان.

## وڵاتی( زەویەكانی ) بانیقایێ

پێدەچێت ئەم ناوچەیە بكەوێتە نێوان زێ و چیای حەدیاب، چونكە ئێمە دەبینین(ئیشۆعیاب) ی میتراپۆلیت ساڵی ٧٨٠، ناچار بووە بە سوڕانەوەیەكی درێژ بۆ دووركەوتنەوە لەو ناوچانەی كە چەتە و رێگری لێ بووە، كە دەكەوێتە ناوەڕاستی ئەبرەشیەكەی بۆ سەردانی كردنی دەوروبەری گوندە باوەڕدارەكانی سەر بە خۆی([٦٦٩]).

دواتــر رێگەکــەی بــە تــەریبی ســنووری رۆژهــەلاّت بــەرەو باشووری خۆرهــەلاّت بــۆ بــاکووری خۆرائاوا بە تێپەڕبوون وردە وردە بە چیاکانی حـدیاب و حیۆتـۆن، دوای پەڕینـەوە لـە زێـی گەورە و چوونە ناوچەی مەرگە سـەر بـە ئەبرەشـیەی خـۆی و لـەوێ بـاوەڕداران پێشوازی گەرمیان لێی کرد.

## دێری قەشە زینـای:

ئەم دێرە دەکەوێتە نزیك زێی بچوك. لـە سـەردەمی دامەزرێنـەرەکـەی بـەتریك ئیشۆعیابی یەکەم(٥٩٦ ـ ٦٠٤)([٦٧٠]).

لە سەرەتادا قوتابی رەبەن(ستابانۆس) بووە لە چیای حدیاب، هەر کە مامۆسـتاکەی دەمـرێ، هاتە خوارەوە بۆ دامەزراندنی دێرێك و ببێتە بە بارەگایەك بۆ رەبەنـە نوێیـەکان لـە نزیـك رووبارەکە([٦٧١]).

ئەمـە بـووە هـۆی ئـەوەی چـل رەبـەن لـە دەوری کۆببنـەوە.(زێنـای) ناوبـانگی بـە(فرمێسـك رشتن) دەرکردووە، هەروەها بە نووسینەکانی لە سـەر ژیـانی رەبەنایـەتی. بـاوای نسـیبینی و هاورێکەی رەبەن عەودیشۆع([٦٧٢]).

لەگــەڵ دامەزرێنــەر بــۆ ماوەیــەك مانــەوە. لــە دوای مردنــی زینــای و ناشــتنەوەی لــە پەرســتگاکەی لــە پشــت(ماربرشــبتا) دەگەینــەوە بــەو ســەرۆکە وەك دامەزرێنــەر بــۆ دێرەکانی(مەعەلسا) (حەنیسا).

٩ ـ پچڕپچڕەکان

بڕگەی کۆتاییمان بریتیە لە کۆکردنەوەی هەموو شوێنەکان لـە دەشـتی هـەولێر، کـە رەنگـە سوودبەخش بێت بۆ مێژووی مەسیحیان لـە حـدیاب. رەنگـە پێشـتریش تووشـی ئـەو شـوێنە هاتبین، یـان باسمـان کردبێـت لـە نووسـینەکانی پێشوومانـدا بـەلاّم بـە سـەرپێیی بـۆ ئـەوەی خوێنـەر تووشـی مانـدووبوون نـەکاتن ئەگەرچـی جێـی خۆیـەتی بایـەخی باشـی پێبـدەین، چونکە پەراوێز چارەسەری ناکات و مافی خۆی ناداتێ، یان لە خوارەوەی لاپەڕەکە بـە چـەند دێرێك لە سەری بنووسێت. (کەنزا ـ گەزنە ـ وەرگێڕ).

ئەمڕۆ هەموو دانیشتوانەکەی موسڵمانن و دەکەوێتە باکووری رۆژئـاوای عـەنکاوە بـە دووری ٧ کیلۆمەتر لەسەر رێگای شا. بە پێی داب و نەریتی عـەنکاوە، وە پـێش سـەد سـاڵی رابـردوو ژمارەیەك لە مەسیحی تا ئەو کاتیش لە گەزنە دا هەبووە. بۆ پشتگیری ئـەوە باسـی(فنقیـت) دەکەین دەگەڕێتەوە بۆ قەشەیەك، کە بە رەچەڵەك خـەڵکی گەزنـە بـووە، ناوەکەی شـەمعون

کوڕی عیسا بووە ئەم فنقیتە تا ئێستاش پارێزراوە لە کەنیسەی عەنکاوە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٢١٠٦ ی یۆنانی بەرامبەر بە ساڵی ١٧٩٥ ی ز.
(فنقیت) بریتیە لە پەرتووکێکی نوێژکردن دابەشکراوە بە پێی جەژن و بۆنەکان ـ وەرگێڕ).
مزگەوتی شێخ محەمەد لە گەزنە ئەمڕۆ بە ئەسڵ کەنیسەی مارقریاقۆس بووە لە کۆندا و لە نێوان عەنکاوە و گەزنە شوێنەواری دێرێکی کۆن هەیە، ئەم شوێنەوارە پاشماوەی دێری(مارعودا) یە، سێ کیلۆمەتر لە عەنکاوە دوورە.
دەتوانی مۆمدان و گۆسکە و شتی تر لە ناو شوێنەوارەکە بدۆزینەوە... تاد.(سیداوە) گوندی دووەمە و دانیشتوانەکەی موسڵمانن و دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای هەولێر. لێکۆڵەر پاشماوەی کەنیسەیەکی تێدا دەبینێت کە پاشماوەی کەنیسەیەکە بە ناوی(کەنیسەی مارت مریەم) ئەو ئەگەرە هەیە کە تاوەکو سەدەی شازدەهەم مەسیحی بووبن. بەتریك عەود یشوعی چوارەم باس دەکات لە لیستێکدا رێکی خستووە لە ساڵی ١٥٦٢ کەوا سیداوە نیمچەبارەگای کورسی ئەسقەفیە بووە([٦٧٣]).
گوندی(کوردی سەرەوە) کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی هەولێر گوندی بێت سلۆتایە لە کۆندا(؟). کە پێشتر بارەگای کورسی میتراپۆلیتی هەولێر بووە(؟).
لە نێوان هەولێر و عەنکاوە و بە دووری نیوسەعات لە عەنکاوە گوندێکی بچوك هەیە پێی دەڵێن دێرکا، دێرەکە. ئەمە پاشماوەی شوێنەواری کەنیسەی(مارسنیقایە)([٦٧٤]).
دواتر باسی ئەو گردە دەکەین کە لە سەر خشتەکانیدا نووسینی بزماری هەیە. بەڵام ناوی گردەکە ناوێکی مەسیحیە ـ (گردی یەڵدا) رەنگە ئاماژە بێ بۆ ناوی ئەو جوتیارەی کە زەوی نزیك گردەکەی هەبێت.
گوندی گەورەتر و گرنگترینیان گوندی(کێنێ) یە کە مەڵبەندێکی بازرگانی بووە بۆ سێگۆشەی دەکەوێتە نێوان رێگای شاو. زێی گەورە ـ بەرەو باشوور رێگەی نوێ کە دەچێتە موسڵ و بە ئەسکی کەڵەك تێپەڕ دەبێت.
پێشتر ناوی ئاسکی کەڵەکمان بەسەردا تێپەڕ بوو کە بە ناوی(قینای) باسمان کرد کاتێك باسی دێری بێت قوقامان کرد([٦٧٥]).
ناوی(بیرقوت ـ بێرکۆت ـ وەرگێڕ) کە لە سەر نەخشە هەیە ئاماژە بە گوندێکی بچوك دەدات بە دووری حەوت کیلۆمەتر بۆ باکووری رۆژهەڵاتی هەولێر ئەو بازرگانەمان بیر دێنێتەوە کە ناوی(یەعقوب کوڕی قوتەیە) و کوڕەکەی می(ر مەسعود) کە کۆتایی بە ژیانی هێنرا بە شێوەیەکی دڕندانە. گوندی(رەختاوە) چوار کیلۆمەتر دوورە لە ناوەڕاستی

ڕێگەی هەولێر ـ گوێڕ. ڕەنگە گوندە کۆنەکە(ڕەحتا) هەروەك لە مێژووی هەولێر هاتووە ئەو شوێنە بێت کەوا هاویل(هابیل) کۆچی دوایی تێدا کردووە، کە یەکێکە لە مەترانە کۆنەکانی حدیاب(؟) ئەمە لە ساڵی ١٨٥ ی ز بووە([٦٧٦]).

لە کۆتایی پێمان باشە ڕوونی بکەینەوە تاوەکو ئێستاش هەندێك لە ناوەکان بەرگریان کردووە لە تۆڵەسەندنەوە لە گردبوونەومیان و بەزیندوویی تاوەکو ئەمڕۆ ماون، لەوانە: بێت ڕوای ئەو گوندەیە کە لە نزیکیدا میتراپۆلیت مارن عەمما کۆچی دوایی تێدا کرد کە ناوی(برقانا) چارەسەر و شیفای نەکرد. شوێنی ئەو گوندە دەبی لەو جێگایە بێ کە دەکەوێتە سەر ڕێگەی نێوان حەدیسیە و هەولێر([٦٧٧]).

ناوی ئەو گوندە تاوەکو سەدەی هەشتەمیش هاتووە. سەرچاوەکان باس دەکەن کەوا دوو لە دانیشتوانی(بێت ڕوای) لە نەخۆشیەکەیان بە دەستی ڕەبەن برانسیە و ماران عەمما سەرۆکی دێری بێت قوقا چاکبوونەتەوە و چارەسەریان کردووە([٦٧٨]).

بەڵام دێری بچوك ناسراو بە دێری(شاکوح) یان(شاخوح) کە لەوێدا(ماهانۆش) شەهیدی دواڕۆژ هەیە، کە پێی دەڵێن(ئیشوع سورەن) لە سەر دەستی شەمعون سەرۆکی دێر لە ناو هەڵکێشراوە لە سەرەتای سەدەی حەوتەم([٦٧٩]).

لە سەرمانە لە بەری ڕۆژهەڵاتی هەولێر بکۆڵینەوە. ماهانۆش دەهاتە ئەو دێرە لە(قوڕ) ەوە کە دەکەوێتە نزیك سەلاحەدین.

قەشە بیترس لە نووسینەکانیدا دەبینین زۆر هاندەر نیە بە هەڵسانمان بەو هەولانە بۆ گەڕان و دۆزینەوەی قەلای مارقەرەداغی شەهید لە ساڵی ٣٥٠ کە لە ناو میللەتدا زۆر ناودار و بەناوبانگە([٦٨٠]).

چیرۆکەکەی ئاماژە بەوە دەکات قەلاکەی لە سەر گردێك بووبێت بە ناوی(مەلقی) بەرزاییەك نزیك بە هەولێر([٦٨١]).

لێرەدا پێویستە هەڵوەستەیەك لە سەر ناوەکە بکەین کە شێوێندراوی وشەیەکی عەرەبیە(مەلقی)(واتە شوێنی بە یەك گەیشتن) یان(شوێنی کۆبوونەوە) مێژووی سعردی ئەوەمان بۆ باس دەکات، هەروەها وەك بۆمان باس دەکات بە فەرمانێك ڕوویدا بێت لە سەدەی یازدەهەم هەموویان دەیزانن و دەیڵێن: گۆڕانکاری بە سەر قەلای قەرەداخ دا هاتووە و بۆتە دێرێکی گەورە، ساڵانە ئاهەنگی پێ دەگێڕدرێ([٦٨٢]).

پێدەچێت کەوا هەوڵ بدەین بۆ دۆزینەوەی شوێنی دێرەکە بەلای(کفرعوزێل) لەبەر ئەوەی لێرە ـ واتە نزیك جێگەی ماڵی(بێت مارقەرداخ) ـ سەگەکانی ڕۆستەمی کافر پارچە

پارچـــەیان کـــردووە کـــە لـــەوێوە دەهـــات دوای ئاهـــەنگ گێـــڕان لەگـــەڵ کۆمەڵەکانی(شەهریکان)([٦٨٣]).
تا ئێستاش ژمارەیەکی زۆر ناومان هەیە بۆ شوێنەکان کە سەرچاوەکان دەڵێن دەکەونە حەدیاب، تاوەکو ئێستاش نەدۆزراونەتەوە، چونکە هۆکارەکان نازانین بۆیە شوێنەکانیان دەخەینە ناوچەی دەوروبەری هەولێر. بۆیە لەلایەکدا بەجێی دەهێڵین کە رەنگە لە ناوچەی دیکەیشدا هەبێت. لیستێك یا خشتەیەك بەو ناوانە ریکدەخەین جێگیریان دەکەین لە لاپەڕەکانی بەشی کۆتایی پەرتووکەکە.
هەروەها شوێنی زۆر هەیە ناوە نوێیەکانیان بۆتە هۆی بزربوونی ناسنامەی شوێنە کۆنەکە کە مەسیحیەکان تێیدا نیشتەجێ ببوون لە دێرزەمانەوە. ئەم بارە بە سەر گوندی(ئەسکی کەڵەك) دەچەسپێ(ناوەکە تورکیە) یان پێی دەڵێن(کەڵەکی یاسین ئاغا). ئەو ناوە واتە بە سەر ئاوکەوتەی یاسین ئاغا(کەڵك ـ الطوافة ـ سەر ئاو کەوتە)( بریتیە لە چەند شەپکە دارێك بە یەکتری دەبەسترێتەوە بە وریسێکی بەهێز و جێگیر بە چەند مەشکەیەکی فوودراو)(واتە پڕ کرابێت لە با)(هەوا).
خەڵك لە سەری دادەنیشن کاتێك سەر ئاو دەکەوێ و بە سەر ئاوەکە دا دەڕوا، بۆ گەشت و گوزار بەکاردەهێنرێ ـ وەرگێڕ).
لێرە بە تەنکیدی گوندێکی مەسیحی زۆر کۆن هەبووە ناوە رەسەنەکەی دیار نیە، لە نزیکیدا تەنکاوێك هەبووە بەناوبانگە بۆ پەڕینەوە بە ئاسانی لە زێی گەورەدا لەو جێگەیەدا. ئێستا پردێکی نوێی لێیە بۆ تێپەڕبوونی رێگەی موسڵ هەولێر([٦٨٤]).
لە ساڵی ١٨٢١ کاتێك ریچ بە کەڵەکی یاسین ئاغا تێدەپەڕی بینی دانیشتوانەکەی یەزیدین([٦٨٥]).
ناوەکەی ئەو کات: کەلەك دواسینا بووە ـ واتە کەڵەکی یەزیدیەکان. لە راستیدا هەموو خەڵکی ناوچەکە لە دەوروبەری کەڵك و سۆلچی و دەوروبەری بێتاس و باشووری ناوچەی مەرگە پێشتر لە ئێزیدیەکان بوون، وە لەوێ مانەوە تاوەکو هێرشە گەورە و لەوبردەکانی عوسمانیەکان بۆ سەر ئێزیدیەکان و بۆ سەر گوندەکانیان لە کۆتایی سەدەی نۆزدە.
٥ ـ چیای حدیاب
زۆر جاران ئەو دەقە(چیای حدیاب) بەسەرمان دا تێپەڕیوە. لای دێرینەکان چەمکێکی دیاریکراوی هەیە و ناسراوە. لە هەرێمی حدیاب زۆر چیا هەیە، بەڵام لە راستیدا حدیاب یەك چیای هەیە بەو ناوەش کراوە و لای هەمووانیش ئاشکرایە. کاتێك دەڵێن(چیای حدیاب) مەبەستمان هەر خۆیەتی، بەرزترین کەپکە چیایە بە دەوری کەرتی حدیاب دایە

لەلای رۆژهەلآتەوە، وە بالّی چوارەم پێکدەهێنن لەو شوێنە موعینیە بۆ ئەو ناوچانەی کە دەمانەوێت بیاندۆزینەوە وە هەروەها لە هەمان کاتدا سنووری جیاکەرەوەیە لە نێوان حدیاب و کەرتی سالاخی چیایی. سالاخ دەبێت بە دوو بەشەوە پێیان دەوترێت(سالاخی ناوەخۆ)، کە دەکەوێتە نزیك حدیابی فارسیەوە سالاخی دەرەوە کە تاوەکو ئێستا لە بن دەسەلآتی عێراقدایە. پێشتر سنووری جیاکەرەوەی نێوان سالاخ و حدیاب درێژ دەبۆوە بەلای رۆژئاوای شەقلآوە. لە راستیدا گوندی شەقلآوە دوا گوندە(ئێستا شەقلآوە شارە و مەلّبەندی قەزایە ـ وەرگێر).

لە رابردووی کۆن دا پێی دەوترا(دارا ئاباد) و ئەم ناوە بە هەموو ناوچەکە دەوترا. بۆیە پێی دەوترا(سالاخ ئاباد)([٦٨٦]).

دەلّێن زەویەکانی حدیاب درێژ دەبۆوە لەلای باشووری خۆرهەلآتی شەقلآوە بە ئاراستەی زێی بچوك تاوەکو کۆیە. بەلآم ئەمە راست نیە. سنووری کۆتایی پێویستە لەو گەروە بێت کە(S.T.Rich) پێی دەلّێن:(بختجی بوغاز) ـ بەکتەژی بۆگاز)([٦٨٧]).

سەرباری ئەوەش ناتوانین ئەو بڕیارە بدەین بە تەئکید بە هۆی نەبوونی بەلگە و دیکۆمێنتی باوەڕ پێکراوەو، بەلآم لەبەر ئەوەی ناوی(مەعەلتا) و(حیۆتۆن) (بێت بەگاژ) زۆر هاتووە لە دەقەکاندا، بۆ زانیاری شوێنەکەی زیاتر بەرەو ناوخۆیە لە تەنیشت ئەبرەشیەی(حنیتا) یە کە سەر بە سەرۆکایەتی ئەسقەفیەی حدیابە. بۆیە من باسی هەردوو شوێنە یەکەمەکان دەکەم و هی سێیەم بەجێدەهێلّم(بێت بەگاش) ـ کە دوورە لە دوو شوێنەکەی یەکەم ـ مەعەلتا و حیۆتۆن. پێشتر ئەو شوێنە دیاری کراوە لە کۆتایی باکووری خۆرئاوای دوور لە چیای حدیاب، بەلآم لە راستیدا پێچەوانەی ئەمەیە. ئەو ناوچەیە رووبارە و دەکەوێتە سەر رووبار لە زێی گەورە و ئاڕاستەکەی باشووری باکوورە.

١ ـ دێری ماریۆنانی(عەبد) کۆیلە:

رەنگە وا دابنرێت دێری مار یۆنان ئۆدا بە(یۆنان عەبد) بەناوبانگترینیان لە ناو دێرەکانی حدیابدا. وا باس دەکرێت باوای نسێبین دوو سالّ لەو دێرە ژیاوە.

بەلآم ئێمە ئەو تێبینیەمان هەیە لەوانەیە توشی جۆرێك لە تێکەلآوبوون و کاری سەرسامی بین، لەوانە: ناوی یۆنان کە زۆر لە دەقەکاندا هاتووە. هەروەها ناوی(ئۆدا)، ئەمەمان مەبەستە لەگەلّ ئاماژە کردن بۆ ئەو دوو ناوە: باوای و ئەبراهام ئەو دوانەش دەمانبەنە رێگەیەکی داخراو و دلّەڕاوکێیەکی سەرسوڕهێنەر هۆکارەکەشی ئەمەیە چەند کەسانێك هەیە بەم ناوانەوە بۆتە هۆی سەرلێشێواندن لە مێژوونووسەکان و نووسەرەکان و دەیانخاتە ناو بیرۆکەی زۆر لە ژاوە ژاو و هەلّەکردنەوە. جوگرافیناسی بەناوبانگ یەکێکە

لەو قوربانیانەی ئەم ژاوە ژاوە و لێتێکچوونە دەبینین چۆن کەوتۆتە نیگەرانی و کاتێک وتارەکەی دەنووسێت لە سەر نەینەوا لە پاشکۆی(دائیرە المعارف الاسلامیە) کە باس لە یۆنان دەکات([٦٨٨]).

ئەم مێژوونووسە وا باس دەکات کەوا یۆنان ئەودا دامەزرێنەری دێری پێغەمبەر یوونسە، دواتر دەڵێ کەوا ئیشۆعزخا نێژراوە لەم دێرەدا بەهۆی وێرانکردنی دێرەکەی خۆی لە حدیاب دا.

بەلام ئەوەی بە دێری مارئۆدا هەیە من دەڵێم: ئێمە تووشی دێرێک بووین بەم ناوە دەکەوێتە نزیک عەنکاوە، وە دێرێکی تر شوێنەکەی دیاری نەکراوە و بە هەمان ناو دەکەوێتە نزیک دهۆك. سەرەڕای ئەو دێرانە خوێنەری خۆشەویست ئاگادار دەکەینەوە کەوا دێری سێیەم هەیە بە ناوی مارئۆدای کۆن کە دەکەوێتە(المعرە) لە ناوچەی حیرە کە لە مێژووی بەتریکەکان دا هاتووە. ئەوەی کە کارەکەمان ئالۆز دەکات ئەومیە کە لە(الحولیات) دا هاتووە، چونکە ناوێک هەیە پێی دەڵێن(مارئۆدا) ی لاو و ناوی باوکی(حتیف) مەبو بەلگەیەی دوایی دەتوانین جیای بکەینەوە لە نێوان ئەو و ئەوانەی کە لە پێشەوە باسمان کردن. کەواتە ئەوەی لە سەرمان پێویستە بیکەین بۆ رەتبوون لە کۆسپەکان دەستنیشان کردنی یەکێك لەمانەی ناوی(ئودایە و دەبێتە قەدیس و شەفیعی دێرەکان ئەوانەی کە شوێنەکانیان دیاری نەکراوە و ناسنامەیان دیار نیە... ئەگەر ناوی رەبەنەکان لەلایەك بەجێبهێڵین دەبێت لەو شەهیدانە بگەڕێین کە ناویان ئودایە. من تا ئێستا یەکێك لەمانەم دۆزیوەتەوە و ترسم لەوە دایە کەوا ناوی تری هاوشێوەی بۆ خەڵکانی تر بدۆزمەوە، ئەگەر لێکۆڵینەوەکەمان بەردەوام بێت باسی یۆنان دەکرێت کەوا کۆیلە بووە، لەبەرئەوەی کۆیلە بووە لە یەکێك لە ئاگرپەرستەکان لە گوندی باڕۆخ ئاباد(ناوەکەی بە عەرەبی فارۆج) ە کە دەکەوێتە حدیاب([٦٨٩]).

ئاغاکەی باخچەیەکی هەبووە لە گوندی(ئاشگر)(ئەشگر). رۆژێك یۆنان ئەمەی بەسەردا هاتووە، بە رێکەوت، یا بەهۆی ئەوەی بەتەنها بووە لە رێگەکەدا، بەرەو ئەشکردە چوو بۆ ئەوەی هەندێك شەراب بهێنێ گەیشتە ئەشکەوتێك باوای نسێبینی تیا دەژیا، شوێنی ئەشکەوتەکە نزیك بوو لە گوندی(ئاتێ)(ئۆباتێ) لە ناوچەی بێت کامالا. لێرەدا پێویستە بگەڕێین بە دوای چەند شوێنێك کە گوندی باڕۆخ ئابادی تێدا هەڵدەکەوێت:(ئاتی) و(ئەشکر) لەگەڵیان دا سێگۆشەیەك دروست دەکات لە شوێنێك نزیك بە ناوەڕاستی سێگۆشەکە ئەشکەوتی باوای لێیە. ئێستا دەبێ پرسیار بکەین باوای بچوك لە چیای حدیابی ترسناك چی دەکرد: دوای مردنی ئەبرەهامی گەورە لە ساڵی ٥٨٨، نسێبینی

دێرەکەی لە نیزلا بەجێهێشت و جلەکانی داکەند و لە جیاتی ئەو جلکانە جلکی دروست کراو لە مووی زبر(خشن)(دڕ) لەبەرکرد، و چوو بۆ ناو ئەشکەوت بژیت، هەندێك لە دەقەکان دەڵێن ئەو بە ژیانێکی رەبەنایەتی بەندکراو ژیاوە، بەلام دەبینین کەوا چووە نهێنیەکانی لە دێرێکی دراوسێ وەرگرتووە. تاکو تەنهایی رەبەنی ناوبراو لای باوای زۆر بووە لەو شوێنەدا مادام نەخۆشەکان روویان تێدەکرد بۆ وەرگرتنی شیفا لە دەستیەوە. خەڵك لە هەموو لایەك رووی تێدەکرد و تاوەکو لە ناوچە دوورەکانیش وەك شاری حەدیسە. (پەرچوو) و شتە سەرسوڕهێنەرەکانی بلاوبوونەوە و دەنگی دایەوە بەتایبەتی پەرچووەکەی زیندووکردنەوەی پزیشکێکی مردوو دەرەنجامی کۆتایی پەرچووەکە ویژدانی هەموو خەڵکی هەژاندووە بەتایبەتی خەڵکە سادە و ساکارەکە و بووە هۆی ئەوەی رق و قینە بچێتە دڵی کافر و خراپەکارەکانی سەر بە شەیتانەوە.

دڵە باشەکان بوونە قوتابی ئەو، لەناو ئەمانە دا سۆریشۆع کە دواتر بوو بە پەتریك([٦٩٠]).

هەروەها یۆنانی کۆیلە(یۆنان ئودا). یۆنان ئەوەی لەبیرچووەوە کەوا ئاغاکەی پێی سپاردووە جێبەجێی بکات. هەموو شتێکی بەجێهێشتووە لەبەردەم قاچەکانی نسێبینی دانیشت. ئێوارە، لە رۆژئاوابوون دا یۆنانی کۆیلە درکی بەوە کرد، سەری سوڕما بە ژیانی رەبەنایەتی ـ ئەو کاتەی بۆ نەمایەوە تا بچێتە ئەو گوندەی کە دەیەوێ شەرابی لێ بهێنێت ئەگەر بە شەو بڕواتەوە بە دەستدرێژی کردنە سەری، یا کوشتنی زۆر بیری کردەوە بەلام رێگەچارەی نەدۆزیەوە. دواتر ئەمەی بە باوای وت و درکاندی خوێنەر تۆ ئەم ئەنجامە هەڵسەنگێنە. بەهەرحاڵ شەرابی دروست کراو بە پەرچوو بەتامترە لە شەرابی ئاسایی. ئەم راستیە بووە هۆی ئەوەی پاڵ بە مەجوسی بنێت کەوا لێکۆڵینەوە بکات و راستیە روون ئاشکراکانی دۆزیەوە و ئەم راستیە یۆنانی لە کۆیلایەتی رزگار کرد و بووە یەکێك لە قوتابییەکانی باوای. باوای بەو ناوبانگیەی کە لە ناوچەکە بلاوببۆوە رازی نەبوو بۆیە ئەشکەوتەکەی بەجێهێشت کە ماوەی دوو ساڵی تێدا نیشتەجێ بوو. وە چوو بۆ ئەوەی فەزایەکی تر بدۆزێتەوە کەوا مەرجەکانی ئارامی تێدا بێت کە بۆی دەلوێت. یۆنان ئوداو لە پێناو پارێزگاری لە داب و نەریتی باوای هات و نیشتەجێ بوو لە هەمان ئەشکەوتی باوای. دوای ئەوەی دەستی کرد بە کارەکانی بە پێی رەفتاری سروشتی بۆ گەیشتن و قاڵ بوونەوە و کۆمەڵە کەسانێکی پێکهێنا بە پێی داب و نەریت و دێرێکیان دروست کرد بۆ ئەوەی تێیدا بژین. دوای چەند ساڵێك یۆنانی کۆیلە مرد و لە دێرەکەدا نێژرا. دێری یۆنانی کۆیلە بە زیندوویی و چالاکی مایەوە بۆ زیاتر لە ٢٥٠ ساڵ. دوای ئەوە، واتە لە سەردەمی خەلیفەی عەباسی، المتوکل ٨٤٩ ـ ٨٥٠ دەستی تێکدان کاولکردن گەیشتە دێرەکە

کە لە تەنیشت دێری یۆنانی کۆیلە بوو ناسراو بە دێری(مارئیشۆعزخا). رەبەنەکانی دێری یۆنان، رۆڵە ئازاکانی حدیاب چوونە دێری ناوبراو و روفاتەکانیان هێنا تا بە رێورەسمێك بنێژرێن لە پاڵ روفاتی باوکیان دامەزرێنەری دێرەکەیان(یۆنانی کۆیلە ـ عودا ـ عەبد).

٢ ـ دێری گەج(دیر الجص)

لە جێگەیەك زۆر دوور نیە لە دێری العبد ـ کۆیلە، دێرێکی زۆر قەشەنگ هەبووە لەلایەن رەبەن ئیشۆعزخا دامەزرێنراوە، ئەم دێرە بەبەرد و گەچ دروستکراوە، چونکە لای هەموویان بە دێری گەچ ناسراوە. ئاساییە کەوا ئێمە دێری تر دەبینین بە گەچ دروست کراون و ناسراون وەك دێری نەهلە، وە دێرێکی تر دەکەوێتە دامێنی چیای دێری هەڵواسراوەوە لە خوارەوەی رووی باشوور لە چیای باتمان. باشترین گەچ و بەناوبانگترینیان گەچی پارێزگای توخومایە کە لەوێوە دەستنووسی(مێژووی مارسۆریەشۆع) بەدەستمان گەیشتووە لە بێت قوقا(منکنا) بلاویکردۆتەوە([٦٩١]).

ئەوەی پەیوەندی بە رەبەن ئیشۆعزخاوە هەیە کە پێشتر باسمان کردووە، دەڵێن ئەو ناوەش ژمارەیەکی زۆر هەڵیانگرتووە، بۆیە تکا دەکەین بەم جۆرە پێناسەی نەکەن وەك چۆن بادجەر کردوویەتی([٦٩٢]).

چونکە لای ئەو لێکتێنەگەیشتنێك دروست بووە لەلایەن ئەو ئیشۆعزخایەی کە باسی دەکەین و (زخائشیشۆع) دامەزرێنەری بێت رەبان کە دەکەوێتە داسن و هەروەها لەگەڵ(مشیحازخا).

پێویستە رەبەن ئیشۆعزخا بەناوبانگ بێت مادام مێژووەکەی نووسراوەتەوە لەلایەن سۆریشۆع رۆستەم([٦٩٣]).

مخابن کەوا ئەو مێژووە بزر بووە و ئێمە هیچ رێگایەکی ترمان بەدەست نەماوەتەوە پشتی پێ ببەستین بۆ بەراوردکردن لە نێوان سەرچاوەکۆنەکانی دژ بە یەك([٦٩٤]). یا لێکجیاواز.

بۆ نموونە: چ رێگەیەکمان لەبەردەم دایە بۆ لێکنزیکردنەوەی دەقەکانی مێژووی ئەبراهام سعردی([٦٩٥]).

کەوا ئیشۆعزخا بە قوتابی باوای نسێبینی دادەنێ وە دەقەکانی پەرتووکی(العفە) و مێژووی کشکری([٦٩٦]).

دەڵێ باوای دەهاتە خوارەوە بۆ دێری ئیشۆعزخا بۆ وەرگرتنی نهێنییەکان. جگە لەمە لە سەر ژیانی ئیشۆعزخا دەخوێنینەوە کەوا کەسی ناوبراو هاوکاری بەتریکی دوا رۆژ سۆریشۆعی کردووە(٥٩٦ ـ ٦٠٤) بۆ ئەوەی بۆ دەرەکردنی گیانە شەیتانیەکان لە سەر(نەعمان پاشای حیرە) ئەم چیرۆکە زۆر باو بووە. ئیشۆعزخا دێرەکەی لە شوێنێك دروست کردووە

هەموو دانیشتوانی حدیاب بە مەڵبەندی دزو ڕێگر و جەردەکانی دادەنێن و ئەمە کارێکی هاسان و بێ بایەخ نیە بەتایبەتی کاتێك نووسینەکانی تۆما مەرگەیی دەخوێنینەوە کە باس لە کوردەکان دەکات. ئەم واقیعە یارمەتی ئەوەمان دەدا هەست بە هۆکارەکە بکەین کە پاڵی بە دامەزرێنەرەکە ناوە تا شورەی دێریەکەی بەهێز و قەڵاو سەنگەر بێت بە پێچەوانەی دێریەکانی تر کە لە خشت و قوڕ دروست کراون. ئیشۆعزخا کۆچی دوایی کردووە لەناو ئەو دێرەی کە دایمەزراند دوای ئەوەی کە لە کردنەوەی قوتابخانەیەك لە دێرەکە جێبەجێی کرد(مەلفان ـ مامۆستا) یەکی باشی تێدا دامەزراند کە لە تەمەنێکی گەورە دابوو، کۆچکردنەکەی لە ساڵی ٥٩٠ بووە. ئیشۆعدناح لە سەری نووسیوە: لەناو هەیکەلی دێرەکە نێژراوە کە دروستی کردبوو بە پێی مەراسیم و سروتی ئاینی باو لەو کاتەدا(ئەو رستەیەی خوارەوە جیاوازی هەیە کە دەڵێ تەرمەکەی لە گۆڕێك نێژراوە کە لە دێری حدیابدابوو) لەم دەقە بۆمان دەردەکەوێت کەوا دێری حدیاب گەچ نیە بەپێی نووسینی پەرتووکی(العفە) کە دەڵێ: دێڕی ئیشۆعزخا تاوەکو ئەمڕۆش ناوەکەی وەك خۆی ماوە و پارێزگاری لێکردووە، واتە تاوەکو سەدەی نۆزدەهەم، ئەمە لەو کاتەی کە دەبینین لە نزیکەوە دێری حدیاب تێکدراوە و کاولکراوە لە ساڵی ٨٤٩ ـ ٨٥٠. لە ڕاستیدا ئاماژە بە ئیشۆعدناح دەکات لە سەردەمی خۆیدا ئەو قوتابخانەی کەوا ئیشۆعزخا دایمەزراندووە و بەناوی ئەم مایەوە تاوەکو دێرەکەش رووخێنرا لە سەر زەوی نەما بۆیە هیچ بەرهەڵستێکمان نیە لە پێناسەی دێری گەچ کەلەلایەن ئیشۆعزخا دروست کراوە بەناسنامەی ناسراو بە دێری حدیاب.

کەواتە لە سەرەتادا، لێرەدا نیشتەجێ بوون(ئەستابانۆس) و قوتابیەکەی(ئابا) لە زیناى، واتە لە ڕۆژانی یەکەمی دێرەکە لە کۆتایی سەدەی چوارەم([٦٩٧]).

تاکە جارێك دێری گەچ باسکراوە پێش ساڵی ٨٣٢ کاتێك رەبەن یووسف هات کە لە دۆڵی (دنیخا) دەژیا لە نزیك دێری بێت عاوی لە کەرتی مەرگە بە یەك ڕۆژ بۆ دێری ئیشۆعزخا وە بۆ ڕۆژی دوایی دەگەڕایەوە ئەشکەوتەکەی خۆی([٦٩٨]).

لێرەدا پێویستە ئەوە بخەینە بەرچاو کەوا رەبەن یووسف هیچ کاتێکی بۆ پەڕینەوە لە زێی گەورە دانەناوە لەبەرئەوەی بە پیادە بە سەر ئاوەکە دا دەڕۆیشت وەك نەریتی خۆی. زۆر سروشتیە کە بزانین ئەو ماوە دورودرێژە لە نێوان دێری بێت عاوی و دێری حدیاب، وا پێویست دەکات کەوا رەبەن یووسف ئەو کاتە لەبارەی هەبێت بۆ ئەوەی بیبڕێ، بۆیە دەبینین لەگەڵ گەردی بەیانی بۆی دەردەچوو. لێرەد ئەبێ ئەوە بخەملێنین چەند کیلۆمەتر، لە ڕۆژێکدا ئەم رەبەنە دەتوانێت ببڕێت لە ناوچەیەکی چیایی، لە کاتی

زانینمان بۆ ئەو ماوەیە، پێویستە دە میلی لێ ببڕین، واتە نێوان دێری بێت عاوی و زێ ئەوەکەی تر کە دەمێنێتەوە ئەو ماوەیە لە نێوان زێ. ئەوەکەی تر، کە دەمێنێتەوە ئەو ماوەیە لە نێوان دێری و گەج کە باسی لێوە دەکەین. ئەم دێرە لە ساڵی ٨٤٩ ـ ٨٥٠ کاولکراوە و تەقێندراوەتەوە بە شێوازێکی دڕندانە و لەوانەیە بە هێرشکردنێکی کاولکەرانە لەلایەن کوردەکانەوە بووبێت. واتە لە ساڵی سێیەم لە وەرگرتنی خەلیفە جەعفەر دەسەڵاتی حوکم لە موعتەسمی باوکیەوە. دواتر ڕەبەنەکانی دێری ماریۆنان هاتن بۆ دێری گەج بۆ ئەوەی ڕوفاتی دامەزرێنەری دێرەکە ببەن. لە کاتی هەڵدانەوەی گۆڕەکە، بینیان لاشەکە وەك خۆیەتی بەبێ هیچ بۆگەنی بوونێك دوای تێپەڕبوونی ٢٦٠ ساڵ بە سەر کۆچی دوایی کردنی.

خستیانە ناو دارە بازەیەك و گواستیانەوە بۆ دێری ماریۆنان لێرە خستیانە ناو گۆڕێك لە تەك گۆڕی یۆنان دامەزرێنەری ئەو ماڵە پیرۆزە.

٣ ـ دێری ئیشۆع سورەن

ڕەسەنایەتی شەهید ئیشۆع سورەن بۆ گوندی(کوڕ) دەگەڕێتەوە هەروەك لە پێشەوە روونمان کردەوە([٦٩٩]).

لە کۆتایی سەدەی چوارەم بەشێك لە دانیشتوانی ئەو گوندە باوەڕیان هێناو هاتنە سەر ئاینی مەسیحی بەڵام بەشەکەی تر لە سەر دینی زەردەشتی خۆیان مانەوە. دوای ئەوەی ئشۆع سورەن بوو بە ڕەبەن، کارێکی سروشتیە کەوا دێرێك بۆ خۆی دروست بکات و ئەمەی کرد بە دووری دوو مێل لە گوندەکەی خۆی([٧٠٠]).

بەڵام ئیشۆع سورەن دامەزرێنەری دێرەکە دوای تەواوبوونی بینای دێرەکە کارێکی دیکەشی کرد لە دەرەوەی داب و نەریتی باو(لێرەدا پاشکۆیەکی درێژ هەیە بە وردی نووسراوە کە هاوشێوەی زۆر لە مێژووەکەیدا هەیە و ئەمە جێگەی سەرچاوەی باوەڕ پێکردنە بڕیاری دا بیست منداڵی بێ کەس و کار کۆبکاتەوە و لە ناو دێرەکە نیشتەجێیان بکات لەگەڵ ڕەبەنەکان. واتە دەیوست هەتیوخانە بۆ بچوکەکان بکاتەوە کارەکەی بووە هۆی گومان بەرهەڵستی لەلایەن ڕەبەنەکانەوە، و بەرپەرچی ئەم پرۆژەیان کرد لە بنەڕەتدا بەهۆی ئارەزوو نەبوونیان بۆ ئەو ژمارە نوێیە کە هیچ بەرهەمیان بۆ دێرەکە نیە. ئیشۆع سورەن گوێی بەو بەرهەڵستی کردنە نەگرت و کارەکەی تەواو کرد و بیست منداڵە هەتیوی هێناو لە دێرەکە نیشتەجێی کردن بە پێی دەقە تۆمارکراوەکان لە سەر ئیشۆع سورەن، هەست دەکەین کەوا پەتریك ئیشۆعیابی سێیەم پاڵپشتی کردووە لە دەستپێشخەریەکەی دامەزرێنەر. ئەم کارە پاڵی بە پەتریك ناوە چاو لە ئیشۆع سورەن بکات بۆ کردنەوەی

چەند مەڵبەندێکی تر بۆ حەواندنەوەی منداڵە هەتیوەکان لەناو دێرەکانی تردا، بەرهەڵستی کردنی رەبەنەکانی دێری بێت عاوی بەهێزترینیان بوو وە پێداگیریان لەمە توندتر بوو لەوەی رەبەنەکانی دێری(گوڕ) کاتێك بەتریك تەنها ویستی قوتابخانەیەك لە دێری بێت عاوی بکاتەوە. نازانین لەلای نەستۆریەکان یا یەعقوبییەکان هەتیوخانەی تر هەبووە لە ناو دێرەکان وەك دەردەکەوێ و بیرۆکەکە تاکو ئێستا پێمان نەگەیشتووە. رەبەنەکان هەردەم دەیانویست کەشێکی ئارام و هێمنیان لە دێرەکان دا بۆ فەراهەم بکرێت کە پێویستە بۆ تێرامان و هەڵسان بە کرداری خواپەرستی و روحی رەحمەت و خۆشەویستی دراوسێ. بە کردار ئێمە تێبینی دەکەین تۆما مەرگەیی هەتیوەکان لە نوێژەکانیدا بەشدار دەکات([٧٠١]).

داوای خێریان بۆ دەکات و دەڵێ: تکا دەکەین بەخشندە و سۆزتان لەگەڵ هەتیوە هەژارەکان دا هەبێت و جلوبەرگی منداڵی ئەیوبیان لەبەر بکەن و بیانپارێزن بۆ ئەوەی سوپاست بکەن. مافی یاسایی کلدانی لە کۆندا بایەخی بە هەتیوان نەدەدا جگە لەوانەی هەندێك ماڵ و سامانیان هەبوو. شێوەی ئەمانە دەخرانە ژێر چاودێری مەتران کە بەهۆی یەکێك لە وەسیەتکەران و رەزامەندی خێزان دەمێنێتەوە و دەپارێزرێ و کاری دابینکردنیان بە موڵك و ماڵەوە دەدات([٧٠٢]).

لەلای سریانەکان یاسای کەنیسە(کەنەسی) سورە، بایەخ بە هەتیو و هەژارە نەدارەکان دەدات و ئەوەی توانای خوێندنی هەبێ دەنێردرێتە قوتابخانەی مەترانیە و لە سەر ئەو کەنیسەی سەر بە ئەون پێویستە یارمەتی بایەخیان پێ بدات جا ئەوە بە پارە و پول و پێداویستی کە هەیەتی یا بەو یارمەتیەی کە لەلایەن باوەڕدارانەوە دەکرێت هەر وەك ئەرکێکی ئاینی([٧٠٣]).

٤ ـ ئەبرەشیەی حیوتون

رەنگە خوێنەری خۆشەویست ئەو پرسیارە بکات بۆچی باس لە ئەبرەشیەکانی زێی گەورە بۆ ناوچەی ناوەڕاست دەکەین لۆژیکی باشتر نیە ئەگەر باسەکەمان بەرەو هەوراز بێت لەگەڵ رێڕەوی زێ لە باشوورەوە بۆ باکوور، لە حدیابەوە، وە بە ئاراستەی سالاخ، یا بەرەو خوار بێت لەگەڵ رێڕەوی رووباری زێی گەورە لە باکوورەوە بۆ باشوور؟ وەڵامەکەم بۆ ئەمە ئەوەیە: هۆکارەکەی پاڵی پێوەنام بۆ ئەمە هاسانی لە ناسینیدا و دانانی هێما لە سەر شوێنەکان بەتەواوی ئەو کات دەتوانین بچینە سەر ئەبرەشیەکان کە زانیاریمان لە سەریان کەمترە:

## ناسینی شوێنەکە

ئاشوورییەکان بە(خیبتونا) ناویان ناوە(٧٤٣). ناوچەکە ئاشکرایە لای جوگرافیناسە عەرەبەکان و ناسراوە بە ناوی(حیبیتۆن)(٧٠٤).

لە کلدانیدا ئەو ناوە هی چیای(برحیوتون) ە و زۆر جاران ئەو دەقە بەو شێوەیە دووبارە دەبێتەوە، ڕێگەی هاسانتر بۆ دیاریکردنی شوێنی ئەو ئەبرەشیەدا ئەوەیە، پشت بە پەرتووکی(العفە) ببەسترێت و ئەو تێبینیە تۆمار کراوە لە ژمارەی(٩٠) کە تایبەت بە(ڕەبەن قامئیشۆع) کە دەڵێت(چیای حیوتۆن) کەوا ڕەبەن قامئیشۆع دێرەکەی تێدا دابمەزرێنێت دەکەوێتە دووری دە میل لە دێری بێت عاوی تیایدا ئێستا فرگالەکەمان دەگەینەوە لە بەرامبەر بەو دەمیلە و گونجاو بێت لەگەڵ پێوەری نەخشەکەمان دواتر خالێك دەستنیشان دەکەین لەسەر کەوانەی بازنەکە، کە دروست بووە لە ئەنجامی ئەو جێگەیەی کە جێگیرمان کردووە دەیکەینە شوێنی دێری بێت عاوی بە مەرجێك بکەوێتە باشووری ئەو(خربا)کەلاوەیەکە دەکەوێتە خۆرئاوای ئاکرێ. لەو خاڵە فرگاڵەکەمان دەچەقێنین لەبەرئەوەی دەقەکانی تر شوێنی حیوتون لە حدیاب دیاری دەکەن واتە لەوبەریتری زێی گەورە بە پێی کەرتی مەرگە. ئەو لایەی کەوا فرگالەکەمان ئاماژەی بۆ دەکات کە دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی زێ شوێنی حیوتون دیاری دەکات.

ئەوەی بە کردەوە پێی هەڵساین تەنها دەستپێوەگرتنێکی نەرم بوو لەبەرئەوەی ماوەی نێوان بێت عاوی و زێ دە میلە(٧٠٥).

بەم شێوەیە تێدەگەین چۆنیەتی تێپەڕبوونی میتراپۆلیت مارئیشۆعیاب کە کۆمەڵی شەهریکان زۆر لەلایان پەسەند نەبوو کە دەگەڕایەوە لە چیای حدیاب بەرەو کەرتی مەرگە دەچوو بە(حیۆتۆن) دا(٧٠٦).

هەروەها ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە چۆن نەقارەکان(پیشەی ئەو کەسانەیە کەوا کاری بەرد و مەرمەڕ دەکەن(٧٠٧).

دەچنە کانە بەردەکان لە حیۆتۆن بۆ بڕینی ئەو بەردانەی کە پێویستیانە لە کەپکە گەورەکاندا بۆ ئەوەی گەچی لێ دروست بکەن بۆ بیناکردنی کەنیسەی بێت عاوی(٧٠٨).

لە دوای بڕینی پارچە پێویستیەکان، ڕەبەنەکان دەیانخستە ناو بەلەمەکانیان و بەرەو هەوراز بەناو ڕووباری(شیڤالالیل) دەیانبرد تا دەگەیشتنە(خەرجاوە) لەوێ بەردەکانیان دەهێنایە خوارەوە، ئینجا بە پشتی کەر و ئێستر باریان دەکرد و بۆ دێرەکە بەسەریان دەخست.

## مەترانەکانی حیۆتۆن

Lequien بابەتی مەترانەکانی حیۆتۆنی کورت کردۆتەوە و بە لیستێك ڕێکی خستووە([709]).

لە تواناماندایە بە دڵنیاییەوە بڵێین هەردەم پشت بە نووسینەکانی ماری بەستراوە. تکایە تێبینی ئەو مێژوونووسە بکە سەرەڕای ئەوەی بە عەرەبی دەینووسی بەڵام شێوازی کلدانی تێدا بەکارهێناوە و دەینووسی(حافتون).

(١ ) ـ داود

مێژووی دامەزراندنی ئەبرەشیەی حیۆتۆن نازانین لە ساڵی ٧٩٠ لەگەڵ ئەبرەشیەی حانیتا دا بە یەکەوە لە بن دەسەڵاتی مەتڕان داود بوون([710]).

مەتران داود بڕیاری خۆکێشانەوەی قەشە نەستۆریۆسی واژوو کردووە کە قەشەی دێری(ماریۆزاداق) بووە و بەوە تاوانبار کراوە بە بدعەی(نوێژکەران)

(بدعەیەك) بڵاوبۆوە و لە دوو سەدەی چوارەم و پێنجەم کە تێیدا تاوانبار کراوە.

(٢) ـ دنح ماران

لە ڕەبەنەکانی دێری(ترعێل) و مەترانی(حیۆتۆن) بووە لە ماوەی نێوان ساڵانی ٦٥٠ ـ ٨٢٠([711]).

بەڵام بە پێی ئەوەی بۆ ئێمە دەردەکەوێ ماوەی کارکردن لە سەر کورسی مەترانی لە دەوروبەری ساڵی ٨٢٠ لەبەرئەوەی نووسەری مێژووی دێری بێت قوقا باسی دەکات لەدوای میتراپۆلیت نەستۆریۆس، کەوا هەروەها گەواهی بووە بۆ ئاگاداری گەڕانەوەی واژوو کراو ساڵی ٧٩٠ کە لە سەرەوە باسمان کرد.

(٣) ـ س(ناوی دیار نیە)

ئەو مەترانە کە ناوەکەی نازانین، دەزانین کەوا کراوەتە مەتران لە ڕۆژی حەوتی ئایاری ٩٨٧ کە هەمان ڕۆژە بەدانانی یان مەراسیمی کردنی ماری دووەم بە بەتریك([712]).

(٤) ـ س(ناوی دیار نیە)

ئەمە دووەمین مەترانە ناوەکەی نازانین بەڵام دەزانین کەوا ئامادە بووە لە کۆمکاری مەترانەکان بۆ هەڵبژاردنی بەتریك ئیلیای یەکەم ساڵی ١٨٢٨. هەروەها لەو کۆمکارە میتراپۆلیتی مووسڵ ئامادە بوو([713]).

(٥) ـ س(ناوی دیار نیە)

لەدوای مردنی مەترانی پێشوو سەرەوە ژمارە(٤) ئیلیای یەکەم رەسامەتی بەتریکی لە ساڵی(١٠٣٨ ـ ١٠٤٩) بۆ کرا. ئەم مەترانە وەك خەلیفەی پێش خۆی ناوەکەی لای ئێمە ئاشکرا نیە.

(٦) ـ مەرقۆس

مەتران مەرقۆس ئامادەبوو لە رێورەسمی بەتریك عەودیشوعی دووەم کوڕی ئەریت لە رۆی ٢٣ تشرینی دووەمی ساڵی ١٠٧٥. دەقەکە بە وردەکاریەوە دیاری دەکات کەوا(حافتۆن) سەر بە سەرۆکایەتی ئەسقەفیەی مووسڵ بووە([٧١٤]).

دوایی ئەمەی دەخاتە سەر و دەڵێ کەوا مەتران مەرقۆس گواستراوەتەوە بۆ دیمەشق وەك میترابۆلیت([٧١٥]).

(٧) ـ سۆر یشۆع

ئامادەی رێورەسمی دانانی بەتریك مەکیخای یەکەم بووە لە ١٠٩٠/٤/١٨([٧١٦]).

(٨) ـ برسۆم

لەو دەقانەی کەوا Lequien نووسیویەتی([٧١٧]).

دەخوێنین کەوا ئامادەبووە لە رێورەسمی بەتریك برسۆم ساڵی ١١٣٤ کە ئەو کات مەترانی حیۆتۆن بووە. بەلام قەشەی یاسایی Mvan Lantschoot ئەمە دەڵێ وەك پێش خۆی. بەلام ماری و عمرود باسی ناکەن لە ناو مەترانەکان کە ئامادەی ئاهەنگەکە بوون. لە رۆژی ١١٣٩/١١/٢٣، و لە ئاهەنگی رێورەسمی پەتریك عەود یشۆعی سێیەم کوڕی مەقلی([٧١٨]).

هەڵبژێردرا بە مەترانی(حیوتون) بەلام رێورەسمەکەی دواتر بۆ کرا.

(٩) ـ جبرائیل

ئامادەی ئاهەنگی دانانی بەتریك مەکیخای دووەم بوو لە رۆژی ١٢٥٧/٤/٤([٧١٩]).

لە سەدەی چواردەهەم، ئەبرەشیەی حیۆتۆن تاوکو ئێستا دەردەکەوێت لە لیستی ئەبرەشیەکان و سەر بە سەرۆکایەتی هەولێر و ئاشوورە بووە([٧٢٠]).

بەلام ناوی ئەو کەسانە نازانین کە ئەو کورسیانەیان بەکارهێناوە.

٥ ـ شیبتیان

سەمعانی([٧٢١]). سەرۆکایەتی ئەسقەفیەی حیۆتۆن([٧٢٢]). بە شیبتیان تێکەڵ دەکات کە هەردووکیان بەدەردەکەون لەو لیستەی سەرۆکایەتی ئەسقەفیەکانی تێدایە و ئەبرەشیەکان کە پێشتر پەتریك عەودیشوعی چوارەم مارون پێشنیاری کردبوون نووسیبوونی کاتێك راپۆرتێکی ئامادە کردبوو لە سەر کەنیسەکەی و ناردبووی بۆ پاپا پیۆسی چوارەم ساڵی ١٥٦٢([٧٢٣]).

وا دەڵێ کەوا ئەوانە دەکەونە ژێر دەسەڵاتی ئەو. بە پشت بەستن بەو سەرچاوانەی پارێزراون لەسەر دەلاقەکانی Babliotheca Orientalis سەرۆکایەتی ئەسقەفیەی شیبیتیان مایەوە لە بەردەوامبوونی مانەوەی چالاکیەکانیدا بە درەوشاوەیی تاوەکو ئەمڕۆ بەڵام لە فەرهەنگەکانی مێژوو و جوگرافیای کەنیسە و بەس([٧٢٤]).
ئەوەی دانەرەکان لە سەری کۆك نین دیاریکردنی شوێنی ئەو ئەبرەشیە و دامەزراندنیەتی. ئەگەر حیۆتۆن بەجێبهێڵین هەروەك سەمعانی وەلاوەی ناوە و لە بابەتەکە بکۆڵینەوە بە هێمنی، دەبینین Hoffmann ([٧٢٥]).
پێشنیار دەکات کەوا شوێنەکە لەو ناوچەیەی ناسراوە بە(هیوفتیان ئی سورهاب) دایە. بەڵام لێکۆڵەرێکی کوردی بەناوبانگ پێشنیار دەکات کەوا ئەو شوێنەیە(خیومرتیان) دایە، واتاکەی(شوێنی قەڵا) کە دەکەوێتە سەر زێ و مەڵبەندی یەکێك لە ناوچە کوردیەکانە کە ژمارەیان(١٦) ناوچەیە([٧٣٦]).
تاوەکو ئێستا دانە رەسەنەکە بە زمانی کلدانی نەدۆزراوەتەوە([٧٣٧]).
بۆ ئەو بەڵگەنامەیە. بۆیە ئەومندەمان بەسە بە خوێندنەوەی دەقەکان کە هەر یەك لەمانە نووسیویانە:(تووزی) و(سەمعانی) و (موڕان) و (شەمۆئیل جەمیل). بە پێی ئەو دانەیەی بە زمانی لاتینی نووسراوە کە لە ئەرشیفی فاتیکان دایە کەوا پشتی پێ بەستراوە لیستێك بە ناوی ئەبرەشیەکان رێکخراوە هەر وەك لای سەمعانی و تووزی و جەمیل دا هاتووە. تێبینیەك هەیە تکایە لێی وریابن نووسینەکە لە دانە لاتینیەکە زۆر خراپە و وشەکان شێوێندراون بۆتە هۆی خوێندنەوەی جۆراوجۆر، ناوەکانی سەرۆکایەتی ئەسقەفیەکان لە نووسینەکە جیاوازە لەگەڵ دەستخەتی ئەوەی کە ئەبرەشیەکانی پێی نووسراوە کە سەر بە ئەو بووە.

(هێڵی بە ژێر دا کێشراوە بۆ روونکردنەوە - وەرگێڕ) لەگەڵ ژمارەی زنجیرەیی:

A - سەرۆکایەتی ئەسقەفەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی

سەمعانی

١ - ئەربل

٢ - ساراڤا

٣ - هەنکاڤا

٤ - شیبتیان

٥ - کرملێس

٦ - ئەکۆسك

٧ ـ نسێبین

٨ ـ ماشازین

٩ ـ تالئیسکاف

١٠ ـ ماردین

١١ ـ سعرد

١٢ ـ ئازن

١٣ ـ ئەلکێسن

١٤ ـ زوك

١٥ ـ مصیاری

١٦ ـ کورجیل

١٧ ـ ئشی

١٨ ـ ئامەد

١٩ ـ کارۆکیا(کیارۆکیا)

٢٠ ـ هین

٢١ ـ تامیر

ترزی

١ ـ ئەربل

٢ ـ ساراوا

٣ ـ عەنکاوا

٤ ـ شیبتیا

٥ ـ کانبیریس(کامبیریس)

٦ ـ ئەکورك

١١ ـ سعرت

١٧ ـ ئشی

١٨ ـ ئامەد

١٩ ـ کیارۆکی

٢٠ ـ هاین

٢١ ـ تامێر

شەمۆئیل جەمیل

١ ـ ئەربیل
٢ ـ سیراڤا
٣ ـ هەنکاڤا
٤ ـ شیبتیام
٥ ـ کارملیس
٦ ـ ئەسشوسك
٧ ـ نسێبین
٨ ـ ماکشازین
٩ ـ تال ئیسکانی
١٠ ـ ماردین
١١ ـ سعرد
١٢ ـ ئازی
١٣ ـ ئەلشێسن
١٤ ـ زوك
١٥ ـ مسیارا
١٦ ـ کوجیل
١٧ ـ ئشیی Esci
١٨ ـ ئامەد
١٩ ـ کیارۆکیا
٢٠ ـ ئیهایر
٢١ ـ تانور

B ـ سەرۆکایەتیەکانی ئەسقەفیەکان لە ولآتی فارسیدا

سەمعانی

ترزی

١ ـ ئورمێی سەروو
٢ ـ ئۆسینی
٣ ـ شۆکیا
٤ ـ ئورمێی خواروو
٥ ـ دووترا

٦ - سۆدۆز(سۆلۆز)

٧ - ئیشهینێرۆك

٨ - ئیسبۆرجن

٩ - ناری

١٠ - سیان

١١ - سالماس

١٢ - بومار

١٣ - شیاباتام

١٤ - فاسكام

**شەمۆئیلی جەمیل**

١ - ئورمێی سەروو

٢ - ئۆلشینی

٣ - ئورمێی خواروو

٥ - دووره سۆلدۆز

٦ - دووره سۆلدۆز

٧ - ئیشینۆك

٨ - ئیسبۆركان

٩ - ناری

١٠ - جینۆ

١١ - سەلماس

١٢ - باومار

١٣ - شیاباتام

١٤ - ڤاسكام

پێش دەستپێکردن بە لێکۆڵینەوە و باسی ئەو بەشەی کە مەبەستمانە لەو لیستانەدا، دەبێ ئەوە بزانین کەوا سەمعانی و جەمیل بە لاتینی دەیاننووسی بە پیتی ئیتاڵی، بەڵام تـرزی بــە ئیتــاڵی دەینووســی هــەر برگەیــەك(Ch بەرامبەرەکـەی لـەفزی K و برگـەی Sc بەرامبـەر بـە لـەفزی ش(ئەمــە وتـەی دانـەرە ئـەوەی پەرتووکەکـەی بـە زمـانی فەرەنسـی بخوێنێتەوە)(وەرگێڕ). لە لیستی نـاوی سـەرۆکایەتیەکانی ئەسـقەفیەکانی یـەکگرتوو ناوێـك

هەیە بۆ سەرۆکایەتی ئەسقەفیەکان:(کیبتیان) و بە پێی سەمعانی و ترزی و یا(کیبتیام) بە پێی جەمیل، ڕێکخستنەکەی کۆمەڵێك پێك دێنێت بریتیە لە سێ شوێن(گوند، یان شار) و ئەو لە سەرووی ئەو کۆمەڵەیە.

ناتوانین لێکیان جیابکەینەوە، لەبەرئەوەی مەڵبەندی کورسیەکانی پاریەدەرەکان بووە(شوێنەکانیان تالین بووە) بۆیە هەردەم لەگەڵ ناوچەی جوگرافی دا بووە، کە سەرۆکایەتی ئەسقەفیەی لێ بووەو پێیەوە بەسترابوونەوە. ئەسقەفیە پاریەدەرەکان ئەمانەن کە دەکەونە ژێر ژمارە(٥): کەرملێس، کامبر، کراملێس و(٦) ئەکوسك، ئەکورك، یان ئەسکوش.

ژمارە(٥) کرەملێس: شوێنێکی ناسراوە و بەناوبانگە لەبەرئەوەی گوندێکی کلدانی گەورەیە دەکەوێتە دەوری مووسڵ. لەبەرئەوەی ئێمە لەو ناوچەیەین، بۆیە قەشە شەمۆئێل جەمیل هەموو مافێکی هەیە بۆ دانانی جێگەی ژمارە(٦) دەگەڕێتەوە بۆ گوندی(ئەلقوش)([٧٢٨]).

کەواتە ئەو شوێنەی دەمێنێتەوە پێویستە بزانین لە کوێیە و دەستنیشانی شوێنەکەی بکەین و سەرۆکایەتی ئەسقەفیەیە و پێویست دەکات گەورەترین گوندی ناوچەکە بێت و دەکەوێتە دەوری مووسڵ و جێگەکەی پێویستە لە نێوان ئەلقۆش و کەرملێس بێت.

دوایین برگەی خوێندنەوەی ناوەکە، یان:(ئان) ئو(ئام) ئەو جیاوازیە کە لای سەمعانی هەیە و ترزی لەلایەك جەمیل لەلایەکی تردا پێویستە ئاگاداری ئەو تێبینیە بین. لە بن ژمارە ١٣ لە خشتەی تایبەت بە سەرۆکایەتی ئەسقەفیەکانی وڵاتی فارس هەمان جیاوازی هەیە لە کاتی خوێندنەوەمیبرگەی کۆتایی ناوەکە بەڵام بە شێوەیەکی پێچەوانەوە. کەواتە دەپرسین کام جۆرە خوێندنەوە پەسندە؟ وەڵامەکەی لای جەمیل دەدۆزینەوە([٧٢٩]).

لەبەرئەوەی بە دڵنیاییەوە پاشکۆی هەیە لە دواییدا: ناوی ڕەسەنی بۆ شوێنی ئەو سەرۆکایەتیەی ئەسقەفیەی پاریەدەر ژمارە(١٣)(شابات) بووە.ئەو خاسیەتەی کە پێی دراوە خاسیەتی ناوە بۆ(شیاباتنای) ڕێکەوتە لەگەڵ بەکارهێنان لەلای کلدانەکان بە پێی ناوچەکە ناونراوە هەروەك باسی دانیشتوانی پایتەختی فەڕەنسی دەکەین و پێیان دەڵێین(پاریسیەکان).

هەروەها لە تواناماندایە بڵێی ئەو جۆرە بەکارهێنانە کورتکراوەی سیفەتی لاتینیە(Sciapathan ensisl ) شیاباتان ئینز. جگە لەمە، دەبێ بزانین کەوا لە نێوان کەرملێس و ئەلقۆش گوندێکی کلدانی هەیە و گرنگی زیاترە(تلکێف) ە و بە کلدانی(تلکێبا) و دارشتنی کۆتایی ئەو ناوەمان دەداتێ و دارشتنی(Keptian(Ensis) کیبتیان ـ ئینز.

ـەگەر لەو دەقانە رابمێنین لە سەر تلکێف، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەوا ئەو گوندە زۆر کۆنە و مەڵبەندی کورسی سەرۆکی ئەسقەفیە بووە. بەهەرحاڵ پێویستە بڵێین کە ـەبرشیەی(کبتیانی) وەهمی بە هیچ شێوەیەك نابێتە حیوتۆن.

٣- مارقەرەداخ دووەمین جار

ـەگەر بەدوای رای قەشە(بیتەرس) دا بچین، ئەبێ لایەنێك لە مێژووی شەهید(قەرەداخ) وەلا بنێین و بیخەینە خانەی داستانەکان، باسەکەمان بۆ لیستی مەترانەکانی حدیابە، وەمان لێ دەکات تێبینیمان هەبێ لە سەر دەرکەوتنی درەنگ بۆ زاراوەی(بێت مار قەرەداخ) و ئەمە جەخت لە سەر رای ئاماژە بۆ کراو دەدات.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ئەمە ئەو ناوە نیە کە دراوەتە کۆشکی پاڵەوان مەلقی. ئەو هەستە دەکەیت. بەڵام هەبوونی دێرێك بە ناوی ئەو قەدیسە لە کۆتایی سەدەی شەشەم ناچارمان دەکات پێداچوونەوە بە حوکمەکەمان بدەین. دەبێت راشکاوانە بین و دەڵێین بە خێرایی، ئینجا ئایا پەیوەندی بەو بابەتە هەبێت، یان هەر بابەتێکی هاوشێوە.

رەسەنایەتی کەسایەتی قەرەداخ و شەهیدبوونی هیچ گومانێکی تێدا نیە سەرەڕای ئەو شێوازە داستانە خەیاڵیەی وەریگرتووە کە لە خوێندنەوەی ژیاننامەی نووسراو لە چەرخەکانی درەنگدا هەبوونی(مارقەرەداخ) دەخاتە مەحەك.

قەشە بیتەرس ماڤ خۆیەتی بە دوورکەوتنەوە لە مێژووی ناخۆشی لە ژیاننامەی لەوبارەی ئێستاوە، هەموو لاوێکی میر و سوارچاك و ئازا لە شێوەی(بەهنام لە ئاسوور) و(کفرەشاسب) ی حدیابی و(ئەبای) لە قولیت و قەرەداخ لە مەقلی(٧٣٠).

دەبینین بەکاری سەرسوڕهێنەر هەڵساون رەنگە باوەڕ نەکەیت لە زۆری خەیاڵ و بیرکردنەوە بە شێوەیەك دەکەویە گومانەوە تاوەکو لە نوێژکردنی میللی. لە دەستنووسێك بەناونیشانی(كتاب الملوك) چیرۆکێك نووسراوە لەسەر پێست(مردوو وەك پێستەکانی کەللە سەریان نووسراوە) پاڵەوانەکانی تاوەکو ئێستاش ئازایەتی دڵیان پڕ دەکات بۆ بەرپەرچدانەوەی کوفر و بەدەنگەوە هاتن بۆ موغزەیات.

خۆڕاگربوون و بەرەنگاربوونەوەی هێز و حاکمە زاڵمەکانی نموونەی شاپووریان کرد، تەحەمولی ئازارەکانیان کرد بە ئارامی، نەك وەها بەڵکو بە شادومانیەکی راستەقینە لەبەرئەوەی چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد دوای شەهید بوونیان بگەنە خۆشیەکی ئەبەدی. ئەوەی دەبینرێ ئەوە سەرتووی مێژووییە لە دوای ئەو هەموو چیرۆك و ریوایەتانە کە جێگەی سەرسوڕمان و دەربڕینە؟

زۆر زەحمەتە بتوانین مێژووەکەمان هەڵسەنگێنین ئەو هەموو ریوایەتانەی کە هەیە لە ژیاننامە و چیرۆکەکانی قەدیسەکان کە چەند سەدەیەك بە سەر نووسینەوەیان و چەند سەدەیەکی زیاتریش بە سەر رووداوەکانیان ئەوەی گرنگە لەمەدا کارکردنیەتی لەسەر داب و نەریتەکان کە پشتاوپشت ماوەتەوە بە قسە کە زۆر کاریگەری بەردەوامی هەیە و بەجۆش و خرۆشەوە بەنووسینەکانی نووسەر و پلەی هەڵچوونیدا([٢٣١]).

باری کۆمەڵایەتی بۆ قەرەداخ ئەوە دەگەیەنێت لەسەرمانە وای دابنێین بەرامبەر میرێکی گەورە(لێرەدا مێژوونووس قەشە جان فیە وتار بۆ خوێنەرەکانی دەدات بە چەمکی ئەورووپی لە ماوەی ژیانی قەرەداخ ـ وەرگێڕ).

یان بە مەرزەبان ناسراو بوو بۆ ناوچەی بێت گەرمای سەر بە نسێبین ئەو پلە و پایە دەگەڕێتەوە بۆ ئیمپراتۆریەتی فارسی کە حوکمی وڵاتی دوو رووبارەکەی دەکرد ئەو کات. تەنها دەدرایە فەرماندەی بەرپرس بۆ پاسەوانەکانی سنووری حدیاب. ئەوەی ماوەتەوە بۆ ئێمە بۆ ناسینی ئەو کەسایەتیە شەهیدبوونیەتی بەهۆی مانەوەی لەسەر باوەڕدارییەوە بە مەسیحیەت، بۆیە زۆر ماف خۆیەتی رێز و وەفاداری مەسیحیەکانی سەردەمی ئەو بزانین دواتریش رۆڵەکانی نەوەکانی دوای ئەمان بەلام کردارەکانی هیچ کەسێك ناتوانین هەڵیانبسەنگێنی و سنووورداری بکات تەنها خوا نەبێت.

با بگەڕێینەوە بۆ سەرگوزشتەی ژیاننامەی قەرەداخ و لێکۆڵینەوەی لە سەر بکەین بە وردی و لە سەرخۆوە ئەوەمان بەدەست دەکەوێت کەوا چیرۆکێکی ئاساییە هاوشێوە لەگەڵ چیرۆکی زۆر لە مەسیحیە سەرەتاییەکان لە پێناو باوەڕدارییان بە مەسیحیەت. قەرەداخ لە ناوچەی حیوتۆن لە دایك بووە کە بابەتی لێکۆڵینەوەکەمانە. لە نزیك ماڵی باوکی پەرستگەیەکی ئاگرپەرستان هەبوو لە ساڵی ٦٠٠ ز. دێرێکی جوان و قەشەنگ لە سەر کەلاوەی ئەو پەرستگایەی بتپەرستەکان دروست کرد ناسراو بە دێری(مارقەرەداخ) ی شەهید. پڕشنگی رۆناکی ئەو دێرە هەڵات بەهۆی چالاکیە روحیەکانەوە و بووە هۆی رووناککردنەوەی چیای حیوتۆن و بێت بەگاش([٢٣٢]).

رستەی کۆتایی لەو دەقەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کەوا شوێنی دێرەکە دەکەوێتە لای باکووری ناوچەی حیوتۆن. دامەزرێنەری ئەو دێرە کە پێشتر ناسیمان کاتێك باس لە دێری گەچمان کرد لەبەرئەوەی هەمان دامەزرێنەرە و ناوی رەبەن ئیشۆعزخایە خوێندنەوەمان بۆ پەرتووکی(العفە) ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کەوا چەند دێرێك ناوی(مارقەرەداخ) یان هەیە بەلام ئەو زانیاریە لە دەقەکانی پەرتووکەکەدا دووبارە دەبنەوە بەبێ ئەوەی بە درێژی باسی بکات([٢٣٣]).

**٧ ـ دێری برایان لە سەبسەبا**

ناوچەی سەبسەبا دەکەوێتە لای باشوور لە زنجیرە چیای ئاکرێ واتە لەو درێژاییەی نێوان شاری ئاکری و خازر بەلای رۆژئاوا لەو ناوچەیە دێرێك هەبوو ناسراو بوو بە دێری برایان لە سەبسەبا ئەو دێرە لە چیای حیۆتۆن دامەزرا لە دەوروبەری ساڵی ٦٥٠، کە دامەزرێنەرەکەی رەبەن قامئیشۆعە([٧٣٤]).

مامۆستا بوو پێشتر لە دێری(سەهدونا) ی بەناوبانگ و سەرۆکی دێری بێت عاوی([٧٣٥]).

بە پێی زانیاریەکانی، ئەو دێرە لە زێی گەورە دوور نەبووە. لەبەرئەوەی(ئیشۆدناح) وتی ماوەی نێوان هەر دوو دێری ناوبراو و بێتعاوی نزیکەی دە میلە. ئەوە کاتێك باسمان کرد لە پێشەوە لە بارەی زانینی شوێنی چیاکە.(قام ئیشۆع) بەساڵان دا چوو بوو، کە ئەو دێرەی دامەزراند و لەوێش کۆچی دوایی کرد و تیایدا نێژراوە لە دواییدا لە مێژووی دێری بێت قوقا دا هاتووە([٧٣٦]).

باسی گوندی(کادان) کراوە وەك ئەوەیە دەکەوێتە سەر چیای حیۆتۆن بەڵام تا ئێستا نەمتوانیە بیدۆزمەوە([٧٣٧]).

لە سەدەی شەشەم یەکێك لە قوتابیەکانی برعێتە ناوی(نیسانایا) یە خەڵکی(حیۆتۆن) بووە([٧٣٨]). دەرکەوتووە و بە ناوبانگ بووە.

**٨ ـ دێری مارگۆرگیس**

رەبەنێکی سەردەمی(برعیتا)([٧٣٩]).

لە سەرەتای سەدەی شەشەمی زاینیدا ژیاوە گۆرگیس و برعیتا لە دێری مارِ ئەبراهامی گەورە دەرچوون گۆرگیس جاری یەکەم چووە چیای حدیاب بۆ ئەوەی لەوێ بژی لە ناوچەیەك ناسراوە بە ماینیز ـ Maynis ([٧٤٠]).

رەبەنێکی نوێژکەر و لە خوا ترس بووە، خواردنی لەسەر میوە و گیاوگۆڵ بووە. ئەو(پەرچووانەی) کە دروستی کردووە بۆتە هۆی راکێشانی راستەوخۆی قوتابیان بۆ خۆی دێرێکی دامەزراند نزیك لە گوندی(رویمینی ـ Rumini) ئێمە نازانین ئەو گوندە لە ناوچەی ماینز بووە یان نا. لە دوای دامەزراندنی ئەو دێرە باوەڕدارانی ئەو ناوچەیە زەویەکانیان کردە ئەوقاف لە ئەنجامی ئەو شیفاو چاکبوونانەوەی کە لە سەر دەستی دامەزرێنەری ئەو دێرە هاتەدی کە بەهۆی درەوشانەوەی رۆناکی باوەڕداری و بووە هۆی رۆناککردنەوەی هەر دوو ناوچەی مەرگە و بەیتبەگاش. لە لێکۆڵینەوە لەو رستەیەی دوایی وابزانم شوێنی دێرەکە دبێت لە حیۆتۆن بێت، چونکە شوێنی حیۆتۆن لە حدیاب دا لە رووی جوگرافییەوە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی کەرتی مەرگەوە و باشووری کەرتی

بێتبەگاش. مردنی رەبەن گۆرگیس لەو دێرە نەبوو کە دایمەزراندبوو لەبەرئەوەی لە کاتی هەست کرد بە نزیکبوونەوەی مردنی بڕیاریدا دێرێکی تر دابمەزرێنێ.
شوێنی دێری دووەم لە(بێتزێتی) لە ناوچەی(بیرتا) لەلای رۆژئاوای لە کەرتی مەرگە و لەسەر سنووری نەینەواو بانوهەداری گەشەکردوو([741]).
کەنیسەی مارگۆرگیسی زەیتوون تا ئێستاش هەر ماوە لە گوندی بێریا لە شەمکان. بۆ گۆرگیس دامەزرێنەری دێرەکانی سەروو، رۆڵێکی گرنگی گێڕا لە لەناوبردنی مۆنۆفیزیەکان و داگیرکردنی شوێنەکانیان، هەروەها کاریگەری کاری هەبوو بۆ باوەڕهێنانی زۆرێك لە کافرەکان کە لەو گوندانە نیشتەجێ بوون. گۆرگیس یەکەم دێری لە گوندی ریۆمینی لە حدیاب دا دامەزراند وەك دەردەکەوێ ئەو دێرە هەمان ئەو دێرەیە کە ناسراوە بە دێری رامۆنین([742]).
ئەم ناوە بە یەکێك لە ئەسقەفیەکان دەوترا کە سەر بە سەرۆکایەتی ئەسقەفیەی هەولێر بووە بەپێی بڕیارەکانی کۆمکاری مارئیسحاق گرێدراو لە ساڵی ٤١٠([743]).
مەترانەکەی تاکە مەترانە کە دەیناسین و ناوی عقوالاها بوو.(شابۆ) شوێنی رامۆنین دیار ناکات. مەنکنا شوێنەکەی دیاری دەکات لەلای باکوری خۆرئاوای هەولێر.
کەواتە دێری مارگۆرگیس نابێ لە حیۆتۆم بێت وەك تێبگەم لەوانەیە رامۆنین ناوی ناوچەکە بێت یا ناوی مەڵبەندە کۆنەکە بێت(؟) و پەیوەندی هەبووە لەگەڵ چیای حدیاب.

٩ ـ ئەبرەشیەی حنیتا

پێشتر بینیمان لە ساڵی ٧٩٠ ئامادەبوونی هەردوو ئەبرەشیەی حنیتا و ئەبرەشیەی حیۆتۆن وەك جمك وا بوون. واتە ئەو دوو ئەبرەشیە لە تەنیشت یەك بوون و کەرتی بێت بەگاش دەکەوێتە باکووری حیوتۆن و کەرتی معەلتا دەکەوێتە باشووریەوە. کەواتە ئەوەی دەمێنێتەوە لای رۆژهەڵاتیەتی کە حنیتای تێدایە. ئەمە یەکتر دەگرێتەوە لە نێوان ئەوەی دەیزانین و ئەوەی باسی لێوە دەکەین. هەورەها ناوەکە بە کلدانی دەردەکەوێ لە ژێر ناوی(حنیتا) یان(حانیتا)([744]).
لە زمانی عەربیدا ناوەکە(قوداما) یە لە ناوەڕاستی سەدەی دەیەم ناوەکەی(حەنایا) بوو([745]).
زانینی شوێنی راستەقینەی حنیتا هۆکاری زەحمەتی بۆ زۆربەی دانەرەکانە جا چ بۆ کۆنەکان یان نوێیەکان چونکە هەمیشە چاویان بڕیبووە بەستنەوەی نێوانحنیتا و معەلتا

بۆ زانیاریتان ئێمە تەنها یەك معەلتا دەزانین كە لە بانۆهەدارایە بۆیە دەچوونە ئەو لایە بۆ دۆزینەوەی حنیتا([٧٤٦]).

بە پێی بۆچوونمان:(هۆفمان) یەكەم كەس بووە([٧٤٧]) شوێنەكەی دیاریكردووە لە دۆڵی روفندز كە لقێكی زێی بچوكی تێدا تێپەڕ دەبێت. ناوچەی حنیتای چیای لەبار بووە بۆ پێگەیاندنی ژیانی رەبەنایەتی. لەسەرەوە باسمان كرد كەوا رەبەنەكان نوێژورۆژیان گرت لەو دنیایە و بە ژیانێكی تەنیایی و سكهەڵگوشین لە نێوان تاشە بەردەكان و ئەشكەوتەكانیان دا.

مار نستۆرسیش قوتابی یەكێك لەو رەبەنانە بوو پێش ئەوەی بڕوات و دێرێك بۆ خۆی دابمەزرێنێت لە(دارساب).

پێش چوونە ناو باسەكەمان ئەوەی پەیوەندی هەیە بە لیستی مەترانە وشكەكەم زانستەكان، با كەمێك هەڵوەستە بكەین و ئاوڕێك لەم چیرۆكە بدەینەوە: رووداوەكەی بەسەر رەبەنێك دا هاتووە لە ناوچەی حنیتا ژیاوە لەو ناوەی دەكەوێتە نێوان نیوەی ماوەی سەر رێگا بۆ معەلتا([٧٤٨]).

بەرسەهاتی چیرۆكەكە بەم شێوەیە و دەڵێت ئەگەر دوو كەس ژیابن لە دوو ئەشكەوتی دوو چیای لێك جیاواز زۆر دوور نین لە یەكتری. یەكەم رەبەنێكی تەنیایە بە ناوی مارۆنی و ئەوەی تر ناوی(ئەژدیهایەكی گەورەیە). بەڵام ئەو رەبەنە(مارۆنی) لەو دڕندە گەورەیە نەدەترسا و هیچ رۆژێك ئازاری نەداوە بەهۆی پیرۆزیەوە كە پێی ناسرابوو. لە شوێنێكی زۆر دوور نەبوو لە ئەشكەوتەكان گوندێك هەبوو هەندێك خەڵكی تێدا نیشتەجێ بوون، كە بە بەخێوكردنی مانگاو رەشەوڵاغ خەریك بوون. ئەژدەها كە فێر ببوو دەچووە گوندەكە و رۆژانە مانگایەكی دەڕفاند لە گاڕانی گوندەكە و وەك خواردن پێی دەژیاز خەڵكی گوندەكە زۆر لەمە بێزار بوون و سەریان سوڕمابوو كە چ بكەن بۆ دۆزینەوەی رێگەچارەیەك بۆ دەرباز بوون لەو دڕندەیە و هێرشە بەردەوامەكانی رۆژانەیەوە كە زۆری بەسەركەوتووە ناچار بوون بە گریانەوە هاتنە لای رەبەنەكە و كێشەكەیان بۆ باس كرد. گریانەكەیان كاری كردە سەر رەبەنەكە و سۆزی بۆیان دەربڕی. لەگەڵ خەڵكی گوندەكە كە هاتبوونە لای بۆ یارمەتی دەرچوو، وە چووە ئەو ئەشكەوتەی كە ئەژدیهایەكەی تێدا دەژیا كە زۆر مەترسیدار بوو. كاتێك گوێبیستی دەنگەدەنگیان بوو لە ئەشكەوتەكە دەرچوو بە فیكە فیك و تووڕەبوونێكی زۆر كە بەرامبەر فیشقاندنی هەزار مار دەبوو. دەستبەجێ شێخی قەدیس نەفرەتی لە ئەژدیهایەكە كرد بە چاونوقانێك ئەو ئەژدیها مەترسیدارە لە

شوێنی خۆی ڕەق بۆوە و دوای ئەوەی کە بوو بە بەردێکی ڕەق نە جوڵە و نە ژیانی تێدا ما. تا ئەمڕۆ ئەو خەڵکەی بەوێدا تێپەڕ دەبێت ئەو ئەژدیهایە بەردینە دەبینن بە گەورەیی قەبارەی خۆیەوە لە سەر ڕێگایە([749]).

هەروەها بینایەکی بەرزی بەردینیە. ئەوانەی بە ڕێگادا تێپەڕ دەبن لە ژێر سێبەرەکەی دادەنیشن سەریان سوڕدەمینێ و سوپاسی خودا دەکەن لە سەر هێز و توانایەوە کە بەهۆی ئەو ڕەبەنە قەدیسەوە هاتەدی و بە دوعایەکانی ئەمەی جێبەجێ کرد و داوای لێدەکەن نوێژیان بۆ بکات تا لە قەزاوبەلای دونیا بیانپارێزێت([750]).

## لیستێك بە ناوی مەترانەکانی حنیتا

ناوی هیچ مەترانێك حنیتا نادۆزینەوە لە دەقەکانی سونهاودسی ڕۆژهەلاتی. Leqien لیستێکی ڕێکخستووە ناوی ٥ مەترانی تێدایە لە تواناماندایە ناوی هەندێکی دی بخەینەسەر، بەڵام ناتوانین بڵێین لیستەکە تەواوە. هەروەها زانیاریەکانمان جەخت لە سەر مێژووی ناوە یەکەمەکانی ئەو مەترانانە بکاتەوە. لە ڕاستیدا بە گومانێکی گەورەوە لە مێژووی هەولێردا باس لە یەکەم کورسی مەترانی حنیتا دەدۆزینەوە بە ناوی مەتران(زخائیشوٚع) بووە ئەمە لە ساڵی(١٨٣)([751]).

هەروەها باس لەو ئەبرەشیە کراوە لە ڕۆژانی مەترانی هەشتەمی حدیاب(هیرام - حیرام)(٢٢٥ - ٢٥٨)([752]).

ئەگەر ڕای قەشە(بیترس) وەربگرین، ئەو کات شەهید(عقویەشما) کە بە مردن حوکم لە سەر دراوە لە ساڵی ٣٧٨ چانسی نابێت کەوا مەترانی(حنیتا) بێ([753]).

لێکۆڵینەوەمان بۆ ئەو قدیسە و کردەوەکانی([754]).

سوودمەند دەبین کەوا ئەو قەشەیە زانایەك بووە لە ڕەبەنەکانی(بولاندێست) Bollandistes پێشتر وتبووی کەوا: کۆمەڵێك بەڵگەی جێگیرکراو ڕاستگۆ نیە وەك بەڵگەی مێژوویی کەوا پشتی پێ ببەسترێ لە کاتی وردبوونەوە و تاقیکردنەوەدا. ئەو مێژووەی کە لە دەقەکان دا هاتووە زۆر زەحمەتە قبوڵی بکەین لە تێکهەڵکێشانی چیرۆکی دا زۆر دژی یەکتر دووبارە دەبێتەوە و کاری ئەستەم دا دواتر ئەوەش دەخاتە سەری:(پەرتووکی ئازارەکانی(ئەسیبسیماس) لە شوێنێکی نزیك ئەربیل تۆمار نەکراوە و لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەم تا ئێستاش دیار نەماوە).

ـدوای ئەوەی قەشە بیترس گفتوگۆی لە سەر بابەتەکە لە دەمەتەقێیەکی دوور و درێـژدا کردەوە، دەبینین رەتیدەکاتەوە هەتا ئەو راستیە کە(عقواشم) مەترانی(حنیتا) بووبێت. وە ئەبرەشیەکە بەدەر نەکەوتبوو تەنها لە درەنگ وەختانێك نەبێت. کۆمکاری بەتریك ئیسحاق هیچ ئاماژەیەکی بە شتێك لەم جۆرە نەکردووە لە راستیدا بیانگەکانی بیتریس ئەبارن و لەسەر ئێمەش ئەوەیە قبولی بکەین بە تەواوەتی و پشتگیری بکەین.

(١) ـ برشەبتا

برشەبتا مەترانی حنیتا بووە لە مێژووی رەبەن قەرەداخ([٧٥٥]).

ئەگەر وا دابنێین کەوا هەر دوو ئەبرەشیەی: حنیتا و معلتا یەکیان گرتبوو لە کۆتایی سەدەی شەشەم. وە هەروەها ئەو بارەیان لە سەرەتای سەدەی هەشتەم دا. ئەو کاتە دەتوانین ئەوەمان دەست کەوێ ئەو مەترانە هەمان مەترانە ئامادەو بەشدار بووە لە کۆمکاری بەتریك حسقیال سالّی ٥٧٦ و کۆمکاری بەتریك ئیشۆعیابی یەکەم سالّی ٥٨٥([٧٥٦]). کەواتە پێویستیمان بەوە نیە ناسنامەی ئەو مەترانە بزانین، هەر وەك لە دەقەکانی فەرهەنگی مێژوویی و جوگرافی کەنەسیدا هاتووە([٧٥٧]).

تایبەت بە رەبەن برشەبتا کە بەم نزیکانە دەبینین دێرێك دادەمەزرێنێ لە معلتا.

(٢) ـ دیندوایێ

بە چاودێر لە دێری بێت عاوی دامەزراوە لەلایەن یۆحەننان میترابۆلیتی هەولێر لە دوا رۆژ دا. رێورەسمی بۆ ئەم پایە لە نێوان سالآنی ٧١٤ و ٧٢٨ بۆ کراوە. میترابۆلیت یۆحەننان رەبەن دیندوایی هەلّبژارد تا ببێت بە مەترانی حنیتا و معلتا.

پیاوێکی قەدیس و بە هەیبەت بوو([٧٥٨]).

پێش مردنی وەسیەتی کرد پەرتووکەکانی مولّکی دێرە رەسەنەکەی خۆی بێ و لەوێش نێژراوە.

(٣) ـ سەرکیس

خەلیفەی پێش خۆیەتی و لە رەبەنەکانی(بێت عاوی) یە و بوو بە مەتران. دوای ئەوەی لەلایەن میترابۆلیت ئەحە دیاری کرا(رەسامەتی لە نێوان سالّی ٧٤١ ـ ٧٥١) بۆ کراوە([٧٥٩]).

لە ئەبرەشیەکەی خۆی رایکرد بە هۆی ئەو هێرشەی دێلمیەکان کردیانە سەر سالاخ و حنیتا(کەواتە لە تەك یەکتری بوون) بە مەبەستی تالآن و برۆ، سەرکیس کۆچی دوایی کرد لە ناو دێرەکەی خۆی لە بێت عاوی.

ئایا هەڵساوە بە دامەزراندنی دێرێك لە حدیاب؟
سەرکیسێك هەیە لە حنیتا ناوی لە لیستی دامەزرانـدنی دێرەکـان دا هاتووە لـە ناوچـەکەدا. وە ئاهــەنگیان بــۆ یادکردنــەوە دەکرێــت لــە رۆژی هــەینی پێنجــەم لــە(حەفتانــە) بــۆ پیرۆزکردنی کەنیسە.
(٤) - رۆستەم
بەناوبانگترین میترابۆلیتی بێگانەی حدیابە([٦٠]).
رکابەری پـەتریك ئیشـۆعیاب بـووە لـە سـەرەتای دانیشـتنی پـەتریك تیماتیۆسـی یەکـەم لـە ساڵی ٧٩٠ دا.
رۆستەم مەترانی حنیتا بووە لە بنەڕەتدا. پێشتر ئاماژەمـان پـێ دا بـۆ ئـەو مردنـە خراپـەی کە بووە هـۆی دانـانی سـنوورێك بـۆ یـاخیبوون و لـە رێگـا دەرچـوونیەوە. دوای سـەرکەوتنی تیماتیۆسـی یەکـەم بـە سـەر ئـەو بێگانەیـە، نـازانین ئایـا دەیویسـت ئەبرەشـیەی رۆسـتەم لابەرێت لە ناو لیستی ئەبرەشیەکان؟
ئــەوەی دەیــزانین بــە دڵنیایــەوە ئەوەیــە یەکگرتنــەوەی هــەر دوو کورسـیەکانی حنیتـا و حیۆتـۆن. کـە دەبیـنـین مـەتران داود لـە سـاڵی ٧٩٠ واژووی دەکـات لـە ژێـر نـاوی هـەر دوو ئەبرەشیەکان دا([٦١]).
لـە هـەمان سەرچـاوە دەبیـنـین مـەترانێك هەیـە بـۆ ئەبرەشـیەی حنیتـا بـەس لـە سـەدەی چواردەهەم.
(٥) - عەودیشۆع
یەکێك لە پاڵەوانەکانی ناخۆشیەکانی هەولێر ساڵی ١٣١٠. یەکێك بووە لـە ئەنـدامانی شـاندی گفتوگۆکردن کـردن بـووە دەربـارەی چـۆڵکردنی قـەڵا(٨٠١). هـەروەها لـە سـاڵی ١٣١٨ ئەنـدام بـووە لـە کۆمکـاری تیماتیۆسـی دووەم([٦٢]). لیسـتی عەدیشـوعی نسـێبینی([٦٣]). ئـەم جـارە جەخت دەکاتـەوە لـەو ماوەیـەدا ناونیشانەکە بـووە(نـاو) ی حنیتـا بـە جیاکردنـەوە لەگـەڵ حیۆتۆن.
١٠ - ئەبرەشیەی معلتای زاب
پێش هەموو شتێك پێویستە ئەوە روون بکەینەوە کەوا دوو ناوچە هەیـە بـە زمـانی کلـدانی پێیان دەڵێین(معلتا) یان(معلسا) و لـە عـەرەبی(معلثایـا ، یـان معلثـا) ئـەوەی جێگـەی

سەرسوڕمانە زیاتر لە دوو ناوچە نیە، لەبەر ئەوەی ئەم تاکە واتای ناوی رەگەز بە واتای(گەروو) یان(دەربەند).

کەواتە لەوانەیە بەکاربهێنرێت بۆ باسکردنی هەر دەربەندێکی سروشتی ـ لە نێوان دوو چیا ـ بۆ نموونە: بەرامبەرەکەی بە زمانی کوردی(دەربەند) ە.

بە دڵنیاییەوە ئەو معلتایەی بەناوبانگە ئەوەیە کە لە نزیک دهۆك دایە کە دەربەندێك دروست دەکات بۆ بەیەکگەیاندنی هەر دوو کەرتی(بانوهەدار) و(داسن)([٦٤]).

ئەو دەربەندە دەچێتە ناو ئەو رێگەیەی بە سەر رێرەوی ئاوی زێی گەورە کە لە ناوچە چیاییەکان دا دێت، ئەگەرچی جوگرافی ناسەکان دەڵێن کەوا مەعلتا ناکەوێتە باشووری حیۆتۆن([٦٥]).

ئەمە دەمانخاتە گومانەوە بۆ ئەو بانگەوازە مادام جمك بووە لەگەڵ حنیتا([٦٦]).

وە پێیوە بەستراوە. ئەو خشتەیەی پێشتان بەستنەوە و پەیوەندی نێوان ئەو ناوچانەی کە باسمان کرد روون دەکاتەوە:

مەرگە(المرج)/ بێت بەگاش

حیۆتۆن

حنیتا

معلتا

تاکی بەرامبەر بۆ تاکی کلدانی بە زمانی عەرەبی(معلة) بە یەك جیاوازی دیاری دەکرێت بە زیادکردنی خاڵ و جوڵەی زمانەوانی رەنگە ببێتە(مغلة)([٦٧]).

دوای ئەمە سوپای موسڵمانەکان ناوچەکەی داگیر کرد بە سەرۆکایەتی(عوتبەی کوڕی فرقد) لە ساڵی ٢٠ ی کۆچی ـ ٦٤١ ز.

کەواتە ئەو ناوچانەی کە بە هەمان ناو ناویان دەبەن ـ معلتا ـ دەتوانین شوێنەکانیان بە ئاسانی بدۆزینەوە. بەڵام لەبەر نەبوونی وردەکاری لە دیاریکردنی جوگرافی، زانیاریەکانمان زۆر کەمە با بزانین مێژوونووسەکان و دانەرەکان لە سەر کامیان دەدوێن لە دەقەکانیان کە تۆماریان کردوون. ئەوەی دەیزانین دەستکەوتنمانە لە نەخشەی فراوانی یەعقوبیەکان، بە تایبەتی لە سەرەتای سەدەی حەوتەم، دەتوانین بڵێین مەترانیەی یەعقوبیەکان لە معلتا هەبوو لە ناوچەی دهۆك کە لە کاتی خۆی باسی دەکەین. ئێستا باسی معلتای زابی نەستۆری دەکەین و بەس.

**لیستی مەترانەکانی معلتا**

**دوای ئـەوەی بـاری جـوگرافی شـوێنەکە بـە تـەواوی دیـار دەکـەین هەسـت بـە دڵتەنگیـەك دەکەین کاتێك دەمانـەوێت لیسـتی مەترانـەکانی تایبـەت بـەو شـوێنەی پێـی دەڵـێن مـەعلتا روون بکەینەوە.**

**ئەوەی پەیوەندی بە معلتای زاب هەیە، بە دڵنیاییەوە دەڵێین چوار مەتران و ئەمانە: (دیندوایێ و سەرکیس) لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهـەم. کە نازنـاوی مـەترانی حنیتـا هەڵـدەگرن، ئـەوان هـەروەها بـە دڵنیاییـەوە هـەڵگری نازنـاوی معلتـای زابـن، ئەمـە بـە پێچەوانەی دوو مەترانەکەی تر:(عـەود یشوّع)(سـاڵی ٩٦٣)(یاوالاهـا)(تـاوەکو سـاڵی ٩٩٥) کە هەڵگری نازناوی(معلتا و بانۆهەدار) ن بە یەکەوە.**

**کەواتە لە سەرمانە بیانخەینە ناو لیستی مەترانەکانی معلتای دهۆك. دیـاریکردنی معلتـا کە ئەو دوو مەترانەی دواییان بۆ دەگەڕێتەوە، وەستاوەتە سەر ئـەوەی بوارمـان بـۆ دەرەخسێت بە رێکەوت و ئەگەرەوە بەس بەبێ دڵنیابوون(٧٦٨).**

**ئەگەرێکی گەورە هەیـە، تـا ئـەو سـێ مەترانـەی خـوارەوە تەنسیب بکـەین بـۆ معـەلتای زاب ناوەکانیـان: یۆحـەننان(لـە سـاڵی ٤٩٧)(٧٦٩). برشـەبتا(لـە سـاڵی ٥٧٦ ـ ٤٨٥)(٧٧٠). دواتـر کلیـل ئیشوّع(لە ساڵی ٦٠٥)(٧٧١).**

**ئێمـە دەربارەیـان دەخوێنینـەوە کـەوا بەشـداریان کـرد لـە هـەمان کۆمکاری بـەتریکی کـەوا مەترانەکانی بانۆهەدار بەشدارییان تێدا کرد.**

**هەرچۆنێك بێـت، ئەگـەر ئـەو بەڵگانـە بۆمـان جێبـەجێ بکـرێن کـەوا بانۆهـەدار و معلتـای دهۆك دوو ئەبرەشیەی سەربەخۆن و لێك جیاوازن بـە هـۆی بارودۆخیانـەوە، بـەڵام واقیعـی حاڵ دژی ئەو ئەگەرەیە.**

**لایـەنی دووەم پێویسـتە ئـەو تێبینیـە بکـەین، ئـەو مەترانانـەی نازنـاوی مـەترانی معلتایـان وەرگرتـووە و دواتـر دەگوازرێنـەوە بـۆ نەینـەواو موسـڵ، چانسـیان باشـترە بـۆ ئـەوەی پـێش گواستنەوە مەترانی کورسی معلتای دهۆك بـن: ئەمـە لـە سـەر(یزدبنـە) جێبـەجێ دەبـێ لە مـاوەی نێـوان سـاڵانی ٥٥٤ ـ ٥٧٦، بـە مـەرجێك ئەمـە خـۆی بێـت(؟)(٧٧٢). یاوالاهـا لـە سـاڵی ١٠٦٢(٧٧٣). دواتر مەتران مالاها کە لە دوای ئەو هاتووە(٧٧٤).**

بەلاّم بە پێی ئەو رێسایەی کەوا باوە لە هەندێك فەرمانگەی دیبلۆماسیدا ئامانج فەرمانبەرەکانە کە هەردەم دەمێنێتەوە لە ناوچەی کارەکانیان کە لە هەمان ناوچە و هەرێمدان کە کاریان تێدا کردووە.
دەبینین کەوا ئەو رێسایە لە کولتووری نەستۆریدا پەیرەو نەکراوە.
ئێستا پرسیارەکەمان ئەوەیە، چی دەربارەی ئەو مەترانانە بڵێین کەوا هیچ زانیاریەکی ئەوتۆمان لە بەردەست دا نیە تەنها کەمێك نەبێت، بۆ نموونە:
ئەوان ئامادەی کۆمکاری فلاّنە و فیسار بوون، یان رەسامەتیان بۆ کراوە لە سەر دەستی بەتریك فلاّن؟
ئەم بارە لە سەر مەتران شەمعون جێبەجێ دەکرێت لە ساڵی ٥٥٤([٧٧٥]).
مەتران یۆحەننان کەوا رەسامەتی بۆ کراوە لە نێوان ساڵانی ١٠٧٥ ـ ١٠٩٠([٧٧٦]).
مەتران قریاقۆس لە ساڵی ١٠٩٢([٧٧٧]).
مەتران گۆرگیس لە ساڵی ١٢٨٣ بە کردەوە ئەستەمە بتوانین لیستێك رێکبخەین بە ناوی مەترانەکانی معلتای زاب و معلتای دهۆك، بە هۆی تێکەلاّوکردن و ژاوە ژاو و نەبوونی رێکخستن لە ناویاندا.
ئێستا بارەکە درەنگە و لە بار نیە بۆ هیچ کارێك. ئێمە دلگرانین کە نەمانتوانی لاسایی هاورێمان بە توانا و دلفراوان و چاك قەشە(میشیل لی کن) Miocllequien Quien بکەین و دەڵێین بە بێ سێ و دوو کەوا معلتا دراوسێی نۆهەدار و حنیتا بووە. ئەم قسە و باسە بە دڵنیاییەوە هاسانترە بەلاّم مومکین نیە. هەر دوو ئەو شوێنانە باسیان نەهاتووە: معلتای زاب یان معلتای بانۆهەدار لە لیستی ئەبرەشیەکانی نەستۆری کە(عەودیشۆع) نسێبینی رێکیخستووە([٧٧٨]). لە سەرەتای سەدەی چواردەهەم.
١١ ـ دێری برشەبتا
لە بەختی چاکەوە، چیرۆکی برشەبتا کەوا دێرەکەی لە خاکی(معلتا) یە دامەزراندووە پێدەچێت ئالۆزی کەمترە، بە پێی مێژووی سعردی([٧٧٩]).
دامەزراندنی دێرەکەی لە زەوی معلتایا بووە، بەلاّم لە دەقەکانی پەرتووکی(العفة) دەڵێ کەوا شوێنی ئەو دێرە لە معلتا و حنیتایە([٧٨٠]).
ئەو شوێنە وەك دەردەکەوێ زەحمەتی تێدایە لە کاتی خوێندنەوەمان بۆ دەقەکە کە دەڵێ:(ئیشۆع دناح) وتی: برشەبتا بۆ یەکەم جار چوو بۆ ئەوەی ببێت بە سەرۆکی دێری

زێی بچوك لە جیاتی مارزینای دواتر دێرێکی تایبەتی بە خۆی دامەزراند بەڵام لە وەرگێڕانە فەرەنسیەکە بۆ مێژووی سعردی دەخوێنینەوە کەوا زینای پێش کۆچی دوایی کردنی بەڵێن بە قوتابیەکی خۆی برشەبتا دابوو کە پێشتریش دێرێکی دامەزراند لە خاکی معلتایا.

بەختی باش بووە، کەوا ئەو جیاوازیەی کە هەیە لە دەقە عەرەبیەکە بەتەواوی لەناو چووە و بزرە. دەقە عەرەبیەکە ئەو سوودەمان پێ دەدات:(بەڵێنی دابوو دێرەکەی بداتە قوتابیەکەی، رەبەن برشەبتا، کە دواتر دێرێك دادەمەزرێنێ.. ) کەواتە ژیاننامەی زینای لە سەردەمی بەتریك(سۆر یشوع) بووە(٥٩٦ ـ ٦٠٤)([٧٨١]).

کەواتەدامەزراندنی دێرەکە لە سەر دەستی برشەبتا بوو لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەوتەم. ئەو کاتە پرسیار دەکەین: چ پێویست دەکات بۆ بەستنەوەی پێناسە و ناسنامەی برشەبتا بە مەترانی حنیتا، بۆ زانیاری ناوی شەبتا پێوەرە بۆ ناوێکی بەناوبانگ و دیار لە ناو رەبەنەکاندا([٧٨٢]).

ئەو ناوچەیەی کە پێی دەڵێن(معلتا ـ حنیتا) باسکراوە وەك نیشتمانی رەسەنی رەبەن قەرەداخ. کە بە خزمایەتی دەگاتە باوای گەورە ساڵی ٦٢٨.

گوندەکەی پێی دەوترا(بێت عەرەبایێ)([٧٨٣]).

لەو گوندە قوتابخانەیەك هەبوو پەرتووکی پیرۆزی تێدا دەخوێندراو شرۆڤەیان دەکرد. مەترانی حنیتا ناسراو بە برشەبتا قەرەداخی دامەزراند بە سەرۆکی دێر نە ناوی دێرەکە و نە شوێنەکەی باس نەکراوە.

١٢ ـ بێت قرتوایێ ـ قوردایێ ـ کوردایێ

بێت قرتوایێ ـ قوردایێ ـ کوردایێ واتە وڵاتی کوردان، بەڵام دیاری نەکردووە بە زەویەکانی رۆژئاوای زێی بچوك، هەروەك پێشتر بۆدج ویستوویەتی([٧٨٤]).

(وڵاتی کوردان لە سنووری شاخەکانی حەمرینەوە بەرەو باکوور دەگرێتەوە کە پێی دەڵێن کوردستان ـ وەرگێڕ).

شوێنەکەی حدیاب و باکووری حدیاب دیاری دەکات، مێژووی رەبەنەکان ئەو کاتە باسی کورد دەکەن کە دووچاری هەژاری و نەداری دەبن. هەروەها باسی ئەوانە دەکات کە شەرکەری بەتوانا بوون و چوست و جەسوور بوون، لە ناوچەکە زۆر بە خێرایی ژمارەیان زۆر دەبێ و تێیدا نیشتەجێ دەبن بە تایبەتی ئەو ناوچانەی کە دەکەونە دەوروبەری دێری

بێت عاوی([785]). و بێت بەگاش([786]). گوندەکانی مەسیحی بڵاوبوونەتەوە لە ناو گوندەکانی کوردەکان و جێگیرن و پشتگیری دەکرێن. هەر وەك قەشە عەو یشۆع نووسیویەتی: کە کوڕی رەسەنی ناوچەکەیە، و لە بێت قوقا پەروەردە بووە. نازناوی کوردی هەڵگرتووە. واتە(عەودیشۆعی کوردی)([787]).

واتە دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی کوردان ـ کوردستان ـ وەرگێڕ).

هەروەها نیشانەیەکی دیکەش هەیە بۆ ئەو نازناوەی مەتران کلیل ئیشۆع ناسراو بە(کلیل ئیشۆع لە کوردستان) کە ئامادەی کۆمکاری بەتریکی بووە کە لەلایەن ئیشۆعیابی یەکەم لە ساڵی ٥٨٥) بەستراوە، هەروەها(داود) نازناوەکەی(کوردی) ـ قوردایيە([788]).

دانەری پەرتووکی(الفردوس الصغیر)(بەهەشتی بچوك)، کە ژیاوە لە سەردەمی تیماتیۆسی یەکەم(٧٨٠ ـ ٨٢٣) لە کاتی لێکۆڵینەوە لە سەر یەکەم مەترانی وڵاتی کوردان، دەبینین ئەو ئەبرەشیەی تایبەت بەو وڵاتە سەرەتا یەکگرتوو بوو لەگەڵ ئەبرەشیەی وڵاتی تیۆس(کە پێیان دەوت(بێت تبیاتا ـ بێت تبیاسا))([789]).(بێت: بە مانای ناوچە دێت ـ وەرگێڕ).

بە هەر دووکیان شوانێکیان هەبوو. ناوەکان ئاماژە بە چیا دەکەن بەڵام بە شێوەی شیعر هەورەها هەر دووکیان یارمەتیمان نادەن بۆ دیاریکردنی نەخشەی ناوچەکە و ئەو شوێنانەی دەکەونە سەری بە وردیەوە.

( ٦ )

## پاشماوەکان( پچڕپچڕەکان )

لەم پاشکۆیەدا هەندێك لە ناوی شوێنەکان کۆدەکەینەوە کە نازانین دەکەونە کوێ ئەگەر بە شێوەیەکی نزیکیش بێت لە شوێنەکە، ئەوەی دەیزانین تەنها ئەوەیە زۆربەیان دەکەونە جێگەیەك لە حدیابدا.

### گردی دارا( تل دارا )

لەم گوندە دا فەرمانی مردن بە سەر قەشە یەعقوب و خوشکەکەی ماری جێبەجێکرا لە ساڵی ٣٤٧ هۆفمان([٧٩٠]). جێگەی شوێنەکەی لە دارا دیاری دەکات کە دەکەوێتە سەر زێی بچوك لە هەرێمی بێت گەرمای، گەرمیان. پێرستی رەها([٧٩١]). جەخت لەوە دەکاتەوە کەوا شوێنەکە دەکەوێتە حدیاب، بەلام(بەرتووکی کردەوەکان) شوێنەکە دەخاتە سەر زێی گەورە ئەگەر ئەو زانیاریە بە واتای ورد وەرگرین ناتوانین شوێنەکە بدۆزینەوە و بزانین کەوا لە(دارای شمشاتی) یە. کەوا(دێری ئەبیشبیرماخ) نزیك لە دێری بێت قوقایە کە دەکەوێتە دووری پێنج کیلۆمەتر لە رۆژهەلاتی زێی گەورە.

پێویستە لە سەرەمان لە شوێنێکی تردا لە دوای بگەڕێین.

### گردی شاریلا( تل شاریلا )

ئەو قەشە یەعقوبەی کە لە پێشەوە ئاماژەمان پێی دا خۆی بەرپرسیاری ئەو گوندە بوو، نازانین ئایا ئەو گوندە دوورە یان نزیکە لە شوێنی سەپاندنی فەرمانی مردن بە سەریدا واتە(گردی دارا).

### مەتران لە ناوچەی زاب؟

دەقە عەرەبیەکەی Opus Chronologicum ی ئیلیای نسێبینی([٧٩٢]).

باسی کەسێکمان بۆ دەکات ناوی یۆنان بووە کاندید کراوە بۆ ئەوەی ببێت بە بەتریك لە ساڵی ٩٠٠. هەروەها دەڵێ ئەو یۆنانە مەترانی زاب بووە،(ئەسقەف زاب). لە راستیدا ئەو وەرگێرانەی کە لەلایەن Brooks تەواو بووە([٧٩٣]).

بە پێی دەقە کلدانیەکە ئەو بە تەواوی: (مەتران زابی) دەقە عەرەبیەکەی نووسراوە دەخوێندرێتەوە(الزوابی) لە تواناماندایە بۆ خۆمان جەخت لەوە بکەینەوە کەواتە ئەگەر

پێداچوونەوە بەو بڕگەیەی کە ماری نووسیویەتی([٧٩٤]). کە بەم شێوەیەی نووسیوە Episcopus Zawabiae ئەبرەشیەی زابی([٧٩٥]).
دەروانیتە ئەو هەرێمەی دەکەویتە بەری ڕۆژئاوای دیجلە کە دەکەوێتە نێوان سلۆقیا و کشکەر. ئەم ناوچەیە بەناوبانگە بە زۆری جۆگە و جۆگەلەی ئاودێری و بەکارهێنانی بۆ ئاودێری. ئەمانە ئەو ناوەیان بەخشیە زەوابی([٧٩٦]).

## گردی نیاحا ـ تل نیاحا

گوندێکە لە گوندەکانی حدیاب بۆ چەند جارێك ناوی لە مێژووی هەولێر دووبارە کراوەتەوە لە سەر دەستی مەترانی حدیاب(شحلوبا)(٢٥٨ ـ ٢٧٣)(؟) هاتوونەتە سەر دینی مەسیحی و باوەڕیان هێناوە بەهۆی ئەوەی شیفای بۆ یەکێك لە کەسایەتیەکانی ئەو گوندە هێناوە کە ناوی نکیحا بووە([٧٩٧]).
لە نەخۆشی سك چوون. تێدا فەرمانی مردن جێبەجێکرا لە ساڵی ٣٤٤([٧٩٨]). بە سەر مەتران ئەبراهام، هەروەها بە سەر مەترانی(اربیل) هەولێر ژمارە ـ ٢٠) کە ناوی(حەننانا) بوو ساڵی ٥١١ مار حەننا کوڕی ئەو گوندە بوو بە پێی مێژووی ئەربیل([٧٩٩]).
ئەوەی جێی داخە نەمانتوانیوە لێکۆڵینە لە سەر ئەو هەموو شەهیدانە بکەین.

## زایرا

لە مێژووی ئەربیل باسی ئەم گوندە کراوە و ئاماژەی پێ کراوە(٨٤٣) کەوا گوندی مەتران هاویل رەسەن بووە. هاوێل شەشەم مەترانی حدیاب بووە لە ساڵی ١٨٣ ـ ١٩٠(؟).
مەسیحیەت چووە ناخیەوە لە تەمەنی منداڵی ئەو مەترانە بەرێزە(منکنا) باسی ئەو شوێنە دەکات کەوا ڕۆژە ڕێیەك بە پیادە دوورە لە ئەربیل بە ئاڕاستەی باکووری خۆرهەڵاتیەوە، رەنگە ئەو گوندەی منکنا ئاماژەی پێداوە ئەو گوندە بێت کە پێی دەڵێن زیرتا کە دەکەوێتە خوار(سەلاحەدین)، بەڵام پێدەچێت کە ناوە نوێیەکەی ئەو گوندە لە رەگەکانی تر بێ.

## کاشاز

گوندی کچە شەهید تەقلاو هاوڕێکانیەتی(دەستە خوشکەکانی) قەشەی گوندەکە ناوی پۆڵس بووە([٨٠٠]). لە ئاینی مەسیحی هەڵگەڕاوە.

## بێت تەباحا ـ بێت تیباحا

پێشتر شارۆچکەیەك هەبووە لە نزیك هەولێر بەم ناوەوە. فەرمانی جێبەجێکردنی شەهید نەسبسیماس لێدەرکرا لەگەڵ هاورێکانی بە پێی رای قەشە بیترس([801]).
پێدەچێت ناوەکە لە سەر ئەو بنەمایە داندراوە کە بە مانای قەسابخانە دێت. ناوێکی لەبارە و لەگەڵ واقیعەکە دا گونجاوە.

## قەلای بەدیکار ـ قلعە بدیکار

لەم گوندە بەندکردنی هەر دوو شەهید حەنا و یەعقوب لە دەوروبەری ساڵی ٣٤٤ کرا. قەشە بیترس وای بۆ دەچێت([802]). کەوا لە توانامانداییە ئەوە بدۆزینەوە کەوا ناوی(بدیکار) شێوێندراوە بۆ ناوێکی رەسەن کە(بات ـ ئی ـ کار)(یان بەدکار) ـ وەرگێڕ.
شەهیدەکان لەم گوندە بەندکراون لە کۆشکی حاکمی دەسەلاتدار بە سەر ئەو چیایە.
ئەسبەرکلتا و بێت نگاری
ئەمانە دوو شارۆچکەن ناویان لە چیرۆکی ئازار و ئەشکەنجەدانی یەعقوب بو ئازاد دا هاتووە([803]). هیچ جارێکی تر ناویان دووبارە نەکراوەتەوە تەنها لەم چیرۆکە نەبێت.

## مشکلیك، کلك مشك، مشکە کلك

کلك مشك، ئەمە ناوی گوندێکە(دەکەوێتە نزیك ئەربیل)(ئێستا گەڕەکێکی شاری هەولێرە ـ وەرگێڕ).
دەربارەی دەخوێنین: شەماسێکی تێدا بووە و ئاینەکەی خۆی گۆڕیوە و بۆتە موسڵمان بەڵام مێژووی ئەو رووداوە نازانین(عۆنیسایەك هەیە) واتە لێرەدا گۆرانیەك هەیە، سرودێکی سروتەکان ، گۆرانیەکی میللی تۆمارکراوە لە دەستنووسێك دا([804]).
دانەیەکی هەیە چاپکراوە لەگەڵ وەرگێڕانە ئەڵمانیەکەی([805]).
ئەم عۆنیتایەی باس کراوە بریتیە لە چیرۆکێکی کۆتایی لە دەستنووسەکەدا باس لە چۆنیەتی رووداوەکە دەکات، ناونیشانەکەی لە دەستنووسێکەوە لەگەڵ ئەوی تر جیاوازە. لە هەندێکیاندا بۆ نموونە دەستنووسی کەرملێس بە ناوی(وەردە) یە ساڵی ١٧٤٥ و ناوی گوندەکەی نەهێناوە. بەڵام قەسیدەکە بۆ وەردە دەگەڕێتەوە، واتە دانەرەکەیەتی. لە دەقەکانی تردا ناوی دانەرەکە خەملێندراوە بە خەملاندن بە هۆی ئەوەی ناوەکەی بە روون و ئاشکرا نەهاتووە ناوی وەردە بە تەواوی لە بیر کراوە. ئەوەی هاتووە: کۆکراوەتەوە و جێبەجێکراوە بۆ پەرتووکخانەی(دیر السیدة حافظة الزروع) بە فەرمانی(قەشە

شموئیل جەمیل)(ئەم دێرە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی شارۆچکەی ئەلقوش و ناسراوە بە دێری سیدە ـ و نزیك بە دێری رەبەن هورمز ـ وەرگێڕ).
مادام چامەکە دەگەڕێتەوە بۆ وەردە ئەربیلی ئەمە کارێکی ئەستەم نیە تەنها ئەگەر دەقەکە بدۆزیتەوە و لە دەستنووسێکی کۆنتر لە سەدەی سێزدەهەم. بە پێی ئەوەی هەیە کۆنترین دەستنووس ئەو دەقەی تێدایە دەستنووسەکەی فاتیکانە لە ژێر ژمارەی ۱۸۸ هەروەك سەمعانی ئاماژەی پێ داوە و مێژووەکەی دیاری کردووە لە دوای ساڵی ۹۵۰. ئەگەر وا دابنێین کەوا چامەکە لە دانانی وەردەیە کەواتە دەبێ کۆکردنەوەی دەقەکان پێویستە بگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێزدەهەم. جگە لە ناوی شەماشە ئەبراهام کە بە رازاندنەوەی شیعر دەردەکەوێت(رازاندنەوە ـ نیگار) پێکدادانی دێرە شیعرەکانە ئەگەر پیتە یەکەمەکان کۆبکەینەوە ناوی دانەرەکە دەردەچێت یان ئەو کەسەی پێشکەشی کراوە ئاماژە بۆ هێمایە(وەرگێڕ).
دوای ئەوەی پیتە یەکەمەکانی دێرەکە کۆدەکەینەوە سەرەڕای هەندێك زانیاری لە سەر خێزانەکەی، چامەکە زۆر بە وردی لە سەر رووداوەکە نەدواوە. هەندێك بۆیان باس کردم کەوا گوندێکی بچوك هەیە دەکەوێتە نزیك ئەربیل لە بەری رۆژئاوایە ناوی کلك مشکە؟ تاوەرێکی لێیە نەخشەکانی هەیە ئاماژەیان پێی نەداوە.

## بێت قواز ، قەواز

بێت قواز ناوی گوندێکە دەکەوێتە سەر زێی گەورە بەڵام نازانین دەکەوێتە کام بەری زێ یان ئایا دەکەوێتە کەرتی حدیاب یان دەکەوێتە کەرتی مەرگە. یەکێك لە باوەڕدارانی ئەو گوندە دوو کوڕی هەبووە شەیتان سواری سەر سەریان بووە شیفای بۆ کردن و چاك بوونەوە([٨٠٦]). لەلایەن سەرۆکی دێری بەرازی ئەو کات.

## ئەشکەوتی مارئەحا

یەکێك لەوانەیە کەوا لە وڵاتی یۆنان هاتووە، مەتران بووە و لە رەبەنە گەورە و چاکەکان بووە، هۆی هاتنی لە ترسی چەوساندنەوە لەلایەن ئیمپراتۆری رۆمانی ڤالانس (٣٦٤ ـ ٣٧٨) رای کردووە. مارئەحا لە ئەشکەوتێکی بچوك نیشتەجێ بووە کە دەکەوێتە چیای نزیك زاب([٨٠٧]). نیشتەجێبوونی لەو ناوچەیە گیانی هێمنی و جەسووری لە دڵ و دەروونی

خەڵکی ناوچەکە زیندوو کردۆتەوە. هیچ ئاماژەیەك بۆ شوێنی ئەم ئەشکەوتە نەدراوە، لە بەر ئەوە نازانین ئایا دەکەوێتە حدیاب یان دەکەوێتە مەرگە.

## دۆڵی سافی ـ صافی

لە سەدەی هەشتەم و لە رۆژانی مارگبرئیل سەرۆکی دێری مارسیبریان هەبوو بە ناوی(قبریانس) پیاوێکی لە خوا ترس لە ناو خەڵوەتگەیەك دەژیا دەکەوێتە دۆڵی سافی([408]). ناوی(بسیۆن) بوو پێشتر ناومان هێناوە کە دەکەوێتە نزیك بە یەك گەیشتنی رووباری زاب بە خازر ناوی(سفایا) یە نزیکی لێکچوونی ئەو دوو ناوە سافی و سوفیا رەنگە لابەلا بێ. دوای کۆچی دوایی کردنی ئەو پیاوە گەورەیە، خەڵکی گوندی(رێشا) هەڵسان بە گواستنەوەی جەستەکەی بۆ گوندەکەی خۆیان بۆ ناشتن لەوێدا ئەمە و هیچ زانیاریەکی ترمان لا نیە.

## قەشە مشیحارەحیمە

بە دڵنیاییەوە لە حدیاب ژیاوە، بەڵام نازانین بە تەواوی لە کوێ بە تەواوی ئەم رەبەنە پیاوێکی خودا ناس و مەزن بوو، بە نوێژەکانی مەترانی ئەربیل شفای بۆ هات و چاك بۆوە(مەتران عەبووشتا) لە نەخۆشیەکەی. ئەمە لە دەوروبەری ساڵی ٤٨٦ (؟). مێژووی ئەربیل([409]).

تاکە سەرچاوەیە کە باس لەو پیاوە قەدیسە دەکات بەڵام بێ ئاماژە دان بە درێژی و چونیەتی کۆتایی هاتنی داب و نەریتە خۆجێییەکان باس لە چیرۆك و گێڕانەوەی دەکەن بەڵام رەنگە بتوانین شوێنەوارە راستەکان بدۆزینەوە.

## ناوچەی بێت ئەروعێ

رەنگە پرسیار بکەین شوێنی ناوچەی بێت ئەروعێ دەکەوێتە کوێ([410]).

کە خەڵکی ئەروعاتیای نیشتەجێ بوون([411]).

کە هاوکاری(شەهریکانیان) کردووە لە ساڵی ٧٨٠ و رەتکردنەوەی میتراپۆلیت ئیشۆعیابیان کردووە؟

ئەوەی کە لە سەر ئەو ناوچەیەی دەزانین رەنگە ئەوە شوێنی بێت جا چ لەلای باشوور یان لە رۆژئاوای حدیاب، بە پێی ئەوەی کەوا لە لای رۆژهەڵاتیدا(بانی قای) تێدا نیشتەجێ بوونە، و لەلای باکووری چیای حدیابە کە خەڵکەکە بە وەفاو پشتگیری... میتراپۆلیت بوون.

کاتێك واتای وشەی(ئەروعێ) بە(شوێنی بە یەکگەیشتن یان دوو ریان) دا دەنێین، ئەو کات دەتوانین باس لە خزمایەتی بکەین کەوا قەشە بیترس پێشنیاری کردووە([813]).
لە نێوان ئەو واتایە و نێوان ناوی(قەسر قەرەداخ) کۆشکی قەرەداخ لە چیرۆکی ژیانیدا کەوا لەلایەن باوەڕدارانیەوە دەوترێ. بە تەئکید ئەوەمان بە بیر دێتەوە کەوا چۆن زانا و مێژوونووسی ژیاننامەی قەدیسەکان باس لە تاکی الملتقی بە یەکگەیشتن دەکات.
دەڵێ واتای شوێنی بە یەکگەیشتنە، دوو ریانە، کاتێك دوو لێکدانەوە هەیە بۆ واتاکەی، هەوڵدان بۆ بەیککەیشتنیان بێهودە و بێبنەمایە، بەڵام نابێت هیچ یەکێکیان پەراوێز بخەین.
مادام پەیوەندیەکە هەیە، واتە چەند دووریانێك هەیە پێویستە بەدوایاندا بگەڕێین بۆ ئەوەی بمانگەیەنێتە کۆشکی قەرەداخی یەکەم و پێش ئەوەی شوێنی بێت ئەروعێ دیاری بکەین.

## دێری عەود یشۆع

بە پێی رۆژمێری فەرمی کەنیسەی نەستۆری لە سەرووی لیستی ناوەکانی دامەزرێنەری دێرەکاندایە لە حدیاب ناوی(مارعەودیشۆ)ە رەنگە هۆکارەکەشی ئەوە بێت لە هەموویان ناودارتر بووە. بەڵام من تا ئێستا نازانم ئەو دێرە دەکەوێتە کوێ؟ و نازانم ئایا هەبووە یان نا؟ رەنگە بپرسم ئایا(مارقەرەداخ) ە؟([813]).
ژیاننامەی قەدیسەکان ئەوەی زۆر گەشەی کردووە شوێنەواری ئەو قەدیسەی لە دەست داوە بە تایبەتی لە ماوەی کە(مەرزەبان) باوەڕی هێنا(قەرەداغ) و هەروەها باس لە دامەزراندنی دێر ناکات.
هەروەها یەکێك نیە لە پەرستەکانی عیسا کە ژمارەیان زۆرە(وەرگێران بۆ ناوی عەودیەشۆع - لە شێوەی کۆ - وەرگێڕ)، کە لە ژیاننامەی قەدیسەکان دا تایبەت بە سریانەکان هاتووە کێ دێری لە حدیاب دامەزراندووە، لەبەر ئەو هۆیە بابەتی زانینی شوێنی ئەو جۆرە دێرەی(مارعەودیشۆ) و گەڕان و پشکنین بە دوای کەسایەتی دامەزرێنەرەکەی دەخرێتە بەر گفتوگۆ و باسکردن.

(٧)

# زانیاری گشتی

ئـــەو زانیاریانـــەی لەبـــەر دەســـتمان دایـــە ئـــەوەمان پـــێ دەبەخشـــن کـــەوا ناوچەی(نوهدرا)،(نۆهەدار) ناوچەیەکی کاکی بە کاکیە و زەویەکەی بە پیت و بەرەکەتە، بەلاّم ناوچەی مەرگە بەبەراورد لەگەڵ ناوچەی نۆهەدار دا ناوچەیەکی تەسك و تروسکە. بەلاّم بەبەراورد کردن لەگەڵ ناوچەکانی تردا دەبینین ناوچەیەکی چڕوپڕ و فراوان و زەویەکەشی بە پیتە و بەرهەمێکی زۆری هەیە. ئێستا هەوڵ دەدەین ئەم پرسیارە وەلاّم بدەینەوە: چی دەربارەی مەرگە دەزانین؟ کە پێشتر بەتریك تیماتۆسی یەکەم لە ساڵی ٨٠٠ باسی کردووە، هەروەك لە پێشتر باسمان کردووە؟ و بارودۆخی سروشتی چۆنە؟([٨١٤]).

## جوگرافیای ناوچەکە

هەرێمی مەرگە هەرێمێکی سنووردیار و ئاشکرایە، سنوورەکەی سروشتیە و ئاشکرایە. ئەو دەقانەی کە باسیان کردووە زۆرن و باوەڕ پێکراون. زانیاریەکانمان لە سەر ناوی هەرێمی مەرگە ئەوەیە وشەی(مەرگە) ناوێکی کلدانیە بە عەرەبی بە واتای(المرج) او(المرعی) دێت ـ واتە زەوی پڕ لەوەڕگا و بە پیت، لە رێگەی سروشتیەوە ئاو دەدرێت واتە دێمە تەنها بە باران.

هەرێمی مەرگەی فراوان زۆر ناسراوە لە سەرچاوە مەسیحییەکان دا بە تایبەتی لە پەرتووکی(الرؤساء)، کە لە لایەن تۆما مەرگەیی نووسراوە کە یەکێك لە مەترانەکان بووە لە سەر کورسی ئەبرەشیەی کەرتی(هەرێمی لە بیر کراو) مەرگە. ئەم مێژوو نووسە هەموو مێژووەکانی کۆکردۆتەوە بە تایبەتی ئەوانەی کەوا پەندی لێوەردەگیرێ و پەیوەندی هەیە بە پیاوە ناودارەکان کە مێژوو باسیان دەکات دوای دەرچوونیان لە دێری بێت عاوی بەناوبانگ.

زۆر جار ئەو مێژووە شێوێندراوە لە بەر زۆری باسکردنی جوگرافیای و مێژوویی کە زۆر جار پێویستی بە پاکۆکردن هەیە و لێکدانەوەی وردی دەوێت، ئینجا پشتی پێ ببەستری بۆ دیاریکردنی شوێنێك یان جەخت کردنەوە لە سەر جێگەیەك. پێشتر مێژوونووسەکانی عەرەب ئەو هەرێمەیان بە المرج ـ مەرگە ناوبردووە([٨١٥]).

بەلام بەستویانەتەوە بە ناوی(موسڵ) بەم شێوەیە هەرێمەکە لای ئەوان ناسراوە بە(مەرگەی موسڵ)، یان مەرگەی(ئەبی عوبەیدە). بۆ جیاکردنەوەی لەگەڵ هەرێمەکانی تر کە بە مەرگە ناویان نراوە. مێژوونووس(کانارد)، Canard هەڵساوە بە کۆکردنەوەی هەموو سەرچاوەکان کە مێژوونووسان بەکاریان هێناوە، و کردویەتیە ئامانجێك وەك دەرهاوێشتەیەکی ئامادە کراو لەلایانەوە و ئاخنیویەتیە ناو پەرتووکێك بە ناونیشانی(حەمدانیەکان) - حەمدانیەکانی سوریا(٨١٦).

سنووری هەرێمی(مەرگە) ئاشکرایە، هەروەك لە پێشەوە روونمان کردەوە شێوە ئەندازەییەکەی سێگۆشەیەکی دوو لا یەکسانە بە نزیکیەوە سەری دەکەوێتە لای باشوور ئەو لایەی لە باشوور - خۆرهەلاتی بەرەو باکوور - رۆژئاوای رووباری خازر پێکدەهێنێت و دەست پێدەکات بەرەو هەوارز لە خاڵی بە یەکگەیشتنی بە زێی گەورە و دواتر درێژ دەبێتەوە بە هێڵێکی نیمچە راست و رووباری کۆمەڵ پێکدێنێت، بەلام ئەو لایەی کە بەلای باشوور دایە - خۆرئاوا بەرەو باکوور - رۆژهەلاتی رووباری زێی گەورە پێکدێنێ. بەری دووەمیشی هەرێمی حدیابە.

سنووری باکوور بۆ باڵی سێیەم دیاری کراوە بە زنجیرە چیاکانی ئاکرێ و درێژبوونەوەی بەرەو خۆرئاوا.

لەو باسەدا بۆمان روونەبێتەوە کە ئەو هەرێمە هەموو مەرجەکان و خاسیەتەکانی و پێویستی هەیە بۆ ئەوەی بە هاسانی و روونی بناسرێت بەلام لە سەر ئەوەشەوە مێژوونووسەکان بە مێژوونووسە نوێیەکانیشەوە، یان دوا کەوتووەکان نەیاتنوانیوە پێناسەی ئەو هەرێمە بکەن(سێروالیس بودج) Sir E.Awallis Budge کە ئێمە قەرزاری چاکەی ئەوین لە وەرگێرانی پەرتووکی سەرۆکەکان، وەرگێرانێکی نیمچە تەواو و ورد. بەلام زانیارییەکانی لە سەر هەرێمەکە لە رووی جوگرافییەوە کەم و زۆر نیە(٨١٧).

نەخشەکانی تەنها داهێنانێکی خەیالیە و بەس. پێویستە سەرسام نەبین کاتێك یەکێك لە مێژوونووسەکان وەك قەشە Lequien کە لە نووسینەکانیدا پشتی بە نووسینی(سەمعانی) بەستووە، هیچ جیاوازیەك ناکات لە نێوان(مەرگە) و(مراغە). کە دەکەوێتە رۆژئاوای ئێران - ئازربێجان، سەرباری ئەوەی کە هەردوو ناوچە زۆر ناسراون(٨١٨).

پشکنینێك لە نووسینەکانی Lequien هەوڵی زۆر دەدات لیستی مەترانەکان رێکبخات واتە هەر دوو هەرێمەکە و دابەشکردنی ناوی مەترانەکان بە تایبەتی هەر لیستێك بە وردی و بە شێوەیەکی راست و دروست.

سەرباری تێبینیەکانمان پێویستە دان بەوە دابنێین کەوا بەختمان هەیە لەوەی مێژوونووسەکان نەکەونە گومانەوە و دانیان بەوە ناوە بە هەبوونی زۆر جێگە و شوێن. یان هەرێم پێی دەڵێن(مەرگە) و(مەراگا).
وە بەبێ ئەوەی ئەم واقیعە بیروڕایان بشێوێنێ و هەراو هۆریا لە نوسینەکانیان دەربکەوێ وای لێبکات دوورو درێژبێت، یا کەم تێبیگەین . روونکردنەوە و بۆ نموونە وە بە پێ تایبەتمەندی لە مانە : مەرگەی جوهەینە نزیك گوندێکی چوڵ بەو ناوەوە کە دەکەوێتە بەری رۆژئاوا لەسەر رووباری دیجلە باکوری گەیارە، دواتر مەرگە، ئەو مەرگەیەی دەکەوێتە(بێت عەرەبایێ) کە لە رەسەندا کێڵگەیەکی دەوڵەمەندی قەزبۆیە([819]). هەروەها گوندێك هەیە لە نزیك زاخۆ بە ناوی(مەرگە)([820]). وە هە روەها ناوچەیەکی مەرگەی کوردی هەیە دەکەوێتە سەر رووباری زێی بچوك لە باکوری خۆرئاوای شاری سلێمانی[821]().
دواتریش (مێرگەسوور) و Margana _ merge تاد.

ـ ناوچەی خۆرهەڵات، وەیا ئەوەی بە تەنها بە ناوی (مەرگە ) ناسراوە، سنوورەکەی زێی گەورە لە خۆرهەلات، خازر لە خۆرئاوا، زنجیرە چیایەکانی ئاکرێ لە باکور کە سووچە باشورەکەی لە کۆندا ناسرابوو بە(سەب سەبا ).
ـ ناوچەی خۆرئاوا، بە(بێرتا) ناودەبردرێ. لەو ناوچەیە دوو شاری کۆن هەبووە بەناوی(بیلاوتیلا) لەرووی کارگێریەوە دابەش بووە بۆ قەزای مەزوری و قەزای شێخان. بەڵام سنوورەکەی روباری خازرە لە خۆرهەڵات و روباری کۆمەڵ لە خۆرئاوا.
ـ ناوچەی دوو دۆڵکە کە یەکیان تەواوکەری ئەویتریانە بەوناوانە(نەهلە) وە(تەلانا) یەکەمیان دەکەوێتە خۆرهەلاتی خازر وە دووەمیان لە لای خۆرئاوایە. شوێنەکەیان لە پشت زنجیرە چیای ئاکرێیە بەرەو خۆرئاوا درێژدەبنەوە. لە سەرەتادا لە رووی کەنەسیەوە ئەو دوو دۆلە سەربە ناوچەی مەرگە بوون دواتر بە ناوچەی داسن. شوێنی ناوچەی(بێت رستاقا) کە(عێن سفنێ) و(خنس) دەگرێتەوە..هتد لە رووی جوگرافیەوە دەکەوێتە(بانوهەدار). بەلام لەرووی کارگێری کەنەسیەوە ئەو ناوچەیە بەستراوەتەوە بەکەرتی(مەرگە) وە. لێکۆلینەوەمان بۆ ئەو ناوچەیە لەگەل هەرێمە سروشتییەکەی بابەتی باسەکەمان دەبێت لەگەل هەرێمی(بانوهەدار).

## سەدەکانی یەکەمی مەسیحی

زانیاریمان لە سەر مێژووی گشتی مەسیحیەت لە هەرێمی مەرگە کەمە.بۆیە ئێمە بە تەواوی نازانین ناوی ئەو قوتابیەی کەوا مژدەی ئینجیلی گەیاندۆتە ئەو ناوچەیەوە هەروەها مێژووەکەی.لەگەل ئەوەشدا دەتوانین بڵێین کەوا مەسیحیەت زانراو ناسراو بووە لەو هەرێمە لە سەدەی چوارەمی زاینیی دا. ئەمە دەلێین بە پشت بەستن بە ئاماژەکردنێکی وە ها کە لەسەر شارێك هاتووە بە ناوی(قوب) ئەم ئاماژەکردنە ئەوەمان پێدەدا کە وا ئەو شارە تاوەکو سەدەی چوارەم ئەم موژدەیەی قەبوول نەکردووە([٨٢٢]).

وە هەروەها تێبینی ئەوە دەکەین لە هەندێك پەرتووکدا کە لەلایەن رەبەنەکاندا نوسراوە،کەوا چەند گوندێك هەبووە لە سەر بت پەرستی خۆی ماوەتەوە، کە تاوەکو ئیستاش لێرە و لەوێ بلاوبۆتەوە، تاوەکو سەدەی شەشەمی زاینیی و سەرەتای سەدەی حەوتەم([٨٢٣]).

لە واقیعدا و سەرەرای بەردەوامی حوکمی فارسەکان لە ولاتی نێوان دوو رووبارەکە،دەبینین هەبوونی مەجووسەکان لە کۆمەلگەدا تەنها کەمینەیەکی سادە پێك دەهێنێ.لە راسیدا فارسەکان کەمینەیان پیك دەهینا هەروەك لەسەرەوە ئاماژەمان پییدا و کۆسپ نەبوو لە بەردەم هەرێمی مەرگە بە چەوساندنەوە خوێناویەکان کە لەلایەن شاپوورەوە راگەیەنرابوو کە هەموو هەرێمەکانی دەگرتەوە لە ولات دا کە لە ژێر دەسەلاتی دا بوو ئەوەی مایەی سەرنجە لە سەر ئەمە نەبوونی زانیارییە لە سەر قوربانیەکانی ئەم هەرێمە. ئەو زانیاریە کەمانەی کە دەیدۆزینەوە تەنها لە سەرچاوەکانی دواتر دا هەیە، لەوانە: نووسینەکانی عەمرٍ بە زمانی عەرەبی([٨٢٤]). مێژووی سعردی([٨٢٥]).

ئەو دەستەواژە لابەلایانەی لەو دوو سەرچاوەیەدا هاتوون وەرگیراوە لە هەمان ئەو دەقەی پەیوەندی هەیە بە شەهیدبوونی(مارشەمعوون بر سباعی) لە ساڵی ٣٣٩ ز و لە هیچ سەرچاوەیەکی تردا بوونی نیە([٨٢٦]).

لە کۆتایی سەرگوزشتەکە ئەم رستەیە دەخوێنین کە دەڵێت:(ئێمە ئەوەمان بە سەر دا تێپەڕ بوو بەبێ دەنگیەکی تەواو، ئەو رووداوانەی کە بە سەر باوەڕداران دا هات... لە ناوچەی... مەرگە).

لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات: کام لەو مەرگانە مەبەستی لەو دەقەدا دەبینین ناوی موسڵی دەخاتە سەر بەلآم لە راستیدا مووسڵ ئەو کاتە بوونی نەبووە؟ لەمە ئەوەمان دەست دەکەوێت ئێمە رووبەڕووی ماوەیەکی جوان دەبین کە زۆر لە دەقی ئاخاوتنی تێدایە. بەلآم لە سەر ئەوەشەوە ئەوەی لای ئێمە روون دەبێتەوە ئەو ماوەیە کە زۆر راستی

أ

تێدا هاتووە بەڵام لە گێڕانەوەی مێژوویدا بزر کراوە و شێوێندراوە. بۆیە و بە پێی تێبینیەکانی قەشە بیترس([٨٢٧]).

ئێمە بۆ راستیەکان هیچ بەڵگەنامەیەکی ئەوتۆمان نیە تا لە سەری بنیاتبنێیت کاتێك باس لەو چەوساندنەوەیەی ئاماژەمان پێیدا دەکەین، گێڕانەوە پچرپچڕ و کەمەکان کە لە ویژداندا زیندووە لێرەو لەوێ بە دەستمان گەیشتووە لەوانەیە:(وێنەی تابلۆیەکمان بۆ بکێشێ بۆ ئەو درندەیەی کە هەموو ئیمپراتۆریەتی فارسی گرتبۆوە.

بڵاوبوونەوەی تۆقاندن و تیرۆرو و تۆمارکردنی ئەو کارە نامرۆڤەییانە و کوشت و بڕی بە کۆمەڵ لە هەژمار نایەت و زۆربەی لەبیر کراوە و کەس باسی ناکات).

کاتێك باسی حدیاب دەکرێت، لە پاڵ ژیاننامەی شەهیدە ناسراوەکان دا، زۆر چیرۆك هەیە کە بە درێژی باسی دەکات و ئاماژە بە شوێنە جوگرافیەکانیش دەدات لە پاڵ باسکردنی مێژوویی، ئەو شوێنە جوگرافیانە ناوبانگیان هەیە بە چەوساندنەوەی ترسناك و خوێناوی کە تێدا روویداوە. هەر وەك قەتماغەی سەر برینەکانە و هەڵدەدرێتەوە، لەمانە: بەدواداچوون بۆ شەهیدەکانی(حەدیسە ی مووسڵ ـ وەرگێڕ).

کە رەنگی ئاوی رووبارەکە سوورهەڵگەڕا بە رەنگی خوێن لەبەر زۆری خوێنی شەهیدەکان کە دەڕژایە ناوی لە ناوچەی(نتفار ـ گوێڕ) و دێرەکە ناسراوە بە(دێری شەهیدان) کە لەلایەن سۆریشۆع نوێ کرایەوە([٨٢٨]).

لە شوێنی تریشدا. زۆر بەڵگەی بڵاو هەیە بە درێژایی رێڕەوی رووباری زێی گەورە ئاماژە بەو یادگاریانە دەکەن، بوار نیە بۆ ئێمە و گومانیش کەوا بەری رۆژئاوا ئەو چەوسانەوەی لێ نەبووە کەوا شاپوور رایگەیاندبوو بۆ ماوەی چل ساڵ جێبەجێی کرد. بۆیە ناسراوە بە(چەوساندنەوەی چلی بەناوبانگ). رەنگە یەکێکمان پرسیار بکەین، کەی ئەو ناوچەیە ناسراوە بە(مەرگە؟

لە وەڵامدا دەڵێین مێژووی ئەمە بە تەواوی نازانین. لەوانەشە هۆکاری دەرنەکەوتنی ئەو ناوە لە لیستی مەڵبەندەکانی مەترانەکانی نەستۆری کۆندا رەنگە گۆڕانکاری بە سەر ناوەکان دا هاتبێت.

لە سەرەوە کە ناوی کورسی مەترانیەی(بێت بیهقارت) یان(ماهقارت) م هێنا لە ناو کورسیەکانی سەر بە کەرتی حدیاب ساڵی ٤١٠ دا سەرەرۆییم کردبێ و ئەو ناوە لە ناویان دا بزرە ناوی(مەرگە) ئەگەرچی قسەکانیشم هیچ سەلماندنێك نیە پشتگیری بکات بە پێی ئەو تیۆرەی داواکراوە.

هەورەها تووشی شۆك و دڵەڕاوكێ دەبین كاتێك داوامان لێ دەكەن بۆ دیاریكردنی شوێنی كورسی مەتڕانی مەرگە و بە تەئكید(بودج)([829]). هەڵەیەكی كردووە كاتێك(مەرگە) ی بە حەزە داناوە؟ و كردوویەتی لە جیاتی كفرعوزێل پێشتر وەك باسمان كرد ئەو شارە دەكەوێتە دەوروبەری نزیك ئەربیل كەواتە دەكەوێتە كەرتی حدیاب لەوانەشە كەوا مەڵبەندی كورسی مەتران لە مەڵبەندی كارگێڕی بووبێت. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كەوا لە ماوەیەك دا بەلای كەم لە بازاڕی یەكشەمە بووبێت. وەك دەبینین لە خوارەوە لە سەدەی هەشتەم یەكێك لە مەتڕانەكان نازناوی(تەلاوبیلا) ی هەلگرتووە. ئەو راستیە دەگەیەنێت كەوا مەڵبەندی راستی مەسیحیەكان لە ناوچەی مەرگە بووە بۆ ناوچەیەكی تر كێشاوەتەوە بۆ(ناوچەی بیرتا)، واتە مەرگەی خۆرئاوا و ئەمەش وامان لێ دەكات پرسیار بكەین: ئایا ئەو ئێزیدیانەی كە تووشیان دەبین لە دوا رۆژدا لە ناوچەكەدا نیشتەجێبوون و هەڵساون بە داگیركردنی ناوەڕاستی كەرتی مەرگە لە سەدەی هەشتەمەوە؟
زانیاریەكانمان لە سەر مێژووی ئەو گەلە پچڕپچڕە و زۆر نیە بۆ وەلامدانەوەمان بۆ ئەو پرسیارە.

## نیشتەجێبوونی مۆنۆفیزیەكان

وا دەردەكەوێت كەوا بیروباوەڕی نەستۆنیەكان رووبەڕووی بەرهەڵستی بۆوە و لە هەندێك گوندی كەرتی مەرگە لە كۆتایی سەدەی پێنجەمی ز دا. ئەنجامی ئەوە بەرگریكردنە لەلایەن نەستۆریەكانەوە بە پێچەوانەوە روویدا، رەبەن مارگۆرگیس سەركردایەتی تێدا دەكرد لە دەوروبەری ناوچەی دێرتا. بەم شێوەیە توانیان دوژمنانیان بۆ دواوە رەوانە بكەن دوای ئەوەی كە هەندێك ناوچەیان داگیركرابوو گەڕایەوە.
بۆیە برعێتە([830]). لە سەر ماف بوو كاتێك پێشبینی كردبوو كەوا لە ناوەڕاستی سەدەی شەشەم لە توانایدایە هەموو باوەڕدارانی نەستۆری ناوچەی مەرگە لە سەر رێبازی خۆیان دا بمێننەوە.
لە راستیدا مۆنۆفیزی توانی رەگی خۆی داكوتێ لە ناوچەی رۆژئاوای كەرتی مەرگە لە كۆتایی سەدەی شەشەمی ز، ئەمە وای كرد كەوا كورسیەكانی ئەسقەف ئەرسەدۆكسی دابمەزرێنن لە ساڵی ٥٩٥([831]).
پێشتر باسی بەرپەرچدانەوەی كۆمكاری سۆریشۆعمان كرد كە لە ساڵی ٥٩٦ بەسترابوو دەربارەی هەلگەڕاوەكانی مۆنۆفیزی، هەروەها ئاماژەمان بە بڵاوبوونەوەی ئەو

هەڵگەڕانەوەیە کرد کە بووە هۆی دامەزراندنی کورسیەکی ئەسقەفی لە حەدیسە تا ببێتە لەمپەرێك بۆ نەوەستاندنی بلاوبوونەوەی.

لە باسەکەمان تێبینی ئەوە دەکەین و بە پێی ئەو نووسینانەی ئیبن ئەلعبری([٨٣٢]).

کەوا مەترانی یەعقوبیەکان بۆ کەرتی مەرگە شاری(کۆمەڵ) ی کردە گەورەترین پێگەی خۆی کە یەکێکە لە شارە گەورەکانی کەرتەکە لەلای رۆژهەلات و باکوور لە چیای(ئەلفاف، ئالاف) مەڵبەندی ئەو کورسیە بوو. لەلای جوگرافیناسە عەرەبەکان ئەو شارە ناسراوە بە(پردی کۆمەڵ) بەلأم تۆما مەرگەیی ناوی دەبات بە(کو جمال، کۆجەمال) بەلای منەوە هیچ شتێکم نیە بیخەمە سەر ئەوەی نووسراوە لەلایەن([٨٣٣]).

Honing Mann لە سەر ئەو شارە، بۆ زانیاری یەکەم مەترانی یەعقوبیەکان نازناوی(ئیتئالاها)([٨٣٤]). ئەمە لە سالی ٦٢٩. ئەو ناوەی دوایی تاکە مەترانی ناسراوی یەعقووبیەکانە بۆ شاری کۆمەل کە (برحزبشبا، بر حەزبشەبا)([٨٣٥]). کە لە ئابی (٨١٨) دا بەلگەنامەی هەلبژاردنی بەتریك واژو دەکات بەناوی (دیۆنیسۆس تەلەحری)، ئەگەر لیستەکەی میخائیل سریانی ([٨٣٦]).

بۆ ئەساقیفیەکان - ئەوانەی لەلایەن ئەو پەتریکە رێورە سمیان بۆ کراوە لە پێش دیونیسیۆس واتە پەتریك قریاقۆس cyriaque بە تەواوی کە ناوی (برحزبشبا) ی تیا نیە ، ئەمە ئەوە دەگەیەنی کەوا رێورەسمەکەی بۆ کراوە پێش ئابی ٧٩٢. جگە لەمە ناوی هیچ مەترانێکی تری یەعقووبیەکان لە مەرگە نازانین .

بلاوبونەوەی بیروباوەری یەعقوبیەکان لە بەری رۆژئاوای مەرگە ئەنجامی روودانی نەدەکرا . بەهۆی ئەمە ئەبرەشیەی (بێت رۆستاقا) ی نەستۆری جیاکرایەوە لە کەرتی کەنیسەی (بێت نوهەدار) وە کرایە ئەبرەشیەیەك سەر بە کەرتی مەرگەی کەنەسی .ئەم خالە دواتر دەگەرینەوە سەری بۆ ئەوەی لێکۆلینەوەی لەسەر بکەین کاتێك باسی (بێت روستاقا) دەکەین .بەکردەوە ئەمە ئامانجی گۆرانکاریەکانی فەرمی بوو بە ناوی (تاعەتی رەبەنایەتی) بکەن، بووە هۆی بلاوبونەوەی ئارامی و هیمنی لە هەموو ئەو بەرەی کەدروستکرابوو لە نیوان نەستۆری و یەعقوبیەکان . وە سەپاندنی هێلی کۆتاییە بۆ ناکۆکیەکانی نیوان براکاندا .

## لیستی ئەسقەفیەکانی نەستۆری

(١) ـ عەودیشۆع

یەکەم مەترانی نەستۆرییەکان لە کەرتی مەرگەدا لە بەرکردنی مێژوو و یادگاری ئەوە([٨٣٧]). ناوی ئەو مەترانە لە ناو ناوەکانی مەترانەکاندایە کە بەڵگەنامەی گەڕانەوەیان مۆرکردووە لە بیرەوەری نوێژکەرەکان کە دەرچووە لەلایەن کۆمکارەوە لە ساڵی ٧٩٠.

(٢) یەعقووب

تۆما مەرگەیی ناوی ئەو مەترانەی هێناوە لە کاتی باسکردنی ئیلیا مەترانی (موقان)([٨٣٨]). لە واقیعدا مەتران یەعقوب داوای کردووە لە مەتران ئیلیا گەشتێك بکات لە ناو چوارچێوەی ئەبرەشیەکەیدا بۆ پیرۆزکردنی باوەڕدارانی و چاکردنەوەی نەخۆشەکانیان. پەتریك(تیما تیۆس) ی یەکەم ئیلیای بە مەتران دامەزراند. ڕێوڕەسمەکەی لە سەر دەستی میترابۆلیتی حدیاب(نەستۆرس) بوو. ئەمە لەنێوان ساڵانی ٧٩٠ـ٨٢٣ دابووە دواتر ئامادەی ناشتنی مەتران یەعقوب بوو دوای ئەوەی کۆچی دوای کرد مەترانەکە(بەتریك دوای ئەو ئیراهیمی دووەم کە ئەویش خەلکی مەرگە بوو، دواتریش بوو بەترك لە ساڵی ٨٣٧.

مارەن زخا

مێژوونوس Le Quien ناوی کەسێکی ئاخنیوەتە ناو لیستی مەترانەکانی کەرتی مەرگە بە ناوی(مارەن زخا)([٨٣٩]). بە مەترانی دادەنێت پێش تۆما مەرگەیی لە سەر کورسی مەترانی مەرگە دابوو. هەڵەی ئەو مێژوونوسە لە سەر بناغەی هەلەیەیە کەوا مێژوونوس(سەمعانی) کردوویەتی([٨٤٠]).

Assemani کە باس لە کەسێك دەکات بە ناوی(مارەن زخا) کەوا ئەسقەفی(مەراغە. Maragae) بووە ئەوەی تۆما مەرگەیی پێمان رادەگەیەنێ([٨٤١]). ئەوەیە کەچۆن ئەم گوێبیستی کردارەکانی مارەن زخا دواوە بە پێشەنگ و مامۆستا بە توانای داناوە، بەلام بەبێ هیچ ئاماژە پێکردنێك کە گوایە مەترانی مەرگە بووە([٨٤٢]).

(٣) تۆما مەرگەیی ـ تۆما المرجی

ژیاننامەی ئەم نوسەرە بەناوبانگە لەلای زۆران ناسراوە . مێژونوس (بدج)([٨٤٣]) کورتی کردۆتەوە . جێگەی پێهەلگوتن نیە بۆ پێوەرکردن لەونووسینانەی کەوا تۆما مەرگەیی نووسیوتی بەهۆی ئەوەی وردەکاری و ئەمانەتی لە زانیاریەکاندا نەبووە . وە ئێمە ناتوانین بە مێژوونوسێکی راستەقینەی دابنێن. زۆر شوێن باسی دەکات کە دەکەوێتە کەرتی مەرگە وە یا شوێنە دوورەکان نە ناسراوە لەلای زۆر کەس و هەر بوونی نیە بە روون و ئاشکرایی . بەلام ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە ئەو بۆ جەند جارێك لە ناوجەکەدا

گمراوە بۆ خۆشەویستی و نیشتمانی پاکەوە . ڕێزگرتنی بۆ قەداسەتی کۆنەکان نیشانەی غیرەتی پەیامەکە بووە کە دڵی پڕبووە هەردەم وە لەو پێناوە دا بەکاری هێناوە بۆ خزمەتکردنی خەلك لە کاتی هەڵسوراندنی کاروباری ئەبرەشیەکەیدا . سادەیی وبێ فیزی گەواهی بۆ دەدەن ، بەتایبەتی کاتێك باس لە خودی خۆی دەکات لەنوسینەکانیدا .

(٤) ئیبراهیم ئەبرازا/ابراهیم ابرازا

بەرەچەلەك خەڵکی (بێت گەرمای)یە/گەرمیان ). وە بۆتە مەترانی مەرگە پێش ئەوەی ببێت بە بەتریك لە ماوەی نیوان سالانی (٩٠٥-٩٣٥) بە ناوی ئبراهیمی سێ یەم ([٨٤٤]).

لە عەمرو دا دەخوێنینەوە دەربارەیەوە چیرۆکێکی نیمچە خەیالی تایبەتە بە هەڵبژاردنی بۆ پایەی پەتریکی . کاتێك مەتران بووە لە گەرتی مەرگە وە بەسەردانێك چۆتە مووسل ناکۆکی لە نێوان خۆی و یۆحەننا گوری بەختیشوع میتراپۆلیتی مووسل دروست بووە ، بڕیاریداوە ئەم بابەتە بگوازێتەوە بۆ بەتریك بۆ ئەوەی چارەسەری نیوانیان بکات . لەو کاتەی کەخۆی ئامادە دەکرد بۆ وەرگرتنی کە لەکێك بۆ گواستنەوەی لەمووسل بۆ بەغدا ، کۆچەرێك هاتووتە لای و کیسەیەکی پڕ لە زێڕو زیوی پێ بووە وتویەتی : ئەو هەموو ماڵە وەربگرە لەگەڵ خۆتا و هەوڵبدە بەهۆیەوە کاربکەی بۆ ئازادکردنی برازاکەم کە لە بەغدا بەندکراوە . لە کاتێك کە بۆت نەدۆزرایەوە ، تکایە ئەو ماڵە خەرجبکە بۆ کاروباری تایبەتی خۆت . لە کاتی گەیشتن بۆ بەغدا مەتران ئیبراهیم هەموو هەوڵیکی خستە گەر بۆ دۆزینەوەی ئەو بەندکراوە ، بەلام هەوڵەکانی بێ هودەبوون لە ئەنجامی ئەمەدا مەتران سامانیکی باشی دەسکەوت . ئەو کاتە خۆی توندوتۆڵکرد و دڵی پڕبوو لەتەماحی بۆ وەرگرتنی دەسەلات . لەبەر ئەوەی لە دوای بیست ڕۆژ بە گەیشتنی ئەو مەترانە بۆ بەغدا بەتریك کۆچی دوایی کرد ، بۆیە لەکۆبوونەوەی سنهادۆس بۆهەلبژاردنی بەتریکی نوێ ، مەتران ئیبراهیم هەڵسا بە کڕینی دەنگی دەنگدەران وە لەوانە کبریئێل میتراپۆلیتی جوندیسابور کە یەکێك لە ئوپۆزسیۆنە سەرسەختەکان بووە . لەدوای سەرکەوتنی بە کورسی بەتریکی و دانیشتنی لە سەردا وە وەرگرتنی دەسەلاتەکانی پێی دراوە ، کاروبارەکانی زۆر بە ڕێکو و پێکی و ژیرانە بەڕێوەدەبرد ، وە لەماوەی خۆیدا لاپەرەکانی مێژوویی پرشنگداری تۆمارکرد، سەرەرای ئەوەی گومان هەبوو لە چارەسەرکردنی هەندیك دۆزو کێشەدا .

(٥) عەودیشۆع/عەودیشۆ

لەسەر فەرمانێك كە لەلایەن ئەو مەترانە دەرچوو بوو، ئینجیلی پیرۆز دەستنووس كرا بەپێی سرووتی دێری سەرو لەساڵی ١٢١٨. ئەم دەستنوسە لە دێری بێت عاوی لە سەر دەستی رەبەن یاوالاها تەواوبوو لەسەر حیسابی كەنیسەی (بیبۆزی) ([٨٤٥]).

(٦) شەمعوون

مەتران بووە لە (تەلاوبیربیری) لەساڵی ١٢٦٥.([٨٤٦]). یاوەری مەتران یاوالاهای سێ یەمی كرد لە ساڵی ١٢٨٣. لەو دەقانەی خوارەوە تایبەت بەو دەبینین كەوا ئەو مەترانەی كە لەدوای ئەو دێت بۆ (تەلاوبیربیرێ) ناسنامەی مەترانی (تەلاوبیلا) پێناس دەكات . ئەو دووگوندە سەربەناوچەی (بیرتا) ن كەدەكەوێتە ناوچەی مەرگەی رۆژئاوا كە سەر بە كەرتەكەیە. ئەو ناونیشانەی ئاماژەی پێ كراوە بەرامبەر بەوەیە بڵێین مەترانی خۆرهەڵات و خۆرئاوا.

(٧) ـ عەودیشۆع كوڕی مەسعود

تێبینیەك هەیە نووسراوە لە سەرەتای دەستنوسی ساڵی ١٢١٨ كەلەسەرەوە ئاماژەمان پێیدا نوسراوە بە دەستی مەتران عەودیشۆع كوری مەسعود كەبەرەچەلەك خەلكی كەرملێسە . لەم تێبینیە ئەوە دەخوێنین كە وا چەوساندنەوەیەك هەبووە لەلایەن (نەورۆز) ەوە وەكۆتایی پێ هاتنی كە هاتەدی بەهۆی ئەو نوێژانەی كەوا پەتریك یاوالاهای سێ یەم كردوویەتی و بەرزی كردۆتەوە بۆ خوا. بۆیە مێژووەكەی پێویستە پێش ساڵی ١٢٩٦ بە كەمێك بێت. ئەو نازناوەی كەوا مەتران عەودیشۆع هەڵیگرتووە مەترانی مەرگەیە كە مەترانی(تەلاوباربلا) یە توانیمان پێناسەی مەترانەكە بزانین كە پێش ئەو لە سەر كورسیەكە دانیشتووە.

(٨) ـ ئیشۆعیاب

ناوی ئەو مەترانە لە ناو ناوەكانی ئەو مەترانانە دەدۆزینەوە كەوا واژوویان كردووە لە كاروبارەكانی كۆمكاری تیماتیۆسی دووەم كە لە ساڵی ١٣١١ بەستراوە([٨٤٧]).

لەگەڵ نازناوەكەی مەترانی(تەلاوباربیلا) هەبوونی ئەو كورسیە لەو مێژووەدا بەلگەیە لە ناو لیستەكانی عەودیشۆعی نسێبینی([٨٤٨]).

نسێبینی باس لە مەتران ئیشۆعیاب دەكات و دەیكاتە سەر بە میتراپۆلیتی چوارەم كە دەسەڵاتەكانی درێژدەبۆوە بۆ سەر ئەربیل و ـ حەزا و ئاسوور ـ مووسڵ([٨٤٩]).

لە لیستی ساڵی ١٦٠٧ هیچ پاشماوەیەك نادۆزینەوە بۆ ئەبرەشیەی ئیشۆعیاب. بەلام لە لیستی ساڵی ١٦١٠ ئەوە تێبینی دەكەین كەوا لە لایەن بەتریك ئلیای هەشتەم ناوی مەرگە بە تەواوی فەرامۆش كراوە. لە جیاتی ئەو ناوە دەبینین ئەو ناوچەیەی كەوا ئەو دوو دێرە

ناسراوەی تێدایە بە ناوی(دێرمارِ عەودیشۆع) و(دێری بێت عاوی) کە دەکەونە مەرگە بە ناوی کوردی(هەکاری)( [٨٥٠]).

لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین بەتریکی کلدان لە(سەلامز) دادەنیشت و نازناوی(مارشەمعوون) ە( [٨٥١]).

کاتێك نامە دەنووسی بۆ پاپا(ئەنۆشنتس) ی دەیەم لەساڵی ١٦٥٣ ناوی مەرگە دەهێنن وەك ناوچەیەك و بەو هەرێمانەی دادەنێ کە سەر بە ئەبرەشیەکەیەتی بەلاَم بێ هیچ ئاماژە کردنێك بەوەی کورسی هەیە بۆ مەتران.

لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەم دەسەلاَتی مەترانی نەستۆریەکان ناسراو بە مارِ ئیبراهیم لە دێری مارِ عەودیشۆع کە دەکەوێتە(نێرم ـ کوندۆك) درێژدەبێتەوە بۆ هەندێك گوندی ناوچەی ئاکرێ و زێبار و مزوری و چیای گارە. شوێنی ئەو گوندانە ناوچەی مەرگەمان بیر دێنێتەوە و بە زەویەکانیەوە کە ناسراوە لە پێشتر و دووردا هەروەك کەرتێکی سەربەخۆ. پێشتر(بادجەر)( [٨٥٢]).

ئاماری کردبوون(مەرگە) لە نێوان شوێنەکانی کەرتەکانی کەنەسی کە لە سەری نووسیوە. بەلاَم ئەوە باس ناکات کە ناوەکەی تا ئێستاش بە ناوە کۆنەکەیەوەیە. ئەمرۆ هیچ کورسیەك بۆ مەترانی نەستۆریەکان لەم چوارچێوەیە نەماوە. مەترانیەی کلدان لە ئاکرێ( [٨٥٣]).

(کە مێژووەکەی دەگەرِێتەوە بۆ یەکگرتنەوەی(بە کاسۆلیك) ـ(وەرگێرِ). بۆ ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەم بەلاَم لە رووی کارگێرِی کەنەسی جیانەکراوەتەوە لە هەردوو ئەبرەشیەی ئامێدی و زاخۆ تەنها لە سەردەمی پەتریکی ناودار ماریووسفی شەشەم ئۆدۆ نەبێت لە ساڵی ١٨٥٠. لە نێوان ساڵانی ١٨٩٥ ـ ١٩١٠ ئاکرێ بە شێوەیەکی کاتی لەگەڵ ئەبرەشیەی ئامێدی یەکیان گرتەوە بەلاَم دواتر لە ئامێدی جیاکرایەوە و نوێنەرێکی پەتریکی بۆ دامەزرێنرا. بەم شێوەیە مایەوە تاوەکو ساڵی ١٩٤٧ ، کاتێك پۆڵس شێخو وەك مەترِان بۆی داندراو(دواتریش بەتریکی بابل لە سەر کلدان) مەترانی کلدان لە ئاکرێ و زێبار. ئێستا و لە ساڵی ١٩٥٧(واتە کاتێك دانەر ئەو پەرتووکەی دەنووسی ـ وەرگێرِ).

مەترِانی ئاکرێ و زێبار بەرِێز مەتران ئەندراوس سەنا بوو.

ئەم بەرِێزە هەموو هاوکاریەکی کردم بۆ زۆر لە وردەکاری بە درێژی کە لەو پەرتووکە دا هاتووە. تکام وایە هیوا و داخوازیەکانم قەبوڵ بکات و سوپاسی بکەم بەرامبەر ئەو هەموو هەوڵ و کۆششانەی.

( ٨ )

# بەشی خۆرهەلآت لە ناوچەی مەرگە

١ ـ بێت عاوی

وەك دەبینین بە کەڵك نایەت بۆ جارێکی تر لە سەر مێژووی ئەو دێرە بەناوبانگە بدوێین لە پێشەکی پەرتووکی سێرW.A.Walis Budge لەسەر ئەودێرە لەگەل وەرگێرانی پەرتووکی (الرؤساء) بۆ زمانی ئینگلیزی دەبینین هەوڵیداوە بۆ دووبارە نەخشە کێشانی شوێنی دێرەکە . ئەمە ئەوە دەگەیەنی کەوا بێ سودە هیچ پاشکۆیەك بخرێتە سەریەوە لەلای ئێمەوە هەروەك لە پێشەوە تەئکیدمان لێکردوە . بەلام لەسەر ئەوەشەوە، واپێوست دەکات چاوێك بەجوگرافیای ناوچەکەدا بخشێنین کەوا ئەو زاناو رۆژهەلآتناسەی ئینگلیزی پشتی پێ بەستووە .هەر لە دیاریکردنی شوێنی دێرەکە بەپێی ڕای خودی خۆیەوە ([٨٥٤]).
وا لە خوارە وە باسی دەکەین ،هەوڵدەدەین پاشکۆی دریژو تەواوکەر لە سەر مێژووی دێری بێت عاوی بۆ ماوەی دوای سالی ٨٣٢ بخەینە سەر .

## مێژوونووس بودج شوینی دێرکە دیاریدەکات:

لە لێکولینەوەی پەرتووکی بودج دا ([٨٥٥]). بەوردی و قوولیەوە هەست بەوە ناکەین دڵتەنگ بوو بێت لە دیاریکردنی شوێنی دێری بێت عاوی وە تاوەکو ئێستاش ماوە و بەبێ هیچ گۆرنکاریەك بە سەر ناوەکەیدا ، وە هەروەها هیچ لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر ناسنامەی (شۆش) ی ئیستا نە کردووە .وە پەیوەندی بە(باشۆش) کەوا تۆما مەرگەیی باسی کردووە ، وە نە لە ناسنامەی (شارمن) کە پەیوەندی هەبووە لەگەل (شەلات)و هیتریش. ئەوەی مێژوونووس بودج کردوویەتی ختوویەتیە سەر نەخشەکە لە پەرتووکەکەیدا جێگیری کردووە بەدوو هێلی تەریب بۆ گوندەکانی هاوشێوە .بەپێی ئەمە بۆدج شوێنی دێرەکەی ختۆتە سەر چیایەك کە زۆر دوورنیە لە زێی سەرەوە، دەورە دراوە بە زەوی بەسوود بۆ کوزەرانی و هێمنی .ئەوەی لە دەقەکەدا دەردەکەوێ ناوەکانی تیا هاتووە کە ئاماژەی پێکراوە و پەیوەندی بە دێرەکە هەیە، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە دێرەکە دەکەوێتە سەر لووتکەی ئەو چیایەی کە دەکەوێتە نێوان دوو دۆڵ. لە ودۆلەی کە دەکەوێتە بەری رۆژهەلآت ڕوباری زێی سەروو ی پێدا دەروات . بەلآم ئەو دۆڵەی کە دەکەوێتە بەری خۆرئاوا روباریکی بچوکی پێدا دەروات. لە پرسیار کردن دا چ هۆکاریك پالی بە بودج ناوە بۆ دیاریکردنی شۆێنی دێرەکە نزیك بە رووبار؟ وە روباری زێی گەورە بەو ڕوبارە دادەنێ.

لە وەڵامدا ئەمەیە: بە پێی ئەو دەقانەی کە هەیە، بودج تێبینی ئەوەی کردووە کەوا خەتەر ئاکەکانی لافاو کەمپێشتر بینای یەکەم دێری ڕامالیوە، وە هەروەها یەکەم کەنیسەش.([856]).

بۆیە بودج ئەوەی دەخاتە سەر:(لێرە لافاوی ڕوبار هەیە ) بەلأم لەواقیعدا مەبەست لە دەقە پێشەیەکەیدا لافاوی ئاوە. ئەو دووروبارەی بەو دوودۆلەدا کە لە نیوانیاندا یەکەم کەنیسە دروستکراوە کە زۆربە بەسەرکەشی و خۆڕاگریدا هەبوو. زۆر سروشتی و ئاشکرایە کەوا ئاوی باران و لافاوی زۆری بەهاران لەناکاو و بەتەوژم دەبێت خاوەنی هێزو توانایەکی زۆرە بۆ ڕمالینی هەرشتێك و بەربەستێك کە دەکەوێتە پێشیەوە، وە بەخێرایەکی سەرسورمێنەربەبێ مانەوەی هیچ دڵۆپیك پاش ماویەکی کەم بەلام لەهاوین دا ئاستی ئاوەکە زۆرنزمەوە هەندێك جار وشکایی تەواوە لەو دوودۆڵەدا. بەهۆی باوەربوونی بودج کەوا پێویست دەکات بۆ زۆربوونی ئاوی ڕوبارێك لەنزیك دێرەکەدابۆیە یەکسەر ڕوودەکاتە روباری زاب‌ڕای خۆی لەسەر ئەوە دارشتووە کەدەینووسی،([857]).

دەڵێ ئەو بەردانەی پێویستە بۆ دروستکردنی گەچ بۆ دروستکردنی کەنیسەکە بۆ جاری سێیەم بەکەلەك دەیان هێنا بۆ ئەو بەری ترەوە لەرێگەی روبارەکە، دواتر بە پشتی کەرو ولأغ دەیانگواستەوە بۆ بەسەرەوە کەدێرەکەی لێیە.ئەوەی ئاشکرایە کەوا شوێنی(کان)ی دەرهێنانی بەردی گەچی ئیستای بچووك لە ئاکرێ و خەردس قولایی کەمە، وە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کەوا زۆریان نەبردووە ئەگەرچی چەند سەدەیەکی بەسەردا تێپەڕ بووە.سەرەڕی ئەوەی کەوا گوندی(خربە) لەرووبای زاب دوورە بەنزیکەی پێنج وەیا شەش کاتژمێر بەپیادە رۆیشتن،ئەم ماوەیە زەحمەت نەبووە لەلای ڕەبەنەکانی سەدەی هەشتەم، وە هەروەها بەم شێوەیە نەبووە بۆ کوردەکان و مەسیحیەکان کەلەو ناوچەیە نیشتەجێن تاوەکو ئەمرۆ.لەسەر ئەم خالە بودج([858]). تێبییەکی بەجێهێشتووە و دەڵێ:کاتێك ڕەبەنەکانی ئەلقۆش ویستیان دێرەکەیان دووبارە ئاوەدانی بکەنەوە لە ساڵی ١٩٨٠ ناچار بوون کەوا بەردی گەچی پێویست لەوشوێنانە کەوا چەند میلێك لە دیرەکە دوورە، بۆیە هیچ کێشەیەك نیە بۆ ئەوەی شوێنی دێرەکە نزیك رووباری زاب بێت. جگە لە وەی پێشتر، دەلێم ئاماژەیەکی دەرونی هەیە کە کاریگەری هەیە لەسەر هەر کەسێك کار لەگەل ئەو سەرچاوە مێژوویە کۆنانە دابکات: ئەگەر زاب نزیك بە دێرەکە بێت ئەوا رۆڵێکی گەورە لە مێژوو دەگێڕێت لە ژیانی رەبەنەکان(قەدیسەکان) باشەکان و پەرچووەکانیان. زانیاریمان لەسەر هەندێکیان هەیە، دەڵی ئەوانە لە رووبارەکە تێپەر دەبوون وە بۆ چەند جارێك بە پیادە بەسەر ئاوەکە هەروەك بەرێگەیەکی وشکانی دا. لەناو ئەوانەدا(رەبەن یوسف) کە

جارێك ویستویەتی دەربکەوێ تواناکەی بەسەر رووی ئاوی رووباری زاب دا، ویستویەتی بچێتە ئەو رووبارەی کەهەیە لە نزیك دێری رەبەن(ئیشوع زخا)([859]) بۆ ئەوەی بچیتە لای(مارنرسی) و(مارقریاقوس) کە راهێنانیان بە رۆیشتن لەسەر رووی ئاوی رووباری دیجلە دەکرد لە نزیك(بەلەد)([860]).

تایبەت بەو لقە رووبارەی کە دەرژێتە دۆلی رۆژئاوا، کە ناوی لای بودج نەهاتوە، ئەوە رووباری خازرە([861])، ئەمە بەپێ ئەو نەخشەیەی کەخۆی کێشاویەتی. وە بەپێی ئەو تێبینی یەی هاتووە([862]). لە دەقەکەدا ناسنامەی رووبارەکە دەردەکەوێ(رووباری خازر)ە بە ئاماژەکردنێك بۆ سحربازێکی ژن کە مێوژی گۆریوە بۆ زەنگە سوورە و لەناو روبارەکە خنکاوە لەبەر ئەم تاوانەی کە کردویەتی سزادراوە. ئەم چیرۆکە لە دەرەوەی بازنەی باسەکەمانە کە لەسەر دێرەکەیە. بەپێی ئەوەی لەپێشەوە، ئەبێ رای بودج وەرنەگرین بۆ دیاریکردنی شوێنی دێری(بێت عاوی) وە لەسەرمانە لێکۆلینەوە لە شوینی ئەو دێرە بکەین.

## توخمەکانی دیاریکردنی شوینەکە

لە سەرەتادا، دەمانەوێت روونی بکەینەوە کەوا دێری بێت عاوی دەکەوتە باشووری گوندی(خربە)([863]). بودج ئەمەی نەزانیوە، بۆیە رایەکەی لەگەل با دەروا، لەبەر ئەوەی گوندی خربە زۆر ناسراوە، دەکەوێتە دووری سێ چارەگە کاتژمێر بەپیادە لە ئاکرێ وبەلای باکوری خۆرئاوای. داب و نەریتی خۆجێی شوێنی دیرەکە دەخەنە نزیك گوندەکە لەناوچەیەك کە ئاستەکەی نزمترە.ئەوەی دەوترێ ئەوەیە: دەبینین ئەو داب و نەریتە خۆجێییە بنچینەی مێژوویەکان و شوێنەوارەکان دەسەلێنی.بەلام، لە پێش هەموو شتیکدا، لەرووی پرۆگرامەوە پێویستە لەسەرمان لەم وتە بەناوبانگە دوربکەوینەوە کە خەلکە ساویلکەکە دەیلێتەوە دەربارەی شوێنیك وە شوێنەواریك گوایە(زۆرکۆنە) ئەم ووتەیە رەنگە تەنها چەند سالێك بیت و بەس. ئەوەی پەیوەندی بە بابەتەکەمانەوە هەیە (دیاریکردنی شوینی دێرەکەیە) پیوێستە زۆر وریا بین لەو پروپاگەندانەی کەیەکێك لە قەشەکان وتی لە گوندی خەرجاوە لە دیاریکردنی شوێنی دێری بێت عاوی ،لەبەر ئەوەی هێچ بەلگەیەکی باوەر پێکراوی نیە. ناوی ئەو قەشەیە (پۆلس )ە لە سالی ١٩٤٧ کۆچی دوایی کردووە . وە بەناوبانگە بە هەولەکانی لە سەر خوێندنی پەرتووکی تۆ مامەرگەیی و هەولدانی بۆ دیاریکردنی شوێنەکان بەخێرایی و بێ دیتنی و باس کردنی کە ئەمەوا دەکات گوند نشینە ساکارە کان باوەری پێ بکەن. سەرچاوەی زۆر لەو قسەلۆکانە کە لێی

تێدەگەێن! ئـەوەو ئـەویٚ (دابوونـەرێتی کۆنـە ) وەبلاوبـۆ تەوەلـە هەمووناوچـەی ئـەو قەشـەیە. بابگەرێنـەوە بـۆ هۆکارەکانی دیـاریکردنی شـوێنەکە،کە تۆمـا مەرگـەیی پێـداوین: ئەوناوچانەی کـە باسـیکردووە ئەودانـەرە (تۆمامەرگـەیی ) زۆرن: قـەلای بچووك. بـەپێ ی رای بودج ئەو قەلایە کۆشکێکی قەلایی بووە ،وە لەوانەیە شوێنەکەی هەنـدیٚ جار لـە بـەری دووەمی ڕوباری زاب بوو بێت و لە توانادایە لە دێرەکە ببینریٚ([٨٦٤]).

هەنـدێك جـار وە بـەپێی نەخشـەکەی لـەنیوان زاب و خـازر وە لـە هـەمان بـەری لای دێرەکە،جگە لەمـە(تۆمامەرگـەیی) بـەوە باسـی دەکـات کـەوا (قـەلای بچوك) بەسـتراوەتەوە بەئەشکەوتی ڕەبەن (ئیشۆع داد) کـە دەلـێن دەکەوێتـە سـەر لوتکەی ترۆپکـی ئـەو چیایەی دەکەوێتـە نیـوان هـەردوو دۆلەکـە. شـوێنەکەی دەکەوێتـە لای راسـت لـە سـەرکەوتن بـەرەو سەرچاوەی کانیاوەکە، وە بەرامبەر بە قەلاکە پێی دەلێن (بچوك)([٨٦٥]).

لـەکاتی چـوونت بـۆ گونـدی خربـە، لـەویٚ دانیشـتوانی ناوچـەکە دەبیـنین وە بـە تایبـەتی سەرۆکی گوندەکە بـەرێز(دنحا) ئامـاژە بـەدوو لوتکـە دەکـەن بـەبیٚ سـیٚ و دوو کـە دەکەونـە نزیـك گوندەکـەیان پێیـان دەلـێین(قـەلا) وە لـە هەمانکاتـدا ئـەم ووشـەیە بـۆ لوتکـەو قەلابەکاردێت، لوتکەی یەکـەمیان ناسـراوە بـە (لوتکـەی گـەورە)(نـەك بەقـەلای گـەورە) کـە بەرزترینی ئەو دوو لوتکەیەیەوە لە توانادایە ببیبنی لـەلای بـاکوری خۆرئـاوا کـە تەماشـایان دەکـەی لـە سـەربانی مەترانیەکە.بـەلام دووەمیـان پێـی دەلێن(لوتکـەی بچوك) شـوێنەکەی نزیکترە لەگوندی خربە.ئەو گەشتەوانەی کە لە ئاکریٚ وە دێت بـەرەو خربـە تێپـەر دەبێـت بە لێـواری دامـێنی چیایەکە، کـە لوتکەکـەی بەسـەرەوەیە، تـاوەکو ئـەمرۆ، وە لەبـەر ئـەوەی ئەشـکەوتەکە دەکەوێتـە ترۆپکـی لوتکـە چیاکە درێژدەبێتـەوە بەتـەریبی ئـەو رێگایـەی دەکەوێتە دوو دۆلەکە بەرامبەر لوتکەی بچووك. ئەم ئەشکەوتە هیچی لێنەماوەتـەوە تـەنها کـەلاوەکانی نـەبێت وا بـاوە کەئـەو ئەشـکەوتە دەگەرێتـەوە بۆرەبـەن(هـورمزد) ئـەم رەبەنـە بەناوبانگـە لـە ناوچـەکەیە دێرەکـەی کـە دەکەوێتـە نزیـك ئـەلقۆش. بـەلامپێش ئـەوە، ئایـا پێویست ناکـات ئەشـکەوتەکەی رەبـەن ئیشـۆع داد بناسـین لـەو دەوروبـەرە دابنـێین یەکـەم؟ گریمان ئەم شتە راسـتە، لەسـەرمان پێویسـتە دێیەکە بدۆزینـەوە شـوێنی جێگەکـەی دیـاری بکەین و لێکولینەوە بکەین لەوەی بگوازینەوە لە دۆلێك بـۆ دۆلێکی تـر([٨٦٦]). بـۆ ئـەوەی لـە ئەشکەوتەکە بەرەو دێرەکە بچین. پێناسـەکردنی ناسـنامەی(دۆلی دخیـا)([٨٦٧]). بـۆ چـوونی زیاتر هەیـە، ئـەم نـاوە بـزرە بـەلام بـەپیٚ مـن ، مـن لایـەنگری ئـەوەم بـەدانانی ئـەم دۆلـەی دەکەوێتە نێـوان ئەشـکەوتی (ئیشـۆع داد)ـ هـورمزد وە لوتکـەی بچووك. لـە واقعـدا تـاوەکو ئێستاش شوێنێك هەیە لەم دۆلە ناوی(قەشە یوسف)ی هەیە. ئەم جێگەیـە دەکەوێتـە نێـوان

درەختـەکانی قـەزوان (درەخـتی قـەزوان: درەختێکـە لـق و پـۆپی زۆرە قـەزوان و بـاوی و بادەمچـە، لـە قەدەگـەی مادەیـەکی راتنجـی دەردەهێنـری زۆر بۆنـدارە و بـەکاردەهێنریّ - وەرگێڕ) وەپێش تێپەربوون بـە جۆگـەی ئـاوی خربـە، کاتێـك لـە ئـاکریّ دەردەچین. رەنگـە پرسیار بکەین: (ئایا ئەو قەشە (یوسف)ە هـەمان ئەمیـە کـە تۆمامەرگـەیی باسـی دەکات کـە هەلساوە بـە دروسـتکردنی پـە رسـتگایەك (خەڵوەتگـە) لـە پێش باغچـەیەگی(کێلگەیـەکی) بچووك دەکەوێتە دۆلی دخیـا. دواتـر قەشـە یوسـف باسـی دەکـات لـە یـەکێك لـە دەقەکانـدا درێـژبووبوو کـاتی نوسـتنی دوای نیـوەرۆی بەسـەردەبرد لـە بـەردەم پەرسـتگاکەیدا، دوای هێرشکردنێك بۆ سـەر دێرەکـە لەلایـەن کوردەکانەوە.مێـژوونوس بودج،جێگەکـە دیاردەکات کـە دەکەوێتـە بـەرزایی قـەلای بچـووك وەك شـوێنێك بـۆ پەرسـتگای ڕەبـەن نرسـای. بـۆ جێگیربوونی ئەو ڕایە، دانەر ناچارە شێوەی ئاوەلناوە کەچاك بکاتـەوە (بچوك)(بـۆ نێرینـەو مێنە) لەبەر ئەوەی جیاوازی نیـە لـەم بارەیـەوە لـە سیخەی دروست بـوونی زمانـەوانی بـۆ ئاوەلناوی کلدانی(ئارامی ـوەرگێر).لەداب و نەریتەکان باس لەو پەرستگایە ناکات . پێویسـتە بە دوای بگەرێین لەلای رۆژهەلاتی دێرەکە. ڕەنگە شـوێنەکەی نزیـك بـەدرەختی زەیتونەکـە بێت کە چێنـراوە لەلایەن (بچوکترین نەوەی) قەدیس لـە دامێنی یـەکێك لەلووتکەکانـدا. لـە جێگەیـەك کـە دورنیـە لـە ئەشـکەوتەکەی ڕەبـەن نرسـای، پەرستگایەکی لێبوو دەگەرایـەوە بۆ(مارقریاقۆس) کە رەبیەك دەکەوێتـە لای باکوریەوە،لـە سـەر ئەربیـە دا جێگەیـەك هەیـە پێی دەلێن (گەپادکۆریاکیّ) Geppa Dkoriake کەرەنگە بـەو واتەیـە بێـت(ئەشـکەوتێك دەگەرێتەوە بۆ ناوی قریاقۆس بووە بەلام نەناسراوە. ئەو ئەشـکەوتە دەکەوێتـە جێگەیـەکی بەرز لە سەر ئەو لوتکەیەی ناسراوە بە(لوتکەی گریگۆمیّ/کریـە کومیـە) بـەلام شـوینی ئـەو ئەشکەوتە دەکەوێتە رۆژئاوای دێری بێت عاوی. لە هەمانکاتدا لە هەموو دەقەکانـدا هـاتووە کەوا ئەشـکەوتەکەی مارقریـاقۆس دەکەوێتـە رۆژهـەلاتی دێرەکـە. لەمـە بۆمـان دەردەکـەویّ لەوباردا شوینەواری ئەشکەوتی رەبەن نرسای([٨٦٨]) وە مارقریاقۆس بزر دەکـەین. بـەلام(گـەبا دکۆریـاکیّ) دەگەریتـەوە بـۆ قریـاقۆس دواناسـنامە بزرکـراو. ئـەوەی تێبـینی دەکریّ.ئـەو جێگەیەی پێی دەلێن (جـیر کهنی/گردکـەهنیّ) چـەندجارێك نـاوی دەهینـرێت وەك ئەوەیـە دەکەوێتە زۆر نزیکی دێـری بێـت عاوی.مێـژوونووس بـودج([٨٦٩]). هـەر بەهـەوای نـەفس ئـەو نـاوەی وەرگێراوە بـۆ (عـین القـیر/ کـانی قـیر) بـەلام واتـای ئـەو نـاوە دیـار و سـادە و سـاکارە بە(گرد ـ تل/ تل الکهنە ـ گردی قەشان/ وەرگێڕ).

لە بەراییدا وای بۆ چـووم کـە لـە توانادایـە ناسـنامەی ئـەو شـوێنە بناسـین بـەپێی:(ئـەرعات قاشی ـ زەوی قەشان) کە دەکەوێتە لای باکووری خۆرئاوای گوندی خربـە، وە لـە ناوچـەیەك

ـەرزترە لە گوندەکە. بەلأم ئەو جێگەیە ناگونجێت لەگەڵ ئەوەی تۆما باسی کردووە. لە ڕاستیدا(گرد کەهنی) شوێنەکەی بەرامبەر بە دێرەکە بووە بەلأم لە ئاستێکی نزمتردا، بە هۆی پێویستی چوونە خوارەوە بۆی لە کاتی ئارەزوو بوون کە بچێتە ئەوێ. سەرەڕای ئەوەش لە تواناداییە لە سەر بانی بەتریکخانە بەشێکی ببینین([870]). بە کورتی لەو ناوچەیە ژمارەیەك لە ئەشکەوت و پەرستگا هەیە([871]). دوای هەڵسانگاندنی ڕووداوەکان پێم وایە ئەو ناوە تایبەتە بە هەندێك گرد و تەپۆلکە کە بلأوبۆتەوە بە درێژایی لای باکووری باشووریدا، کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای دێرەکە. کوردەکان بەو شوێنە دەڵێن(سێ گردکان) واتە(سێ گرد، سێ تەپۆلکە). ئەگەر بابەتەکە بە وردی تێڕامانی بۆ بکەین دەبینین هەموو هێڵەکانی باسەکە بە سەر ئەو شوێنە جێبەجێ دەبێت، بەلأم شێواندنێك هەیە لە ناوەکەیدا ئەوە شتێکی سادەیە و ئەنجامی سروشتیە بۆ ئەو سەدە یەك لە دوای یەکانە و جیاوازی ئەو خەڵکەی لەوێ نیشتەجێ بووە ناوەکەی گواستۆتەوە بە پێی زمان و تێگەیشتنی خۆیانەوە. ناوی(کانی ڕەبەنان)([872]).

کە بە تەنیشتیدا تێپەڕ دەبوون کاتێك لە گردکانی دەهاتن و دەچوونە دێرەکە، هیچ شوێنەوارێکی نەماوە لەو شوێنانەی ئێستادا(شوێن باسکردنێکی زمانەوانیە، یان مێژوویە بۆ ڕچەڵەکی ناوەکانی شوێنە جوگرافیەکان ـ وەرگێڕ).

زۆری کانیاوەکان و جۆگەلەکانیان کە بە ناوچەکە دا دەڕوات وامان لێ دەکات توانامان نەبێت بۆ خستنەگەڕی هەوڵی تر بۆ دیاریکردنی شوێنەکانی ڕەبەنەکان بە وردی.

پێشتر ئاماژەمان بە کانیاوێك دا بە ناوی(کانی دێر)، تۆما دەربارەی ئەم کانیە دواوە و شتێکی باس کردووە بۆدج تێی نەگەیشتووە بە شێوەیەکی ڕاست([873]). وتوویەتی: ئیشۆعیاو بنێرە کە کێ(نۆکەندەکە هەڵدەکەنێ) لە توانادا بێت زەویەکانی پێ ئاو بدرێت بە درێژایی ڕێڕەوی جۆگەکە. بەلأم لە ڕاستیدا ئەو ویستوویەتی ئاوی کانیەکە بەرێتە ناو تەنکیەکی ئاو لە دێرەکە دا. یان وەك خەڵکی ناوچەکە دەڵێن(گلدانەوەی ئاوەکە). ڕێڕەوی کەناڵەکە لە کۆن دا هەیە و لە سەر دەمانێکی زۆرەوە. بەلأم یەك جار لە هەفتەیەکدا ـ ئەو ڕۆژەش یەکشەممەیە ـ ئاوەکە گل دەدەنەوە و ئاراستەی دەکەن بەرەو تەنکی دێرەکە بۆ پڕکردنەوەی و هەروەها ئەو گلدانەوەیە کە بۆ ئاوە کەمەکان دا دەکرێت هەر وەك(باکۆس) یش دەیکرد ئەمە کارێکی نوێ نیە. باکۆس شێخێکی شۆخ و شەنگ بوو زۆر حەزی بە گاڵتە کردن و مەکرکەری هەبوو.

حەفتانە لێڕاهاتبوو کە بەشی خۆی ئاوەکە ببڕێ لەو ئاوە بۆ ئاودانی درختە زەیتوونە تایبەتیەکانی خۆی کە زۆر لە دڵیدا ئازیز بوو. لیستێك لە ناوەکان دا ماوە و زیندووە و

بەکاردەهێنرێت ئەگەرچی ١٠٠٠ساڵ بەسەر بەکارهێنانید ا تێپەڕ بووە، واتە لە ڕۆژانی تۆما مەرگەییەوە.

ناوی ئەو زەویانەی(بێت حەببا) تاوەکو ئێستاش دەوتری بە سەر زمانەوەیە لە ڕێگەی ناوی دار زەیتوونە بەناوبانگەکە بەناوی(درختی حەببا) و شوێنەکەی نزیك گوندی خربەیە. هەروەها دەربارەی ئەو ڕێگەی لێژ دەبێتەوە کە دەکەوێتە نێوان سەری کانی و بێت عاوی کە ئێستا پێی دەڵێن(ڕێگەی شیکۆن، شیکون)([٨٧٤]).

بەڵام شوێنەکە پێی دەڵێن بەردە تشینیکێ) کە دەکەوێتە سەر ڕێگەی سەرکانی تێپەڕدەبێت بەو ناوچەیەی دەکەوێتە سەرووی گوندی خربە. ئەو ناوچانەی تر کە تۆما ئاماژەیان بۆ دەکات هیچ شوێنەوارێکیان نادۆزینەوە لەوانە: باخچەیەکی زەیتوونی فراوانی سەر بە دێرەکە([٨٧٥]).

خەرمانە ناسراوەکان بە ناوی(ئیوزی دەباراس) کە ئاماژەیە بۆ سنوورەکانی کۆتایی بۆ موڵك و ماڵی دێرەکە([٨٧٦]).

پاوانەکانی ناو دارستانەکان کە بە ناوی دێرەکە و سەر بە دێرەکەن، عاوی وشەیەکی ئارامی ـ سریانیە بە عەرەبی واتە دارستان ـ وەرکێڕ).

لە رووی جوگرافیەوە دەکەوێتە ئەو دۆڵەی نزیك گۆڕستانەکە، کە ئەویش شوێنەواری نەماوە([٨٧٧]). هەروەها شوێنەواری(تلادزالێ) بزرە([٨٧٨]). و (بازێوە، بازیوە)([٨٧٩]).

جگە لەو هەموو شوێنانەی کە شوێنەوارەکانیان بزر بووە، لەمانە: ئاشی(باوردا)([٨٨٠]).

کە موڵکی بەتریکخانە بووە دەکەوێتە نزیك(شارمن).

وە هەروەها دێرێك ناسراوە بە(دێری مەلعونان) و بە پێی ئەوەی دەوترێ بە هیچ شێوەیەك رەبەنی تێدا نیشتەجێ نەبووە. ئەم دێرە وەلا نراوە بە پێی داب و نەریتی نوێ لە مێژووی بێت عاوی. ئەو دێرە کەسێك دروستی کردووە بە ناوی(هۆگر) لە جێگەیەك دەکەوێتە نێوان(شۆش) و(شارمن) و شوێنەکە ناسراوە بە(هوێگر ئاباد)([٨٨١]).

دواتر پێویستە ئاماژە بە بزربوون و نەمانی دارچنارەکان و شوێنی بتەکان بدەین کە لادراون لە پێناو دروستکردنی یەکەم بینایە بۆ دێرەکە، کە لەلایەن(ئیشۆع دناح) ئاماژەی پێ دراوە لە نووسینەکانیدا([٨٨٢]).

## سێ کەنیسەکەی دێری بێت عاوی

لەو ماوەیەی کە پەرتووکی(سەرۆکەکان) باسی دەکات، لە دێری بێت عاوی سێ کەنیسە دروستکراوە یەك بە دوای یەك. سەردەمی ئەو کەنیسانە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی شەشی

زەینی. بینایەکان بەکەرپووچی وشك بووە؟ شوێنەکانیان لەنێوان دوو دۆلەکە بووە لەسەر بەرزاییەکی باش دروستکراوە بۆ ئەوەی پارێزراو بێت لە بەردەم تەوژمەکانی ئاوی بارانی وەرزی کە دێت و کە زۆر جار هەرەشەی هەلکەندنی دەکات لەبناغەوە([٣٨٣]).

لەناوەراستی سەدەی حەوتەم، بەتریك (ئیشۆعیابی سێیەم) یەیکەری کەنیسەیەکی دووەمی دروستکرد بەخەرجکردنی پارەیەکی چاك.دیوارەکانی کەنیسە نوێیەکە ئەستورو بەهێزبوون، لەپێناو جێ بەجێکردنی ئامانجی پاراستنی بینایەکەو هەبوونی بەرگری بۆ بارە سروشتی یەکان.بەتریك فەرمانیدا بەهێنانی خۆڵێك(قسل) لە چەشنێکی تایبەت لە سیرامیك کە لە حەدیسە هەیە و چەشنەکەی باش و بەناوبانگە: (هاوشێوەی نەبوو) لەبەر ئەوەی باشترین و بەهێز ترینیانەو لە گەچ بەهێزترە کە ئەو کات باوبووە، بەلام کەرەستەکانی تر لە حدیاب هێنراون([٣٨٤]). بەدلنیاییەوە ئەم خۆلە سەر سورمێنەرە یارمەتیمان دەدات بۆ زانینی شوێنی کەنیسە نوێیە کە بە تەواوی بەلام ، وە زۆر بەداخەوە هیچ کەسێکی خربە نازانێت شوێنێك کە پاشماوەی بینایەك بوو بێت لە ناو زەویەکانیدا(هاوشێوەی نەبوو) ئەم گێرانەوەیە تۆما مەرگەیی تەئکید دەکات کەباسی دەکات چۆن ڕەبەنەکان ئەو ماوە بەکەلکانەیان دزی (خۆل) کە بە نرخ بوو دوای دا تەکاندن و رامالینی دا بەهاندانی سەرۆکەکەیان وە بەهۆی فێلبازیەکی دارێژراو بەسەر بێ گوناهی پێچراو کە لەلایەن سەرۆکی دێرەکە بووە([٣٨٥]). وەلام بۆ ئەم پرسیارە لەسەر شوێنی کەنیسەکەی دووەم جار، دەلێن: ئەم کەنیسەیە لەشوێنی کەنیسەی یەکەم نەبووە، وە نەلەشوێنی بتەکان مادام تۆما بۆمان باس دەکات بەراشکاوی و بەس لە سەر شوێنی کەنیسەی یەکەم دا لەو شوێنەی کە تێیدا دروست کراوە([٣٨٦]).

ئەوەی پەیوەندی هەیە بە کەنیسەی سێیەم دەلێین(دروستکردنی دوای سەدەیەك لە زەمەن بووە و لە سەر دەستی میتراپۆلیتی حدیاب(ئیشۆعیاو) بووە و شوێنەکەی هەمان شوێنی ئەوانەی پێش خۆی بووە. کەنیسەی دووەم تووشی داڕووخانی تەواو هات و ئەو خاك و خۆلەی(هاوشێوەی نیە) بە تەواوی دزرا، جەستەی ئەو قەدیسانەی لەوێ نێژراون لە هۆلی کتێبخانەکەدا پارێزراون([٣٨٧]).

بەم شێوە دەست کرا بە دروستکردنی کەنیسەی سێیەم، کەرستەکانی بەکارهێنرا بۆ دروستکردنی هەندێکیان خۆجێیی بوون وەك بەرد و گەچ و کەرپوچی شووراو و کلس و گەچی دروست کراو لە بەردە دەرهێنراوەکانی کانەکانی چیای(بارحیتۆن) کە دەکەوێتە بەری تری ڕووباری زاب کە بە کەلەك هێنراوە و دواتر بە پشتی ولاخ گواستراوەتەوە([٣٨٨]).

دەقە تایبەتەکەی بابەتی گەچی بەکارهێنراو: کەرستەی سەرەتایی بە کەڵەك دەهێنرا بۆ شێخ لالا کە سەر بە دێرەکەیە، دواتر بەسەر دەخرێت بۆ شوێنی بیناکە.
شێخ لالا کە بودج بەکاری هێناوە و لە پەرتووکەکەی وەریگێڕاوەتەوە بە بینایە. من خۆم هەوڵی زۆرم دا لێکۆڵینەوە بکەم بۆ ئەوەی بە درێژی باسی بکەم بەڵام بێهودە بوو بە پێی ئەوەی لە فەرهەنگی(ئۆجین مەننا) دا هاتووە(کلدانی ـ عەرەبی) واتاکەی ئەوەیە: گۆڕەپان یان خەرمان، لێرە مەبەستی رۆخ یان کەنار رووبارە یان گۆڕەپان بەکاردێت بۆ کۆکردنەوەی کەلوپەلانەی بە هۆی کەلەك گەیشتوونەتە ئەوێ یان بۆی ناردراوە. لەو گۆڕەپانە گەچەکە بار دەکراو بەسەر دەخرا بۆ سەرەوە کە شوێنی بیناکەی لێیە(بە بڕوای من ئەو وشەیە رەنگە بەو واتایە بێت: جێگەی(کورە) واتە کورەی گەچ کە لەوێ بەردەکان دەسووتێنرێ دواتر دەهاڕدرێ بە رێگەیەکی سەرەتایی بە هۆی ئاژەڵ کە باگوردانێك بە دوای خۆی رادەکێشێ بە سوڕانێکی رێك و پێك تا دەبێتە گەچێکی ئامادە کراو بۆ بەکارهێنان ـ وەرگێڕ).
دوای تەواو بوونی بیناکە میتراپۆلیت ئیشۆعیاو جەستەی قەدیسەکانی گواستەوە بۆماڵی شەهیدان کە بۆ جاری دووەم نێژران. ئەم مەترانە کۆچی دوایی کرد پێش ئەوەی هەموو پرۆژەکەی تەواو بێت کە دەیویست دێرەکە بە تەواوی بە بەرد و گەچ دروست بکاتەوە([٨٨٩]).

## کورتەیەك لە سەر باری تۆپۆگرافیاییدا

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کورتەیەك لە سەر رێکخستنی زانیاری تۆپۆگرافیایی کە لامان دەست دەکەوێت بکەین، وە دەتوانین بزانین شوێنی دێری بێت عاوی لە کوێیە. تێبینی یەکەم کە پێویستە لە سەرمان رەچاوی بکەین ئەوەیە: لێکۆڵینەوە و بەدوا گەڕان لە شوێنی دێرەکە لای باشوور نزیك بە گوندی خربە کە نزیك ئاکرێ یە. لەبەر ئەوەی رۆژێکی تەواوی پێویستە بۆ پڕ کردنەوەی تانکی یان گلدانەوەی ئاوی دێرەکە بە ئاو، کەواتە شوێنی دێرەکە پێویستە نزیك لە جۆگەیەك ئاو بێت و ئاوەکەی گرنگ و زۆر بێت بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەبەستەو لەو ساتەوەختەدا.
جۆگە ئاوی کانیەکە دەکەوێتە سەرووی خربە تاکە سەرچاوە ئاوەکە ئەوەی پێ دەکرێ. سەرەڕای ئەوەش، کەسەر دەکەوێت بەرەو سەرچاوەی ئاوی کانیەکە، لەلای دەستە ڕاستمانەوە لووتکەیەکی بچووك هەیە ئامازە بۆی دەکات لەسەرەوە. خاسیەتی دووەمی دێرەکە بەرزترە لەشوێنی (گردی قەشان) وە دەتوانی لەوێوە ببینرێ.دواتر،کاتێك

شوێنەکە دەدۆزینەوە شوێنەواری زۆری لێیە لەگەڵ باسکردنەکەدا دەگونجێ، کەواتە لەسەرمانە بینایەی کەنیسەکە بدۆزینەوە.کەشوێنەکەی دەبێ بەرزتر بێت لەشوێنەوارەکانی تردا لەبەر گرنگی بینایەکە بە بەراورد بە بینایەکی تردا. وە لەوانەیە تەنها ئێمەوە بەتەئکید باشماوەی گەچەکە بدۆزینەوە کە بەکارهێنراوە لەدورستکردنی بیناکە، بەلأم بەشەکانی تری بینایەی دێرەکەی تر مادەی گەچی تیا نادۆزینەوە بەکارهێنرا بێت. لە کاتی دۆزینەوەی شوێنەواری دیوارەکانی بینایەکە بەو مادە ڕق و بەهێزانە نیشانەی ئەوەیە ماوەیەکی زۆر پێش ئیستا دروستکراوە بۆ سەردەمی تۆما.لەتوانادایە کەنیسەکە بدۆزینەوە بەهۆی ئەستووری دیوارەکانی کە هاوشێوەی ئەستوری ئەو بینایانەیە کە لە هەمان ماوەدا لە ناوچەکە دروستکراون کە ئەستوری زیاتر لە مەترێك دەبێت. ئاراستەی بینای کەنیسەکە بەرەو خۆرهەلأتە نیشانەیەکی زێدەیە بۆ زانینی بینایەی کەنیسەکە بەتەواوی، لەدوای دیاریکردنی شوێنی کەنیسەکە بەدڵنیایەوە، ناسینی بەشەکانی تری بینایەی کەنیسەکەی تر کارێکی هاسانترە کە دەتوانین لە دوارۆژدا بەو هیوایەی هەندێك گۆرستان و نووسینەوەی بدۆزینەوە. بەپێی ئەو دەقانەی لە بەردەستماندایە،لێرەدا سێ کۆمەڵە قەبر هەیە.کۆمەڵەی یەکەم بریتیە لە قەبرە بەجێماوەکان لەماڵی شەهیدان لەناو کەنیسە وێرانکراوەکە([٨٩٠]). لەناو ئەوانەدا پێنج تابووتی بەردی هەیە دەگەرێنەوە بۆ پێنج میتراپۆلیت وە(١٨)هەژدە قەبر دەگەرێنەوە بۆ مەترانەکان ومیا ئەساقیفەکان. پاشماوەی گۆری ماریەعقووب ([٨٩١]). وە هەروەها گۆری قەشەکانی تر کەلەو شوێنە هەیە([٨٩٢]).(میتراپۆلیت ئیشۆعیاو) هەڵساوە بە گواستنەوەیان بۆ ماڵی شەهیدانی نوێ. دواتر ئەبێ ئەوە روون بکەینەوە کەوا ئەو قەبرانەی کە هەیە لە ناو پەرستگاکەدا کە ڕەبەنەکان هەردەم نوێژی فەرزیان لەناودا دەکرد([٨٩٣]). دەگەرێنەوە بۆ هەندێك لەسەرۆکەکانی دێرەکە لەوانە"ڕەبەن گۆرگیس حدیابی بەرصەن(خەڵکی نیسرا موکنی) یە"بار صیادی" ومیا کوری راوکەران ومیا راوکەری ماسی، وە(ساما)ی برای، وە قەشە نەشنائیل،وە قەشە صلیوە،وە ڕبەن گەوریێل کەناسراوە بە(سیفرۆنا) ئەمە پەیوەندی هەیە بە بابەتی قەبرە تاك تاکەکان. جگە لەم سێ کۆمەڵەیە لەوێ کۆمەڵە قەبرێك هەیە واتە گۆرە بەکۆمەڵەکان شوێنەکەی نزیك(بێت صلۆتا) یە – واتە ماڵێ نوێژ کردن .([٨٩٤]). رەنگە لە تواناماندا هەبێت ئەو قدووەی کە نەخش و نیگار کراوە لە بەرد هەلکەندراوە لە سەری خاچێك و جەستەی دوو لە کارو بیمەکان کەزەخیرەی(واتە ئیسك و پروسك) نێردراوەکانی تیایە کە دزراوە لە ئەنتاکیا لەلایەن(ئیشۆ عیاو) وە بەرەچەلەك خەلکی(قوبلانا)یە([٨٩٥]).

## دۆزینەوەی شوێنێك

لەكاتی گەڕان و پشكنینیان لەو ناوچەیەی دەوروبەری گوندی خربە شوێنیك دەدۆزیتەوە لە دەوروبەری خربە پێی دەڵێن(عێنادگۆزا) پێم وایە ئەمە مەبەستی كانی گوێزە نەك كانی مەرگە ـوەرگێر).
بە پشكنینێك كە پێشتر خەلكی گوندەكە پێی هەڵساوە بە بەر چاوان كەوتووە پارچەیەك لە دیواری بەهێز بە بەرد دروستكراوە. بەلآم شوێنەكە دەكەوێتە قوولآیی دۆڵەكە و لە ناوچیە دا دەكەوێتە ژێرەوەی ئەو شوێنەی ناسراوە بە گردی قەشان.
دوای لێكۆڵینەوە لە شوێنەوارەكە دەركەوت ئەوە پاشماوی ئاشە. لەو شوێنەی پێی دەڵێن(حیلیتا) شوێنەواری دیوارێك دەدۆزینەوە بەلآم زۆر گرنگی پێ نەدراوە بەهۆی ئەوەی تووشی لەناو چوون بووە و لەتواناماندا نەبوو بە دیواری كەنیسە یا بینایەی دێری دابنێین. دوای دوركەوتنەوەمان لە هەموو شوێنەكانی تر كە رەنگە شوێنی دێرەكەی تیابێ. دەگەڕێنەوە بۆ شوێنە ئاساییەكەی خۆمان، یا جێ خەرمانی گوندی خربە([٨٩٦]).
لێرە هەموو مەرجە داخوازیەكان بە پێی دەقەكان هەیە سەرەڕای لێك جووت بوونی ماوەكان لە سەر زەوی كە لەگەڵ دەقی ناو پەرتوكەكان. ئەو شوێنە تەواو دەكەوێتە رۆژهەڵاتی(حیلیتا)(خیلفت).(واتە شوێنیكی پیرۆز و مقدس و كاری سەر سوڕهێنەری لێ روویدا، جا ئەو شوێنە پیاو چاكێك یا مەزارێكی پیرۆزی لێ هەیە بۆیە بەو شوێنە بە (سریانی) دەڵێن حیلێتا/بەتوانا/بەهێز- (وەرگێڕ).
گەیشتن بۆ حیلیتا پێویستە بە(رێشادعینا ــ راس العین سەرچاوەی كانیاو) ە كەوا تێپەربین([٨٩٧]).
هەروەها ماوەی چوارمیل دەبێت و بەلای باكور بۆ گەیشتن بۆ ئەو جێگەیەی دەكەوێتە بەری دووەم لە رووی چیای ناسراو بە(كبیسا) بەڵام ئەمرۆ ناوەكەی(كووبا) یە([٨٩٨]).
ئەمە لەلایەك، بەلآم لە لایەنی دووەم ئەو ماوەیە لێرەوە بۆ حیتوون كە دەكەوێتە پشت زاب لە بەری رۆژئاوادا لە دێری بێت عاوی دە میل دەبێت([٨٩٩]).
پرسیاردەكەین لێرە چی دەبینین؟ یەكەم شت كە دەدۆزینەوە كێلگەیەكی فراوانە لە كاولگە لای باكوری خۆرهەلآتی بەرزترە لە زەویەكانی تری كێلگەكە و دیواری تیا دەدۆزینەوە بە ئەستوری زیاترەوە.
لەكۆتایی سنورەكەدا لەم ناوچەیە، دەبینین بەختی زیاتر هەیە بۆ ئەوەی بینای كەنیسە بێت. لەم جێگەیە چالآییەك هەیە دەمی كراوەتەوە، بۆیان باسكردم كەوا بیرە، لەچوونە ناوچالآییەكە دەردەكەوێت ئەمە پێچەوانەیە، چالآییەكە بریتیە لە گومبەتێك لەسەر

بیناییەك ڕێگەی هاتنە ژوورەوەی بەلای خوارەوەیە. لەو جێگەیەی کەدوور نیە لە چاڵەکە دەبینین کەوا زەویەکە تەختایی نیە ئەم زەویە سەرنجی ڕاکێشام.
لە دوای هەڵسان بەرامالینی خاك و خۆڵەکە و بەخێرایی بەردێکی گەورە لەبەردەم دا دەرکەوت، ڕوون بۆوە کە ئەوە دەرگایەکی ترە بۆ چوونە ناو بینایەکە کە لەژێر گومبەتەکەدایە.
لە دوای لابردنی بەردەکە توانیمان بچینە ناو ژوورێك بە دیواری بەهێزەوە. بە هۆی نەبونی کات و نەبوونی کەل و پەل و ئامێری پێویست نەمتوانی لێکۆلینەوەکە تەواو بکەم بۆ دۆزینەوەی نهێنیەکانی ئەو بینایە.
لە بەر ئەوەی زەویەکە بە چۆلی بە جێماوە، زۆر هاسانە کەوا بتوانین دیوارە ئەستورەکان لابەرین و ئەوەی شوێنەوارە لە توانامان دایە بگەینە(مەزبەح)ی تایبەت بە کەنیسەکەو دۆزینەوەی بەکارهێنراوەکانی تر کە سودیان گەورەیە([٩٠٠]).

## تەواوکەری نووسینەوەی مێژوو

بودج لە نوسینەوەی مێژووی دێری بێت عاوی راوەستاوە لە ساڵی ٨٣٢. لەم ساڵەدا تۆمە مەرگەیی رەبەن بووە لە دێرەکە([٩٠١]) دا.
بە پێی ڕای زانای ئینگلیزی و رۆژهەلاتناس بودج، کەمێك گومان هەبووە کەوا رەبەنەکان تووشی بلاوە پێکردن بوون لە بێت عاوی. ئەم بلاوەپێکردنە لە هەمان مێژوو رویداوە. ئەو زانیاریانەی پەیوەندی بە مێژووی سەرەتاکانی بێت عاوی هەیە نیە و هیچ دەربارەی نازانین، بەلام لە سەر ئەوەشەوە، رەنگە بینای ئەو دێرە(ژێرزەمینێك) یا شوێنێکی لە بارو گونجاو هەبووبێت بۆ هەندێك لە رەبەنەکان و بۆ چەندین ساڵ.
لە واقیعدا چەند دەستنووسێك هەیە لەو دێرە دا نوسراون. ئەو دەستنووسانە نیشانەی گەڕانەوەی ژیان بووە بۆ ئەو دێرە لە ماوی سەدەی سێنزەهەمی زاینییەوە. بەرێز گۆرگیس عەواد([٩٠٢]). توانیویەتی سێ لەوانە بژمێرێ و ئێستاکە لە موزەخانەی بەریتانی دان([٩٠٣]).
ئەم دەستنووسانە لە نوسینەوەدا تەواوکراون لە نێوان ساڵانی ١٢٠٧و ١٢٨٩ و دەستنووسێکی ئینجیلی پیرۆز هەیە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٢١٨، نووسەرەکەی رەبەن(پاوالاها) بووە لە دێری بێت عاوی لەسەر حیسابی کەنیسەی(بی بوزی)([٩٠٤]).
هەروەها دەستنووسێك بۆ پەیمانی نوێ (واتە ئینجیل) بەدوو بەرگ دەگەڕێتەوە بۆگوندی(خربە) ئێستا پارێزراوە لە مەترانیەی ئاکرێ([٩٠٥]). مێژووی ئەو دەستنووسە

دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دوانزە یا سێنزەهەم. لەوانەیە سەرچاوەکەی دێری بێت عاوی بوو بێت. ئێستا پرسیار دەکەین، ئایا رەبەنێك هەبووە بەناوی(ڕام ئیشۆع) لە بێت عاوی نیشتەجێبوبێ لەساڵی ١٤٥٢؟

بەتەئکیدی بەپێی زانیاریەکانمان کە باوەڕی پێدەکەین ئەو دێرە لەو مێژووەدا بوونی هەبووە و چالاك بووە، بەڵام هیچ بەڵگەیەکمان نیە کەوا پشتی پێوە ببەستین و تەئکید لەهەبوونی ئەو رەبەنە بکات کە مێژووی(شێخ عادی الخیالی) باسی دەکات و نووسیویەتی کە ئەمە دانەری ئەوە. لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو بابەتە دەکەین کاتێك باسی ئەو مەزارە ئێزدیە دەکەین. قەشە Veste بەو نزیکانە لێکولینەوەی کردووە لەسەر یەکێك لەبەرگەکان کەناوی رەبەنەکانی تیانوسراوە(رەبەنەکانی دیری بێت عاوی) وە مێژووی نوسینەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٥٦٤([906]). کەواتە سەرچاوەی ئەو بەرگە دێری بێت عاوی بووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەوا ئەو دێرە زیندوو چالاك بووە تاوەکو سەدەی حەفدەهەم ([907]). بەپێی دەرهاوێشتەکان ئەوە و ئەوکارە ڕویداوە، بەپێی ئەو ڕاپۆرتەی کەلەلایەن بەتریك ئیلیای هەشتەم بۆ پاپا پۆلسی پێنجەم ئاراستەی کردوە لەساڵی ١٦١٠([908]) . لەم راپۆرتەدا چیرۆکێکی غەمناك هەیە بەڵام بەبێ دیاریکردنی مێژووەکەی، بەڵام لەئەنجامی دەقەکە دەردەکەوێ کەوا ڕویداوە لەدوا چارەگی سەدەی شانزەهەم.لەواقیعدا ئەو روداوە بووە بەسەر سەرۆکی دێری مار یەعقوب Jnterlucus ئەو کات کەپێیان دەگوت(گریگۆرێوس). چەوسێنەرەکان ئەو رەبەنەیان بردوە کەرەبەنێکی قەدیس بووە ستەمکاریان لەدژی کردووە بردویانە سەر لوتکەی چیایەکی بەرز وە لەوێدا فرێیان داوەتە خوارەوە بۆ قولایی دۆڵەوە کە بەسەریدا دەروانی ئەو چیایە هەموو ئێسکەکانی تێك و پێك شکان و کەلەی سەری وردووخاش بووە گیانی لەدەستداوە دوای ئەوەی ئەشکەنجەو ئازارێکی زۆر دراوە. رەنگەشوێنی روداوەکە(خەردس) بێت چونکە تاوەکو ئەمرۆش پوش وپاوانێك هەیە پێی دەڵێن(گریگۆر). لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمە دەبینین دێرەکە یەکسەر لەناو نەچووە دواتر، لەبەر ئەوەی هەمان بەتریك، واتە بەتریك ئیلیای هەشتەم مایەوە دێری بێت عاوی لەنێوان دێرە گەورەکان دادەنێ کە بە شوێنی حەوانەوە و پشوودان و برسیەکانی خواردەمەنی دادەنێ کەوا لەوێ پێی تێر دەبن، ئەمەو سەرەڕای ئەوەش کەوا شوێنێکی لەبار بووە بۆنیشتەجێبوونی رەبەنەکان و پیاوە لەخوا ترسەکانی پاراستوە و نوێژی بەردەوام بەرێکی تێداکراوە([909]). بەڵام لە سەرمان پێویستە ئەوە بەیاد بێنینەوە بە هەمووترش و تاڵیەکەوە بەسەر ئەو دێرە لەمێژین و دەروشاویە هاتوە، وە بەهەموو ئاهێکی راستەقینەوە لەبەر ئەوەی لە خودی ئەو دێرە ئەم جاسلیقە(بەتریك)ە

ژیاوە بە دڵەراوکێوە بەهۆی هەرەشەوە کە ئاراستەیکراوە وە زۆر ئەشکەنجە و ئازار و لێدانی پێکەوتووە کاتێك گیراوە لە هەمان ئەو راپۆرتەی ئاراستەی پاپا پۆلسی پێنجەم کراوە پەتریك دەڵی:(لەم دێرەدا ٣٨ قەدیس هەیە نێژراون لە ماڵی شەهیدان چاوەرێی هەڵسانەوەن بکەونە بەر بەهەشتی بەرینەوە، ئەمە جگە لە ٧٠ لاشەی تر دەگەڕێتەوە بۆ مەتران و ئەسقەفەکان لە دێر زەمانەوە نێژراون([٩١٠]). بەلاَم ئەمرۆ مەگەر چۆن ئێمە بتوانین بچینە سەردانی ئەو دێرە بۆ ئەوەی قەداسێکی خودایی لەوێ بکەین، هەموو ئەوە لە ئەنجامی لاوازی و بێ توانابیمانە.

٢ـ ناوچەی سەبسەبا

مێژونوس هوفمان([٩١١]) شوێنی دێری بێت عاوی دیاریکردووە لە جێگەیەك دەکەوێتە ئەو ناوچەیە. بە شێوەیەکی گشتی ناوچەی سەبسەبا دەکەوێتە ئەو زەویانەی لە ناو سێگۆشەکەدان کە بریتیە لە زنجیرە چیای ئاکرێ لە باکوور، رووباری خازر لەلای رۆژئاوا، لەلای رۆژهەلاتەوە رێگەی ئاکرێ ـ مەندانی نوێکە بە شێکە لە و رێگەیەی کە لە موسلەوە دێت زۆر لەو گوندانەی کە دەکەونە رۆخ چیاکان رۆلی گەورەو گرنگیان بینیوە لەمێژووی ئەو دێرە. ئەم گوندانە بە پێ هەلکەوتنی جوگرافیان وە بە ئاراستەی رۆژهەلاتی رۆژئاوای ئەمانەن: (خربە یەکێکە لەم گوندانە، دوای ئەو(سەرکانی) دواتر (خرپدس) دواتر (گندك) دواتر (شووش) دواتر(شارمن) دواتر و کۆتایی(خلافت).

خربە

بەپێ دەقەکانی پەرتووکی(الرؤساء) ئەم گوندە بوونی نیە تەنها بەناو نەبێت([٩١٢]) تۆما مەرگەیی باسی دەکات دەربارەی خربە دەکەوێتە ناوچەی سەبسەبا ئەمەی خوارەوەیە:(گوندێکە دەکەوێتە سەبسەبا وە لە باکووری دێری بێت عاوی، ئەم ناوەی وەرگرتووە لە ناوی کەنیسەکەوە) لێرەدا ئەوە تێبینی دەکەین کەوا هیچ باسی خەلکەکەی ناکات وە هەروەها لە سەرمانە ئەم تێبینیە بکەین کەوا(بادجر) کەلەو ناوچەیە بووە لەسالی ١٨٥٠ ناوەرۆکەی P. voste دایناوە([٩١٣]). (یانزە ١١) دەسنوس هەیە بۆ گوندی خربە لە واقعدا هیچ دەسنووسێك نیە کەلە سەر نووسرابن. بەپێ پەراوی Codex ژمارە. XXX (٣٠) تەنها یەك دەسنوس هەیە پێ دەلێن (کزا) دەگەڕێتەوە بۆ ئەم گوندە وە نووسینەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ماوەکانی دوایی(واتا ماوەی یەکگرتنەوەی بەرۆما) نووسینی ئەم دەسنووسە لە ئەلقۆش تەواو بووە لە سالی ١٨٥٣ لەسەر گوندی(خربە) بە تایبەتی وە لە سەر داوای بەرێز(مەتران ئێلیا سەفەر) مەترانی ئاکرێ. ئەو مەترانە کۆچی دوایی کردووە نێژراوە لە هەمان گوندا لە سالی ١٨٥٤. لە ئامارێك کە ناوی رێکخەرەکەی بزرە

دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی ساڵی ١٨٦٥([٩١٤]). ئەوە دەخوێنین ئەو کاتە بیست ماڵ هەبوو. دوای سێ ساڵ، واتە لە مانگی تەمووزی ساڵی ١٨٦٨، کوردەکانی خێڵی زێبار هێرشیان کردە سەر گوندی خربە . وەتوشی قەشە موشی(وەیا میشۆ) هاتن کە لە خەوێکی قوڵدا نووستبوو دایانە بەر گوللەو کوشتیان کە بە پشتە سەری کەوتبوو سێ قەشەکانی تر ئەمانەن(روفائیل)و(رەبەن داوید) ([٩١٥]). وە (زەیا) توانیان رابکەن لەگەڵ خەڵکی گوندەکە ئەوانەی کە لە ژیاندا مابوون . سەرەتا هەڵاتووەکان روویانکردە باغچەی کەنیسەکە کە دەکەوێتە سەر ئاکرێ. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو پەناگەیە سەلامەتی ئەوانی تێدا نەدەکرا لەبەرئەوەی یەکێک لە هەڵاتووەکان کە ناوی(تجونا)بوو بەخەنجەر لێیدرابوو لەکاتێک کە لە ژێر دار هەنجیرێك دانیشتبوو قەشەکان جیاکەیان بەجێهێشت و هاتنە خوارەوە بۆ گوندی (بانوری)وە لەوێوە بەرەو دێری رەبەن هورمزد. ئەم باسە درێژە بەهۆی هۆنراوەیەکی شیعری بەدەسمان گەیشتووە کە لەلایەن قەشەیەك دانراوە و ناوەکەی زانراو نیە وە خەڵکەکە دەیڵێتەوە بۆ باسکردنی ڕوداوەکە. وە هەروەها گۆرانیەکی دڵتەزین هەیە(انشوده نواح)(واتە گۆرانی سەردولکە)ی تر ڕێکخراوە بەشێوازێکی ئەدەبی و شیعری بەرز چێرۆکی هەمان ڕووداو باس دەکات. ئەم سروده لە دەستنوسەکەدایە کە ئیستا لە پەرتوکخانەکەماندا هەیە ([٩١٦]). (پەرتووکخانەی قەشەکانی دۆمنیکان - مکتبة الاباء - الدومنیکان -وەرگێر) تێبینیەك سەرنجمان ڕادەکێشی لەو درێژیەی کە تۆمارکراوە وە تیایدا کە ئەو گوندە بچوکە، ژمارەی خانوەکانی بیست خانوو تێپەر ناکات چوار قەشەی هەبووە. لەساڵی ١٩١٤ وە بەپێی نووسینەکانی بەرێز (تفەنگچی) لە گوندی خربە ئەو کات(٢٠٠) کلدانی هەبووە، قەشەیەك و کەنیسەیەك و قوتابخانەیەکیان هەیە. کەنیسە کۆنی گوندەکە لەژێر شەفەعەتی(ام اللە) بەتەواوی نوێکراوەتەوە دوای کرداری فراوانکردنی پێویستی بۆ کراوە. ئەم نۆیکردنەوەیە لە سەردەستی بەرێز بەتریك پۆلسی دووەم شێخو([٩١٧]) .جێبەجکراوە(کاتێك مەترانی عەقرە بوو - وەرگێر) ئەشکەوتێك هەیە دەگەڕێتەوە بۆماڕیۆحننان دەکەوێتە ناو باغچەکانی گوندەکە. قەشە خوری پۆلس خەڵکی تلسقف - نوینەری بەتریکی ئاکرێ بووە تاوەکو ساڵی ١٩١٨- هەڵساوە بە فراوانکردنی شوینەکە دوای ئەوەی گۆرانکاری تیاکرد بۆ پەرستگایەك. ناوبانگی ماڕ یۆحننا لە ناوچەکە فراوانە وە ئاهەنگی یادکردنەوەی بۆ دەکرێ لەهەینی سێیەم لەدوای جەژنی هەڵسانەوە ئەمرۆ لە گوندەکەدا(خربە) .نیشتەجێن (واتە ماوەی دوای پەنجاکان و پێش ناوەراستی شەستەکان لەبەر ئەوەی مەسیحیەکانی ئاکرێ گوندەکانی خۆیان بەجێهێشت و

کۆچیان کرد بۆ شارەکانی موسڵ و هەولێر). ١٦٠ کلدانی وە قەشەیەکی پیری بەساڵاچوو لە خزمەتکردنیاندایە (ژمارەکە لەسەر ژمێری ساڵی ١٩٦١) وەرگیراوە .

## سەرکانی ـ سەروکانی

ڕێش ئەینە ـ راس العین ـ سەرکانی، سەرچاوەی کانی، سەروکانی ـ گوندێکە لە گوندەکانی ناوچەی سەبسەبا. تۆما باسی دەکات وەك شوێنی لە دایك بوونی دوو لە ڕەبەنەکان(برا بوون) کە ئەمانەن: یاوالاها و قەشە قەرەداغ. هەر دوو برا دواتر بوون بە میتراپۆلیت([918]). هەندێك جار ناوەکە کورت دەکرێتەوە و دەبێت بە(ڕێشا) و بەس، واتە(سەر) ـ (بە زمانی کلدانی ـ وەرگێڕ).

بەم شێوەیە ناوی ئەو گوندە باس دەکرێت لە چیرۆکی هەوڵدانی(عیمڕان) بۆ دەست گرتن یان داگیرکردنی زەویەکانی ئەو دێرە ـ دێری بێت عاوی لە دەقەکان ئەوەمان دەست دەکەوێت([919]).

دەکەوێتە نێوان دێرەکە و گوندی خربە. ناوەکەی وەك دیارە باس کراوە([920]).

بە شێوەی کورتکراوەی وەك شوێنێك پەیوەندی هەیە بە ڕێگەی شیکون کە لە سەرەوە باسمان کرد. لە ئاماری ساڵی ١٨٦٥ ناوی سەرکانی دەدۆزینەوە کە باس دەکات چوار ماڵی کلدانی تێدایە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دا لەو گوندە هیچ مەسیحیەك نەماوە. نازانین کێ شەفیعی ئەو گوندەیە و نە ناوەکەی و هەروەها شوێنی کەنیسەکە و ناتوانین بە تەواوی دیاری بکەین.

سەرۆکی گوندەکە ئێستا پێی دەڵێن(ئەسعەد ئاغا) و باوەڕی وایە ماڵەکەی ئێستای/ خانووەکەی کەنیسە بووە. بەڵگەشی ئەوەیە کە ئەگەرچی بە چاو لار بۆتەوەو بەرەو داڕمان دەچێ تا ئێستاش بینایەکە بەهێزە هەر وەك لە کاتی دروست بوونی دایە. بۆیە وە بە پێی ڕای خاوەن ماڵ(سەرۆکی گوندەکە ئاغا) ئەو بینایەی پەیوەندی بە بینایەکی پیرۆز و تایبەت بە پەرستنی هەیە([921]).

خردس

ناوی خردس نەهاتووە لە نووسینەکانی تۆما مەرگەیی([922]). تەنها یەك جار نەبێت و باسکردنی ناوەکە وەك جێگەیەك تیایدا ڕەبەن باوای قوتابخانەیەکی تێدا دامەزراندووە کە دامەزراندنەکەی بۆ فێربوونی سروتەکان بووە. دواتر هەندێك لە خەڵکی خردس و ناسین لە ناو زنجیرەیەك لە پەرتوك دا وایان کردووە بنووسرێت.

چالاکی ئەم نووسینە لە سەر ئەم پەرتووکانە لە ساڵی ١٦٩٨ تاوەکو ساڵی ١٨٥٨. لە ساڵی ١٦٩٨ یووسف کوڕی مەتی داوای کردووە دەستنووسی پەیمانی نوێ(ئینجیل) بکرێ([٩٢٣]).

لە ئەلقۆش، بۆ کەنیسەی(مەریەمی پاکیزە) و بۆ هەمان کەنیسە و کاتێك بەرپرسی کەنیسەکە قەشە کۆرو داوای کردووە لە سەرۆکی گوندەکە کە ناوی داوەدە کوڕی ئەسکەندەر بووە لە ساڵی ١٧١٥(حزرا) ی بۆ بنووسنەوە(دەستنووسێکە بە قەبارەیەکی گەورە، کە نوێژە فەرزەکانی رۆژانەی تێدایە، کە بە کۆمەڵ بەکاردێت تاوەکو ئێستاش بەکاردێت لە کەنیسەی رەبەن هورمزدا. دواتر لە ساڵی ١٧١٦ پەرتوکی(کزە)([٩٢٤]).

نووسرایەوە، دواتر لە ساڵی ١٧٢٠ تەواوبوونی کۆمەڵێك لە ئاوازەکانی گۆرگیس وەردە نووسرانەوە تایبەت بە ژیانی خودا عیسای مەسیح([٩٢٥]).

کەنیسەیەکی تر هەیە هەمان سەرۆك و پیاو چاك هاوکاری کردووە، ئەم کەنیسەیە پێی دەڵێن گومبەتەکان(کوڕەکانی مارشمۆنی). لە ساڵی ١٧١٧ ئەو پیاو چاکە داوای کردووە بە هاوکاری قەشەیەك بە ناوی گوریئیل دەستنووسی وتار و ئامۆژگاریەکانی ئاینی و رەوشتی لەگەڵ دەقی تەواوی نوێژەکانی سروتی باعوسا نووسراوەتەوە([٩٢٦]).

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمی ز، بۆ ماوەی نۆ ساڵ قەشەیەك لە خردس ژیاوە بە رچەڵەك خەڵکی(بارزانە) ناوی داود بووە. پێشتر توشی ناوی ئەو قەشەیە بووین لە دەقەکانی سەرەوە لە ساڵی ١٨٥٤ هەڵساوە بە نووسینەوەی بەلای کەمی دوو بەش لە سفری پێغەمبەرەان([٩٢٧]).

دەستنووسێك بۆ وانەکانی لیتورجیا(سروتەکان) سەرچاوەکەی ئینجیلی پیرۆزە، نقمة لة سالي ١٨٥٨([٩٢٨]).

هەشت کەس لە خێزانی ئەم قەشەیە لە خردس مردن، بەلام خۆی ناچار بوو رابکات پێش ساڵی ١٨٦٣. ئەو کات ژمارەی ماڵە مەسیحیەکان لە خردس ١٢٠ ماڵ بوو. هێرشەکانی تالان و برۆ کوردەکان بە سەرۆکایەتی عوسمان ئاغا بوون و قەشە داودیان لە گوندەکە دەرکرد و خەڵکی گوندەکە لە مەسیحیەکانیان ناچار کرد گوندەکە چۆڵ بکەن و لێی دەربچن بۆ هەتا هەتایە. بە پێی ئاماری ساڵی ١٨٦٥ تەنها حەوت ماڵە مەسیحی مابوون بەرێز قەشە تفەنگچی ناوی ئەو گوندەی نووسیوە بە(هەردێن)(یان رەنگە خەردێز بێت ـ وەرگێڕ).

بەلام ژمارەی مەسیحیەکان لە ساڵی ١٩١١ بە ١٢٠ مەسیحی دیاری دەکات قەشەیەك و کەنیسەیەکی بچوکیان هەیە، بە(کەنیسەی پاکیزەی گەورە باس دەکرێت. ئەم کەنیسەیە تاوەکو ئێستاش بینایەکەی وەك خۆیەتی و بە سەرکەشییەوە ماوەتەوە. لە تەنیشت کەنیسەکە گۆڕستانێکی فراوان هەیە ژمارەی مەسیحیەکان ئێستا لە بیست کەس تێپەڕ

ناکات و قەشەیان نیە لە نزیک گوندەکە(پاوانێك) لەوەرگەیەك هەیە پێی دەڵێن(پاوانی مارگریگۆر) رەنگە ئەو ناوە لەوە هاتبێ بۆ ئەو پاوانە بۆ یادکردنەوە و زیندووکردنەوەی ناوی سەرۆکی(دێری بێت عاوی شەهید). بەلام کانیاوی تایبەت بە گوندی خردس پێی دەڵێن(کانی قاشا) واتە کانی قەشان. لە لای باکوری گوندی خردس ئەشکەوتێك هەیە پێی دەڵێن ئەشکەفتی(مازۆن).(ئەشکەوتی مەزن). زۆر سروشتیە کەوا مەسیحیەکان ئەو ئەشکەوتە بۆ رەبەنەکان دەیگەرێننەوە کە تیای نیشتەجێ بوون و ناوەکانیان نازانن.

نیرم کوندوك

ئەم ناوەیە دوو برگەیە دەگەرێتەوە بۆ ئەو گوندە بەم ناوەوە. برگەی یەکەم لە ناوەکە تاکەکەی ئاساییە لە ناو مەسیحیەکان باوە و لە دەقە کلدانیەکان دەیدۆزینەوە بەلام برگەی دووەم زیاد کراوە و نوێیە و بە زمانی کوردی واتە(گوند). لە سەرەتادا پێویستە وریا بین و جیایان بکەینەوە لە نێوان نیرم کە دەکەوێتە ئێرە و باسەکەشمان لە سەر ئەوە، وە (نیرم دەراعاواسا) واتە (نیرم الرعاە / نیرمی شوانەکان) کەدواتر باسی دەکەین و دەکەوێتە ناوچەی (بیرتا) جێگەی داخە لەراستیدا کەوا گوندی نیرم کوندوك هۆکاری زۆر سەر ئیشەو نارەحەتی بووە بۆ رەبەنەکانی دێری بێت عاوی. جارێکیان سەگێکی بەرەلایان بۆ ناردون. وەجارێکیان جادوکەرێك(ساحرە)([٩٢٩]).

تۆما لە نوسینەکانی هیچ زانیاریەکی لە نوسینەکانیدا لە سەر خەلکی ئەو گوندە لە مەسیحیەکان وە نە لەسەر کەنیسەکەیان پێ نەداوین. لەکۆتایی سەدەی حەفدەهەم دا، ئەم گوندە قەشەیەك و سەرۆك (موختار)یکی هەبوو کە لەکارەکانیادا چالاك بوون و جیادەکرانەوە. قەشەکە ناوی(کاورۆ) کوری (خۆشابا) و سەرۆك (موختار) (شەمعوون) کوری (خودادا) بووە. هەردوکیان داوایان کردووە بۆ نوسینەوەی سێ دەستنوسی لەخۆشنوسەکانی ئەلقۆش. چونکە لەگوندەکانی ئەوان بەکاردەهێنران. یەکەم لەو دەستنووسانە مێژووی سالی ١٦٩٣ بریتی یە لە جیاکردنەوەکان بۆ نویژەکانی بەیانیان و ئێواران ، قەشە فۆستی ناوی نا: Ordo Sacirdotum([٩٣٠]). بەلام دووەم مێژووی سالی ١٦٩٨ لە سەر نوسراوە و تایبەتە بە ئینجیلی پیرۆز([٩٣١]) بەلام سێیەم نوسینەکەی لەسالی ١٧٠٠ تەواوکردوە، بریتیە لە سرودەکان و ئاوازە تایبەتە کانی رۆژانی یەك شەمە و جەژنەکان لەگەل باسکردنێکی پێویست بۆ سروتەکان و لیتۆرجیای نەستۆری([٩٣٢]).

دەستنووسەکەی ئینجیل دەستەواژەیەکی تیایە کەوا ئەو دەستنووسە نووسراوە بۆ بەکارهێنانی لەدێری مار عەودیشۆی قەدیس و رەبەنی بەرێز.کەدەکەوێتە تەنیشت گوندی ئامازە پێکراو، دەقی ئەم دەستەواژەیە رەنگە ئامازە بۆ ئەو گوندە نێرم بکات کەوا

کەنیسەی تایبەت بەخەومرنەکەی نەماوە. بۆیە کەنیسەی ئەم دێرە کەنیسەی خەڵکی گوندی (نێرم)ە. ئەم بارەمان توش دەبێ، کە بۆ چەند جارێك دووبارە کراوەتەوە لە ساڵی ۱۸۵۰، کاتێك بادجەر سەردانی کردووە.
ئەو کات گوندی(نیرم گوندوك) قەشەی هەبووە و لە دێرەکەدا ژیاوە و ۱۲ خێزانی کلدانی تێدا نیشتەجێبوونە و دوای ۱۵ ساڵ بەسەر سەردانەکەی بادجر، ژمارەی خێزانە کلدانیەکان کە لە گوندەکە نیشتەجێ بوون کەمبۆوە بۆ چوار خێزان و بەس.
لە ساڵی ۱۹۱۱، و بە پێی ئاماری قەشە تفەنگچی لەم گوندە ۱۰۰ کلدانی نیشتەجێ بوون و قەشەیەکیان هەیە. دەبێ ئەو تێبینیە بکەین زۆری ئەو ژمارانەی تۆمار کراون لە ئامارەکان دا ژمارەکان زیادەڕۆیان تێدایە. مایەوە هەندێك لە کلدانیەکان لەم گوندە نیشتەجێ بوون تاوەکو ساڵی ۱۹۲۵. لەم ساڵەدا قەشەی گوندەکە و ۱۲ کەس لە کلدانەکان کوژراون لە هێرشێك دا کە لەلایەن کوردە بارزانیەکان کراوەتە سەریان دانیشتوانی گوندەکە ئێستا هەر هەمووی کوردە کۆمەڵێك لە برایانی عیسا لە بچوکەکان هەڵساون بە دامەزراندنی دێرێك بۆ خۆیان لە دەوروپشتی ئەو گوندە کە بریتیە لە خانوویەکی بچوك دەکەوێتە ناو زەویەکانی دێری مارعەودیەشۆ لە تەنیشت گوندەکە. ئەم برایانە لەوێ نیشتەجێ بون لە ساڵی ۱۹۵۳ تاوەکو ساڵی ۱۹۵٦.

## دێری مارعەودیشۆ

ئەم دێرە دەکەوێتە دووری نزیکەی یەك کیلۆمەتر لە گوندی نیرم گوندوك و بەلای باکوری ڕۆژئاوای(شۆش) مێژووی دامەزراندنی ئەو دێرە و هەروەها ناوی دامەزرێنەرەکەی دیار نیە([۹۳۳]).
جەژنی یادکردنەوەی خۆجێیی ڕۆژی دووشەممەی دووەمە لە هەڵسانەوە . ئەم دەقە هیچ زانیاریەکمان ناداتێ دەربارەی ناسنامەی ئەو کەسە مادەم ڕۆژی دووشەممەی ئاماژە پێ کراو ئەو ڕۆژە تایبەتیەیە بۆ ئاهەنگێران بە یادکردنەوەی هەر ڕەبەنێکی خۆجێیی قەدیسدا.
هەر وەك(ئەبنی مارۆن) لە(تلسقف) و(مار ئۆدا) لە دهۆك. لە هەمان ڕۆژ ئاهەنگ دەگێڕدرێ لە(نسیریە) کە دەکەوێتە نزیك عێن سوفنا) بۆ یادکردنەوەی کەسێك پێی دەڵێن(مار عەودیشۆع) کە لەوانەیە هەمان مار عەودیشوع بێت کە بابەتی باسەکەمانە، ئەمە ئەگەر کەسەکە هەمان ناوی هەبێت.

یەکەم ئاماژەی مێژوویی دەگەڕێتەوە بۆ کۆنترین ماوەی زەمەنی لە بەردەستمان هەبێت تایبەت بەو دێرە لە راپۆرتی پەتریك ئیلیای هەشتەم کە ئاراستەی پاپا پۆڵسی پێنجەمی کردووە لە ساڵی ١٦١٠ دەکەین. لەم راپۆرتە دا ناوی مار عەودیشۆی رەبن دێت وەك ناوی دێرێك لە ناوی لیستی دێرەکان دا کە تاوەکو ئێستاش چالاکە و کار دەکات لە چوارچێوەی هەکاری([٩٣٤]).

لەگەڵ کەنیسەی نوێی یەکگرتووی تازە لەگەڵ کەنیسەی رۆما هەروەها ئەو ناوە دەخوێنینەوە لە دەستنووسی ئینجیلی ساڵی ١٦٩٨ کە لە سەرەوە باسمان کردووە. ئەم دێرە رەبەنی تێدا نەما کاتێك بوو بە نیشتەجێبوونی علمانیەکان، وە لەوانەیە دوای ئەوەی کە هەندێ کاری نوێکردنەوە و نۆژەنی تیاکراوە بوو بێت، کەسێکی سەرسوڕمێنەر بە کارەکانی بەم ئیشە هەڵساوە، ئەویش مەتران ئەورەهایە کە هی(گوندوك)ە .ئەم مەترانە بەوە جیا دەکرێتەوە و ناسراوە زۆر زوو زوو لە سەر باوەڕی خۆی ئەو پەرو ئەو پەری کردوە، دوای ئەوەی بڕوای بە باوەرداری کاسۆلیکی هێنا خۆی کرد بەکلدانی،دواتر گەڕایەوە بۆ نەستۆری کاتێك مار شەمعوون لە موسل دادەنیشت ([٩٣٥]).

ئەم کەسە کراوەتە مەترانی ئاکرێ لەسەر دەستی یوحەننا هورمزد(بەتریك ساڵی١٨٣٨). دوای هەڵگەڕانەوە لەنیوان ئەو دوو مەزهەبە دا بۆ چەند جارێك لەساڵی١٨٤٧٨ گەڕایەوە بۆ نەستوری. بەتریك مار شەمعوونی حەفدەهەم ئیبراهیمی کرد بە مەترانی زێبار و مزووری(ئیبراهیم ـ ئەورەها) لە سەردانی بادجر بۆ دێری مار عەودیشۆ لە گوندوك رۆژی ١٧ئیسانی ١٨٥٠ مەتران ئەورەها ئامادە نەبوو، لەو کاتەدا لەناو دێرەکە رەبەنێك و راهیبەیەك تیایدا نیشتەجێبوون. هەردووکیان رازی نەبوون بە نیشتە جێبوونی(قەشە گورگیس) ناسراوبە(بادجر) لە دێرەکەدا تەنها دوای بەخشینی هەندێك لە دیاری بۆ هەردوکیان. بەم شێوەیە بابەتەکە یەکلاکرایەوە، ئەم قەشە ئینکلیکانیە توانی بمێنێتەوە لە ناو دێرەکە تاوەکو درەنگ وەختانێك لە شەو، دوای ئەوە وە بەپێ ئەوەی دەردەکەوێ، هەندێك لە رەبەنەکان هاتنە ئەو دێرەو تیایدا نیشتەجێبوون ئەمە بەپێ ئەو زانیاریانەی کە بەتریك مارپۆلیس دووم شێخو لە ساڵی ١٩٥٠ کۆیکردبۆوە کە دەڵێ پێش سەد ساڵێك بەر لەئێستا رەبەنەکان دەهاتنە(شارمەن) بۆ ئامادەبوونی قەداسی خودایی(شارمەن) گوندیکە دەکەوێتە دووری کاتژمێرو چارەگێك بە پیادە، لە دێرەکە قەشەی گوندەکە جل وبەرگی قەشایەتی لەبەردەکات کە تایبەتە بە رێورەسمی قەداسی خودایی کاتێك کەدەیانبینی رەبەنەکان دێن وە ئەوان لە لێژاییەکەدان کە دەکەوێتە نێوان شوش و شارمەن، بینایەی ئیستای دێرەکە، بەشێکە لە بینایە کۆنەکە، کە پێشتر کاری نوێکردنەوە

و چاککردنەوەی تیا کراوە لەسەدەی نۆزدەهەم. دوای ئەو چاککردنەوەیە، بەڕێز بەتریك مارپۆلس دووەم شێخو هەڵسا بەکرداری نوێکردنەوەو و چاکسازی نوێ و تازە لە سەر ئەو بەشەی دێرەکە. بینایەی کۆنی دێرەکە قەبارەی گەورەتربوو، دیوارە ئەستورەکانی تاوەکو ئێستاش بەشێکن لە دیواری بینایە نوێیەکە لەلای باشووریەوە. خوشکانی قەشە شارل دەفۆگو بچووکەکان لەودێرە دا دەنیشتن بینایە نوێیەکە لەسالانی ١٩٥٥و ١٩٥٦. بە دوریەکی کەم لەدێرەکە هەندێك ئەشکەوت و پەرستگا و خەڵوەتگەی تیا بلاوبۆتەوە لەوانە: ئەشکەوتی(ئەمبۆس) وە ئەشکەوتی(مارعەودیشیۆ) کە دەکەوێتە نزیك لوتکەی چیاکە. کە دەگێرنەوە کانیەکی ئاوی لێبوو جۆگەی دەکرد. لەوبوارەدا پێویستە ئاماژە بەئەشکەوتی مارپوحەننان بکەین، ئەم ئەشکەوتە بەوە ناسراوە کەدەکەوێتە ژێر بەردێکی زۆرگەورە(واتە وەك ژێرزەمینێکی گەورەیە لەژێر ئەو بەردەمەزن و گەورەیە)ـ(وەرگێر). بۆشایی و کەلەنی ناو ئەو ژێرزەمینە چالاییە هەندێك بۆشایی و قولایی پێچاوپێچی تیایە کە دەچێتە ناو جەرگەی بەردەکان. کە زۆر لەمانە تاوەکو ئێستاش نەدۆزراونەتەوە. ئەو ئەشکەوتە زۆر ناودارو بەناوبانگە لای شوێنە وارناسەکان لە بەرئەوەی زۆر دەنووکە چالایی قولی تیایە(پەیکەرتاشی بەرد) کە دەبینی جێگای سەرسورمانە([٩٣٦]) (گوندی کوندوك)ی بەناوبانگ کردیە.

## دێری برحز بشّبا

لەنێوان ناوی دامەزرێنەرەکانی دێرەکان لە کەرتی مەرگەوداسن کە ئاهەنگیان بۆ دەگێردرێ بەپێ ی لیتورجیای کلدانی لە هەینی چوارەم لە ماوەی سرووتە ناسراوەکان بە(پیرۆزکردنی کەنیسە) ناوی(برحزبشبا) دێت. لە دەقەکانی تۆ مامەرگەیی([٩٣٧])، باس لەو رەبەنە دەکاتو دەڵێ(دوای پەرت و بلاوەکردنی رەبەنەکانی دێری(ئیزلا)ی گەورە ئەم رەبەنە گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆی کەناوی(حزود) بوو شوێنی لە دایك بوونی .

لێرە هەڵسا بە دروستکردنی بینایەی دێرێکی گەورە لەو دۆڵەی کە دەکەوێتە سەر گوندەکە . لەساڵی ٥٩٥ ئەم رەبەنە یاوەری ڕەبەن یەعقووبی کرد – کە هاتبو بۆ سەردانیکردنی – کاتێك ئەوەی دوایی لە رێگەدا بوو بۆ رۆیشتن و دامەزراندنی دێری (بێت عاوی). دوای ئەوەی دێری بێت عاوی تەواو بوو،(برحزبشبا) دێری بێت عاوی بە جێهێشت و گەڕایەوە دێرەکەی خۆی. ولەدێرەکەدا دەژیا تا کۆچی دوایی کردنی.

ئەم دێرە هەر مابوو کاری دەکرد بە چالاکیەکانیەوە بۆچەند ساڵێك پێش زەمەنی تۆمامەرگەیی ([٩٣٨]). دواتر دوچاری دەستی تێکدەرو کاولبوون بوو. رووداوەکانی دواتر

بێمان نالێن هۆکاری ئەو کاولکردنە چی یە کە بەر دێرەکە کەوت، وە چۆن ڕووی دا . ئەوەی دەیزانین ئەوەیە کەوا(جەستەی دامەزرێنەری دێرەکە (برحزبشبا) لە دێرەکەی گواسترایەوە بۆ ئەوەی لە (دێری بیت عاوی)بنێژرێ- رەنگە پرسیاربکەین : گوندی (حزود)دەکەوێتە کوێ؟ وەدێری((برحزبشبا) (دەکەویتە کوێ))؟ وەئایا دەکەونە کەرتی مەرگەوەیا داسن وەبە پێی ئەوەی لە مێشکی دامەزرێنەرەکەدایە؟ لە راستیدا ڕەنگە لە ناوچەی مەرگەبن،وەلەلای رۆژئاوای دێری بێت عاوی . مادام ڕەبەن یەعقووب لە نصێبین هاتووە، کەواتە وەبەپێ ی واقیعەکە و شوێنی جوگرافیای پێویستەیەکەم جار بە دێری برحزبشبا تێپەر ببێت پێش ئەوەی بگاتە ئەو شوێنەی کەدێرەکەی لێ دروست دەکات و دایدەمەزرینی، واتە لەلای رۆژئاوای شوێنی دێری بێت عاوی.رەنگە ئەو شوینە بکەوێتە لای باکوری(بیرتا) واتە بەلای باکوری ـ خۆرئاوا لە(سفسفا).چیرۆکی ئەو کەسەی کەڕبوو کەبە عەجائب شیفا بۆ کرا کە دواتر باسی دەکەین، وە باس ناکرێت کە ئەو پاڵەوانە بە باوەرداریەوە توانی بەسەر ئاوی خازردا تێپەڕ ببێت(واتە ڕۆیشتن بەپیادە بە سەر ڕووی ئاوەکە. وەرگێر). تەئکید لەوە دەکاتەوە کەوا ئێمە زۆر نزیکین لە شوێنی دێری بێت عاوی لەسفسفا. لەبەر ئەوەی شوێنەواری تر نیە بۆ کەلاوەی دێری لای رۆژئاوا لەبێت عاوی جگە لە کەلاوەکانی دێری مارعەودیشۆ ئەمە لەلایەك، وە نەبوونی هیچ باسکردنێکی کۆن بۆ ئەم دێرە لە لاپەرەکانی مێژوودا لەلایەنی دووەمەوە. وە هیچ ئاماژەیەك لە نوسینەکانی تۆما مەرکەیی دانەهاتووە کە پێویست بووە لە سەری باسی بکات مادام ئەم دێرە دەکەوێتە ناوچەیەکی نزیك بە سنووری دێری بێت عاوی، بۆیە من وای بۆ دەچم کەوا دێری برحزبشباهەمان دێری مارعەودیشۆیە. بەڵام لێکدانەوە بۆ هۆی هەبوونی دوو ناو بۆ هەمان دێر دەگەرێتەوە بۆ دوو ماوە بۆ ژیان و چالاکیەکانی ئەو دێرە لەنێوانیاندا ماوەی نوێ کردنەوەیە ـ ماوەی دووەم لە هەلسانەوەی ئەو دێرە دێت بە چالاك بوونەوەی دوای نووسینەکانی تۆما مەرگەیی بەناونیشانی سەرۆکەکان ساڵی ٨٤٠ .ماوەی دووەم دەست پێ دەکات لەوکاتەی رەبەن برحزبشبا هەلساوە بەکارەکانی چاك کردنەوە و نوێکردنەی دێرە کۆنەکە.(بەم شێوەیە رەبەن برحزبشبا بە هەلەبە دامەزرێنەر دادەنرێت و ئەزانین ئەمە دێری مارعەودیشۆ نیە) کاتێك دەمانەوێت باسی شوێنەوارەکانی گوندی(حزود) بکەین پێویستە لەسەرمان بەدوایدا بگەرێن لەدەوروبەری دەکەوێتە ژێر گوندی(گوندۆك) وە لەوانەیە ئەو شوێنە بکەوێتە لای رۆژئاوا بەلاربوونەویەکی کەم . تایبەت بەناوەکەی دەڵێن(دەقە کلدانیەکە بۆ ئەو ناوە هاتووە لەنوسینەکانی تۆما وە ئەوەی بێجان هەوڵی بۆ

داوه بەبەردەوامی(حزود)ە جیاکردنەوەیان لەلایەن بودج([939]). لەنێوان ئەو دووناوە (حزود) وە حازودە) دەبینیم هیچ واتایەکی نیە و پێویست ناکات.
لێرەدا ناوی کەسێك هەیە پێی دەڵێت تۆما بە رەچەڵەك خەڵکی حزوتە لە لیستی(٤٢) مەترانەکان دا دەردەکەوێت کە لە دێری بێت عاوی دەرچوو([940]).
جگە لەمە، ئەوەی جێی خۆیەتی ناوی گوندەکەیە کە ناوی هاتووە لە گێڕانەوەی چیرۆکێکی کورت دا لە ژیانی رۆژانەی خەڵك هەڵقولاوە تۆما دەیگێڕێتەوە([941]).
بەم شێوەیە: (لە گوندی حزوت دا باخچەوانێکی کەر هەبوو رۆژێك ویستوویەتی بەشداری بکات لە کردارەکانی پارمەتیدانی دروستکردنی کەنیسەکە لە دێری بێت عاوی کە خەڵکی گوندەکە پێشکەشیان دەکرد. ئەمە لە سەردەمی میتراپۆلیت(ئیشۆعیاو) بووە. رۆژێکیان ئەو پیاوە کەرە بارێکی پیاز بە پشتی کەرەکەیەوە دەگوازێتەوە، ئەم پیاوە پیرۆزە(ئیشۆعیاو) هەڵسا بە پیرۆزکردنی پیاوە کەرەکە و ئاوڕشێنی کرد دوای ئەوەی کە خاچەکەی لە ئاوەکەدا هەڵکێشا کە خاچی مار یەعقوب بوو([942]).
دامەزرێنەری دێرەکە لەبەر ئەوەی بەزەیی پێ هات بە هۆی بێسەروبەرییەوە. لە رێگەی گەڕانەوە بۆ گوندەکەی ئەو پیاوە کەرە هەستی بەوە کرد گوێبیستی دەنگ دەبێت و دەنگەکان جیا دەکاتەوە بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر و عەجایب. کە گەیشتە بەرزاییەك گوێی لە دەنگی زەرەی نێرە کەر و دەنگی هەندێك ئاژەڵی تر بوو، لەوانە: دەنگی باڵندەکان کە لە ترسان دا رایاندەکرد... هەروەها گوێی لە دەنگی کەڵەشێر بوو واتە قوقاندنی کەڵەشێر و وەڕینی سەگ. ئەم پیاوە کەرە هەژارە زۆر دڵخۆش بوو بەم بارە نوێەوە و لە خۆشیان دا سەری سوڕمابوو باوەڕشی نەدەکرد کە وای بەسەر هات. کاتێك گەیشتە ماڵەوە و لە دەرگا چووە ژوورەوە و یەکێك لە منداڵە بچوکەکانی گوێی لێ بوو بە دایکی دەڵێت:
-(ئا ئەوە بابە هاتەوە).

## شووش یان باشووش

برگەی(با) کە پێش هەندێك ناو دەکەوێت بۆ گۆڕانکاری تاکەکەیە(بێت) کە وای بەسەهاتووە بە پێی تێپەڕبوونی سەردەمەکان. ئەو گوندە کوردیە ئەمڕۆ پێی دەوترێت(شووش) بەڵام تۆما ناوی هێناوە بە باشووش. لەو گوندە رەبەن باوای میوزیکژەنی بەناوبانگ یەکێك لە قوتابخانە بەناوبانگەکانی بۆ خوێندنی لیتورجیا زانستەکانی کەنەسی دامەزراند([943]).
لە مامۆستا بەناوبانگەکانی ئەو قوتابخانەیە لەمانە(مارنەورەهامبرداشاندات)([944]).

کە لە ساڵی ٧٢٠ ژیاوە یەکێك بووە لە قوتابیەکانی جاسلیقی دوا رۆژ تیماتیۆسی یەکەم(٧٨٠ ـ ٨٢٨) هەروەها خەلیفەکەی ئیشۆعبرنون و(ئەبو نوح ئەلئەنباری) هەموو ئەوانە کەسایەتی ناسراو و بەناوبانگن لە ئەدەبی سریانیدا. لە نێوان کارەکانی ئەوراهام بوداشندادی تر لەوانە نووسینەکانی: (دەمەتەقێیەك لەگەڵ جولەکە) رەنگە ئەو کارەی لە(باشووش) تەواو کردبێت([٩٤٥]).

دواتر ئەورەهام کوڕی داشندات گواسترایەوە بۆ دێری سەروو کە دەکەوێتە باکوری مووسڵ. دواتر ناوی مارگبرئیل خرایە سەر ناوەکەی دواتریش ناوی مارئەورەهام. هەروەها لە قوتابخانەی شووش دارەبەن(بسیۆن) وانەی تێدا گوتۆتەوە کە لە دێری سەروودا کۆچی دوایی کردووە(مارگبرئیل) کاتێك تیماتیۆسی یەکەم بەتریك و جاسلیقی کەنیسەی رۆژهەلأت کەواتە ئەمە لە دوای ساڵی ٧٨٠ بوو([٩٤٦]).

لەوانەیە شوێنی ئەو قوتابخانەیە لە ناو ئەو دۆڵە دا بێت کە دەکەوێتە پێش گەیشتن بۆ گوندەکە ئەگەر لە کوندوك بۆی بچیت، ئەم دۆڵە بچوکە ناوە کوردیەکەی خۆی پاراستووە کە بە شێوەی(ئۆڕابی) یە کە واتاکەی(ئەوڕەهایە). بۆی هەیە ئەو ناوانە بگەڕێتەوە بۆ یەکێك کە ناوی ئەوڕەهامی وەرگرتووە کە بەناوبانگ بووە و لەوانە ئەو ئەورەهامەی کە باسمان کرد. لێکدانەوەیەکی تر هەیە بۆ ئەو ناوە رەنگە باسکردنەکە لاوازیش بێت دەڵێ لەوانەیە یەکێك لەوانەی دوایی کە شوێنەکەیان بەدەست بووە مەسیحی بووە و ناوی ئەورەها بووە. ئێستا بەشێکی ئەو دۆڵە دەگەڕێتەوە بۆ خێزانێکی موسڵمان ناوی(ئەحمەد مشیحایە)، واتە ئەحمەدی مەسیحی. لە ساڵی ٨٠٠ ناوی یەکێك لە پیاو ماقوڵەکانی گوندی باشۆش ناوی(خۆزناهێر) بووە مەتڕانی(کارتاو) کە ناوی داود بووە دەستنووسێکی نووسیوە بە ناوی(بەهەشتی بچوك)([٩٤٧]). کەسێك بە ناوی عەمڕان کوڕی محەمەد ئازادی([٩٤٨]). Al Azdi ـ گوندی باشۆش و چەند گوندێکی تریشی داگیر کردووە کە دەکەونە سفسفا. دواتر خاوەنداریەتی موڵکەکانی ئەو گوندانە کەوتۆتە دەست کوردەکانی(حەمیدی)، ئەوەی یاقووتی حەمەوی باسی دەکات([٩٤٩]).

دەربارەی شوش ئەویە : قەلایەکی زۆر گەورە و بڵندە لە نزیك ئاکرێ. حەمیدی سەربە کاروباری موسڵە. دەڵین بەرزترە لەئاکرێ گەورەترە بەلأم بە ژمارە کەمترە لەساڵی ١١٣٣/٤ نورالدین زنکی داگیریکردووە وەك سزایەك بۆ(عیسای حومێدی) بەهۆی ئەو یارمەتیەی کەبۆ خەلیفە(المسترشد) دابووی لەو کاتەی کە ئەوەی دوایی دەیویست مووسڵ داگیر بکات([٩٥٠]). لەگوندی(شوش)ی ئیستا قەسرێك(کۆشکێك) هەیە ئاغای گوندەکەی تیا نیشتەجێ یە. دانیشتوانی ئەو کۆشکە توانیان بەرگری لە خۆیان بکەن لەو هێرشانەی کە

بارزانیــەکان کردیانــە ســەری و گــەمارۆیان دابــوو وە لەژیانــدا مــابوو تــاوەکو ســاڵی ١٩١٤ـ ١٩١٨(واتــە ســاڵانی جــەنگی جیهــانی یەکــەم) . ئــەو بەرگریکردنــە ســەریگرت بــەهۆی ئــەوەی کانی ئاوەکەیان لەناوکۆشکەکەدابوو، وە خواردنیـان هـەبوو بـە ڕێکـو پێکـی بـەکاریان هێنـا شوش لەهاوینانـدا ئـاو و هەوایـەکی سازگاروخۆشـی هەیـە، وە دارمیـوەی زۆر و هەمـەجۆری بەلەزەتی هەیە.

گوندی شارمن هەمان خاسیەتی هەیە کە دراوسێیەتی. بۆیە مەتەڵێکی کوردی هەیـە پێیـان دەڵێن(بەهەشتی سەرزەمین).

هیچ دەستنووسێکی زانراومان نیە بگەڕێتەوە بۆ شۆش. هەروەها نـاوی کەنیسـەکەی نـازانین کە شوێنەوارەکەی بە تەواوی نەماوە. دەڵێن ئەو قوتابخانەیەی ئێستا کـە پێشـتر کرابـوو بـە مزگەوت کەنیسـە بـووە ئێسـتا هـیچ مەسـیحیەك لـە گونـدی شـۆش نیشـتەجێ نیـە. خەڵکە کۆنەکانی ئەو گوندە پارێزگاریان بە هەندێك ناوی ئەو شوێنانە کردووە، کـە ڕەنگـە سـوودی هەبێت بۆ وەبیرهێنانەوە و لەو شوێنانە وەك:(کانی مارزمیا)([٩٥١]).

کە دەکەوێتە لایەك لەو ڕێگەیەی دەچێتە(شارمن). ئـەوەی باسـی ئـەو کانیـە دەکرێـت کـەو گەیشـتن بـۆ سەرچـاوەکەی قەدەغـە بـوو بـە هـۆی حەزیایـەکی زۆرەوە قـەدیس مارزمیـ هەمووی لە ناو برد بـە مـوعجیزە و سـەمەرەوە و خەڵکەکـە لـەو ترسـە ڕزگاریـان بـوو و بـۆ جـارێکی تـر سـوودیان لـە ئـاوی کانیەکـە وەرگـرت. هـەروەها شـوێنی(ماردانیـال) لـە نێـوان باخچەکان دا لە شوێنێك دەکەوێتە سەرووی شـوێنی کۆشـکەکە، هەنـدێك پاشمـاوەی بنـاغەی بینایـەك دەدۆزینـەوە پێـی دەڵـێن(شـەهید) و دوا جـار شـوێنێك هەیـە پێـی دەڵـێن شـوێنی(خـاچ) کـە دەکەوێتـە ناوچـەیەك پـێش بنکەیـەك گەیشـتن بـە گونـدی شـۆش کـە دەکەوێتە بەری ڕۆژهەڵاتـەوە لـە ڕۆخـی ڕێگەکـەدا و دەڵێن کـەوا لـە شـۆش و لـە ماوەیـەکی زۆر کۆن  دا ژمارەیەکی زۆر جولەکەی تێدا بووە، بەم بۆنەیـەوە کـە پێشـتر باسمـان کـرد لـە سەر مارئەورەهام و نووسینەکانی بە دەمەتـەقێی زمـانێکی توونـدەوە لەگـەڵ جولەکـەکان د لە سەدەی هەشـتەمی ز. لـە سـەدەی ١٩ هـەم بـادجر ژمـارەی خێزانـە جولەکـەکانی بـە ٣٠٠ خێزان خەملاندووە لە گوندی شۆش دا. ئێمە گومانمان لە ڕاستی ئەو ژمارەیـە هەیـە لەبـەر ئـەوەی زێدەڕۆییـەکی زۆری تێـدا هەیـە. نـەوەکانی ئەوانـە کـە گوندەکـەیان بەجێهێشـت لـە دەرکردنی جولەکەکان بە کۆمەڵ لە ناوچەکانی باکوری عێراق لە ساڵی ١٩٥١ دا.

یەکەم شت کـە توشـی دەبـین لـە گونـدی شـوش کـە ئێمـە لـە گونـدی کونـدوك بـۆی دەچین گەڕەکی جولەکـەکان و کەنیسـە تایبەتیەکـەی ئـەوان و گۆڕسـتانەکەیانە. لـەو گوندانـەی کـە سەر بە شۆش بوون لەوانە یەکەم:(حابوشتا)([٩٥٢]). شـوێنەکەی لەلایەکـە بـەرزترە لـە شـارمن

و باکوری خۆرهەلاتی مەزاری(مارساوا) و دووەم گوندی(بیناسا)([953]). کە ناوەکەی خۆی پاراستووە تاوەکو ئەمرۆ ـ ئەم گوندە دەکەوێتە لایەکی دەشتەکە لەبەری باشوورەوە و لە گوندی شۆش دا ئەو گوندە وێران کراوە لە ماوەیەك پێش ماوەی ژیانی تۆما مەرگەیی بە هۆی گەردەلولێکی وێرانە ئەمە بە پێی نووسینەکانی(ماران عەمما) دوای کاولبوونی ئەو گوندە(باشووش٩ زەویەکانی وەرگرت و بوو بە موڵك و ماڵی رەوای ئەو گوندە.

## شرمن/ شارمن/ یان شلمت

گوندی شارمن لە کۆن دا ناوی شالمات بووە، یەکێکە لە گوندەکانی سفسفا([954]).
بەو ناوە زیاتر بەکاردێت. شوێنێکی دیاری هەیە لە دەقەکانی پەرتووکی(الرؤساء) دا بە هۆی فێرکردن و رۆشنبیری کە تێیدا هەبووە لەلایەن مار ئەحا([955]).
کە دواتر بوو بە قەشەی بێت عاوی و دواتریش بوو بە مەتران و دوای مردنی لە شامات نێژرا. ناوی لەو کەنیسەیە نرا کە لە سەر گۆڕەکەی دروست کراوە تاوەکو ئێستاش ئەو کەنیسەیە ناوی ئەومیە تاوەکو ئەمرۆ. مارئەحا لە گوندی ئۆواخ ـ ئەواخ لە دایك بووە کە دەکەوێتە ناوچەی تالانا. کە دەکەوێتە کەرتی مەرگە.
زانست و رۆشنبیری لەگەڵ برایەکەیدا(شوحا لمارن) بەدەست هێناوە لە شلمات لەو قوتابخانەیەی کەوا باوای دایمەزراندبوو([956]).
هەر دوو برا چوونە ناو دێری بێت عاوی دوای ماوەیەك ئەحە بوو بە سەرۆکی دێرەکە. ئەم رەبەنە بەوە دەناسرێ کەوا ساکار و سادە بوو و ژیانی رەبەنایەتی رێك و پێك بووە بە شێوەیەکی راستەقینەوە کە ناوبانگی پێ دەرکردووە لە کاتی نوێژکردن دا لە کەنیسە بە هیچ شێوەیەك چاوی هەڵنەدەهێنا بۆ تەماشاکردنی قاچەکانی، و لە سەرەتای نوێژکردنی فەرزی تاوەکو کۆتاییدا. لە سەردەمی بەتریك(ئەبا) ی دووەم(٧٤١ ـ ٧٥١) کاندید کرا بۆ میترا پۆلیتی(ئاشوور) و(حدیاب) هەروەك پێشتر روونمان کردەوە.
دوای کۆچی دوایی لە شەلمات نێژرا لە سفسفا. رەبەن شەمعوون هەڵسا هەر وەك تۆما باسی دەکات بە مامۆستا، دکتۆری قەدیس مەترانی بێت بەگاش، بە دروستکردنی کەنیسەیەك لە سەر گۆڕی مار ئەحا بە بەرد و گەچ([957]).
یەکێك لە هەوالگریەکانی تۆما مەرگەیی کە هەندێك زانیاری پێداوە و لە پەرتووکەکەیدا تۆماری کردووە ـ وەرگێڕ). کە ناوی شێخ(راما) مەزن کە قەشەی لێپرسراوی کەنیسەی شالمات بووە([958]).

لە جێگایەك دەكەوێتە بن شوێنی شالمات لە كۆن دا گوندێك هەبووە ناوی(بێت ئیزرێ . واتە خەرمان)([959]) بووە.
لەگەڵ شالمات یەكیان گرتووە لە سەردەمی ماران عەمما و لە بن دەسەلآتی ئەو دابوون.
سەرۆكی ئەو گوندە ناوی(شاور) بووە.
ئەم گوندە لە سەردەمی تۆما دا چۆڵ بووە، دواتر بە یەكجاری ون بووە لەگەڵ رۆژگاردا.
دواتر دەقەكانی تۆما ئاماژە بە هەواڵگرێكی تر دەدات بۆ تۆما قەشەیەك بووە بە ناوی(عەمانوئێل)(خەڵكی باشۆش بووە)([960]).
لێرەدا پرسیارێكمان بە بیر دێتەوە ئەوەیە ئایا ئەو گوندەی كە پێی دەڵێن بێت ئیزرێ، یان با ئیزرێ؟ و لەوێدا ئەو گایە دزرایە دۆزراوەتەوە لە باقد شای؟([961]).
لەبەر ئەوەی لە توانای ئەو گوندە دا هەمان گوند(باقدیشی) یە كە ناوی لای تۆما هاتووە([962]).
تاوەكو ئێستا شوێنەكە نەدۆزراوەتەوە. لەبەر ئەوە زۆر زەحمەتە بزانی لە كام لای مەرگە ئەم رووداوە بووە بە تەئكید ئەوەی كە روویداوە لەلای باكوری خۆرهەلآتی چیای مەقلوب بووە، بەلآم ئاراستەی رۆیشتنی دزەكە(لایۆلۆخ) نازانین كە خەڵكی زاخۆ بووە و ویستوویەتی ئاژەڵە دزراوەكە بفرۆشێت یاقوت حەمەوی لە فەرهەنگەكەیدا باسی شارمن دەكات. بەلآم بە(شەرملە) وە هەروەها ئاماژە بە بەناوبانگی بەهەنار دەكات([963]). ناوی یەكێك لە دانیشتوانی شلمات لە رۆڵەكانی سەدەی سێزدەهەم هەیە و پارێزراوە بە شێوەیەكی چاوەڕوان نەكراو ناوی لە دەستنووسێكی یەعقووبییەكاندا هاتووە(١٠٠٩).
ئەم ناوە ناوی(ئەبراهام بریۆحەننان بریەلدا/ئەبراهام كوری یوحەننا كوری یەڵدا . وەرگێر). خەڵكی گوندی شالماتە كەدەكەوێتە نزیك شوش. ئەم ناوە لەو دەستنوسەدا هاتووە وەك تێبینیەك ساڵی ١٢٧٢ خراوەتە سەری. ژمارەیەك دەستنونسمان بەدەست گەیشتوە سەرچاوەكەی(شالمات)ە. كۆنترین مێژوو بۆ یەكێك لەو دەستنوسانە هی ساڵی ١٦١٤. كە ئێستا لە (مەلابەروان)ە ، لە خێزانێك كە بەرەچەلەك خەڵكی شارمنە. ئەو دەستنوسە بریتیە لە(ئینجیل)ێك بۆ كەنیسەی مارئەحا نووسراوە([964]). وە هەروەها دەستنوسێك هەیە ناونیشانی(تركامی)یە/وەرگێراوەكان . دەگەڕێتەوە بۆ (عەودیشۆ) نصێبینی. وە دواتر گێرانەوی تەفسیر بۆقەداسی خودایی بەپێی سروتی نەستۆریەكان . ئەم دەستنوسە لە ئەلقۆش نوسراوە لەساڵی ١٦٧٨ لە سەر داوای قەشە هورمزد وە كورەكەی قەشە ساوا بۆ بەكارهێنانی لە كەنیسەی شەلمات([965]). لەساڵی ١٧٢٣ لەسەردەمی سەرۆكی گوندەكە(یەلدا) وە قەشەكان هورمزد و یەلدا دوو لە خەڵكە باوەردارەكەی ئەو گوندە كەناویان(حەننا)و

(کامۆ) بەهاوکاری ژنەکانیان بەناوی(سارا)و (مەریەم) هەڵساون بە پێدانی نرخی کرێی نووسینی دەستنوسی (کزا)(پەرتوکی نوێژەکانی سروتی رێك و پێك) بۆ بەکارهێنانی لە کەنیسەی مارئەحا([٩٦٦]).

هەروەها دەستنووسێك بۆ مێژوو لە ساڵی ١٧٤٠ لە ئەلقۆش کۆتایی بە نووسینی هاتووە لە سەر ئەرکی(میرۆت) کچی هورمزد([٩٦٧]).

دوای بلاوکردنەوەی ناوەرکی قەشە فۆستی دەستنووسێکی بۆ ئینجیلی پیرۆز بە سریانی(السورت) زمانی ئاخاوتنی سریانی - وەرگێر). سەرچاوەکەی شالماتە. کرێی نووسینەکەی ئەو دەستنووسە بە بەشداری قەشە هورمزد و وافە بووە(وافە): بەرپرسی هەڵسورێنەری کاروباری کەنیسەیە) کەنیسەی شالمات و کورەکەی قەشە تۆما لەلایەك و ئیلیای کوری برای لەلایەکی تردا. لە ساڵی ١٧٨٧ سەرۆکی گوندەکە داوای کرد موختاری گوند کە ناوی گۆرگیس کوری زهیا کوری سەرۆك تۆمایە کە یەکێکە لە نووسەرەکان، خۆشنووسەکان کە بەناوبانگ بووە لە رۆڵەکانی ئەلقۆش بووە دەستنووسێکی نووسیوە بۆ عۆنیسا(سرودێکی ئاینیە لە وەرزێکی دیاریکراو دا دەگوترێت). دانەرەکەی(گبرئیل قەمسا) یە میترابۆلیتی مووسڵ بووە([٩٦٨]).

دەستنووسی ساڵی ١٧٤٠ تێیدا نوسراوە بۆ بەکارهێنانی هاوبەش ئامادەکراوە لە نێوان کەنیسەی مار ئەحاو کەنیسەی مارساوابەیەکەوە. لەواقیعدا مارساوا مەزارێکی بچووکە ئەشکەوتی رەبەنێکی تیابوو ئەو ناوەی هەبوو. شوێنکەی بەدووری لە دۆڵەکەدایە، وە لە باشووری خۆرئاوای کەنیسەی شارمن، کە لە کەنیسەکەوە دەبینرێ، وە هەروەها ئەشکەوتێکی تریش هەیە دەگەرێتەوە بۆ مارپۆ حەننان. کاتێك بادجر سەردانی شارمن دەکات بینی کەوا دانیشتوانەکەی نەستۆر نیەو ژمارەیان ٣٠ خێزان دوو قەشەیەیان هەیە بۆ خزمەتکردن و کەنیسەیەکیان هەیە تایبەت بە خۆیان([٩٦٩]). هەمان ژمارەی خێزانەکان تۆمارکراوە لە ئاماری ساڵی ١٨٦٥. لەساڵی ١٩١١ ژمارەی کلدانەکان کەلەوێ نیشتەجێ بوون (٢٥٠) کەس بووە وە لە تەنیشت ماڵە کوردەکان دەژیان بە هاوکاری و لێکتێگەیشتنی تەواوەوە.سەرۆك وەیا (موختاری) گوندەکە مەسیحیی بوو. کە نیسەی مار ئەحا تائیستاش ماوە وە بەشێوەیەکی لەبار. لایەکی بۆ زیادکراوە لەلای رۆژئاوایەوە باڵی کەنیسەکە پارەی چاك کردنەوەی لەلایەن ژنێکی خێرخوازەوە. بەلام ئەو بەشە تووشی خراپ بوون هات بۆیە رۆخینراوە بەتەوای لابردار. بەم شێوەیە کەنیسەکە گەرایەوە سەردۆخی جارانی. ئیستا کەنیسەکە دوولایەنی هاوتەریبی هەیە. هەمان داب و نەریتی رۆژئاوا - رۆژهەلاتە. چوونە ناو کەنیسەکە لەو دەرگایەوە کە دەکەویتە دیواری خوارووی. لە بالی یەکەم لە

چوونە ژوورەوەمان(جوڕنەی لەناو هەلگیشان دەبینین)، لەژورێکی بچووك دروستکراوە لەو پەری لای رۆژهەلاتی بالەکە. وە هەروەها لەوژوورەدا تەندورێکی بچووکی نانکردن هەیە. کەلەویدا نانی قوربانی تێدا دروست دەکرێت،پاڵیداوەتە گۆشەی باشووری خۆرهەلاتی ژوورەکەبە بەرزی نیوەی بەرزی ژوورەکە.لەگۆشەی باشووریخۆرئاوای ژوورەکە هەندێك قادرمە هەیە بەرەو ناو هەردووبالەکە دەروات. مالی شەهیدان دەکەوێتە بالی یەکەم لەنزیك دەرکای چوونە ژوورەوە بۆ ناو کەنیسەکە لەبالی باشوورەوە دەچینە بالی سەرەکی ـ باکووری ـ بەدوو دەرگەی سەرەکی یەکێکیان تایبەتە بە ژنان و دووەمیان تایبەتە بەپیاوان . لەپێش پیرۆزی پیرۆزەکان(مەزبەحی سەرەکی) (قەسرۆك) (مێزێکی شێوە قادرمە) کراوەتە مزگەوتی گوندەکە و دووەمیان بۆتە کاولگە و دەتوانین دیوارەکانی ببینین تاوەکو ئەمڕۆ، شوێنی ئەم دوو کەنیسەیە دەکەوێتە بەری رۆژهەلاتی گوندەکە لەلای خرِدز.

## خلەفتایان ـ خیلافەت

ئەو گوندە دەرکەوت لە سەدەی شەشەمی ز لە ژێر ناوی" باحیلابیە/ باحێلابیّ" لەو کاتەی کە(برعێتا)([970]).

(رەبەن و مێژوونووس لە ژیان دا بوو یەکێکە لە گوندە پیرۆزەکان درێژ دەبێتەوە بۆ لای باشوور لە دۆلێکی زۆر جوان هێمن و ئارامی بەردەوام پڕ ئاو بووە بە شێوەیەکی باش. لێرە دامەزراندنی دێرەکە کرا. ئەم گوندە یەکێکە لەو گوندانەی کە داگیر کراوە لەلایەن(عمران کوڕی محەمەد)([971]).

لە سەردەمی تۆما مەرگەیی لە سەر مەسیحیەت نەمابوو. ئەو کاتە دانیشتوانە کۆنەکەی پەرت و بلاوەیان کردبوو. بەلام مانەوە هەتاوەکو ئێستاش ناوی گوندەکەیان پاراستووە بە رەسەنایەتی خۆی تاوەکو ئەمڕۆش(رەبەن یۆحەنان)([972]). خەلکی ئەو گوندەیە کە زۆر جار ناوی یاد دەکرێتەوە لە دەقە مێژووییە رەبەن یووسف بۆسنایا لە سەدەی دەیەم دا. ئێستا ئەم گوندە بە(خەلفەت) ناو دەبردرێت و هەموو دانیشتوانەکەی موسلمانن یاقووتی حەمەوی ناوی ئەم گوندە بە حیلیبتا) ناو دەبا([973]).

وە زۆر زۆری پێ هەلدەلێ و مەتحی دەکات بە هۆی ئاو و هەوا سازگار و زەویە بە پیتەکەیەوە. هەروەها باسی ئەوە دەکات مزگەوتێك و کانیاوێکی تێدایە ئاوەکەی پاکە باخچەکانی لەلایەن جوتیارەکانەوە بەکاردێت بەرامبەر بە دەیەك؟

حەترا(یا هەترا/ Hetra

هـەروەها پێـی دەوتـرێ(حطـارا/ حتـارا) دەکەوێتـە سـەر رووبـاری خـازر. بـەلأم پەرتووکی(سەرۆکەکان) شوێنەکەی دەباتە سفسفا([٩٧٤]).
دانیشتوانەکەی لـە سـەردەمی رەبـەن گبرئیـل مەسـیحی بـوون. ئـەم رەبەنـە هەڵساوە بـە شیفاکردنی کوڕی یەکێك لە رۆڵەکانی ئەو گوندە ناوی(نگارا شەهریخ) بوو([٩٧٥]).
دواتـر عمـڕان داگیری کـردووە، دەسـتی بەسـەردا گرتـووە لەگـەڵ چـەند گونـدێکی تـردا لـە سەردەمی تۆما مەرگەیی دا هەموو دانیشتوانەکەی موسڵمان بوون، چونکە ناوی ئـەو گونـدە واتاکـەی(ئاشـە) ە بۆیـە لەوانـە تووشـی گونـدی تـر بـبین هـەمان ناویـان هـەبێت، هـەروەها دەگەینە دێرێك بە ناوی(ختڕا ـ خـەترا) دەکەوێتـە شمکان نزیـك(هەرماشـێ). هـەروەها دوو گوندی تریش هەیە بە ناوی(حەتارا) یەکەمیان دەکەوێتە رۆژئاوای رێگەی نێـوان مووسـڵ و زاخۆ و بە لادانێکی کەم لە نیوەی رێگـەدا لـە نێـوان(تەلعـەدەس) و(باقـاق) بـەلأم دووەمیـان دەکەوێتـە لایەکـەی تـری رێگەکـەوە بـە دووری دە کیلۆمـەتر رۆژهـەلأتی یەکـەمیان بـەلأم تکایـە ئاگـادار بـە هـەر دوو گوندەکـە ناکەونـە ناوچـەی سفسـفا. بـەلأم لـە سـەر ئـەو راستیەشـەوە دەبیـنین تۆمـا تەئکیـد لـە سـەر ئـەوە دەکـات کـە دەکەونـە ئـەو ناوچـەیە. بودج([٩٧٦]). دوو گوندی تریش بۆیان زیاد دەکات ئەوانیش گونـدی(بیبـۆزی) و(بیرتـا) یـە. لـە راستیدا هۆکـاری ئـەو هەڵەیـە لێکدانـەوەی خراپـە بـۆ دەقەکـە، بـەلأم وەرگێڕانەکـەی بـودج راسـت و وردە([٩٧٧]). بـە پـێ ئەمـە لـەوە تێدەگـەین کـەوا کەسـێك لـە(بیبـۆزی) هـاتووە و ناوچەی(بیرتـای) داگیر کـردووە، واتـە بـەری رۆژئـاوای کـەرتی مەرگـە، دواتـر چـوار گونـدی تریش داگیر دەکات و دەستی بە سەردا دەگرێت کـە دەکەونـە سفسفا، ئەمـە جگـە لـە چـەند گوندێکی تر.

٣ ـ ئاکرێ ـ عقرة

ئاکرێ قەلأیەکی کوردیە لە کۆنـەوە ناوبـانگی هەیـە ئێستا لـە رووی کارگێڕی کەنەسـی لـە ژێـر دەسـەلأتی مـەتڕانی ئـاکرێ و زێبـارە و بارەگـای کورسـیەکە بـە رەسـەن شـاری ئـاکرێ خۆیەتی. هیچ ئاماژەیەکی پێ نەکراوە لە مێژووی مەسیحیەتی کۆن دا([٩٧٨]).
ئەگـەر وا دابنـێین ئـاکرێ ئێسـتا هـەمان ئاکرێیـە کـە بـاوای قوتابخانـەی تێدا دامەزرانـدووە ناسراوە بە قوتابخانەی مەرگە دەڵێن باسی نـەکراوە لـە پـەرتوکی(الرؤسـاء) تـەنها یـەك جـار نەبێت(ئەگەرچی دەکەوێتـە نزیـك دێـری بێت عـاوی) یـەك شـاعیر هەیـە خـەڵکی ئاکرێیـە مێـژوو باسـی دەکـات نـاوی(ئـادەم ئاکرەیـیە) لـە نـەوەکانی سـەدەی شازدەهەمە سـرودێکی شیعری داناوە لە سەر رەبەن هورمزد ساڵی ١٥٩٦([٩٧٩]).

مێژووی ئەبرەشیەی ئاکرێی کلدانی پێشتر بە کورتی باسمان کردووە کاتێک Cuinet سەردانی ئاکرێی کردووە لە ساڵی ١٨٩٠([٩٨٠]).

کاتریدائیەکەی کە لە ژێر ناوی شەفاعەتی پاکیزە بووە کاول بووە و چۆڵگەیە. دواتر کاری دووبارە دروستکردنەوە و فراوانکردنیان وەك پێویست بۆ کردووە. ئەم کارە لە سەر دەستی بەرێز بەتریك مارپۆڵسی دووەم شێخۆ بووە. کۆنترین دەستنووس لە سەر ئاکرێ کە لامان هەبێت دەگەڕێتەوە بە ساڵی ١٦٩٥([٩٨١]).

هەروەها لامان دەست دەکەوێت دەستنووسێك بە تەواوی بۆ نامەکانی قەدیس پۆڵس دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساڵی ١٨٧٣([٩٨٢]).

بەم دەستنووسە هەیکەلی پەرتووکەکانی سروتی تەواو دەبێت کە گەیشتۆتە ئاکرێ کە رۆژێك لە رۆژان هیچ گرنگیەکی نەبوو لەبەر ئەوەی مەڵبەنێکی مەسیحی بووە، جگە لەمە دەبێ ئاماژە بە کەنیسەیەکی بچوك بدەین دەکەوێتە نزیك بە کەنیسەی کلدان بە دووری چەند مەترێك دەگەڕێتەوە بۆ تایەفەی یەعقوبی ئەم کەنیسەیە بەوە دیارە کە لەناو دڵی بەرد هەڵکەندراوە. شەفیعی ئەوەی کە کەنیسەکەی بەناو نراوە(مارگۆرگیسە) کاتێك Cuinet سەردانی کردووە بینیوەتی لە سەر شێوازی کەنیسە سەرەتاییە کۆنەکانە کە زۆر زەحمەتە باسی بکەیت و بە وردی روونی بکەیتەوە و وردەکاریەکانی دەگمەنە کە بە شێوەیەکە نایبینی لەبەر ساکاریەکانیدا. دوای سەردانەکە بۆ ناوچەکە ئەو لێدوانەی داوە:(ئەگەر بیرۆکەیەکمان لە سەر کەنیسەکانی مەسیحی کە لە ناوچە چیاییەکان دا هەیە، پێویستە لە سەرمان وا خەیاڵ بکەینەوە کەوا ئێمە لە ژوورێکی ئاست نزم و تاریك داین دیوارەکانی تابلۆی ئەستوورن و بە قوڕ داپۆشراون لە سەرووی ژوورەکە هەندێك تابلۆی تەختەیی گەورە هەیە وێنەکە بە یەك بەستراوەتەوە بە شێوەیەکی سەرەتایی بۆ ئەوەی بکرێت بە مەلەوانگەی تایبەت بە مەراسیمی قەداسی خودایی لە سەر ئەو مەلەوانگەیە خاچێك دەبینین ئەو دیو ئەو دیوی نەچەسپێندراون بە سەر یەك دا بە شێوەیەکی رێکوپێك و پێویستیان بە هەندێك بزمار هەیە بۆ ئەوەی جێگیریان بکەیت بە سەر یەکەوە بۆ ئەوەی بە راستی وێنەی خاچەکە بدەن هەر وەك دەیزانین. لە پاڵ ئەمە دا، وێنەیەك یان دوو وێنەی لەبیرکراو هەیە. لە یەکێك لە گۆشەکان دا و هەندێك جار لە ناوەراستی ژوورەکە شێوەی مێزێك داندراوە هەندێك پەرتووك بە سەریدا کەڵەکەیان کردووە کە هی سروتەکانن تێکەڵ و پێکەڵ بوون. باری ئەو پەرتووکانە گریانت بۆی دێت بەهۆی ئەوەی دووچاری لەناوچوون بوون بەهۆی شێووکۆنیاندا. ئەمە زۆربەی کەنیسەکانی گوندەکانی ناو چیاکان بەم شێوەیەن کاتێك باس لە کەنیسەکانی تایبەت بە

نەستۆریەکان دەکات پێویستە ئەمەش زیاد بکرێت کەوا کۆمەڵێك داری تێدایە وەك گۆپاڵ وان و لە کۆتایی ژوورەکە داندراون ئەوانەی لە ناو کەنیسەکە دا ئامادەبن لە کاتی نوێژکردن و سروتەکانی(نوێژکردن پاڵیان بەم دارانە داوە). لەگەڵ ئەوەی کە ئەم باسە دەگونجێ لەگەڵ کەنیسەی یەعقوبیەکانی ئاکرێ پێویستە و بە خێرایی ئەوەش بخەینە سەر باسەکە:

(لە تەنیشت دەرگا نوێیەکە، دەرگەی کۆن دەبینرێت کە تاوەکو ئێستا پارێزراوە بە پێوانەی ١,٤م ٦٠ سم(درێژی و پانی چوارچێوەی دەرگاکە(٣٠ سم لە ئاستی زەویەکە بەرزترە کەنیسەکە بریتیە لە سێ ئەشکەوت بە هۆی تونێلێك یان گەروێکی هەڵکەندراو لە سەر بەرد بە یەك بەستراون و بەدوای یەك دا بە ئاراستەی رۆژهەلاتی ئەشکەوتی یەکەم کە لەوێدا دێتە ژوورەوە لە دەرگەی سەرەکی ئاماژە پێکراو درێژیەکەی(چوار مەترە) ئەشکەوتی ناوەراست ـ مەڵبەند ـ واتە هەیکەلی سەرەکی قولاییەکەی(٤,٥ مەترە) بەلام پانیەکەی(١٢ مەترە) و یا لە دەرگا نوێیەکە تاوەکو دیواری باکوریدا. ئەشکەوتی خۆرهەلات(سێیەم) هەر وەك پیرۆزی پیرۆزەکانە، هەمان پانی هەیە(١٢ مەترە) بەلام قولایی چوار مەترە لەلای باکور پەرستگەیەکی بچوك هەیە کە مەلەوانگەیەکی زۆر بچوکی تێدایە.

مەزبەحی سەرەکی دەکەوێتە ناوەراست لە خالێکی نیمچە مەڵبەندی . قەبارە کەی گەورەترە لەوەی باسمان کرد بەکەمێك وەبە بەرزاییەکی بەرچاو.

جورنی لەناو هەلکێشان پالی بەدیواری باشووردا داوە کە دووپەنجەرەی بچووکی تیایە جالیەی تایەفەی یەعقووبیەکان لەئاکرێ زۆر بچووکە بە بچووکی کەنیسەکەیانن ، هەر وەك دورگەیەکی چۆل وایە لەژێر رەحمەتی هەلکشان وداکشان دا کەوا هەلگەراوەکان بەکاربهێنن کەجەستەی ئەو مەسیحیە هەژارانەی دادرەدان، وەیا هەروەك کۆچەرەکانن لەکاتی رووداوەکاندا هاتوون ،بەلام ئەمە کارێکی زەحمەتە دیاریبکرێت.ژمارەی رۆلەکانی ئەبرشیەی کلدان لەسالی ١٨٥٢ زیاتر لە ١٥٠ کلدانی نیە ، وەلەسالی ١٩١١ژمارەیان بووبە ٢٠٠ کلدانی وقەشەیەکیان هەیە لەسالی ١٩٦١ژمارەکەیان دەگەیشتە ٢٥٠ کلدانی .

لەسەر لوتکە چیاکەکە خانووەکانی ئاکرێ ی تیابلاوبۆتەوە لەوسەرەوەیە پاشماوەکانی قەلای کوردی ماوە .بەشی هەرەزۆری ئەو قەلایە هەروەك دەبینرێ لەسەر بەردەکان هەلکەندراوە بەقوولاییەکی زۆرەوە(نەقارێ کراوە) ئەم قەلایە وێرانکراوە وەبەشێوەیەکی کۆتایی لەماوەیەکی زەمەنی پێش سالی ١٨٤٠بەماوەیەکی کەم (١٠٣١)

لەناو ئەو قەلایە داسالۆنێکی فراوان هەیە هەمووی دەکەوێتە ژێر زەوی ، سەرمانسورِما وە هەرلەچرکەی یەکەمدا لەگوێبیستمان کەوا بینایەیەك هەیە لەو قەلایە کوردیە خەلکی ناوچەکەو مەسیحیەکان دەلێن ئەوە کەنیسە یە . بەلاّم پاش کاولکردنی قەلاّیەکە بەتەواوەتی بۆ پاشماوەی پاشماوەکان هەندیك مەسیحی هاتن بۆ گەران بەدوای کونێك وە (ژێرزەمینێك) بۆ ئەوەی بیانپارێزی لەو ئاشووب و هەراو هۆریایەی ناوچەکەدووچاری هاتبوو ، بۆیە بەدورنازانریٚ کەوائەو سالۆنە کردبێتیان بەکەنیسە بۆ نوێژکردن و سرووتەکانی ئایینی وعیبادەتکرن . لەناو ئەو سالۆنەدامەزبەحێکی لەقوردروستکراو هەیە پێدەچێت کەنوییە لەناو سالۆنەکەدا .لەو واقیعەدا هیچ سەلماندێکمان نیە بۆ ئەوەی روون بێتن لەلامان کەوا ئەو سالۆنە بەرسەن کەنیسە بووە.

٤- لە ئاکریٚ بۆ زێی گەورە

لەبەدواچوونماندا بۆ مێژووی درێژبوونەوەی گوندەکانی سفسفاکە هیوادارم بدۆزینەوەو قسەیان لەسەربکریٚ ، وەبەلای رۆژهەلاّتی رووی خواریێ زنجیرەچیای ئاکریٚزۆر گوندمان تووش دەبیت کەتاوەکو ئێستا شوێنەواری مەسیحی خۆی پاراستتوە .هێلّی گەشتەکەمان بۆ چوونە ناو ناژیانیان پێویستە هەمان هێلّ بێت بەلاّم بەئاراستەی پێچەوانەی ئەو هێلەی کەوا میترِاپۆلیت ((مارن عەممە)) گرتبوو یە بەر ، کاتێك ((نوفی)) ناردوومبۆ کەرتی مەرگەلە برِی ئەو فەرمانەی وەك سزابەسەری سەپێنرابوو(١٠٣٢)

پاشقال ئەوگوندەیەکە یەکەم گوند تووشی دەبین لەکاروانەکەماندا، لێرەدا شوێنەواری کەنیسەیەك دەدۆزینەوە بەوێرانکراوی. ئەم کەنیسەیە کاتی خۆی لە((کونا )) بوو ، دواتریش تەلارێك ، بەشێك لەو کەنیسەیە لەبەرد هەلکەندراوە وەهەروەها ئەشکەوتێکی بچووکی لێیە کە دەگەرێتەوە بۆ یەکێك لەرەبەنەکان لەنزیك گوندی ((زمنتا)) وەبەلای خۆرهەلاتیدا پاشماوەی کەنیسەیەك دەبینین.

وەهەروەها پاشماوەی کەنیسەیەکی تریش دەگەرێتەوە بۆ گوندی ((خاناکا))کە زۆر کۆنە (ئەشکەوت ) ی تیایە :-

گوندی بجیل گوندیکە دەکەوێتە خۆرهەلاّتی گەروی ((زمنتا )) لەپال کەنیسەکە ، ژمارەیەك ئاشی تیایە ، بۆیە لەکوندناوچەکە ناسراوە بە (بیٚ تخۆنایی)(واتە ناوچەی ئاشەکان – وەرگێر )).گەرانەوە بۆ نووسینەکانی(تۆما) مەرگەیی دەزانین ئایا لەوگوندە دێرێکی تایبەت بەراهبات –واتە بەژنان – هەبووە پێش ئەوەی ئەو گوندە دووچاری کاولکردن بێت بەهۆی ئەو ئاگرکەوتنەوەیەی کە ناوچەیەکی گرتەوە وبۆهۆی هەلوشینی زەویەکە لەگەل خەلکەکەیدا ، ((مارەن عەممە )) هەولیداوە یارمەتی یەکێك لەژناکەن

بـدات کـە زۆر نوێژکـەر و خاپەرسـت بـووە لەگـەل باوکیـدا نـاردی بـۆ دێـرى ((قـوڕای )) شوێنی ئەو دێرە نەتوانرا بزانرێ تاوەکو دوایی . لەوێ قوتابخانەیەك هەیـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ((باوای ))(١٠٣٣) .

لەسـەردەمی تۆمـا ((بـێ تخۆنـایی )) بریتـی بـوو لـەپاشماوەی گونـدیك کـە لەکونـدا تووشـی وێرانـی هـاتووە. (کەلاتی)،گونـدی دواتـرە کەلـە ڕێگەمانـدا تووشـی دەبـین بەئاراسـتەی ڕووباری زاب وە شوێنەواری دوو کەنیسەی تێدا دەبینرێ، هەنـدێك ئـەم ژمارەیـە بـە زۆرتـر دادەنـێن و بەچـوار وە یـاپێنج کەنیسـە. لەناوچـەیەك لـە شـوێنی ئـەو گونـدە بـەرزترە کەلەچیادایە دێرێك هەیە بەناوی دێری(مـاڕ قریـاقۆس) ، هەنـدێك شـوێنەکە بـەدێر بـانگی ناکـات بـەڵکو ئەومنـدەی بەسـە کەباسـی دەکـات بـە(شـوێنی ماڕقریـاقۆس). مەسـیحیەکانی (خەرجاوە) وە یا(خرجاوا) کە دەکەوێتە ماوەی چوار کاتـژمێر بـەپیادە وە بـەلای باشـووردا دوورە، وە هەروەها (مەسیحیەکانی دینارتە) کە دەکەوێتە دەشتی (نەهلە) دێنـە ئـەو شـوێنە بە پیادەیی بۆ حـەجکردن ڕۆژی جـەژنی ئـەو قەدیسە کـە دەکەوێتـە ڕۆژی پـانزەی مـانگی تەمووز.زۆرکەس بەپیادە دەڕوات بۆ حەجکردن لە پێناو ئەوەی منـداڵیان ببیـت بەتایبـەتی بـۆ ژنـە نەزۆکـەکان .سـرووتەکانی بـەکارهێنراوە بـۆ زانـینی ئـەوەی ئایـا ئـەو نوێژانـە داخوازیـەکانیان دێتـە دی یـان نـا، وە هـەروەها لەشـوێنی تـریش ئەمـەباوە: هەڵسـان بـە نووسـاندنی بـەردێکی بچووك بـە دیـواری کەنیسـەکە وە یـا دیـواری ئەشـکەوتی قەدیسـەکە کەداخوازی شـەفاعەتی لێـدەکرێ، لـەکاتی نووسـاندنی بـەردە بچووکەکە بـە دیوارەکـەوە یـا بەئەشـکەوتەکە ئەمـە مانـای ئەومیـە داخوازیەکـە دێتـە دی و داخوازیکەرەکـە ئـەوەی دەیـەوێت دەبێـت. نـاوی(قلیونتـا)(کەبـە ڕەچـەڵك قەلعونتایە)کـەوا مەسـیحیەکان بـۆ ئـەو گونـدە بـەکاری دێـنن واتـە قـەلاً.لێرە ئێمـە وای دادەنـێین کـەوا تووشـی (بیرتـا)ی کـۆن دەبین([٩٨٣]).

لـە کەنیسـەی ئـەم گونـدە گەورەیـە کـە دەکەوێتـە نـاو چـیاکان میترابۆلیـت((مـارەن عەممە)).دوا شەوی لەوێ بە سەر بـرد پـێش گوندەکە بـەجێ بهێڵـی وە بـەجێی هێشت بـۆ خۆراکی ئاگر هەروەك تۆڵەسەندنەوە. بێرتا تا ساڵی ٨٤٠ وەك بیابانێکی چۆڵ مـابوو. لـەلای خۆرهەڵاتیـەوە لەکونـدی(کلاتـێ) گونـدێك هەیـە بـەناوی(نـیروا) گونـدێکی کوردیـە بـەڵام کەنیسە کونەکەی تـاوەکو ئێسـتا بەسەرکەشـی ماوەتـەوە دەڕوانێتـە دەشـتەکان کـە بینایەکـە لـەخۆ دەگـرێ. لـەدۆڵی تەنیشـتیدا هەنـدێك ئەشـکەوتی تێدایـە لـەناو دڵـی بەردەکانـدا هەڵکەنـدراوە بـەڵام هەنـدێکیان دروسـتکراون. لـە ڕۆخ ڕووبـاری زاب کاتێـك دەچـیتە نـاو دۆلی(بەخمە)، لە هەردوو بەری دا_واتە ئـەم بـەرو ئـەو بـەری دێـری تێدایە.پێشـتر، باسـی

دێری حدیابمان کرد کە یەکێکیانە بەلام ئەویتریان دەکەوێتە مەرگە لەدەوروو‌پشتیدا ژمارەیەك لە گۆڕیتە ئەشکەوت هەیە ژمارەیان دەگاتە دووسەد.زەویەکانی دەوروپشتی ئەو دێرە تاوەکو ئێستاش پێی دەڵێن(زەویەکانی کەنیسە).

٥ ـ مەڵبەندی مەرگەی خۆرهەلات

ئەوەی پەیوەندی هەیە بەشوێنەواری مەسیحیەکان لەو چوار چێوەیە لەسەر نەخشە دەرناکەوێ تەنها بەشێوازی سێگۆشەیەکی گەورەی نیمچە بۆش لە هێماکان، بەهۆی ئەوەی چەند سەدەیەك بەسەر ئەو ناوچایە تێپەریوە کەلە ژێر داگیرکردنی ئیزدیەکان و دواتریش کوردەکان بووە. ئەو داگیرکردنە زۆرداریە و دەست بە سەرداگرتنە شەیتانیە دەرهەق بەماڤی مەسیحیەکان هیچ شوێنەوارێکی بەجێ نەهێشتووە بۆ ئەوەی باس بکرێت تەنها کەمێکی نەبێت بۆ ئەوەی وەك یادگارێك بۆ مەسیحیەکان بمێنێتەوە کە لە کۆنەوە هی خۆیان بووە کە لەو ناوچەیەدا بلاوبوو بۆوە. لەناوچەی سورچیەکان کە دەکەوێتە لای باشووری خۆرئاوای ئاکرێ ئەم گوندانەمان تووش دەبێت: خرجاوە:تاکە گوندی مەسیحیە بەجێگیری ماوەتەوە لەسەر باوەرداری مەسیحیی تاوەکو ئیستا کە دە کیلۆمەترە لەئاکرێ دوورە. کەنیسەیەکی نۆێی هەیە ناوی شەفیعەکەی هەلگرتووە بە ناوی(کەنیسەی قەدیس یوسف).ئەو کەنیسە کۆنەیەی کە هەمان ناوی هەیە(مارپوسف) بەرێوەبەریتی شوێنەواری عێراقی(٩٨٤). لەتۆمارگاکانی خۆی تۆماری کردووە تایبەت بە شوێنەوارەکان.لەهەمان گوند دا دەتوانین پاشماوەی کەنیسەیەك ببینین بەناوی کەنیسەی (مارت مەریەم/ وەشوینێکی نوێژکردن/ پەرستگەیەکی بچووك بەناوی (مارپیوس) کانیاوەکو باخچەیکی تێدایە.

لەلای باشوری خۆرئاوای خرجاوە گوندێکی کوردی هەیە ناوی (براکێ) یە بە توتنەکەی بەناوبانگە، کەنیسەیەکی تێدایە بەناوی (قەدیسە مەریەم) لەماوەی دووری زیاتر لە دوو کاتژمێر بە پیادە لە خرجاوە وە، وەبەلای باشوریدا هێمایەك دەبینین نیشانەی هەبوونی شوێنەکە پێ ی دەڵین (قەلای دێر) ێ کێلۆمەتریك دووری لەو دێرە گوندیك هەیە بەهەمان ناو/ واتەگوندی دێرێ). بەپێی دۆسیەی تایبەت بەودێرە هاتوەکە سەربەبەریوەبەریتی شوێنەواری گشتی عێراق (٩٨٥). بەرزی دیوارەکانی ئەو دێرە قایمەکە لەدوورەوە دەبینرێ تاوەکو ئێستا نزێکەی مەترێکە.

بە دووری حەفت کیلۆمەترلەخرجاوەوە بەلای باشووریدا گوندێك بەناوی (باساوێ) یە، بە رەسەن ئەوناوە کلدانیەکی پەتیە _(سریانی/وەرگێر)، ماناکەی(شوێنی پیران) رەنگە ئەوەمان لە وناوە دەستکەوێت شێوائینراوە بۆ ناوی(بازێوا) کە تۆما باسی دەکات(٩٨٦). ئەوشوێنە نەناسراوە و دیاری نەکراوە تاوەکو ئێستا .

لە گوندی (نوهاوا)کەدەکەوێتە نزیك (گەلی زمنتا)کە نۆمیلۆمەتر لە ئاکرێ دوورە وەبەلای باشوری خۆرهەلاتی دا ،پاشماوەی شوینەواری دێرێك هەیە و کانیاوەکی تێدایە. دۆسیەکانی بەغدا ئەو شوێنە بە (دێری مارپۆلس) ناوی دەبات ([987]). تاوەکو ئێستا لەوگوندە نزیکەی (٨٠) کلدانی نیشتەجێ یە.

٦- دێری برعێتا

دۆزی ئەم دێرە دۆزیکی سەرنجراکێشەرە بەپێ باری جوگرافیای کەنەسی.لە بەرئەوەی کاتێك لیکۆلێنەوە لەسەر بابەتێك دەکەین ئەم دێرە وەك دەبینرێ دێریکی دوولایەنە (واتە دوو دێر لەژێر یەك ناو) دابەلام تەنها یەکێکیان ناسراوە بەلام ڕەسەنەکە لەنێوانیاندا نەتوانراوە جێگەکەی بدۆزێتەوەتاوەکو ئێستا. بۆ دیاریکردنی شوێنی ئەو دێرە،لەبەردەستماندا هەیە لیستێکی سەرنجراکێش بەناوی گوندەکان،بەلام وە زۆربەداخەوە هەموو ئەو گوندانەی ناویان لە لیستەکەدا هەیە بە تەواوی لەناوچوون .کەواتە دەبێ بەوە ڕازێ ببین کەوا شوێنەکە بەشێوە یکی نزیککەرەوە دیاریبکەین و بەس.زانینی ئەرومە ـ وە ئەم کارە بەدور دەزانرێ ،. تاکە ڕێگەیە کە بەتەنها بمانگەێنێتە دواچارەسەری کۆتایی لە بەرئەوەی ئەو دێرە دەگەڕێتەوە بۆ بەناوبانگترین ڕەبەنەکانی سریانی رۆژ هەلات.

برعێتا:ژیانی رەبەن (برعێتا) واتای ناوەکەی (کوڕی کەنیە) یە بەناوبانگ و ناسراوە لای زۆر کەس، سەرەرای ئەو سەرچاوانەی کە هەیە،([988]). هەندێك دەق هەیە باس لە ژیاننامەی دەکات کە لە لایەی قوتابیەکەی تۆمارکراون ناوی (یوحەننان فارسی) بووە. وە هەروەها لەلایەکی تر بە شێوەی کورتکراوەی دەقی شیعری ڕێك وپێك ڕێککخراوە لە سەر وەزنی حەفتانە ، لەلایەن قەشە ئەورەهام زبایا دانراوە. ئەم دەقە دوبارە بلاوکراوەتەوە لەگەلێ وەرگێراوە ئینگلیزیەکەی سێر: E.A Wallis Budge Sir لەسالی ١٩٠٢ ([989]).

مە تران ئەدی شێرهەلسا وەبە لێکدانەوەی دەقەکە هاوپێنج لەگەل لێکدانەوەی کەسایەتی ئەو رەبەنە لەگۆفای L Qrient Chretien بلاویکردۆتەوە لەسالی ١٩٠٦ -١٩٠٧ ([990]).

مەتران سلیمان صایغ هەلساوە بە نوسینێکی کورت لە سەر ژیانی ڕەبەن (برعێتا) بە زمانی عەرەبی بەپشت بەستن لەسەر دەستنوسێك بە زمانی عەرەبی کە لەلای بووەو هێناویەتی لە دێری(بەرێز پاکیزە پارێزەری کشتوکالێ) .([991]).

لەوکاتەوە لەتوانای سەرچاوەی ئادابی سریانیدا هەبووەو وە هەروەها فەرهەنگەکانی مێژوو جوگرافیای کەنەسی بۆگەران بەدوای ئەو پالەوانە،(برعێتا) بێتاوان لەهەموو دەمەتەقێیەك پەیوەندی بە رووداوو مێژووەوە هەبێت. بودج پێشنیاری کردووە سالی ٥٠٨-

٥٠٩ ساڵی لە دایکبوونی بێت وە ساڵانی ٥٦١-٥٦٢ مێژووی دامەزراندنی دێرەکەی بێت وساڵانی ٦١١-٦١٢ مێژووی مردنی بێت بەڵام بەرێز مەتران ئەدیشێر ئەم مێژووانەی هەموو گەراندۆتەوە بۆ دواوە بۆ دە ساڵ. نووسەر و دانەرەکانی دواتر بەسەریەکدا دابەشبوون. هەندێکیان پشتگیری ئەومیانکرد وە ئەمانی تریش پشتگیری ئەویتریان کرد. لە واقیعدا ئەگەر فرسەتێك بدەین بۆلێکۆڵینەوە بۆپێشبینی یەکانی برعێتا تایبەت بەو فراوانبوونەی بەسەر یەعقووبیەکاندا هاتووە، پێمان باشە وە لە پێناو پارێزگاری لە ناوبانگی ئەو زاتە(ئەو کەسەی کە پێشبینی دەکات و دەبینی رووداوەکان روودەدەن پێش ئەوەی بەکردار رووبدەن-وەرگێر) لەسەرمانە ساڵانی کۆچی دوایی ٦١١-٦١٢ بکەین کە رووداوەکان بە کردار روویندابوو دواتر. دوای ئەو ژاوەژاوەی کە(سەمعانی) .([٩٩٢]). هۆکارەکەیەتی. توانرا جیاکردنەوە بکرێت(لە نێوان ئەو دوو کەسەی ناوی برعێتایان هەلگرتبوو)لەسەردەستی بودج.([٩٩٣]). وە رۆبنس دویفال.([٩٩٤]). وە مەترانی بەرێز ئەدی شێرکە توانیان لە نێوان ئەو دوو کەسەی کەناویان برعێتا بوو جیایان بکەنەوە، لەهەمان کاتدا، یەکێکی تر دەڵی .([٩٩٥]).:(دووەم) یان ژیاوە لەسەردەمی بەتریك حەننان ئیشوعی یەکەم (٦٨٦-٧٠٠) وە رەبەن بووە لە دێری رەبەن صلیوە کە دەکەوێتە سەررووباری دیجلە لە کەرتی بێت گەرمای. تاوانبارکراوە بەوەی سەر بەگرووبی نوێژکەران بووە . بەرێز ئەدی شێر ئەوەی سەلماندووە کەوا (برعێتا ) ژیاننامەی سەهدونای نەنووسیوە، وەنە ئەو (برعیتای) تر پەرتوکێکی لەسەر ژیانی رەبەنەکان دانەناوە بەناوی(مێژووی ژیانی رەبەنەکان).([٩٩٦]).

برعێتا، دامەزرێنەری دێرەکە ئاهەنگی جەژن لە رۆژی هەینی چوارەم لە ماوەی سرووتەکاندا ناسراو بە(پیرۆزکردنی کەنیسە) بۆ دەگێردرێ لەگەڵ(مارپەعقوب)لە بێت عاوی، وە (برحزبشبا) .وە (قام ئیشوع) وە(ئەفرام) .هەموو ئەمانە ئەوانەن دامەزرێنەری کۆمەڵەکانی خزمەتی خودایی لە چوار چێوەی مەرگەو داسن دا([٩٩٧]). مێژوو بۆمان باس دەکات کەوا(برعێتا) لە دایك بووی رەصافەیە کە دەکەوێتە سەر رووباری فورات، دواتر بۆمان دەگێریتەوە کەوا(٢٣) ساڵ یاوەری(ئیبراهیم )ی گەورەی کردیە لە دیری(ئیزلا) ئەم واقیعە لەتوانای ئەو رەبەنەدا بوو بۆ ئەوەی ئەو سیفەتە هەڵگرێ وەك کورە گەورەی قوتابیەکانی([٩٩٨]). ئەو مامۆستا گەورەیە، لەبەر ئەوەی ئەو دێرە بچووکە تەنها(١٠) لەو برایانەی تیا بوو کاتێك کە بۆ دوا رۆژی نزیك دامەزرێنەر دەبێ بۆ خۆی، کە لە ناویدا ئەشکەوتە پەرستگەیەکی لە ژێر هەیکەلەکە دا کرد. لەسەر بەردێك کە دەکەوێتە سەر کانی ئاوەکە([٩٩٩]). بەخێرایی دەوڵەمەند دەبێت و دەبێتە خاوەن ژمارەیەکی زۆر لە رەبەن

کە هەندێکی باسکراوە لە نووسینەکانی ئیشۆع دناح لەوێ قەشە شەمعوون دامەزرێنەری دێری(السن ـ سن)(١٠٥٢) جلکی ڕەبەنی وەرگرتووە دواتر پێشوازی لە قەشە شەمعوون کرد و لە دێرەکەیدا. لەنوسینەکانی(ئیشۆع سورەن)([١٠٠٠]) . وە هەروەها قەشەی دوا ڕۆژ(دیرتا) بۆ ئەوەی بەژیانی ڕبەنایەتی بژین ([١٠٠١]). وە تاقیبکەنەوە ٠ قەشە شەمعوون بۆ ڕێکخستن و هەڵسورانی کاروباری دێرەکە و ڕەبەنەکان(ئەبنی مارەن)ی دیارکرد([١٠٠٢]). کە دەبێتە باوکی روحی (المرشد الروحی _وەرگێر) بۆ (بسیۆن)([١٠٠٣]). وە بۆ قەشە (ئیشۆع)([١٠٠٤]). وە بۆ (مارزخا)([١٠٠٥]). ڕەنگە مەبەستی مارن زخا بێت _مەترانی حەدیسە_.ڕەبەن هورمزد یەکێك بووە لە قوتابیەکانی(برعێتا)([١٠٠٦]). ڕەبەن هورمزد هاتووتە دێری برعێتا بە یاوەری سێ ڕەبەنی تر کە لە مووسڵ بەیەکگەیشتن ئەوانەن: ڕەبەن یەعقووب خەڵکی (کفر زمری )([١٠٠٧]).وە یوحەننان خەڵکی(ئەشمرخ)([١٠٠٨]). وە حەننان ئیشۆع لە حدیابەوە.ئەو کاتە لەدێری برعێتا(٢٦٤) ڕەبەن هەبوو وە سەرۆکی دێرکە ناوی (سۆر یشوع)بوو.دوای ئەوەی ڕەبەن هورمزد بوو بەڕەبەن لەودیرەدا، بۆ ماوەی حەوت ساڵ لەوێ دەژیا، دواتر لە دێرەکە کشایەو بۆ ئەوەی لە ئەشکەوتێکی سەربەخۆ بە تەنها بژیت . ئەو ماوەیەی کە ڕەبەن هورمزد لەسنووری دێری برعێتا ژیا(٣٩)ساڵ بوو([١٠٠٩]). وە هەروەها ڕەبەن(یوزاداق)یش پەیوەندی بەدێری برعێتا کردووە ([١٠١٠]).کە بەهۆیەوە(ئیشۆع سورەن)یش هاتووە ([١٠١١]). بۆ ئەوەی بەژیانی ڕەبەنەیاتی تەنهایی بژین. ئەم ڕەبەنە_(ئیشۆع سورەن) ـ نوێیە ـ قوتابیەکی هەبووە بە ناوی(شەمعوون)([١٠١٢]). وە ئەم قوتابیەخوشکێکی ڕاهبەی هەبووە ناوی (هێلین([١٠١٣]). بە ناوی قوتابی باش وهەڵکەوت و بەتەئکید(یوحەننان فارسی)بووە([١٠١٤]). کەدەبێتە نووسەرو دانەری ژیاننامەی دامەزرێنەری دێرەکە. لەو خاسیەتانەی کە هەیبووە بەپێی ژیاننامەکەی کەلەسەری نوسراوە ئەمەیە: (پێشبینی) کە ئەمە بەکرداربووە.ئەو پێشبینی کردووەکەوا ئەو برایانەی لەدێری بێت عاوی دەژین پەرت وبڵاودەکەن([١٠١٥]). وە هەروەها پێشبینی کردووە بە دەرکردنی (سەهدونا) لە کەنیسە([١٠١٦]).، وەپێشبینی کردووە بەفراوانبوونی بڵاوبونەوەی مەزهەبی یەعقووبیەکان لە دەشتی نەینەوا([١٠١٧]). ئەوەی تایبەتە بە سرووتانە کە لەسەردەستی دا ڕوویداوە دەڵێین زۆر زۆرە وە هەمووی پێمان تۆمار و ئامار ناکرێت ، هەندێك ئاماژە بە درێژایی جوگراڤی دەکەن . لە واقیعدا خەتەرناك بووە لە مێژووی برعێتا بۆ ئەوەی ئەو سرووتانە جێگیر بن لە کات و شوێنی خۆیدا ، بەڵام لەسەرئەوەشەوە دەتوانین گفتوگۆ بکەین لەسەر مێژووی ئەو سرووتانە، کە تاوەکو ئێستا شوێنەکەیان جێگیر نەکراوە.

## شوێنی تەقلیدی

بەپێی تەقلیدی کلدانی نوێ، چەسپێنراو لەسەر نەخشەی jones بۆساڵی ١٨٥٢، دێری برعێتا دەکەوێتە لای باکورلە گوندی (تەرجەلا /تەرگەلا) وە لە جێگەی شوێنەکەی باکوری رێگەی مووسڵ ئەربیل وە بەدوری (٦) کیلۆمەتر لە رۆژهەلاتی کەرملێس بە ئاراستەی باکوری خۆرهەلاتیدا .لەو ناوچەیەدا شوێنێك دەبینرێ بۆ شوێنەوارێك بە درێژایی (١٠٠مەتر) ئەو شوێنە چالاکییەکی تێدایە ئاماژە بەوە دەکات کەوا دیواری بینایەیەك بووە بەلام بەردوو گەچەکەیان بردووە واتە هەموو کەرستەی بینایەکە(لە بەردو گەچی وشك) بەخێرایی ([١٠١٨]). هەموو مێژوونوسەکانی تر([١٠١٩]). رازین لەسەر دیاریکردنی ئەو جێگەیە بۆشوێنی ئەو دێرە بەبێ شك. بەلام ئێمە لای خۆمان ، پێویستە روونی بکەینەوە بە راشکاوی کە ئەورایە پشتی بەستووە بە خوێندنەوەیەکی هەڵە بۆ دەقێك لە نووسینەکانی عەمروودا هاتووە ([١٠٢٠]). سەلماندن بۆ ئەمە ئەوەیە: لە جیاتی خوێندنە دەقەکە –رەبەن برعێتا و قوتابیەکی رەبەن کۆرکیس لەسەردەمی (ئیشوعیای بەتریك –وەرگێر) کە دێرەکەی دەکەوێتە کەرملێس لەولاتی مووسڵ- خوێندنەکە کراوە بەبێ برگەی (قوتابیەکەی رەبەن کۆرکیس) بەم شێوەیە کردویانە سەر بە دێری برعێتا نەوەك بۆرەبەن کۆرکیس، هەروەك هەیە.بە راستی یەك سەردان بۆ شوێنە تەقلیدیەکە وامان لێ دەکات بێزاربین لەبەر ئەوەی دیاریکردنی ئەو شوێنەپێچەوانەی زۆر لەو باسە دوورو درێژمیە هەیە کە تایبەتە بە ژیانی برعێتا. ئەو کاتە ئەنجامەکەی یان مێژووی ژیانی برعێتا راست نیە ومیان هەڵەیەك هەیە بۆ دیاریکردنمان بۆ شوێنەکە.بەهەرحاڵ ئەمەکارێکی سەر لێشێواوانە یە بەبەردەوامی و پەسندکردنی یەکێك لە فەرزیەکان وە بە تایبەتی لە ولاتی رۆژهەلات دا چونکە تەقلیدە دەورە دراوەکان خەرمانەیەکی پیرۆزییەکانە. خاوەن بەختی چاك بووم کەوا لەسەردانەکەم دا بۆ شوێنەکە شەماسی کاراما(مەتی ئەنیسە)(کەرملیس) لەگەڵدابوو. کەئەوانەم بۆ روونکردەوە هەستی بە هەڵەکان کردوو شلەژا،و هەستی پێکرد وەك خۆم و شەرم دایگرت. دواتر دەڵێ: (منیش گەیشتمە هەمان ئەنجام وەکو تۆ). بە کردەوە، دێری برعێتای راستەقینە پێویستە بکەوێتە ناوچەی(مەرگە)، بەلام دەبینین کەوا(ترجلا) و (حەسەن شامی) دەکەونە نەینەوا، لەلایەکی تر ،پێویستە ئەو تێبینیە بکەین ،وە بەپێی دەقەکانی مێژووی رەبەن یۆنان کەخەریك بوو ببێتە نێچیر بەدەم شێر کە دەگەرایەوە لە سەردانی کەسوکاریدا([١٠٢١]). کەپێویست بوو لەسەری لەرووباری خازر بپەرێتەوە بۆ ئەوەی لە کەرملێس بچیتە دێری بێت عیتا.دەقە تایبەتەکە زۆر بەروونی و تەواوەوە دەڵێ:((زۆر

زەحمەتە کەوا ڕووباری خازر وەك نمونە دابنێین بە لقێکی وە یارێرموی ناوی وەرزی کەتەنها ئاوەکەی لەزستاناندا بەدۆلی جەهەنەم دادەروا.جگە لەمە پێویستەلە سەرمان بەدوای ئەو کانیاوە بگەرێن کە دەکەوێتە ژێر کەنیسەکە . ئەمەمان بۆ جێبەجێ ناکرێت لەشوینی دێرەکە، کە دەبی شوێنی راستەقینەی دێرەکەبێت . ئەمە جگە لەوەی کەوا کانیاوێك هەیە لە ترجلا دەکەوێتە جێگەیەکی دوور ریگەمان نیە بچینە ئەوی لەچوارچێوەی لێکۆڵینەوە و باسەکەماندا. کەواتە ئیمە لەبەردەم رووبەروونەوە داین کە سانایە لەسەرمان بلێین ئەو شوینەی دێری برعێتای راستەقینە ئیرە نیە. لێردا پرسیارێك بەخەیالماندا دێت ئەوەیە: ئەو دێرەی لە ترجلادا هەیە چی یە؟ وە لەبەر چی ناوی دێری(برعێتا)یە ؟ بۆ یەکەم جار هەستم بەوە کرد کەوا لوغزەکەم دۆزیەوە هەلمهێنا لە رستەیەکدا دۆزیمەوە لە دەقێکدا لە پەرتوکی سەرۆکەکان([١٠٢٢]) . کەتۆما دەڵی :(لەدێری برعێتادا پیاوێکی قەدیس دەژیا ناوی(ئیشۆع سورەن برمامی) یە ئەم قەدیسە بۆماوەیەك لەناوجێگەدا راکشابوو. سەرینەکەی ئامێرێك بوو بۆ چارەسەرکردن و شیفای بۆ نەخۆشێکی زۆر کرد. دوای ئەوەی تەندورستی باش بوو چاك بووەوە، بوو بە مەترانی نەینەوا.وە هەڵسا بەکاری چاکردنەوەو پینەو پەرۆی پێویست بۆ دێری برعێتا وە شوێنەکەی گۆری.بەتەواوی هەروەك رەبەن پۆلس لەگەل رەبەن سیبریا(قبریانس) کردیان ، بەلام گۆرانکاری لە شوێنی دێری برعێتا و گواستنەوەی لە کەرتی مەرگە بۆ نەینەوا ناکرێت بیبەستینەوە بە (برمامی) لەبەر ئەوەی : یەکەم دەقەکە تەنها باسی هەیکەلەکە دەکات و بەس، وە دووەم لەبەر ئەوی(برمامی) لەنیوەی دووەمی سەدەی هەشتەمی زاینی ژیاوە، بەلام نووسەرە نەمرەکە لە دەوروبەری سالی(١٠٠) ژیاوە وەلە دەقە نوسینەکانیدا وا دەردەکەوێ کەوا دێری برعیتا تا ئەو کاتەهەرماوەو کاردەکات بەچالاکی لە شوێنێك لە سەر ڕووباری خازر ،لەلایەکی تر، سەرکەوتنی یە عقووبیەکان و زال بوونیان بە سەر ناوچەکە وا دەکات بابەتی گواستنەوەی دێرەکە لە دووسەدەی بە دوای یەکدا بووبێت کە ئەگەری ئەمە کەمە ،ئەگەر نەڵین زەحمەتە .سەرەرای ئەمەش هیچ مەسیحیەك نەماوە لەو ناوچەیە بژیت لە سەدەنوییکەنی دواتر.ئەم روونکردنەوەیە وامان لێدەکات کە بڵین شوینی دیری برعیتا لە ترجلا لەسەر بنەمایەکی جێگیردا نیە. وە لەوانەیە ئەو ئەگەرە پشت بەستووبێت بە هەڵەیەك لەو لێکدانەوەی ڕویداوە لە خوێندنەوەی دەقەکانی نووسینەکان هەروەك لە پێشەوە ئاماژەمان پێیداوە. ئیستا پرسیارێکمان وەبێردێت ئەوەیە :(لە کەیەوە شوێنی ئەو دێرە دیاریکراوە؟ وەلام:واپێ دەچێت ئەم دیاریکردنە نوێ بێت.لە واقیعدا پاشکۆکانی دەستنووسی کەرملێس کە تایبەتە بە کات و زەمەنی دوای سالی

١٣٦٤تایبەتە بەمەی خوارەوە: (ئەوبەناوبانگە لە نێوان(قەدیسەکاندا) (لێرە مەبەستی ڕەبەنەکانی ئەو دێرەیە کە لەو دێرە ژیاون ژیانی قەدیسەکان/ وەرگێر). سك هەلکوشێنەکانیان جێگەی سەر سوڕمانە بەبەراورد بەوانەی کەکاریانکردووە لەسەر ئەمانەتی جەستەو پیویستەکانیدا... (برعێتا) بریتیە لە خۆرێکی پڕشنگدار بۆ قەدیسەکان وە هەروەها خوشکەکەی (حنە ئیشۆع/ واتە خەنەی ئیشۆع(عیسا) ) باوەرداری لەسەرەخۆ. شوێنی تایبەتیان هەیە لە پۆلێنەکانی کەرملیس بەکۆمەل نەك لە گۆشەتایبەتیەکانیدا. وە هیچ زیادەیەك ناخاتە سەر ئەو زیادانە بۆ سەر ناوەکانیاندا رستەی کە زیادە دەکرێت لە دوای ناوەکان ئەم دەقە دەستەواژەیەکە :(لە سەر ئەمە (بۆهەردوکیان برعێتا و خوشکەکە ـ وەرگیر) دێرەکان لە ولاتەکەمان دامەزرێنراون).ئەم دەستەواژەیە زۆربەی دەبینرێ زیادکراوە بەسەر ناوی شەهیدەکان وەیا کەسایەتیە بەناوبانگەکان لە گوندا.هەتاوەکو دەستنوسی (الحوزرا) بۆ سالی ١٧٢٧ کە تایبەتە بەکەرملیس هیچ یادگارو باسی برعێتای تێدانیە.کەواتە دیاریکردنی شوێنەکە لەو جێگەیە بە کارێکی نوێ دادەنرێ و هیچ نرخێکی مێژووی نیە. لەبەر ئەوە دەتوانین بلێین کەوا دێری ترجلا دێریکە دامەزرێنەرەکەی بزرە و دیارنیە وە پێویستە لە سەرمان بەدوای بگەرێین بۆ ناسینی ناسنامەکەی بەراست و وردیەوە.وە ئیستا پێویستە لە سەرمان دووبارە لێکۆلینەوە لە شوێنی (برعێتا)ی راستەقینە بکەین:

## دەرەنجامەکان بۆ دیاریکردنی شوێنەکە

بە پێی ئەو زانیاریانەی پێمان گەیشتووە لە نووسینەکانی(ئیشۆع دناح) دەزانین کەوا دێری(برعێتە) دەکەوێتە کەرتی مەرگەی کەنەسیەوە([١٠٢٣]). بە دەستنیشانکردنی لە ناوچەی رۆژئاوای مەرگە([١٠٢٤]). ئەمە نیشانەی ئەومیە دەکەوێتە خۆرئاوای ولات بۆ زیادکردنی روونکردنەوەی دیاریکردنی شوێنەکە باسی دەقە مێژووییەکانی تایبەت بەو دێرەی ئەو شوێنە نزیکە لە ولاتی نەینەوا([١٠٢٥]) دەکەین. دواتر شتی بۆ خراوەتە سەر:(لە دەشتی مەرگە کە دەکەوێتە نێوان نەینەوا و مەرگە([١٠٢٦]).

بە پێی ئەو دەقانەی کە دەیخوێنینەوە لە مێژووی سعردی کەوا دانیشتوانی ئەو ناوچەیە لە کوردەکانە و ئەو رەبەنە قەدیسە توانیویەتی ژمارەیەکیان باوەڕ بە مەسیحیەت پێ بهێنێ لەو باسکردنەدا، وا دەردەکەوێت کەوا هەموو شتێك ساکار و سادەیە. لەو دەقەی کە ئاماژەمان پێی دا لە سەرەوە ئەو دەستەواژەیەمان خوێندەوە:(لە دەشتی مەرگە لە نێوان نەینەوا و مەرگە). بەلام لەو دەشتەدا(باخیلابی) و(باخۆرنیا) ی تێدایە کە دوو گوندی

پیرۆزن. لەلای باشووریدا دەشتێکی جوان درێژ دەبێتەوە و ئارامی باڵی بەسەر کێشاوە و ناودێریەکی رێکوپێك و تەواو دەکرێت. لەم بەشەی ئەو زەویەدا توانرا دێرێك دابمەزرێندرێ لە دووری کەمێك لە دەوروبەریدا([1037]). واتە لە ناوچەیەك دەکەوێتە لای رۆژهەلاتیەوە گوندێك هەبووە بە ناوی(بەرزانی) هەروەها پێی دەگوترا(شار سعار) لەوێدا برادەرێکی هەبووە ناوی(موبیت) بووە و دۆستێکی زۆر خۆشەویستی برعێتا بووە. بەهۆی ئەمەوە خەسووەکەی چاك بۆتەوە و شیفای کردووە([1028]).

وە گەڕاندنەوەی گوندەکەی کە پێشتر لێی دەرکرابوو. لەو گوندە رەبەنێکی تاقانە هەبوو زۆر بەرۆژو دەبوو بە سکهەلگوشین بەناوبانگ بوو ناوی(ئیشۆعیاو) بووە پێشتر توانیویەتی دامەزرێنەری دێرەکە زیندوو بکاتەوە لە مردنێکی تەواو کە لە ئەنجامی پێوەدانی مارێکی ترسناك کە هێرشی کردبوە سەری([1029]).

بەڕێز مەتران سلێمان سائیغ پێشتر باسی گوندی بارزانی کردووە بە" بەحزانی" ناسنامەی کردووە کە بە دووری ٢٢ کیلۆمەتر لە موسڵەوە دوورە و دەکەوێتە لای باکوری خۆرهەلاتیەوە ئەم باسە هیچ راستیەکی تێدا نیە مادام بە پێی دەقەکان هاتووە، پێویستە شوێنی گوندی بارزانی لەلای خۆرهەلاتی دێری برعێتە بێت، وە ئەمە واتای ئەوەیە وا پێویست دەکات کە بکەوێتە ناوچەیەکی قوڵایی بۆ ناو زەویەکانی مەرگە لەلای خۆرئاوای دێرەکە گوندێك هەبووە پێیان دەگوت(خربات شنۆ نیتە)([1030]).

ئەشکەوتێکی تێدا هەبووە پێیان دەگوت(دێرە دنەقسا) دواتر، لە جێگەیەك دەکەوێتە ژێر دێرەکە([1031]). گوندێك هەبووە ناوی(باعرباسا) بووە لە لێکدانەوە بۆ نووسینەکەی بەڕێز مەتران ئەدیشێر ناوی ئەو گوندە هاتووە بە شێوەی باعربایی(کە واتای جێگەی عەرەب) ە ئەم ناوەی دوایی لە دەقە عەرەبیەکان بە شێوەی(باربێسا) هاتووە([1032]). ئەم گوندە راستەوخۆ دەکەوێتە سەر رووباری خازر. لە ساڵی ٦٨٦ لە گوندی(عەربیتا) یان(باربیسا) شەڕێکی بەناوبانگ روویداوە(عەبدوڵلای کوڕی زیاد) بە دەستی(ئیبراهیم ئەلئەشتەر) کوژراوە([1033]). لەلای(خالیدی) ناوی دێری برعێتە هاتووە لەژێر ناوی دێری بربیسا ئەمە لە ساڵی(١٠٠٠) هەزار بووە، ئەم دەقە لای(فەزلئەڵلا ئەلعەمری) یش هاتووە([1034]). لە نیوەی یەکەمی سەدەی چواردەهەم، خالیدی باس لە مێوانداری و خزمەت کردن دەکات کە لەو دێرلە بۆی کراوە و مەدحی زۆری دەکات کە لەو دێرە لەلایەن رەبەن گبرئیل خواردنی زۆر و بە لەزەت لەگەڵ شەرابی کۆن پێشکەشی کراوە. دانەری پەرتووکی(المسالك) شوێنی دێرەکەی کردووتە سەر رووباری خازر. ئەمە مێژووی برعیتەش تەئکیدی لەسەر دەکات کە ئاماژە بەوە دەکات دێرەکە ئاشێکی هەیە کە نزیك بووە لە جۆگە(رووبار)([1035]).

ناوی ئەو گوندانەی کە خەڵکەکانیان هاوکاری دروستکردنی دێرەکەیان داوە، ئەو گوندانەن کە نزیکی دێرەکەن وە یان لە دەوروپشتی دان، بە دڵنیاییەوە پارمەتیمان دەبێت بۆ ناسینی شوێنی دێرەکە و دۆزینەوەی. بێجگە لە گوندی(باحۆرنیا) کە پێشتر باسمان کرد([١٠٣٦]). ناوی گوندی(بابارسێرا)([١٠٣٧]). هاتووە پارێزگارەکان بۆ داب و نەریتی کەرملێسی دەڵێن کەوا شوێنی ئەو گوندە ئەو گردەیە کە دەکەوێتە کۆتایی سنووری زەویەکانی گوندەکە و بە دووری دوو میل و پێی دەڵێن(بارشێر). بەلآم لە رووی کردەوە دا لە سەرمان پێویستە لە جێگەیەکی تر بکۆڵینەوە. هەروەها رەبەنەکانی دێری زاوایا Zawyia وە بەعەرەبی(زابی)وە واتای (مامزە)ە. پارمەتی دروستکردنی دێری برعێتایان داوە.یەکێك لەو رەبەنانە ناوی یوسف بووە ئامۆژگاری ئامادەکردووە و موژدەیان پێدەدات بەهاتنی دامەزرێنەری نوێ([١٠٣٨]). دێری(الغزال/مامز) ئەو کات هەبووە و رەبەنەکانی بە هەموو چالاکیەکەوە کاریان دەکرد پێش ماوەیەك لەدێر زەمانە، وە لە پێش ساڵی ٥٦٢، دەقەکان باسی دەکەن بە (دێری "مامزی" جوان) شوێنەکەی دەکەوێتە سەر (رێگای شا/طرق الملك) کە بە پردێك تێپەر دەبێت .لەوێوە رێگەکە بەرەو حدیاب دەچێت. دوایی دەروات بۆ بێت گەرمای وە دواتریش بەرەو چیاکان دەروات. لەدێری غەزال بێجگە لەرەبەن یوسف حزایا(یوسف الرائی/یوسفی پێشبینی کردن) کە ئەو کات تەمەنی (١٣٠) ساڵ بووە، قوتابیەکەی (مارکبا) وە هەشت رەبەنی تریش. لەلای نزیك بە دێری(مامز) دوو گوند بەشداریان کرد بە خەڵکەکەیەوە بۆ پارمەتیدانی دروستکردنی دێرەکە یەکەمیان ناوی(برزاخێ)یە([١٠٣٩]). وە دووەمیان(بامارۆس) پێشتر ناومان هێنا و باسمان کرد لەگەڵ(رێگەی شا) ومیان(رێگەی پاشاکان)([١٠٤٠]). وە هەروەها گوندێکی تریش هەیە خەڵکەکەی پارمەتی دروستکردنی دێری برعیتایان کرد، وەناوەکەی(باوسا)یە. ناوی ئەو گوندە زۆر جار هاتووە لە دەقەکانی مێژووی دێری برعێیتا([١٠٤١]). جارێکیان ناوەکەی بە زۆر گرنگیە وە هاتووە(باوسای گەورە) دامەزرێنەری دێرەکە و خەڵکی ئەو گوندە هاوکاری یەکتریان کردووە بەشێوەی پارمەتی و کارگوزاری. یەکەمیان(دامەزرێنەری دێرەکە) نەخۆشەکانی چاك دەکردەوە واتە شیفای بۆدەکردن، بەلآم خەڵکی گوندەکە بەخێرایی خواردەمەنیان پێشکەش بە دانیشتوانی دێرەکە دەکرد و بەتایبەتی کە برسیەتی روویدا، بەبۆنەی قسەکردن لەسەر هەندیك دەکمەنی کە باسکراوە لە دەقەکاندا هاوکارمانە بۆ زانیاری جوگرافی کە پێویستمان پێی هەیە، تێیدا هاتووە کەوا خاڵێکی پاسەوانی سەر بە(حدیاب) هەبووە.

ئەم زانیاریە لە شوێنێکی تریش دا هاتووە کە ئەو گوندە دەکەوێتە سەر ڕێگەی بەرەو مەرگە دەچێت. لە نزیك گوندی باوسا دێرێکی تایبەت بە خوشکی برعیتا و دروست کرا کە ناوی(حنا ئیشوع) وە ناوی دێرەکەش" بامبرۆینا"(١٠٩٥) ئەم دێرە دوای ساڵێك لە دروستکردنی دێری(برعیتا) واتە ساڵی ٥٦٣(حەنە ئیشوع) لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، بە پێی پێوانەی مەتران ئەدیشێر ئەمە لە ساڵی ٣/٥٩٢ بووە. لێرەدا دەبێ ئاماژە بە پێوانەکردنی ڕووداوە مێژووییەکان بکەین کە لەلایەن مەتران ئەدیشێردا بۆ دە ساڵ بۆ ڕووداوەکان لەو حیسابەی زانراوە و بەکاردێ بە پێی حیسابی ئێمە مێژووی مردنی(راهیبە حنا) ی خوشکی برعێتە ساڵی ٣/٥٨٢ بووە. ئەوانەی کەوا باس لەوە دەکەن شوێنی دێری برعێتا نزیك کرملێس([١٠٤٢]) ە.

هەر خۆشیان بانگەشەی ئەوە دەکەن کەوا شوێنی شوێنەوارێکی کاول هەیە لە نزیك کرملێس و دەڵێن هی دێری(فبرونیایە). ئەم شوێنەوارە و کاولانە بە دووری یەك کیلۆمەترە لە کرملێس.

دان پیانان بە راستی ناسنامەی ئەو شوێنە بە شێوەیەکی راستەوخۆ بەستراوەتەوە بە دانپیانان بە ناسنامەی دێری سەرەکی، واتە دێری برعێتە. وەك دەڵێن دێری فبرونیا دەکەوێتە(کەرتی مەرگە) کەوا دەکەوێتە لایەکی ڕێگەکە کە بەرەو مەرگە دەڕوات، واتە دەبی لە ناوچەی مەرگە بێت ئەم تێگەیشتنە تەئکید دەبێتەوە بۆ چەند جارێك لە یادکردنەوەی ناوی گوندی(قوب) کە پێشتر برعێتە بەو گوندە تێپەڕیوە لە ڕێگەی چوونی بۆ دامەزراندنی دێرەکە([١٠٤٣]). ئەمە جگە لەو دەقەی کە دەڵێ: شوێنی دێرەکە دەکەوێتە ناو زەویەکانمان([١٠٤٤]).

ئەم گوندە دەکەوێتە ناو دەشتی(نابکۆر) بۆیە ناتوانین تێکەڵی بکەین لە نێوان ئەو گوندە بە گوندی(کۆبان) کە دەکەوێتە نزیك(بەعشیقە - باشیك). هەروەك ئەوانەی باسی دەکەن کەوا دێرەکە شوێنەکەی کرملێسە، واتە شوێنە ئاساییەکەی([١٠٤٥]). بە پێی ئەوانەوە ئێستا کاتی دەرئەنجام هاتووە و دەڵێین: مادام توخمەکانی بۆش هەیە کە ئەو هەڵەیان تێدا هاتووە، کەواتە دەتوانین بڵێین: (شوێنی دێری برعێتە پێویستە لە مەرگە بێت لە شوێنێك سەر بە نەینەواو لە سەر ڕووباری خازر). لە راستی ئەو گریمانەیەدا پێویستە لە بەری ڕۆژهەڵاتی ڕووبارەکە بێت و لەو بەشەی ئاوی ڕووبارەکە دەکەوێتە نێوان مەرگە و نەینەوا، یان ئەو ناوچەیەی دەکەوێتە نێوان تێکەڵبوونی بە ڕووباری کۆمەڵ لە باکووردا و خاڵی ڕێژگەی بە زاب لە باشوور. ئەو دەشتە جوانە کە هێمنی و ئارامی باڵی بەسەردا کێشاوە و ئاودێری باش دەکرێت لای باشوورییەوە دێری برعێتە دروست کراوە. ئێستا ئەم

دەشتە بە دەشتی(العشائر السبعە) ناسراوە. ئەو دوو گوندەی ناویان هاتووە کە وتراوە دەکەونە باکوری ئەو دەشتە ئەمانەن: گوندی باخیلابی و باحورنیان و لە یەکەمیان دا دەردەکەوێ بە پێی پێشنیارەکەمان دەیدۆزینەوە کەوا پەیوەندی هەبووە لەگەڵ گوندی(خیلافەت) لە سفسفا بەڵام دووەمیان پەیوەندی هەبووە لەگەڵ گوندی(باکرمان) کە سێ کیلۆمەتر بەلای باکوردایە. مادام(چیای زیریك بەردەڕەش) ئەم دەشتە دەبڕێ زۆر بە ڕوونی بەلای باشووریەوە. کەواتە ناتوانین بەدوای دێرەکەدا بگەڕێین لە ناوچەیەکی نزیکتر لەو زنجیرە چیاییە بچووکە. وە ئەمە باسەکەمان کوێت وبەند دەکات لە سەر دێرەکە لەو ناوچانەی کە دەکەونە دەوروبەری(پردی مەندانی) ئیستا. لەلایەکی دووەم دا دەبینین کەوا پاش چەند چرکەیەك(بێ ئومێد)ببم کەوا سەرپەرشتیاری کاروباری دێرەکە، لە ناوچەی دەوروبەری دیرەکە نیشتەجێ بوویێت، وە بینایەیەکی(خان)ی هەبووە کە دەکەوێتە لایەکی(ڕێگەی شا). ئەم تێبینیە تەئکید لە سەر راستی دیدی ئێمە دەکات. هەندێك باوەریان وا بوو کە دەبێ پەیوەندیەك هەبێت لە نیوان ناسنامەی(بربێتا) کە دەکەوێتە سەر خازر و ناسنامی گوندی(مەنقووبە) کە لەکۆندا پێیان دەگووت(مەعروبا) کە ڕەگی ناوەکەی (موعرب/معرب)/تەعریب کراو)ە(وەرگێر )ئەم واقیعە وامانلێدەکات دورکەوینەوە لە ناوی(باعەرەبایی/باعربایی)واتە(باعرب/باعەرەب) ماوە لە نێوان مەندان و گوندی مەنقووبە لەلایەك و موسڵ لەلایەکی دووەم دا زۆرنزیکە واتە (٣٥ کێلۆمەتر) بۆ ئەو ماوەیە لێکچونێکی گەورە هەیە لەگەل ئەو(٥ فرسەخە) کەوا (تەبەری ـ الطبري) باسیکردووە.بەلام تێبینیەك هەیە پێویستە لێ ی ئاگاداربین کەوا گوندی مەنقووبە زۆردوورە لە (ڕێگەی شا) وە، وە هەروەها زەحمەتە بتوانین بڵین کەوا دەکەوێتە باشووری دەشتی (العاشر السبعە). جگە لەمە ئەبێ ئەوە تێبینی یە بکەین کەوا مەندان لە هەمانکاتدا پێ دەلێن (عمر مەندان)تاك (عومەر) شێواندنە بۆ تاکی (عومەر). (وابزانم نووسەری بەڕێز ویستوویەتی ئاماژە بدات و سەرنجی خەلك ڕابکێشی کەوا تاکەکە ئارامیە (ئومرا ـ عومرا ـ کە بەواتای کەنیسە یان دێر دێت(وەرگێر)ئەوەی پەیوەندی بە دێری قەدیسە فبرۆنیا هەیە، پێشتر وتمان شوێنەکەی دەکەوێتە نزیك گوندی (باوسا). وە لە سەر نەخشە ناوی گوندێك هەیە پێ ی دەڵین(دێرین بوت) وە دەکەوێتە دووری (١١ کێلۆمەتر) لە بەردەرەشەوە وەبەلای باشوور. وە ئەم شوێنەش لە بارە بۆ دەستنیشا نکردنی شوێنی دێرەکە. بە پێی ئەو زانیاریانەی ئیستا و زانیاریەکانی تر کە لەسەر ئەرزی واقیعدا هەیە وە بەدەرلە قسەکردن، خۆم دەبینمەوە نەتوانم بچم بۆ خاڵێکی دوورتر کە پێی گەیشووم.

## ئەو گوندانەی ناویان هاتووە

چەند گوندێك هەیە ناویان ئاماژەی پێ دەدرێ لە دەقەکانی مێژووی برعێتا، ئەم گوندانەن کە دوورنین لە دێرەکە. بەلأم زۆر بە داخەوە زۆر بە وردی دیاری نەکراوە کە ئەو گوندانە دەکەونە کەرتی مەرگە وەیا نەینەوا. (باموسای) ناوی ئەو گوندەیە کە برعێتا نەخۆشێکی شیفاکرد لە نەخۆشی(جەرگ/ استسقا _تشمع کبد/دا)([١٠٤٦]). دوو گوندی تریش هەیە دەکەونە دەوروبەری(عین سفنێ) وە پارێزگاریان بە ناوە کۆنەکانیان کردووە. یەکەمیان پێی دەڵێن(مۆزیکا) وە دەکەوێتە دووری پێنج کیلۆ مەتر باکووری ئەو شارە بچووکە(عین سفنی) وە دووەمیان پێی دەڵین(مۆزیکان) وە پانزە کیلۆ مەتر لە شارەکە دوورە ، وە بەلای باشووری خۆرهەلأتیدا . لە گوندی (برات) ژنێکی نەزۆك مێردی بەپیاوێك کردبووناوی (زدقوی) بوو (برعیتا سێ پارچە خەنەی دایە ژنەکە، ژنەکە سێ کوری بوو، ناوی کورە گەورەکەی (بردێری) بوو چووە ناو دێرو بوو بەرەبەن ([١٠٤٧]). رۆژێکیان، لەو کاتەی برعێتا لە گوندی(باقوشتا) بوو، تارمایی توشی دوو بووك و زاوا بوو([١٠٤٨]). هاتنە لای برعێتا بۆ ئەوی یارمەتیان بدات، وە تارماییەکەی دەرکرد و بووك و زاوا کە رزگاریان بوو لەو ترسە کە وەخت بوو بیان کوژی بەلأم لەگوندی(باقشای) رەبەن مەتی، کە یەکێکە لە رەبەنەکانی دێرەکە هەڵسا بە دەرکردنی جنۆکەکە لە بیرێکی قوول دا دەژیان وخەڵکەکەی ئاویان لێ دەخواردەوە بەکاریان دەهێنا بۆ ژیانی رۆژانەیان([١٠٤٩]). بەتەئکید([١٠٥٠]). ئەگەر لە مەرگە گوندێك هەبی بەناوی (بانقروس) کە لەو گوندە (باوای) یەکێك لەقوتابخانەکانی تیا دامەزراند([١٠٥١]). جارێکیان برعێتا هات بۆ ئەو مۆسیقایە وە داوای پەنجا گەنجی بەهێز و توانای لێ کرد. لەوانەیە ئەو مۆسیقارە(ئەو میوزیك ژمنە) مەبەستەکەی نەزانیبێ کە برعێت ئەو گەنجانە بە کاردێنی لە قوتابیەکانی قوتابخانەی مۆسیقا. مەبەستی برعێتا ئەوەبوو ئەو گەنجانە بسورێنەوەو گەشت بکەن بەناو گوندەکان ولە گوندێکەوە بچن بۆ گوندێکی تر بۆ گاڵتەکردن بەو بت پەرستەی بوو بوو بە جوولەکە وە رێکخەری بۆ یەعقوبی ناسراو بە (نانا) بووە([١٠٥٢]).

(عین برقی) گوندێکی ترە دەکەوێتە مەرگە.لەو گوندە برعێتا گەنجێکی ئازاد کرد لە کۆتکردنی لەلایەن شەیتانەوە،کەشەماس بووە([١٠٥٣]). ئەم گوندە شوێنی لەدایك بوونی(مەتران موقان)ە([١٠٥٤]). وە هەروەها شوێنی لە دایکبوونی یەکێك لەوانەیە کەوا هاوکاری تۆما مەرگەیی بووە لە بەخشینی زانیاری کە لە پەرتووکە بەناوبانگەکەی نوسیوویەتی ئەم پەرتووکە (سەرکردەکان )ە وە ناوی (نرسای العتیق) بووە وە هەروەها ناسراوە بە (عەودیشۆ)([١٠٥٥]).

## بریکاری دێری بکوژ

لە دەوروبەری ساڵی ٧٢٠، سەرۆکی دێری برعێتا قەشە یوسف بوو کە خەڵکی شارمزوربوو. تۆما مەرگەیی دەربارەی دەڵێ: سەرۆکێکی باشە و هەموو سیفەتەکانی پێویستی تیایە بۆ سەرۆکایەتیکردنی دێرێکی ناودار وە کارگێرێکی باش و بەتوانایە.بەلاَم وا تێبگەم ئەو سەرۆکە هەندێك جار لە کارگێریدا لاوازی نیشانداوە لە شێوەی ئەوە دەچێت کە لێی چاوەروان دەکرا کاتێك کە سەرۆکی دێری بێت عاوی بوو. لە واقیعدا، ئەبی ئەوە لە بیر نەکەین کە لە توانایدا نەبوو رەبەنە سەرەتاییەکان قەدەغە بکات لە لێدانی بەتریکی جاسلیق (صلیوە زخا) (٧١٤ ـ ٧٢٨) بەدارو بەرد بەهۆی ئەوەی دەیویست دەستنوسێکی بەنرخ تالان بکات کەهی دێرەکەیە([1056]). بەتەئکید، ئەم رووداوە هۆکاری دەست لە کارکێشانەوەی سەرۆکی دێرەکە بوو .دوای ماوەیەك لەزەمەن بە هێمنی و ئاشتی تێپەر بووبە سەر رەبەن یوسف کە بەتەنها لەناو کوریتە ئەشکەوتەکەی خۆی دابوو بەلاَم دواتر خۆی خزاندە ناو سەرئیشەو کێشەی زەحمەتر کە بەربەرەکانیکردنی ئارمزووی رەبەنەکانی دێری برعێتا بوو کە ئەو کات بەبێ سەرۆك بوون وە هەروەها بەبێ پاسەوان کە پارێزگاریان لەو رۆژگارانە دا بکات. کاتی رەبەن یوسف سەرۆکایەتی دێرەکەی وەرگرت باری دێرەکە شلەژابوو،وە تووشی سەرۆکێکی تر بوو توند تر و لامل تربوو لە رەبەن یوسف. رەبەنی نوێ رەبەن (قنوبایا) بووکە پێشتر سەرۆکی دێری(بێت قوقا) بوو.ئەم رەبەنە بەوە جیا دەکرێتەوە بە توانایی بۆ چارەسەرکردنی ئەم بارە و چارەسەرکردنی کێشەکان کە رەبەن یوسف نەیتوانی چارەسەریان بکات بەهۆی قەداسەتی روحی و لاوازی ئادەمیەوە. ئەوەی لەدەقەکانیپەرتووکی(الرؤساء) دا هاتووە باری دێرەکە ماوە زەمەنیەکەی ئەو کات ، وە هەتاوەکو لە رۆژگاری ئەمرۆمان دا، ئەمەوە لە زۆربەی دێرەکان بەم شێوەیە: (ئەو کات سەرپەرشتیاری دێرەکان علمانی بوون)([1057]).

سەرپەرشتیاری دێری برعێتە ئەو کات پیاوێکی عەرەب بوو بە ناوی(ئەیاس) لە هۆزی(شەیبان) و لە خێزانی دووهل. لە سەرەتادا رەبەنەکان پارچە زەویەکیان دایە ئەیاس بۆ ئەوەی حەسارێك بۆ مەرەکانی دروست بکات. ئەم سەرپەرشتیارە بە ئەرکی رەبەنەکان هەڵنەدەستا و سوپاسیان بکات وەك پێویست و لە جیاتی ئەمە دەستی بەسەر زەوی تریش داگرت کە هی دێرەکە بوو و هەڵسا بە دروستکردنی خانێك لەسەر رۆخی رێگای شا تا وای لێهات ئەو خانەیە مایەوە و ناوبانگی دەرکرد تا کۆتایی سەدەی نۆیەمی ز لە بن چەپۆکی(شوێنی ئەیاس)([1058]).

ئەیاس بەردەوام بوو لە جێبەجێکردنی پلانەکەی، ورده ورده دەستی بەسەر زەوی و مولکی دێرەکە دا دەگرت کە لە نزیک ئەو زەویەی پێیان دابوو لەلایەن دێرەکەوە بەخۆڕایی. دواتر هەڵسا بە کوشتنی سندوقەمینی(امین صندوق) دێرەکە(هەڵسوڕێنەری دێرەکە) و لاشەکەی فڕێدایە ناو یەکێك لە بیرەکان کە دەکەوێتە ناو زەویەکانی دێرەکە. ئەو زەویەی کە بیرەکەی تێدایە تاوەکو ئێستا ناسراوە بە((المحرقیە))((سوتماك)) تاوەکو رۆژەکانی تۆما مەرگەییش کاتێك خەڵکی ناوچەکە و دەورپشت هەواڵەکەیان گەیاندە سەرۆکی دێرەکە، ئەیاس لە پلان دانان بوو بۆ ئەوەی ئەویش بکوژێت. بەلاّم دێرەکەی بەجێهێشت و هەلاّت، واتە رایکرد. بەهۆی ئەمەوە، وە وەك کاری خوا بێت توانرا دێرێك دروست بکات و پێی بەناوبانگ بێت بەناوی(دێر ئەبی یووسف) دەکەوێتە(وانا) بەرامبەر بە شاری(بەلەد) بەلاّم دێری برعیتە سەردەمەکەی بەرەو لێژی دەچوو پێ بەپێ بەهۆی ئەو دابڕانەی داگیرکەر(ئەیاس) ەوە بۆ زەوی و مولکومالّی لە کاتی دێرەکە کەم کەمە و بە درێژایی ساڵ بە ساڵ خستیە سەر مولکەکانی خۆی([1059]).

بەلاّم دێرەکە بە تەواوی لە سەر نەخشەی ژیان نەسڕایەوە و بزر نەبوو. بە پێی ئەوەی(ئیشوّع سورەن برمامی) نەرمی نواندووە و توانرا هەیکەلەکە بگوازرێتەوە پێش کۆتایی سەدەکە ئێمە ئەوە نازانین ئەگەر ئەو دەقانەی کەوا(العمری) نووسیوەتی لە سەر دێرەکە ئایا لەسەر باری دێرەکە بە واقیعی دەقەکان تۆمار کراون یان ئەم نووسینانەی لە نووسینەکانی ئەلخالیدی گواستۆتەوە. ئەوەی دەستمان دەکەوێت ئەوەیە ئەو دێرە نەگواستراوەتەوە بۆ کەرملێس تاوەکو ساڵی ١٣٦٢. مادەم ئەمە لە پاشکۆی دەستنووسی گوندی کەرملێس دا نیە ئەم واقیعە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کەوا دێرەکە لە ناوەڕاستی سەدەی چواردەهەم هەر لە شوێنە رەسەنەکانی خۆی بووە. نێردراوانی کەنیسەی کلدانی بۆ کورسی(رەسوڵی نێردراو) بۆ رۆما، باس لەو دێرە دەکەن کە لە ساڵی ١٦٠٨ لە لیستی ئەو دێرانەی کە رێکیان خستووە و شوێنەکەیان بە دڵنیاییەوە دیاری کردووە(بڕوانە لیستی ژمارە ٢٤)، بەلاّم بە پێی ئەوەی ئاماژە بەوە بدەن کە شوێنی دێرەکە جێگا کۆنەکەیەتی یان نوێیەکە و ئەوەی سەرمان لێسوڕماوە باسی ئەو دێرە نەکراوە لەو راپۆرتەی کە بەتریك ئێلیای هەشتەم لە ساڵی ١٦١٠ پێشکەشی کردووە.

## (٩)

# مەرگەی خۆرئاوا
# یان
# هەرێمی بیرتا

زۆر جار ناوی بێرتا دەردەکەوێت کە واتاکەی(قەلا) یە لە تۆمارگەی راگەیاندنەوە(تۆمارگەی ناوی نووسەرەکانی راگەیاندن تایبەت بە کەنیسەی کلدانی. تۆمارگەی فەرهەنگی مێژوو و جوگرافیای کەنەسی. ئەم ناوە دراوەتە شەش ناوچە و بانگ دەکرێن بە ناوی بێرتا([١٠٦٠]).

لەو باسەمان دا ناوی بیرتا هەندێ جار ئاماژە بە(شار)(شارۆچکە) یەکی دیاریکراو دەکات و هەندێك جار بۆ ناوچەیەك کە ئەو شارەی تێدایە. بۆ ناوچەی بیرتا کە بەشێك لە رۆژئاوای مەرگە پێك دێنێت لە شێوەی سێگۆشەیەکی نزیك بەدوو لا یەکسان. سەرێکی دەکەوێتە خوارەوە. بالی رۆژهەلاتی سێگۆشەکە ئاماژەیە بۆ رووباری خازر، بەلام لایەکەی خۆرئاوا ئاماژەیە بە رووباری کۆمەڵ بەلام بنکەکەی لای باکورە و چیای ئاکرێیە بەناوی (تجیاخێری) کە بە دوورتر لەو چیای(تالائانا) یە. مەڵبەندی ئەو ناوچەیە شاری بیرتایە.

١ ـ بێرتا

ئەمرۆ ئەو شارە پێی دەڵێن بیری و ئەمرۆ تەنها وەك گوندێکی بچوك دەبینرێ. خانووەکانی بەسەر چیاکە بلاوبوونەتەوە و بە نیو کاتژمێر بە پیادە لە گوندی(تەلا) دوورە. ئەو گوندە دەکەوێتە سەر بەرزاییەك وەك قوچی بەرز لەو چیایەدا. لەلای خۆرهەلاتی گوندەکە سێ قەلای بچوك هەیە دووەمیان پێی دەڵێن کۆشکی میر. بە واتای شوێنەواری مەسیحیەکانە، لەو ناوچە چیایە لە ناوچەی بیرتا و لە نزیك گوندی بیرێ دوو ئەشکەوتی گەورە هەیە، لە هەر یەکێکیان دا هەیوانێك هەیە گەمارۆدراوە لە تەنیشتەکانی بە دوو ژوور. هەروەها دیوارێك هەیە لەگەڵ(پەیژەیەك) کە دەکەوێتە لای پێشەوە. ئەوەی دەبینرێت بە تایبەتی لەو گوندەدا بەردێکی زۆر بلند کە لە سێ پارچە پێکهاتووە لە بەرد لە سەر یەك داندراوە و لە ناوەڕاستیدا کونێك هەیە قەبارەکەی وەك دەرگا یان کونی بیرێکی ئاوی بچوکە. خەلکی ئەو گوندە ئەو شوێنە پێی دەڵێن بیری قاشا و دەڵێن کەوا گومەزی ناقوسەکە بووە؟

دیمەنی ئەم بەردە بەرزە سەرنجمان رادەکێشێت بۆ چەند لایەك وەها دادەنێین بنکەیەکی کۆنە بۆ تاومرێکی تایبەت بۆ یەکێك(ستوونیەکان - عەمودی) رەبەنێکی مەسیحی رۆژهەلاتی کۆنە کۆریتەکەی دەخستە سەر گرێی ستوونێك و یان رێزێك لە گرێی ستوونەکە بەناوبانگترینیان(سەمعان عەمودی) یە - وەرگێر.

لە راستیدا کۆریتە ئەشکەوتی تایبەت بە رەبەنێك لە عەمودیەکانن نابینینەوە تەنها لە ناوچەی بیرتا نەبێت پێشتر(ماران عەمما) گەیشتووە بە رەبەنێکی عەمودی لە خیس(١٠٦١). کاتێك بە رێگاوە بوو بەرەو شلمات رەنگە لە تواناماندا هەبێت ئەشکەوتێکی هاوشێوە بدۆزینەوە ئەگەر بەدوایدا بگەڕێین لە جێگەیەکی تر ئەویش گوندی بێت قەرەداغە.

٢ - بێت(قەرەداخ)

هەروەها پێشتر ئەو گوندە قەرداغیان پێدەگوت(). لە سەرتادا نەستۆری بوولەبەر ئەوەی (باوای) پێشتر قوتابخانەی تیادامەزراند کە ژمارە بیست بوو لەو قوتابخانانەی کە دروستیکردن لە کەرتی (مەرگە)(١٠٦٢). دواتر بەشێك لە خەلکی گوندەکە وەیا هەر هەمووی گواستیانەوە سەر مونۆفیزی . ئەو گوندە لەلایەن یەکێك لە رەبەنەکانی عەموودی دیاریکرا بۆ ئەوەی جێگەی کۆریتە ئەشکەوتەکەی بێت لەسەدەی هەشتەمی زاینی دا. زۆر دەگمەنە کە رەبەنێکی عەموودی بگاتە ئەو ناوە لەرۆژهەلات. لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە رەبەنانە بەتاك و تەنهان زۆر پەسندنین لەلای تایەفەی سریانیدا(١٠٦٣). کاتێك ئەو رەبەنە عەموودی یەعقووبی لە گوندی(بێت قەرەداغ)دەژی، بەردەوام بەرهەلستی مەترانی نەستۆری دەکرد ئەمە بەپێ ووتەکانی تۆما مەرگەیی. وە هۆکارەکەشی ئەوەی کە دەسەلاتەکانی بەکار نەدەهێنا تەنها لەرێگەی توانای شەیتانی نەبێت. لەم دەقە ئەوە تێدەگەین کەوا برادەرەکەمان تەنها نەبووە و دەگمەنیش نیە کە لەسەر شێوەی ئەون. لەبەر ئەوەی خەتەرناکی لووتبەرزی هەمووکاتێ هەرەشەی سیستەمی کاریزماتی دەکرد لە پەیوەندیەکانی لەگەڵ زنجیرەی کارگێری کەنەسیدا .بەم بۆنەیەوە یەعقووب براهاوی باس دەکەین کەپێشتر یاسایەکی دانابوو دەقەکەی ئەوە بووکە هەموو رەبەنێکی عەموودی بەربەرەنەکانی مەتران دەکات، لەسەر مەترانەکە پێویستە نامە بنێری بۆ باوەرداران لە سنووری دەسەلاتەکەیدا وەیا ئەبرەشیەکەی لەبەر ئەوەی موستەحەقی پاراستنن، وە هەروەها هەریەك گەر کارنەکات بەپێ ئەو کارنامەیە(١٠٦٤). مەتران (مارەن عەمە) بەوانە رازی نەبوو بە سزادانی حەرەم، لەبەر ئەوەی داوی بۆ دەکردن. هەروەها کە سەرماوسۆڵە و ئاگر لە ئاسمان بە سەریان دا بباریّ و هیچیان لێنەمێنێ - نە رەبەن و نە عەمود کە تیایدا جێگیر دەبێت کاتێك تۆما چیرۆکی ماران عەمە دەگێڕێتەوە لە سرودێك کە دایناوە تێبینی

دەکەین کەوا نەیتوانیوە زاڵ بێت بەسەر رق و قینە کە تیایدا بووە بەراوردی عەمودی کردوە لەگەڵ سیسارك(جۆرێکە لە باڵندەی گۆشت خۆر) یان بە شەیتان و گراو پەپۆکەی کردووە لە سەر سەکۆکان.
سەرباری ئەوەش دەبینین مامەڵەیان لەگەڵ دا دەکات هەر وەك بێچوی شەمشەمەکوێرێکی بەدبەخت. ئەو هۆیانەی کە تۆما خۆی لێ بێبەری دەکات بەو هەموو قسە و پێدا هەڵگوتنە رەق و وشە بریندارانە کە باس لە عەمودیەکان دەکات بە گشتی و دەربارەیان دەڵێت ئەوانە شیاوی هەموو ئەوانەن مادام دەستدرێژی بۆ سەر شەرەفی باوکی رۆحیمان و مەزنمان مار نەستۆریۆس دەکەن و کەسایەتیەکەیان لەکەدار کرد ئێستا پرسیارێك دەکەین لەکوێ دەتوانین ئەوە بدۆزینەوە؟ لەلای باشووری خۆرهەلات لە گوندی(بیرێ). گوندێکی تر هەیە بەناوی(باس فریا). دواتر باسی دەکەین. لەلای رۆژهەلاتی ئەو گوندە بە دوو کیلۆمەترەوە، لە دامێنی چیایەکە بەردێکی زۆر گەورە هەیە بەرزیەکەی شەش مەتر دەبێت، پەیکەرسازی ئەو بەردە دەکرا لە سەر شێوەی پارچە پارچەی لاتەریب و پارچەی بنکەکەی چوار لا یەکسانە. ئەم پارچانە بەسەریەکەوە دانراون درێژی یەك لای پارچە بچوکەکە مەترێك دەبێت کە داندراوە بە بەرزی دوو مەتر لەسەرەوە.
لە سەر پارچەی سەرەوە چینی سەرەوە جێگیرە لە ناوەوە کە بە پەیژەیەکی(لوولەیی) دەچیە خوارەوە بازنە پێکهاتووەکان لە سەر یەك پەستراوەتەوە هەر وەك ئەوە بێت لەلای سەریەوە بنکەی ستوونێکی پەستراو بێت. ئەم چینە گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە بەو شێوەی تۆپەڵە بەهۆی کرداری داخۆرین و خوران بەلأم پێشتر لە دێر زەمانەوە تەختایی بووە. کوردەکان بەو بەردە دەڵێن(باری خراتا) و واتای ئەوەیە(بەردی پەیکەر سازکراو)، واتە بەردی هەڵکەندراو. خەڵکی نیشتەجێی ناوچەکە دەڵێن ئەو شوێنە قوتابخانە بووە بەهۆی هەبوونی تاتە بەرد پێکهاتووە لە چینەکان یەك بەوی تریان گیری خواردووە بەسەر یەك بە شێوەیەکی چین چینی لەسەرخۆ و بەرەو خوارەوە. پرسیارەکەمان ئێستا ئایا ناتوانین لەو تاوەرە ستوونێك بۆ رەبەنێك بدۆزینەوە لە رەبەنەکانی عەمودی مۆنۆفیزیەکان؟ ناوی شوێنەکە هیچ هاوکاریەکمان پێ نابەخشێ بۆ باسکردنی ئەو بوارە لەبەرئەوەی ئەو کانیاوەی کە بە تەنیشت ئەو بەردەیە و ئاوەکەی دەڕوا پێی دەڵێن کانی بەردی واتە کانیاوی بەرد و بەس!
٣ - دێری مارگۆرگیس
پێشتر گەیشتینە دامەزرێنەری ئەو دێرە کاتێك باسی حدیابمان کرد. وە باسمان کرد کەوا دێری دووەمی دامەزراندن لە نزیك بیرتا لە کەرتی مەرگە. دواتر پاشکۆیەکمان بۆ شوێنی

ئەو دێرە زیاد کرد و وتمان شوێنی ئەو دێرە دەکەوێتە باخچەیەکی زەیتوونی کۆن ناسراوە بە(با زەیتونا)([1065]).

هیچ زانیاریەکمان دەربارەی ئەو دێرە نیە. دوای چۆڵبوونی ئەو دێرە لە رەبەنەکان کەنیسەی دێرەکە بووە کەنیسەیەکی تایبەت بە خەوەرنەی گوندەکە. ئەو کەنیسەیە دەستنووسێکی ئینجیلی پیرۆزی هەبوو مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٧٤٣([1066]).

٤ ـ گوندی تلا

گوندی تلاوبیلا، یان(بربیلا) دوو گوندن ناویان زۆر لە دەقەکان دا هاتووە ئێستا پێی دەڵێن(تیلان) و(بیلان) دەکەونە نزیك یەکتری هەروەها نزیکن و دەکەونە تەنیشت بیرتا. گوندی تلا دەکەوێتە دووری کیلۆمەترێك و نیو بەلای خۆرئاوا، بەلآم بیلا بە پێنج کیلۆمەتر و ٢٠٠ مەتر دوورە لە تلاوە بە هەمان ئاراستە. لە گوندی تلا کەنیسەیەك هەیە بە دوو باڵ، یەکەمیان بە ناوی(مارئیسحاق) و دووەمیان بە ناوی(پاکیزەی پیرۆز) ئەم گوندە دوو دەستنووسی هەیە دەگەڕێنەوە بۆ کەنیسەی مارئیسحاق تاوەکو ئێستاش پارێزراون. یەکەمیان مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٧٠١ ز، کە بریتیە لە پەرتووکی سەرۆکەکان نووسینەکەی لە ئەلقوش تەواو بووە لە سەر داوای(شمۆنی) کچی(نازر) بۆ بەکارهێنانی کەنیسەی ئیسحاق لە گوندی تلا کە دەکەوێتە کەرتی مەرگە([1067]).

بەلآم دووەمیان بریتیە لە سرود و ئاوازەکانی تایبەت بە وەرزی(باعوسا). ئەم دەستنووسە تەواو کراوە لە سەر داوای گوندی ـ تلا کە دەکەوێتە ناوچەی بیرتا ـ شوێنی لە دایك بوونی ئیشۆعیاوی مەرگەیی([1068]).

کە بڕیار بوو بە پەتریك هەڵبژێردێت لە جیاتی بەتریك تیماتیۆسی یەکەم بەلآم بەوەندە رازی بوو کە میتراپۆلیتی کەرتی حدیاب بێت و بەس. ناوی گوندی تلا زۆرجاران دێت لە دەقە چیرۆکەکاندا کە تۆما مەرگەیی نووسیوێتی بەلآم ئەو چیرۆکەی کەزۆر سەرنجراکێشە وە ئەوەیە چیرۆکی یەکێك لە پیاو ساکارەکانی گوندی تەلایە لەسەدەی حەوتەم کە ئەو پیاوە هاتۆتە لای قەدیس(مارگبرئیل) وەپێی ووتووە کە سەری سورماوە لەو فەوتانەی کەدار مێوەکانی گوندەکە تووشی هاتووە لە ئەنجامی بەستەلەك و نزم بوونەوە پلەی گەرمیەوە جگە لە باخچەیەکەو (خۆی) بەتەنها وبەس کە باغچەکەی زیندووە. وا چاك بوو کە ئەو پیاوە سادەو ساکارە قسەنەکات و بێدەنگبێت . لەبەر ئەوەی ئەم هەواڵە گەیشتە مارگبریئیل بەوبارە وە پاڵ بە قەداسەتی ئەو زاتە دەنێت بۆ ئەوەی چارەسەرێك بکات بەدادوەریەوە لە ئەنجام دەبێتە هۆی نەمان و بزربوونی شەراب کەلە رەزەکەی ئەو دروستیکردوبوو لەو گۆسکانەدا بوو کە لەناویدا پارێزراوە([1069]). لەساڵی ١٨٤٣

یەکێك لە رۆڵەکانی تەلا کەناوی عەودیشۆ کوری دیشۆ بوو ئەو قەشە و رەبەن بوو هەڵسانە بەنووسینی(دەستنووسی) پۆلێنکراو لە دێری رەبەن هورمزد کە تائێستاش پارێزراوە لە پەرتوکخانەی دێرەکە .رەنگە پرسیار بکەین گوندی (مایێ قریری)/مایێ قەریرێ/الما بارد/ئاوی سارد) دەکەوێتە کوێندەرێ کە فوتابخانەی (باوای) تیایە؟ بەدڵنیاییەوەشوێنی گوندەکە ناوچەی بیرتایە، ئێمە دڵنیاین لەوە مادام ئەو دەقانە دەخوێنینەوە کە لەبەر دەستمانەدایە،(ماران عەممە) بەو گوندەدا تێپەریوە بە رێگایەوەبەرەوشلمات بۆ بەری خازر کە دەکەوێتە (خنس) لە پشت (کۆمەڵ). کاتێك میتراپۆلیت بە رێگاوە بوو هەڵسا بە نەعلەت کردنی (زادوای)([١٠٧٠]). کە٧٢ زەوی هەبوو لەکەرتەکانی : مەرگە و کۆمەڵ و نەینەوا. ئەم شارە نابێت زۆر دووربێت لە(قوب) لەبەر ئەوەی سەرۆکی گوندی قوب لە توانایدابوو زانیاری تایبەت بەدرێژی بداتە تۆما تایبەت بەراستیەکان و لێکۆڵینەوە لە پێشبینیەکان. بەپێی ئەو زانیاریەی کە پێشکەش کرا بەمن لەلایەن بەرێز مەتران روفائیل رەبان سەرۆکی ئەساقیفەی ئەبرەشیەی کەرکوك بۆ کلدانی ئیستا وە ئەبرەشیەی ئامێدی و شەمکان پێشتر کەدەکەوتە ژێر دەسەلاتی مەترانی ئەو ئەبرەشیە. دەزانین کەواتا وەکو ئیستا باغچەیەك هەیە دەکەوێتە نزیك گوندی (تلا) ئەو ناوەی هەیە.

٥ ـ گوندی بلا(یان بیلا)

گوندی بیلای کۆن ئەمرۆ بە (بێلان) ناودەبرێ(هەر وەك لەسەرەوە ـ وەرگێر) مەسیحیەت بە تەواوی لەو گوندە نەماوە، بەلام لە سەر ئەوەشەوە تاوەکو ئێستا کەنیسەیەکی تێدایە بەناوی(مارساوا) بەلام پرسیارێك سەرهەڵدەدات ئەویە: ئەمە کام(مارساوا) یە؟ لە ناوچەکە دەڵێن یەکێکە لەو سێ رەبەنانەی کە سێ گوندەکانیان بەسەرخۆیاندا دابەش کرد: ئەمانەن(هەرماشی/ هرماش) بەبەر مارئەفرام کەوت و(تلا بۆ مارئیسحاق) و (بیلا بۆ مارساوا).

ژیانی مارساوا پەیوەندی هەیە لەگەڵ(لاشبار) کە دەکەوێتە بێت گەرمای. دواتر لەگەڵ بیلا([١٠٧١]). بە پێی سەرچاوەیەکی کۆنتر ئەویش دەستنووسێکە مێژووەکەی دەگەرێتەوە بۆ سەدەی چواردەهەم کە بەرێز مەتران ئەدیشێر باسی دەکات([١٠٧٢]). بابەتەکە واتە شەهیدێك لە(بێت زبدای)([١٠٧٣]).

نەمتوانی راڤەی ئەو نهێنیە بجوکە بکەم لەبەرئەوەی سەرچاوەکەی پەیوەندی بەو بابەتەوە هەیە بزر بووە لە پەرتوکخانەی دێری بەرێز پاکیزە پارێزەری کشتوکاڵ، بەلام سەرچاوەیەکی تر هەیە یارمەتیمان دەدات بۆ چارەسەرکردنی ئەمە ئەویش دەستنووسی

ئینجیلێکی پیرۆزە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٦٥٦ وە دەگەڕێتەوە بۆ مەترانیەی ئامێدی. ئەم دەستنووسە لە ئەلقوش نووسراوە بە دەستی شەماشە یەڵدا کوڕی قەشە دانیال کوڕی قەشە ئیلیا کوڕی قەشە دانیال. نووسینەکە تەواوکراوە لە سەر داخوازی مەرقۆس کوڕی هورمزد لە گوندی بێلان. ئەوەی جێی داخە ئەو دەستنووسە تەنها ناوی ئەو دەستنووسەی بۆ کراوە کە مارساوایە و هیچ رونکردنەوەیەکی تری بۆ نەکراوە. ئەوەی لەو دەستنووسەدا رونبکەمەوە لە رابردوودا ئەومیە ئەو دەستنووسە لەگەڵ چەند دەستنووسێکی تردا دەگەڕێنینەوە بۆ مەترانی ئامێدی. ئەو دەستنووسانە کۆمەڵێك دەستنووسی هەڵبژاردە پێك دێنن کە لە سەرەتادا بیست دەستنووس بوو و لەگەڵیاندا پۆلێن کردنێکی کاتی هەبوو کە لەلایەن بەڕێز مەتران رۆفائیل رەبان کراوە کە ئەو کات سەرۆکی ئەساقیفەی ئەو ئەبرەشیە بووە بەڕێز مەتران روفائیل بیداوید هەوڵیدا ئەم ژمارەیە بکاتە دوو هەندە و هیوای وا بوو بیکات بە سێ ئەوەندە بەهۆی بەردەوام بوون لە لێکۆڵینەوە بۆ کۆکردنەوەی دەستنووسە پەرش و بڵاوەکان کە لەلای هەندێك لە خێزانەکان هەیە لە گوندەکانی سەر بە ئەبرەشیەکە. لە زستانی ساڵی ١٩٦٠ ئەو بەڕێزە رێگەی پێ دام بۆ ئەوەی هەڵسم بە رێکخستنی تۆمارکردنی هەموو دەستنووسەکان بە درێژی. دوای ئەوەی بەڕێز مەتران(ئەبلەحەد) بوو بە مەترانی ئەبرەشیەی ئەلقۆش ئەویش هەر رێگەی پێ دام بە پشکنین و پێداچوونەوەی پەرتوکەکانی ئەوەی زۆر جێی داخە رووداوەکانی کاولکردن و وێرانکاری کە دووچاری ناوچەکانی باکور هات لە ئەیلولی ١٩٦١ بووە هۆی بزربوونی ئەو پەرتوکخانەیە بە هەموو ئەوەی لە ناویدا بوو بەتەواوی. ئەوەی کە دڵمان پڕ لە رابواردن دەکات و لە هەمان کات دا پرسەیە بۆمان ئەومیە زۆربەی ئەو دەستنووسانە دەستنووسی تایبەت بە نوێژەکانی فەرزی و سروتەکانی تایبەتە بە بۆنەکان و ناسراون کە ئەلتەرناتیفی ئەوانەمان هەیە جگە لەمە زۆر تێبینیم هەیە تۆمارم کردوون لە سەرچاوەکانیان و لە پێشەکیەکانیان کە لەو دەستنووسانە نووسراون. ئەو تێبینیانە گشت زانیاریەکانی مێژوویی سەرەکی و گرنگەکان تۆمار کراون. ئەوەی پەیوەندی بە ناسنامەی بیلا هەیە دەڵێن هەمان ناسنامەی باربیلایە([١٠٧٤]). هەروەها(بیربلێ) ئەمە دەڵێن و تەئکیدی لێ دەکەینەوە بێگومان([١٠٧٥]). بەڵام پەیوەندی لە نێوان بیلا کە(بۆدج) ئاماژەی پێ داوە([١٠٧٦]). لەگەڵ(بیربیری) کە(بادجر) ئاماژەی پێداوە و دەکەوێتە(ئەبرەشیەی کاوار) بابەتەکە پێویستی بە حوکم دان هەیە لە سەری پێویست بوو کە لە ناوچەیەك بێت زۆر دوور نەبێت لە بیلا دێرێکی تێدا بوو بە ناوی(راما) دەگەڕێتەوە بۆ قەدیس(ئەدی) ئەو رەبەنە خەڵکی وڵاتی یۆنانە. کۆچی پێکراوە لە وڵاتی

خۆی و هاتۆتە وڵاتی خۆرهەڵات لە سەدەی چوارەم. بینایەی ئەو دێرە بینایەکی بەهێزە رەبەنەکانی دەتوانن ژیان بەسەر بەرن بە ئارامی و ئاشتیەوە سەرەڕای دووری لە ناوچە نیشتەجێبووەکان و دوور و لاپەڕە. زۆر پەرچوو و عەجایب لەو دێرە روویداوە([1077]).

یاوەری دامەزرێنەری ئەو دێرە قەدیس گریگۆریۆس بووە کە ئەویش دێرێکی هەبووە لە نزیک گوندی بیربلی ئەو دێرەی دوایی باسی کراوە دەگەڕێتەوە بۆ گریگۆریۆس نەماندۆزیەوە و هیچی لە سەر نازانین.

٦ ـ بازاڕی یەکشەمە

جوگرافی زانە عەرەبەکان باسی ئەو شارە دەکەن و بە مەڵبەندی سەرەکی کەرتی مەرگەیان داناوە([1078]).

هەروەها باس لە زەوی بە پیت و بەرەکەتی ئەو ناوچەیە دەکەن، سەرچاوەکانی مەسیحی پێی دەڵێن(روستاقا) کە سەر بە بیرتایە، درێژ دەبێتەوە تا خازر. بەڵام شارەکە دەکەوێتە رۆخ چیاکان. لەو دەقانەی کەوا تۆمارا مەرگەیی نووسیویەتی لە سەر شاری رۆژی یەکشەممە دەخوێنین کەوا بەندیخانەی ناوچەکەی تێدا بوو. ئەمە زۆر کارێکی سروشتیە مادەم ئەو شارە ئەو گرنگیەی هەبووە لە رووی کارگێڕی فەرمیەوە. من توانیم شوێنی ئەو شارە بدۆزمەوە ـ بازاڕی یەکشەممە کە ئەمڕۆکە بیابانێکی چۆڵ و هۆڵە بە یارمەتی قەشە(حەنناقلو)(دواتر بوو بە مەتران ـ وەرگێڕ). قەشەی کلدانی لەگەڵمان هات و زۆر شوێنی نیشاندام جێگەی بایەخە بۆ من دەکەونە ناوچەی بیرتا بۆیە خۆشحاڵم بەم بۆنەیەوە سوپاسی تایبەتی خۆم پێشکەش بکەم بەرامبەر ئەو ماندووبوونەی لە پێناویدا گردی شوێنی شاری بازاڕی یەکشەممە ئەمڕۆ پێی دەڵێن(میلیێ سوکا) واتە(گردەکانی بازاڕ) لەبەر ئەوەی لەم شارە گەورە و گرنگە هیچی لێ نەماوەتەوە تەنها هەندێك گردی دەستکرد نەبێت کە شوێنەواری شارەکەی داپۆشیوە، ماوەی نێوان شاری بازاڕی یەکشەممە و گوندی بیلا نزیکەی ١.٥ کیلۆمەترە و بەلای باشوور کە دەکەوێتە سەر ئەو رێگەیەی بەرەو بێت شاری(عێن سفی) دەچێت خەڵکی ناوچەکە لایان باوە کەوا گوندێکی گەورە هەبووە بازاڕی تێدا هەبووە.

٧ ـ باسەبری

ئەم گوندە لە کۆن دا بە(باسفری) ناسرابوو کە لەلای یاقوت حەمەوی باسکراوە([1079]). دەربارەی دەڵێ ئەو گوندە لە سەدەی سێزدەهەم هەبوو، و باسی دەکات کەوا گوندێکی گەورەیە دەکەوێتە خۆرهەڵاتی مووسڵ لە دامێنی چیاکان. ئەم گوندە بەوە بەناوبانگە چونکە دەوڵەمەندە بە باخچە و رەز و مێو. خەڵکەکەی دەیرننەوە(ترێ) کە لە

وەرزی زستان. ئێستا ئەو گوندە کوردەکانی تێدایە پێی دەڵێن یاسفری کە لە نزیکیدا بەردە گەورە و بەرز و پەیکەرتاشراوەکەی لێیە و لەوانەیە بنکەیەك بووبێت بۆ عەمودێك دەگەڕێتەوە بۆ ڕەبەنێکی عەمودیەکان پێشتر باسمان کرد. گوندی(باسفری) دەکەوێتە باشووری بیرتا تاوەکو ئێستاش کەنیشە کۆنەکەی تێدا دەبینرێت کە ناوی کەنیسەی(ماریۆحەننانە) ئێستا کردویانە کۆگای گلدانەوەی دانەوێڵە خەڵکی ئەو گوندە شوێنەواری تەلارێکیان دۆزیەوە لە کاتی هەڵکەندی زەویەکەی پێش کەنیسە. لە باسەبری دەستنوسێکی ئینجیلی پیرۆز هەیە نووسراوە لە ساڵی ١٩٨٥ و بۆ بەکارهێنانی کەنیسەکەی ناسراوە بە کەنیسەی ماریۆحەننان ئەم دەستنووسە لە دێری ڕەبەن هورمزدا. ئەوەی دەربارەی مێژووەکەی دەیزانین ئەوەیە لە کۆتایی سەدەی ١٧ هەم بەلای کەمی سێ قەشەی هەبووە ئەمانەن: قەشە سلێوە کوڕی خوا لێخۆشبوو(خودادا) دواتر کوڕەکەی قەشە یۆحەننان و دواییان قەشە یاقۆ کوڕی خوالێخۆشبوو مەرقوس خەڵکی گوندی تلا. قەشە یاقو کوڕێکی تری هەبووە ناوی هورمزد بووە و شەماشە بووە. ئەم شەماشەیە لەگەڵ سەرۆکی گوندەکە عەودیەشۆ کوڕی یۆنان شەماشە یەڵدا کوڕی سەرکیس بەشداریان کردووە لە بڕی کرێی ئەو دەستنووسەی کەوا شەماشە یەڵدا کوڕی قەشە دانیەڵ کوڕی قەشە ئیلیا کوڕی قەشە دانیال ئەلقوشی نووسیویەتی نووسەری ئەم دەستنووسە بە شوێنی لە دایك بوونی بۆ خۆی دەگەڕێنێتەوە بە ئیمتیازی وتارەکانی پۆڵس. دواتر دەبینین کەوا گوندی تلکێف ئەویش ئەو مافە بە خۆی دەدات و بە هەمان ئیمتیاز لە باکوری باسفری جێگەیەك هەیە پێی دەڵێن کالواکا(واتە شوێنی شۆرینی جلوبەرگ). لەو جێگەیە گرێ گومبەزەك دەردەکەوێ لە سەر ئاستی رووی زەوی ئەو گومبەزە(گومەت) پاش ماوەی شوێنەواری کەنیسەیەکی کۆنە پێیان دەوت کەنیسەی مارعەودیەشۆ لە کۆن دا؟. کە لە گوندی بیری دەچیتە گوندی باسفری رێگەکە بە رۆخ هەندێك کاولگە تێپەڕ دەبێت دەگەڕێتەوە بۆ گوندێك بە ناوی(کانیە) لێرە ئەشکەوتێك هەیە لەوانەیە هی ڕەبەنێك بووبێت.(گوندی بێت شەهاری) کە بە کوردی پێی دەڵێن(باساری) شوێنێکی ترە هێمای بۆ داندراوە دەکەوێتە ئەو ناوچە چیایەی دەڕوانێتە رێگەی بیلان - عێن سفنی و بە دووری سێ چارەگ لە بیلا ئەوە بە پیادە:(جێبی) ناوی گردێکە دەکەوێتە باشووری گوندی بێلان بە دووری کیلۆمەترێك لەوانەیە ئەو گردە شوێنی گوندی(کۆپی) بووبێت کە قوتابخانەی چواردەهەم لە قوتابخانەکانی باوای بێت کە دایمەزراندووە. لەلای باشوریەوە لە گوندی بێری و بێلان یان ئەو سێ گوندەی تێدا بێت کە پێیان دەگوت (مەلکوشان) ئەمڕۆ گوندێکی کوردیە بە تەواوی مەسیحیەکان ئەو ناوە بە سیغەیەکی شێوێندراوی دادەنێن بۆ

نـاوە رەسـەنەکەی(مـەلك ئیشـوّع) لـە گونـدە سـەرەکیەکە لـەو سێ گوندانـە، دەتـوانین شوێنەواری کەنیسـەیەك ببیـنین لـەلای رۆژهەلاّتیـدا ناوچـەیەکی چیایی هەیـە دۆڵێکـی تێدایە پێی دەڵێن(گەلی بیرهاڤان) بینایەکی کۆنی تێدا دەبینرێت، بەلاّم نـازانین چیە. لە باشـووری مەلکوشـان و لـە ناوچـە چـیاییەکان دا و لـە زەویـەکانی دەکەونـە ژێـر گوندی(تۆسیپ) شوێنەوارێك هەیە پێی دەڵێن(نارشلیتا)(ئاگری شلیتا) لەبەردەوام بوونمان بـە رۆیشـتن و بـە لاریـەکی کەمـەوە بـەلای باشـوور تووشـی ناوچـەیەکی چیایی(تجوبانگ)(دۆڵی ناردوش) دەبیین، کە سنووری کۆتاییەکە دەکەوێتە نێوان(شەمکان) لە خۆرئاواو(شەرەڤان) لە خۆرهەلاّت لەو شارە بۆ ماوەی کاتژمێرێك و نیو بە پیادە بەلای خۆرهەلاّتی گوندی(مرێبان) بەرامبەر(کەڤرسۆر) واتە بەلای دووەم دا لە دۆڵی ناردوش گونـدی ڤوبـا کـە زۆر بـە داخـەوە لـە سـەر نەخشـە نادۆزرێتـەوە و نیـە بـە پێـی رای هۆڤمان([١٠٨٠]).

دانەرە مێژوونووسەکان تەنها بە هێما ئاماژە بە گوندی(ڤوب) دەدەن، کەوا دەکەوێتە نزیك ئاکرێ.

٨- ڤوب

پێویستە لەسەرمان جیای بکەینەوە لە نێوان(ڤوب) و" ڤوبان" لە بەعشیقە پێشتر" ڤوب" گوندێك بوو سەربە(مـانوی) بـووە (مـانی خـاوەنی ئـەو باوەرداریەیـە کەلـە ولاتـی فورس دا بلاّوبووەوە ـ وەرگێر) پەرستی بتەکان و درەختـەکان. ئـەو (مانـەوەی) یـە کەسـێکی پابەنـدو خووگرتـوو بـووە بـە پەرسـتنی بتـەکان و درەختـەکان هـی تـریش ([١٠٨١]). وەك دەردەکـەوێ خەڵکی ئەو گوندە زۆر بەرهەڵستیان کردووە بۆ زۆر هەوڵدان وە بۆ چەند جارێـك لـە پێنـاو ئەوەی بێنە سەر رێبازی مەسـیحیەت . ئـەم بـارە بـەردەوام بـووە تـاوەکو سـەدەی چـوارەمی زاینی. دواتر ئەمە هاتووتە دی و جێبەجێ بووە بـەهۆی هەنـدێ پەرچـوو و سەیروسـەمەرە کە لەسەر دەستی میترابۆلیتی یۆنانی دورخراو هاتە دی کە ناسـراوە بـە (ماریوحـەننان) کە بـەتاك و تـەنها و لاپـەر دەژیـا لـە ئەشـکەوتێك کـە لـە شـێوەی قـەبر دابـوو، دەکەوتـە گـەروی(بـەرازیی) دواتـر بـاس لـەوە دەکـەین ئـەم قەدیسـە هەڵسـا بـە تێکـدانی پەرسـتگا ئاگریەکـە کـە لەگونـدی (ڤـوب) دابـوو. وە لـەجیاتی ئـەوە کەنیسـەیەکی دروسـت کـرد کـە تاوەکو رۆژانی تۆما هەرمابوو. لەساڵی ٥٦٢، کە (برعێتا) بـە رێگـەوە بـوو بـۆ ئـەوەی بچێت دێرەکـەی دابمـەزرێنێ،([١٠٨٢]) بەگونـدی ڤـوب دا تێپـەربوو، لـەو گونـدە نەخوشـێکی شـیفا بـۆ هێنا.ئەم گوندە شوێنی لەدایکبوونی رەبـەن (ڤـام ئێشـۆع)ە ([١٠٨٣]) وە لـەو گونـدە موسیقاری بەناوبانـگ ڤوتابخانەکەی نوێکردەوە ([١٠٨٤]) کە لەلایەن (ماریۆنـان) دامـەزرابوو لـەو ماوەیـەی

کە باوەری هێنابوو. ئەم گوندە لەسەر ریبازی نەستۆری مایەوە تاوەکو سەدەی نۆیەمی زاینی، مادام دەبینینتاوەکو ئەو مێژووە (تۆما) بە (کێلگەی مەسیح)ی ناودەبات. وە هەروەها هەندێك چیروکمان بۆ دەگێریتەوە دەربارەی داب و نەریتی مێژوویی کۆمەلی(شاهریك)لە خەلکی گوندەکە، پێ یان دەگووت (شاوزران) تەنها دوای ماوەیەك بە دوای یەکدا واتە لە مێژوو هۆکارەکان ئێمە نایزانین گوندی قوب باوەرداری مونوفیزی قەبوولکرد و دانیشتوانەکەی بوونە یەعقووبی. قوب تاوەکو ئێستاش لەسەر باوەرداری یەعقوبی دایە(بادجر) سەردانیکردووە لە ناوەراستی سەدەیرابردوو ([١٠٨٥]) لە کۆتایی سەدەکە ئەو گوندە کەوتەدەست کوردەکان. دوا قەشە لەو گوندەی یەعقوبیەکان ناوی(قەشە سلیمان)بوو کە ریورەسمی قەشەکردنی سالی ١٨٨٩بوو لە سەر دەستی مەتران ئەلیاس قودسی ([١٠٨٦]). بەهۆی زالبوونی کوردەکان بەسەرئەو گوندە خەلکی گوندەکە(مەسیحیەکان) ناچارکردووە گوندەکە بەجێبهێلن و کۆچ بکەن بۆ(مەلابەران) کە دەکەوێتە باشوورو دورترو دەکەوێتە سەر خازر. لە وێ گەرانەوە بوونە کلدانی. هەندێکیان کۆچیان کردو رۆیشتن بۆ گوندی(مریبا)، دواتریش لەسالانی نویدا(دواییدا) گواستیانەوە بۆ(مێرگێ) دواتر(قورا مێرگێ) دواتر بۆ (قەرەقۆش) دواتر (بەعشیقە) لە کۆتای بۆ (بەرتلە) کەدەیانبینین یەعقوبین وە یا سریان کاسۆلیك. کەنیسەی گوندی (قوب)بەناوی (مارگورگیس) نراوە.

٩. گوندی کانی فالا

تاوەکو ئێستا هەندێك مەسیحی کلدان و نەستۆری لە گوندەکە نیشتەجیبوون، کەنیسەیەکیان هەیە بەناوی (مار ئەحا) واتای ناوی گوندەکە بە زمانی کوردی(کانی (ئاو) مەسیحیەکان) سیغەی ناوەکە لە دەستنوسەکانی ئەوەیە: (کانیا فالهان) هەمان شێوە لەدەستنوسی کەشکۆلێك داهەیە لە ئامێدی نوسراوە بە پێی سرووتی دێری سەرو. لە ئەلقوش نوسراوە لەسالی ١٧١٣ لەلایەن شەماشە(ئیلیا وە باوکیەوە قەشە یەلدا) لە سەر خواستی (موشێ) لە (بازار) وە (شەماش عەسکەر) بۆ بەکارهێنانی لەکەنیسەی (مارئەحا). وە هەروەها بەهەمان شێوە لە ناو پەرتووکی سرووتی تردایە بۆ نوێژی مردووان. ئەو دەستنوسە لەلایەن قەشە یەلدا کوری قەشە دانێیل نوسراوەلە سالی ١٧٢٣. وایێدەچێت(قەشە داود بارزانی) ناسراو(بەناوبانگ) بەئەیوبی چەرخی نوێ وە بە خۆشنووس و دانەرێکی بە تواناوە لەو گوندە دووچاری سەر ئێشە و نسکۆی گەورەهات کە تووشی خێزانەکەی بوو. ئەمە لەسالی ١٨٧١بوو. پێشتریش ئەو قەشە نسکۆکان بەدواوەی بووە لەسالی ١٨٥٤

کاتێك زێباریەکان بە درندەی و دوژمنکارانەی ئاشکرا هێرشیان کردە سەر. لێرە - لە گوندی کانیافالهان ـ ژنەکەی و دوا منداڵی لە دەست دا کە ناوی(ئەنتوان) بوو لە تەمەنی (١١)ساڵی دا([١٠٨٧]). پێشتر بە درێژی باسی کۆچی ئەم قەشەیەمان کردووە کاتێك بۆ یەکەمجار تووشی هاتین لە باسکردنی عەنکاوە دا (تەماشای وێنەکە بکە لە لاپەڕە ٢٤٤).

١٠- شوێنەوارە پچرچرەکان: شوێنەوارە موتەفەریقەکان

لە باکوری دوورترە، بە پیادە نیو کاتژمێر بەلای خۆرهەلأتی گوندی(میرسیدا) میر سەیدا، گوندی سیرکاڤ ـ سەرکانی، کەنیسەی تێدا هەیە. لەلای باشووری خۆرئاوای لە گوندی ناوبراوی دواتر سێ ئەشکەوت هەیە یەکێکیان بۆ داود پێغەمبەر دەگەرێتەوە. کە گویمان لێ بوو بەو ناوە(ئەشکەوتی داود) یەکسەر شتێکمان بە بیرهات، ئەویش یاقووتی حەمەوی و وتویەتی([١٠٨٨]).

دەربارەی ئەو جێگەیە کە دەڵێ: لە نزیك ئەو جێگەیە شوێنی(العمرانیە) هەیە کە بینایەکە خاوەنەکەی(عمران کوری محەمەد)([١٠٨٩]). کە لە ماوەی ژیانیدا گەورەی ناوچەکە بووە بەگشتی بەدرێژای ئەم بەرو ئەوبەری ڕووباری خازر. لە باسکردنی یاقوت حەمەوی بۆ ئەو ڕووبارە دەڵی: پێش چونمان بۆ ناوچەی مەرگە ئەو ڕووبارە دەردەچێت لە نێوان چیاکانی حیلیتا(حیلافەت لە سفسفا)(عمرانیە) دەکەوێتە بەری خۆرهەلأت. بابەتی دۆزینەوەی قەلأی تایبەت بە زەوتکردنی زەویەکانی خەلك بە زۆر دەکاری(عمران کوری محەمەد) بۆ هاوڕێکانم بەجێدەهێڵم بەعەرەکراوەکان کە بروام وایە کات بەفێرۆدانادەن بۆ لێکۆڵینەوە لەمەدا. ئەوەی پەیوەندی هەیە بەشوێنەواری مەسیحیەکان دەڵێین: ئەگەر بمانەوێرێکخستنی لیستێکی تەواو بۆ ئەو شوێنەوارانە بکەین پێویستە لەسەرمان ناوی هەمووگوندو لادێکانی کە لەناوچەی بیرتا هەیە بنوسین. زۆربەی ئەو گوندانە ئەمرۆ کوردەکانی تیانیشتەجێن. بۆ سەلماندنی وتەکامان هەندێك لە وانە باس دەکەین: لەلای باشووری(کانیفالا) یان (گردزنگل)(بڵند گوێ زەنگ/ناقوس) شوێنەواری کەنیسەی تیایە. وە هەروەها دەڵێن لە ناوچەیەکی نزیك خازر پاشماوەی مەزارێك هەیە دەگەرێتەوە بۆ(باشمونی) لێیە. لەناوچەکانی دەکەونە دەوروبەری(میر سەیدا) گوندی(تجیاخیری) هەیە (چیای خێر) لە گوندەکانی چیایە، لەلای باکووری گوندەکە سەرەرای هەبوونی شوینەواری کۆشکێکی گەورە کەدەکەوێتە لوتکەی چیا دوو ئەشکەوتی تیایە. یەکێکیان چوار حەوزی تیایە. لە نزیك دووئەشکەوتەکە ڤاپێکی هەڵکەنراو لە بەرد و دەوراندەوری شوێنی دانشتن و نەخشکراو لە بەرد هەیە. بەدوری ٨٠٠ مەتر لە گوندەکە لەلای باکوریەوە شوێنی شوێنەوارێکی تێدا هەیە بەدرێژی ١٥٠ مەتر و ٦٠ مەتر پانی. ئەم شوێنە بەدارو درەختی

چڕ دەوردراوە (١٠٩٠). ئەم شوێنە دەگەڕێتەوە بۆ بینایەی دێریك كە تا ئێستا ناسنامەكەی دیارینەكراوە . كوردەكان ئەم شوێنەوارە بە (زكادیری) ناودەبەن. لە نزیك گوندی (میریبا) گەروێك هەیە بە كوردی پێ ی دەڵێن (گلی كیرماف) بەلام مەسیحیەكان پێ ی دەڵێن (گەروی مار مەنصور) بە هۆی هەبوونی شوێنەواری دێریك بەناوی قەدیسیەوە ناوی دەبەن دەكەوێتە نزیك گەروەكە . تاكە دێر كە بەوناوە هەبێت كە توانیم شوێنەوارەكانی بەڕوونی بدۆزمەوە، (ابن العمری) باس دەكات و دەلی : دامەزراندنەكەی لەسەردەمی بەتریك ئێشۆعیاوی یەكەم ئەرزونی(٥٨٢ ـ ٥٩٠) (١٠٩١). بووە. ناسینی ناسنامەی ئەو دێرە بەتەواوی كارێكی زۆر زەحمەتە ئێستا ،لە بەرئەوەی دانەروا دادەنێت كەوا ئەو شوێنەی دێرەكە لە كەرتی نەینەوایە كە تاوەكو ئێستا نەمانتوانیوە بێدۆزینەوە. لەلای باكوری خۆرئاوای (گاڤ فالا) گوندی (بیسا تی/بیساتی) هەیە وە یان هەردوو گوندی (بیساتی ی سەروخوار). بەهۆی ئەو دووانە ڕەنگە (باساتی) یان (بازیات) بدۆزێنەوە، كە لە دەقەكاندا باسكراوە. لە گوندی (بیساتی)ی سەرو بینایەكی گەورە هەیە،لە ناوچەكەدا دەڵێن ئەوە هی شایەكە بەناوی (مەرقۆس)(؟) لێرە واچاكە بەدوایی دێری قەدیس (مارعاوا)بگەڕێین(١٠٩٢).(كەرۆژانی ژیانی لەسەرووی جیهان بووە ، تاوەكو كۆتایی رۆژەكانی هێنا لێرەدا لە پیرییەكی چاكەدا)؟لەم گوندە قوتابخانەیەكی(باوای) هەیە.(١٠٩٣). قەشە Paul Mouterde عیسایی توانیویەتی هێمای ناوی گوندەكەشی بكاتەوە دوای ئەوەی كەناوەكەیان دۆزیەوە هەلكەندراوە لە گلكەندی (كامد) لە (بقا) (١٠٩٤). كاریكرد لە (باساتی) كە دەكەوێتەكەرتی (مەرگە)ژمارەیەك لە كرێكار بۆ حیسابی خەلیفە وەلید (كوڕی عبدللك وەرگێر)سالی ٧١٥. لە بیساتی شوێنەواری گلكەند هەیە ئەو كرێكارانە كاریان تیاكردو لە وێ فێری پێشەبوون. دواتر، دەمانەوێ ئەوە ڕوون بكەینەوە كە لە ناوەراستی مەڵبەندی باشوور لە ناوچەی بیرتا وە بەماوەیەكی یەكسان لە هەرلایەك لە كۆمەڵو خازر وە لەسەر هەمان هێل كە عین سفنیشی لەسەر هەڵدەكەوێ كە (١٥)كیلۆ مەتر دوورە لە باكوور دێریك پێی دەڵێن(دێرینێ) هەیە. بەڕیوەبەرایەتی گشتی شوێنەواری عیراقی هەڵسا بە ڕێكخستنی دۆسیەی شوێنی ئەو دێرە(١٠٩٥).

ئەم دێرە دەكەوێتە دووری(٣٠٠ ) مەتر رۆژئاوای گوندی(دێرینێ) كەتاوەكو ئیستا ناسنامەكەی لێكۆڵینەوەی لەسەر نەكراوە، دەكەوێتە سەر جۆگە ئاوێك بە هەمان ناو،لێرە كاولە خانوو دەبینین هەمووی بەردو و گەچە پارچە زەویەك دا دەپۆشی بەدرێژی ١٠٠مەتر و پانی ٣٠مەتر . وە هەروەها هەندێك دیوار دەبینین تا ئیستاش لەبەر چاوان دیارن، هەندێكیان بەرزیان لەمەترێك زیاترە.

١١ ـ دێری رەبەن سیبریان (قبریانس)
بەناوی ئەو دێرەوە ژمارەی شوێنە تۆمارکراوەکان لە لیستەکەدا زۆر دەبێت کە پێویستە لەسەرمان لێکۆڵینەوە بکەین وە بەوردی دیاری بکەین بۆ ناوێکی تر. ئەگەر چی تۆمامەرگەیی زانیاری زۆری پێداوین وە بەدرێژی لەسەر ئەو دێرە، بەلاَم ئێمە شوێنەکەی نازانین بەتەواوی. ئیستا ئێمە لە چوارچێوەی جیاکانین لە ناوچەی بیرتا، لێرە جۆگە ئاوێك هەیە لە جێگەیەك کە زۆر دوورنیە. رەنگە ئەو جۆگە ئاوەی هی خازر بێت وە یا بۆ دۆڵی(ناردوش) بێت کە ئاوەکەی بەردەوامە.

## دامەزرێنەری دێرەکە

رەبەن قوبریانۆس لەسەدەی حەوتەم ژیاوە([١٠٩٦]). شوێنی لە دایکبوونی گوندی(بێت مغوشی) بووە واتە گوندی (مەجووس) کەدەکەوێتە بیرتا([١٠٩٧]). کە بەو نزیکانە تووشی کاولکاردن و وێرانی هات بە تەواوی و هیچ شوێنەوارێکی لێ بەجێنەماوە باس بکرێت. لە منداڵیەوە چۆتە قوتابخانەی(مقاوا)([١٠٩٨]). کە یەکێك بووە لە قوتابخانەکانی باوای، کە ئەو کات لەوپەڕی گەشەکردن دا بوو. کاتێك بوو بە رەبەن هەێندەی تریش پابەند بوو بە داب و نەریتی ئورشەلیمی بەو مانایە دابڕانی تەواو لە رەبەنایەتیدا بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ بە تەنها و دابڕاو بوو لە دورگەیەکی ئەرخەبیلی یۆنانی. دواتر گەڕایەوە بۆ کەرتی مەرگە، بەلاَم هیچ پاشماوەیەکی گوندەکەی نەدۆزیەوە کە لێی لە دایك بوو بۆیە چوو بۆ ئەوەی لە دارستان دا بژیت، کە دەکەوێتە ژێر ئەو شوێنەی دێری دوا رۆژی دەبێت. کۆمەڵێك راوچی لە کوڕانی گوندی((نیرم)) دەراعاواسای) دراوسێ، کە دەکەوێتە سەرووی دێرەکە شوێنی ژیان بەسەربردنیان دۆزیەوە و ناسیانەوە و دوای ئەوەی پارمەتیان دا بۆ دۆزینەوەی بزنە کێوی کە بە دوایدا دەگەڕان. دواتر بە خێرایی ناوبانگی دەرکرد و خەڵك سەردانی دەکرد بە کۆمەڵ و تاك. میتراپۆلیتی ناوچەکە وە یان کەرتی ئەربیل چووە سەردانی بە یاوەری ژمارەیەکی زۆر پێکهاتبوون لە قەشەکان و دکتۆر و مامۆستا و قوتابیانی قوتابخانەی(سورا) دوای ئەو زانیاریانە دەتوانین بگەڕێینەوە بۆ تەواوکردنی ئەوەی تۆما نووسیویەتی لە(١٥) لاپەڕەدا([١٠٩٩]).

کە دەڵێ: (پەنجا رەبەن لەو رەبەنانەی، کە بە تەنها دەژیان لە دەوری ئەو رەبەنە بەندکراوە کۆببوونەوە و خەڵکی گوندەکانی دەوروبەر کەنیسەیەکیان بۆ دروست کردوە چەند باڵەخانەیەك بۆ ئەوەی ژیانی بە کۆمەڵ و هاوبەشیان بێتە جێبەجێکردن. دواتر بۆ ماوەی بیست ساڵ رەبەن(سیبریان/ قبریانس) لەو دێرە دەژیا) بەردەوام بوون بۆ

بەدواداچون بۆ داخوازی پەرچووەکان وامـان لـێ دەکـەن گەشـتێکی کـورت بکـەین بـە دەوری ئەو دێرەدا بە پێی جوگرافیای کاتی[١١٠٠]. تووشی کۆمەڵە کەسێکی خـەڵکی مەرگـەی نزیـك شوێنەکە دەبین، ئەوە دەسەلێنی ئێمە بەلای خۆرهەلاتی بێرتـاین، و بـە کۆمەڵـە کەسـانێکی خـەڵکی نوهـدرا. دواتـر بـە هەنـدێك عـەرەب، وە هەنـدێك نەینـەوایی و خـەڵکی حـدیاب. دواتریش خەڵکی بێت گەرمای. هەروەها خەڵکی بێت بغاش و دانیشتوانی دەشتی حیتۆن... وردەکاریەکان بە درێژی رەنگـە بتـوانین شـوێنەکەی دیـاری بکـەین، شـوێنی دێرەکە. لێـرەدا ئێمە نەخۆشێك دەبینین خـۆی دەشـوات بـە ئـاوی ئـەو روبـارەی دەڕوات بـە بـن ئەشـکەوت ـ کۆریتەکەی ئەو قەدیسە. پێیان وتین ئەو قەدیسـە یارمـەتی خێزانێکـی داوە بـۆ باوەڕهێنـان لە دەوروبەری(صورە) کە دەکەوێتە سەرووی دێرەکە.

برایان

لە نێوان قوتابیانی قوتابخانەی سـورە دوو قوتـابی هـەبوون بـە باشـی و زیرەکـی پێشـەنگ و دیار بوون. دواتر چوونە رێبـازی رەبەنایـەتی لـە دێـری قـەدیس قبریـانوس. ناویـان: رەبـەن پۆڵس و رەبەن گبرئیل بوو[١١٠١].

ئـەو دوو برایــە، دوای ئــەوەی گەشــتێکیان کــرد بــەناو ژیــانی رەبەنایەتیــدا هــەر وەك دابونەریتە لە ناو رەبەنەکان دا، گەڕانەوە دێرەکەی خۆیان لێـرە یـەك بـە دوای یـەك بوونـە سەرۆکی ئەو دێرە دوای ئەوەی رەبەن پـۆڵس کۆچـی دوایـی کـرد لـە مـاڵی شـەهیدان نێـژرا، بەلای خۆرئاوا بە ئاراستەی باکور. برایەکـەی رەبـەن گبرئیـل نەیهێشـت پەیکـەری جـەنازەی لە سەر گۆڕەکەی بکرێت. هەروەها ئەوەی قەدەغە کرد، کە هیچ هێمایەك لـە سـەر گۆڕەکـەی دابنرێت. دواتر ئەوڕۆ بۆ رەبەن گبرئیل دێـت و ئـەویش لـە هـەمان شـوێن دەنێـژرێت بـەڵام لە ژێر تارمەی پێشەوەی لای باشوور لە شوێنێکی بەرامبەر پەیکەرەکە، کە هەنـدێك ئێسـك و پڕوسـکی یـەکێك لـە قوتابیـەکانی رەبـەن(سـیبریان/ قبریـانس) ناسـراو بـە رەبـەن شـەعیا رەنگە بپرسن مەبەست چیە لە پەیکەری جەنازەیی؟

لـە وەڵام دا دەڵـێن: پەیکـەرێك دەخرێتـە سـەر گـۆڕی جەسـتەیی ئـەو کەسـایەتیەی بـە قەداسـەت(قـەدیس) ناوبـانگ وەردەگرێـت. ئەمـە لـە دێـری مارمیخائیـل نزیـك مووسـڵ و مارمەتی(شێخ مەتی لە ناوچەکەدا ـ وەرگێـڕ) و مـار ئـەحا لـە شـەلەت و دێـری(ماربـەهنام) دەبینـرێت... تاد.

پەیکەر، بریتیە لە بینایەکی بچوك لـە کەنیسـە پێـی دەڵێن(قمـتر) پـەرتووکی نوێـژی تێـدا دەپارێزرێت. شوێنی باڵەخانەکەی، یان لەلای تەنیشتەکان دەبێت لە نێوان دەرگای پیاوان و

کۆتایی باڵەکەوە یان لە پەرستگەیەکی بچوک پێی دەڵێن(بێت قەدیشی)، واتە(ماڵی قەدیسەکان).
شوێنەکەی بە پێی ئەو پەرستگە بچوکە دەبێت بەرامبەر دەرگا بێت بەلآم لە سینگی پەرستگەکە پاڵی داوەتەوە بە سەر دیواری باکوور یان دیواری خۆرهەلآت. لە بەشی سەرووی قیمتەر و بە بەرزایی یەك مەتر لە سەر زەویەوە بە بەردی مەرمەڕ داپۆشراوە بە شێوەیەکی لار جێگیر کراوە بەرامبەر بەو کەسەی سەردانی دەکات هەڵکەندراوە یان نەخشێندراوە لە سەر بەردە مەرمەڕەکەوە لە ناوڕاستی دا خاچێك هەیە باوەڕداران ماچی دەکەن و دوای سەردانەکەیان و نوێژکردن و داخوازی بۆ شەفیع، کە ئەو قەمتەڕە یا دێرە هی ئەوە. ئەو هێما جوگرافیە تاکەی هەیە کە ڕەنگە سوودی لێ وەربگرین لە خوێندنەوەی ژیانی ئەو دوو ڕەبەنە ئەو دەقەیە کە تایبەت بە خەڵکە گەشت کەرەکە و سەردانەکەیە کە ڕەبەن پۆڵس کردوویەتی بۆ بەندیخانەی تایبەت بە سەرۆکی بازاڕی یەکشەممە.

## نیشانەکانی نیشاندەران

ئەو دێرە کارو چالاکیەکانی بەردەوام و ئاسایی بوو تاوەکو کۆتایی سەدەی نۆیەم بە نیشانەی ئەوەی تۆما سەردانی ئەو دێرەی کردووە ئەو کات(١١٠٢).
تۆما دەربارەی شوێنی دێرەکە دەڵێ: دراوسێی ئەو پیاوە قەدیسانە. واتە حەوت مەترانەکان کە لە گوندی(ریشە) ژیاون. ئەگەر ئەوە واقیعەکە بێ هەر وەك دەردەکەوێ کەواتە پێویستە بە دوای گوندی(ریشە) دا بگەڕێن لە دەوروبەری چیای مەقلوب، وشەی دراوسێ واتە هەموو ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە دەوروبەریەتی و ڕەنگە ڕۆژێك بە پیادەش بێت ئەو دوو گوندەی کە زۆر نزیکترن لە دێرەکە ئەمانەن:(نیرەم دەراعەواسا، یان(نیرامی شوانکارەکان)(١١٠٣).
شوێنەکەی بڵندترە لە شوێنی دێرکە. ئەم گوندە شوێنی لە دایك بوونی یەکێك لە قوتابیەکانی ڕەبەن گبرئیل بووە، ناوی(قوفرا کوڕی سۆریەشۆع) بووە(١١٠٤).
هەروەها ڕەبەن گبرئیل بۆ خۆی لەو گوندە ژیاوە. دواتر ئەو گوندە یەکێکە لەو گوندانەی، کە بۆتە موڵکی عمرانی داگیرکەر و دەست بەسەرداگرتنی موڵکەکان(١١٠٥).
گوندی(سوڕا) واتای ناوەکەی(گەروی چیایی) دەکەوێتە نزیك گوندی نیرام و لەوانەشە شوێنەکەی لە جێگەیەکی بەرزتر لەوە بووبێت(١١٠٦).

هەر چۆنێك بێت، ئەم گوندە كەنیسەی تێدا بووە. هەروەها قوتابخانەیەك كە باوای دایمەزراندووە. ئەم قوتابخانەیە لەوپەڕی گەشەكردنیدا بووە لە سەردەمی قەدیس گبرئێل و پۆڵس. لە نزیك گوندی سوڕە، پاشماوەی دێرێك هەیە بەناوی دێر(شێدە) یەكێك لە پیاوە ماقوڵ و دەوڵەمەندە باوەڕدارەكان ناوی(ماڵباز) بووە ماڵباز كارو كۆششی زۆری كردووە بۆ ئەوەی دێرو ژوورە بچوكەكانی وا لێ بكات بە جوانترین باڵەخانە بێت لە ناوچەكەی ئەو كات دا. مەبەستی ئەو پیاو چاكە ئەوە بووە لە كردارەكەی بۆ ئەوەی ئەو دێرە بەناوبانگ بێت و ناوی ئەو كەسە دەربكەوێت. رەبەن گبرئیل پێشبینی كردووە كە ئەو كات سەرۆكی دێری ماریۆحەننا میتراپۆلیتی(بەرازی) بە تێكدانی ئەو دێرە و كاولكردنی([١١٠٧]).

لەبەر ئەوەی دێرەكان و بەڕای رەبەن گبرئیل پێویستە دروست بكرێن بە دەستی رەبەنە گەنج و قەدیسەكان نەك بە دەستی عەلمانیەكان. لە راستیدا تەنها سێ رەبەن یان دووان پەیوەندیان بەو دێر و بینایە كردووە كە ناوی دێری پێ دراوە، و تیایدا نیشتەجێ بوون. شوێنەواری ئەو بینایە،(دێرە) و پاشماوەكانی تاوەكو رۆژانی تۆما مەرگەیی لەبەر چاوان دیار بوو. پرسیارەكەمان ئەوەیە شوێنی دێری رەبەن سیبریان قبریانس دەكەوێتە كوێ؟

بە دڵنیاییەوە ئەگەری ئەوە هەیە سوود لە هەوڵەكانمان وەربگرین بۆ زانینی ناسنامەی گوندی سوڕا لە رێگەی ناسنامەی گوندی(كەفرسوور)، كە لەو پاشماوەی كاولكاری كەنیسەیەك هەیە و جێی داخە چونكە ناوی سوڕە، واتە گەرووی چیایی. بەلام بە راستی گەرووی چیایی لە ناوچەكە دا نیە تا بەو ناوە ناونرابێت. جگە لەمە: ئەگەر وا دابنێین ئەو ناوە نوێیە بۆ ئەوە بێ شێواندنی ناوی(گەفرسوور) بێت كە بە مانای گوندی گەرووی چیایی، دەڵێین لە سەرمانە لەبیر نەكەین كە ئەو ناوەی دوایی بە كوردی واتە بەردی سوور لەمە بۆمان دەردەكەوێ، كە ئێمە لەبارێكداین رێگەمان پێ نادرێ نە بەرەو پێشەوە نە بەرەو دواوە هەنگاو بنێین و ئەوەی پەیوەندی هەیە بە بابەتی زانینی ناسنامەی دێری سیبریان یان جێگەی ئەو كاولكاریە كە ئاماژەمان پێی دا لە سەرەوە كە دەكەوێتە سەر لووتكەی چیای(كەفرسوور) و(ملكوشان) و بە تەنیشت شوێنەكانی پێی دەڵێن(میتكێ) و (بێراوی) ئەوە شوێنەی دێرەكە بێت بە مسۆگەری، واقیعی كردار لە سەر زەویدایە وە هیچ زانیاریەكی مسۆگەری زیاترمان نیە بیخەینە سەر زانیاریە پڕوپوچەكانمان.

ئەوە لە دۆسیەی ژمارە ١٤٤٠ / ٣٥ دا دەخوێنین و سەر بە بەڕێوەبەرایەتی شوێنەواری عێراقیە تایبەت بەو شوێنە ئەوەیە: (شوێنی كەلاوەكانی دێرەكەیە) و ئەمە باسكردنی فەرمیە بۆ شوێنەكە و هیچ باسێكی وردمان ناداتێ، یان روونكردنەوەی نوێ جگە لە

هێلکاریەکی زۆر سادە نەبێت بۆ باڵەخانەیەکی بچوك بۆ بەکارهێنانی دیارینەکراو لە سەری جێگیرکراوە دەرگایەك لەوانەیە ئەو دەرگایە هی هەیکەلێك بێت و خاچێکی لە سەر هەڵکەندراوە.

١٢ ـ ناوچەی ئەتروش

کاتێك بەرەو خۆرئاوا دەردەچین لە گوندەکانی تیلاوبیلا دەگەینە خاڵی باکوور ـ خۆرئاوای ناوچەی بیرتا، کە بەشی نوێی مزوریە.

کە ئەتروش تیایدا مەلبەندی سەرەکی هەموو ناوچەکەیە. لەو ناوچەیەی کە دەکەوێتە نێوان بیلان و هرماشی. تووشی شوێنێك دەبین پێی دەلین(گەلی دێرا) واتە(دۆڵی دێر) کە تاوەکو ئیستا لێکۆڵینەوە لەسەر ناسنامەکەی نەکراوە گوندی(هرماشی) ناوەکەی لە (ناهرماشی)دەکات ([١١٠٨]). لە ناوچەرەسەنە کۆنەکان کە هەندێك کەس شیفای بۆ کراوە بە پەرچووەکانی دەستی رەبەن سیبریان (قبریانس) بووە، وە هەروەها گوندێك هەیە دەکەوێتە (قەزای/ شاری ـ نحلا دەنهرا) ([١١٠٩]).

کۆن. ناوی ئەو گوندە ناسراوە لای شوینەوارناسەکان بەهۆی هەبوونی پەیکەرێکی هەڵکەندراو کە دەکەوێتە بەشی نزمی چیاکە بەرامبەر بە گوندەکە. بەنیسبەت ئیمەوە. ئەم ناوە بەیەکێك لە قوتابخانەکانی کە(باوای) دایمەزراندوە. وە بیردێنێتەوە ([١١١٠]).

وە هەروەها ئەوەمان وەبیر دێنێتەوە وە بەتایبەتی بە هەبوونی دێری(مار ئەبرام). ئەبرام رەبەنێکی تەنها بووە، بە دریژایی ژیانی لە ئەشکەوتێك ژیاوە دەکەوێتە جێگەیەك پێی دەڵێن (عمیقی). ئەو جێگەیە دووربووە بە هەموو پەیوەندیەك کە هەبێت لەگەل خەڵك و کاروباری دونیاییەوە. تاوەکو ئیستا ئەم دێرە بە چاو دیارە لە رێگەی کەنیسەیەك کە تووشی تێکدان و کاولکردن و وێرانی هات وە هەروەها گۆرستانێك بە دیوارەکانی نووساوە وە دەکەوێتە بەری خۆرهەڵاتی گوندی هرماشی. تاکە دەستنوسی بەدەستمان گەیشتبێت لەو دێرە . دەستنوسێکی تایبەتە بە پێنووسی قەشە یەلدا کوری قەشە دانێیل، لەسەر داوای شەماش کۆرییل مەقدەسی(ئەو نازناوە دەدرێتە هەر کەسێك بچێتە حەجکردن بۆ ئورشلیم ـ قودس ـ وەرگێر). کوری دنحا لەگوندی هرماشی. کرێکەی لەلایەن سندوقی کەنیسەی مار ئەبرام دراوە. تاوەکو ئیستا کانیاوێك هەیە بە ناوی مار ئەورەها و دێرەکەی. دەکەوێتە نێوان گوندی هرماشی، وەهەروەها شوێنێك هەیە(مار نیسا)مان وە بیردێنیتەوە کەلای ئیمە دیار نیە. لەو شوێنە کەنیسەیەکی کۆن هەیە، دیوارەکان بەبەرزی یەك مەترتاوەکو ئیستاش دەبینرێن. ئەم کەنیسەیە ماوەی یەك کاتژمێر بە پیادە لە هرماشێ دوورە وە بە ئاراستەی باشووری ـ خۆرئاوا وە بەدووری یەك کیلۆ مەتر لە خۆر هەڵاتی

گونـدی(دیـراختێرا) بـەو دۆڵـەی کـە ڕێگەکـەی بـەناودا تێپـەر دەبێـت بـەرەو پەرسـتگای ئێزیدیەکان ـ شیخ عادی ـ درێژی چوار دەوری ئەو شـوێنەی کـە پاشماوەکانی تیابلاوبۆتـەوە (٥٠٠م) دەبێت ([١١١١]).

بـەلام، وە زۆر بەداخـەوە، درێژبوونـەوی کێلگـە کشـتوکالیەکان ووردە ووردە زەویـەکانی شـوێنەکە ڕادەماڵێـت و بەسـەریادا زال دەبێـت و دەسـتی بەسـەردا دەگیرێـت لەبـەر زۆری شوێنە بلاوبووەکان یەکێك لەوانە ناوی(حتارا) هەیە لەبەر ئەوەی ئـاش و ئاشـەوانەکان ئـەو کات زۆر بووە لەولاتی کلدانەکان بەهۆی زۆری دانەوێلەوە([١١١٢]). بەرچاومان روونـە کـە ئیمـە دەتوانین شوینی دێری(عنان ئیشوّع) بدۆزینەوە و دیاریبکەین، یەکێکە لەو پیاوانـەی کـە لـە وولاتی یۆنانەوە بەرەو چوارلای خۆرهەلات هـاتن لەسـەردەمی (ئیمپراتـۆری رۆمـانی فـالنس )(٣٦٤ـ ٣٧٨) کەبوونە مەتران و رەبەن، دێری عنان ئیشوّع دەکەوێتـە جێگەیـەك شـوێنەکەی بـەرزترە لـە گونـدی (حتـارا). ئـەم دێـرە ناوبـانگی دەرکـردووە بەتایبـەتی بـە مـوعجیزە و عەجایب کە تیایدا روویداوە([١١١٣]).

ناوی گوندەکە بەسیغەی(حاتاریە)نووسراوە لەپەرتووکی پۆلینیەکانی تایبـەت بـە ئاوەزەکـان و نویـژەکانی سـرووتی تایبـەت بـە بـەرۆژووبوونی نەینـەوا کـە بەدەسـتمان گەیشـتووە لـە کەنیسەی مارت شمۆنی، پاریزراوبووە لە ئامێدی. نوسینی ئـەم پەرتووکـە لـە ئـەلقوش بـووە لە ساڵی (١٧١٦) بـە دەسـتی شـەماش ئیلیـا کـوری قەشـە یەلـدا وە لەسـەر داوای قەشـە نیسان کـوری (مارخایـە) خـەڵکی (حاتاریـە). دواتـر دەستنوسـوکە گواسـتراوەتەوە بـۆ کەنیسـەی (ئازیخ) دوای چاککردنەوەی پێویست بۆی لەساڵی ١٩٣١ لەسەر دەستی خۆشنوسی بـەناوبانگ شەماش پۆلس قاشای ئەلقوشی. وا دەردەکەویّ ئەوگوندە خەلافەتی لـە گونـدی(حیتری)کۆن وەرگرتـووە کـە تۆمـا مەرگـەیی بـۆی دەگەرێتـەوە. وە لەسـەر دەسـتی میترِاپۆلیـت(مـارەن عەممە) وێرانکراوە. لەواقیعدا ئەو گوندە دەکەوێتە خالێکی دوور

لەناوچەی بیرتا (لە کۆتایی زەویەکانماندا)([١١١٤]). ئەم مەترانـە لـە گونـدی(خـنس) هاتـە ئێرە کەدەکەوێتـە ئـەو بـەری دووەمـی رووبـاری کۆمـەڵ([١١١٥]). گونـدی ئـازیخ کـە دەکەوێتـە لای بـاکووری گونـدی(دیـرا حـاترا) تـاوەکو ئیسـتاش کلدانیـەکانی تیـا نیشـتەجێیە وە ژمارەیـان شەست کلدانی دەبێت . لەو گونـدە گۆرسـتانێکی مەسـیحی تێدایـە وە کانیاوێـك دەگەرێتـەوە بۆ کەنیسەی(مار ئەورەهای پزیشك) لەناو حەوزی ئاوی ئەو کانیـە نەخۆشـەکان خۆیـان تیـا دەشوشت پێشتر خۆشوشتن لە پێناو ئەوە بـوو بـە ئـەوەی نەخۆشـەکان شیفایان بۆ بکرێـت وە قوربانیـان بـۆ بکرێت وەقوربانیـان پێشکەش بـە قەدیسی شـەفیع دەکـرد. لەسـاڵی ١٦٩٥، یـەکێك لـە رەبەنـەکان بـەناوی رەبـەن شـابۆ هەلسا بـە کۆکردنـەوەی ئـەو قوربانیانـەوە بـە

پەیمان لەگەڵ قەشە دیشو کوڕی کوریل لە سەرەتادا، کۆی هەموو پارمەتی و قوربانیەکە تەرخان کراوە بۆ نوسینەوەی یەکەم دەستنوس لەو شەش دەستنوسەی ناسراو بە ئازیخ کە پارێزرابوو لە مەترانیەی ئامێدی. یەکێکیان دەستنوسێکی ئینجیلی پیرۆزە و لە ئەلقوش نوسراوە بە پێنوسی قەشە یەلْدا کورشی قەشە دانیال، کورەکەی پارمەتی دا لەو کارە، کە ناوی شەماش گۆرگیس بووە و ئەم کارە بۆ پێوانەی کەنیسەی شەهید مارگۆرگیس بووە لە ئازیخ ئەو دیاریانەی کە پێشکەش دەکران بۆ شەفاعەتی مارئەورەها بواری باشی رەخساند لە ساڵی ١٧١٦ بۆ پێدانی کرێی خەرجی نوسینی ئەو پەرتوکەی نوێژە هەمە جۆرەکان، لەلایەن خۆشنوس ئیلیا کوڕی خۆشنوسی بەناوبانگ کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێی دا نوسراوە. نوسینی ئەم پەرتوکە لە سەر داوای قەشە حەننای کوڕی گوریل لە ئازیخ بووە. لە ساڵی ١٨٦٠ یەك لە دەستنوسەکان بە دەستی خۆشنوس قەشە داود بارزانی بووە و ئەم دەستنووسە پرسیار و وەڵامی تێدایە دەربارەی قەداسی خودایی بەڵام ئەو دەستنوسە نە ناوی خۆشنوسەکەی لە سەر نوسراوە و نە مێژووی نوسینەکەی.لە ساڵی ١٨٧١، شەماس یەلدای کوڕی گۆرگیس هاوکاری کرد لەگەڵ شەماشی خوێنەر(قارۆیا، خوێنەر)، پەترۆسی کوڕی قەشە گۆرگیس لە نوسینی (حوزرا) دا، دەستنوسێی نوێژە فەرزیەکانی رۆژانەیە بە دەستی خۆشنووس قەشە داود کە ئەو کاتە لە گوندی(کانی فەلان) دەژیا. لە هەمان ساڵدا داوا لە هەردووکیان کرا - کە لە سەرەوە ئاماژەمان پێیان داوە - وە بە هاوکاری قەشە رەبەن(عەبدولئەحەد، و داود کوڕی عەودیەشوع) بەرپرسی کارگێڕیی کاروباری کەنیسە چاککردنەوەی دەستنوسێك کە ئامۆژگاریەکانی رەوشتی تێدایە و Hexameron - واتە پەرتوکی شەش رۆژەی خەڵقو چیرۆکی مارگۆرگیس... یەکێك لە خۆشنوسەکان کە شەماش بووە ناوی عیسا بووە هەندێك دەقی زیادەی لەو دەستنووسەدا کردووە دەربارەی کۆمکاری یەکەمی فاتیکان بە درێژی. وە هەروەها رووداوی بڵاوبونەوەی کولە و لەناوبردنی کێڵگەکان و شتی تر دەربارەی رووداوەکان و نسکۆیەکانی تر.

دەستنوسی شەشەم کە هی کەنیسەی مارگۆرگیسە لە ئازیخ کە لە ئامێدی پارێزراوە تایبەتە بە هەموو نوێژە سروتیەکان بۆ رێورەسمی ناشتنی مردووەکان.

پێشەکی پەرتوکەکە(دەستنوسەکە) ون بووە و لە کۆتایی و پێش تەواوکردنی باسەکەمان لە سەر ئەو گوندە، پێمان باشە ئاماژە بەمە بدەین([١١١٦]).

ناوی رەبەنەێك کە بە رەسەن خەڵکی ئەو گوندەیە. ناوی ئەو رەبەنە(حنینای کوڕی بەترۆسە) ئەم رەبەنە لە ساڵی ١٨٨٣ دەستنوسێکی دەربارەی رێزمان بە زمانی کلدانی -

ئـارامی - وەرگێـڕ) نووسـیوە. کاتێـك ڕەبـەن بـووە لـە دێـری ئەلسـەیدە لـە مـاوەی سەردانی(بادجر) بۆ گوندی ئازیخ لە ساڵی ١٨٥٠([١١١٧]).
قەشەی تایبەت بە خۆیان نەبووە و ژمارەی مەسیحیەکان(١٥) خێزانـی نەسـتۆری بـووە. لـە دوای ئەو سـەردانە ئەمانـە بـوون بـە کاسۆلیك، مـادام خۆشـنووس کاسۆلیکی(داود بـارزانی) پەرتووکەکە چاکدەکاتەوە لیتۆ رجیا کانیان(سروتی) لە ساڵی(١٨٦٠) ەوە.
(١٠) ـ نەهلە
تۆمـا مەرگـەیی کۆتـایی پـێ هێنـاوە([١١١٨]). بـەو دەقانـەی کـە نوسـویەتی دەربـارەی دوبـارە ڕێکخستنەوەی کارگێڕی کەنەسی کە لە نیوەی دووەمـی سـەدەی هەشـتەم ڕوویـداوە لـە سـەر دەستی میتراپۆلیتی ئەربیل(ماران عەمما) کە ئەو کاتە کەرتی مەرگە لـە بـن دەسـەڵاتی ئـەو دا بـووە بـەو کۆتاییـەی خـوارەوە: (ئـەو لـە ژێـر دەسـەڵاتی مـەتڕانی(داسـن) دایـە کـە نـاوی(ئیستبانۆسـە)، دێـری گـەورە و هـەموو چـوارلای نەهلـەو تیلانـە کـە پێشـتر لـە ژێـر دەسەڵاتی ئەبرەشیەی مەرگە بووە ). ئارەزوی ئـەوە بـووە هـیچ بوارێـك نـەدات بـۆ ئەوانـەی دوای ئـەو دێـن لـە توانایانـدا بێـت بۆگەڕاندنـەوەی ئـەوەی بڕیاریـداوە بۆدەسـەڵاتگرتن بەسەرداسـن فـەرمانێکی نووسـیوە دەقەکـەی ئەومیـە کـەوا مـاف هـیچ میتراپۆلێنـك نیـە کـە لـەدوای ئـەودابێت بۆگـەڕا ندنـەوەی گفتوگـۆکردن دەربـارەی بڕیارەکـان وەیـا لابردنـی فەرمانـەکانی بۆدەسـەڵاتەکانی بەسـەر ناوچـەکانی ئامـاژە پێکـراو بـۆ ئەبرەشـیەی داسـان. بۆئـەوەی هـیچ ناوچـەیەك توانـای بەسـتنەوەی نـەبێت بـۆ جارێکی تـر بـە کـەرتی مەرگـەو یەکێکی تر بە داسن پێویستە شوێنەکە ناوەراست بێت لە نێو هەردوکیان.
بـەهۆی هەڵکـەوتنی داسـن لـە بـاکووری مەرگـە بۆیـە پێویسـتمان بـە کوشـتنی کـات نیـە بۆماوەیەکی درێژ لەکاتی لێکۆڵینەوە لە ناوچەکانی بـاکوور لـەو دەڤـەرە کـە دۆڵێکـە تـاوەکو ئەمرۆش پێی دەڵێن دۆڵی نەهلە([١١١٩]). دۆڵی نەهلـە دۆڵێکـی گـەورە و دیمەنـەکانی دڵـرفێنن. توانای ئاودێری زەویە کشتوکاڵیەکان زۆرەو ئاسانە. ڕێـڕەوی ڕووبارەکـەی بـە دەوری زنجیرە چیای ئاکرێدەسوڕێتەوە. لێرە بەدواوە، چوونە ناو ئەو دۆڵە کارێکی ئاسانە بـەهۆی ڕێگـەی باش کە بە گەروە جوان و ڕەنگینەکان تێپـەر دەبێت وە لەسـەر ئـەو سروشـتیە وشکانیەیدا پێی دەڵێن(گەلی زەنتا).
ناوی کۆنی ئـەو دۆڵە پێشتر:(نەهلە دەمـەلکا) واتـە (دۆڵی پاشا) بۆجیاکردنـەوە لـە نێـوان ئـەوو نێـوان ناوچـەی تـر کـە بەنەهلـە ناسـراوە هـەروەها، لەوانـە (نەهلـە دەنهـرا ) واتـە (نەهلەی / دۆڵی ڕێچکەی ) کە لەسـەرەوەش توشـی هـاتین. تاکە گونـد کـە دەکەوێتـە ئـەو دۆڵـەو(تۆمامەرگـەیی) باسـیکردووە بـە دەستنیشـانکردن و شـوێن و دیـاریکردنی دا ئـەویش

(گونـدی دوری)یـە.([١١٣٠]). لـەو گونـدەدا (یوحـەننا دەیلـەمی)(باغچـەیەکی مێـو (تـری) و(خانوویێکی بچووك) و مەڵبەنـدێك ([١١٣١]). کە کاریـدەکرد بەچالاکیەوە و توانـای زۆرەوە و ساڵانی سـەرەتایی بـە رەبەنایـەتی بەسـەردەبرد لـە دێـری بێـت عـاوی. مێـژوونوس بـودج (دوری) نـەزانیوە تـەنها یـەك گونـد نـەبێ ئـەوەی کـە دەکەوێتـە دەوروبـەری ئامێـدی. ئـەم گونده لە واقیعدا ناکەوێتە نەهلە بەڵکوله (بێت تنۆرێ) ([١١٣٢]).

بودج بەهۆی ئەوەی رایەکەی بەستراوە بە گوندی دوری(لـە ئامێـدی ) دەبیـنین سەرلێشێواو دەبێـت و ئاراسـتەکانی لـێ تێـك دەچێت و بزردەبێـت کاتێـك کـە دەیـەوێت شـوێنی نەهلـە دیاری بکات. بە کردەوە گونـدی دوری کـە باسـەکەمان بـە دەوریـا دەسـوڕێتەوە وە ئەمڕۆکـە گوندێکی کوردیە پێی دەڵێین (دیفـری) کـە ئێسـتاکە هەنـدێك لـە ئاشـوریەکان گەراونەتـەوە وە تیایـدا نیشـتەجێبوون تـاوەکو ئێسـتاش لـەو گونـدە کەنیسـە هەیـە لەسـەر نـاوی (بـی شمونی) ئاماژە بە مارت شمونی و منداڵەکانی کـە ناویـان هـاتووە لـە یـەکێك لـە سفرەکانی پەرتووکی پیرۆز . گونـدێکی تـریش هەیـە تومـا مەرگـەیی نـاوی هێنـاوە ، وەدەڵـێ (٤ میـل) دورە لـە بـاکووری بێـت عـاوی .ئەمـە مانـای وایـە دەکەوێتـە دۆڵـی نەهلـە. ئـەم شـوێنە پێـی دەڵـین(کبیسا)ـ شـۆینی لـەدایکبوونی رەبـەن یوسـف و براکـەی ئیـبراهیم([١١٣٣]). کەپێشـتر لـە باسکردی(زینای) و(بێت قوقا) تووشیان هاتین. ئەمرۆ ئـەو گونـدە گونـدی(کوبا)ی ئیسـتایە کەکەنیسـەیەکی تیایـە لەسـەر نـاوی (پـاکیزەی قـەدیس)ە وە درەختیـك بەناوبانگـە بـەدرەختی(مارشـدا) لـە واقیعـدا دەستنووسیك هەیـە لـە مەترانیـەی ئـاکرێ سەرچـاوەکەی کەنیسـەی(مارشـدا)یە وەمێژووەکـەی بـۆ سـاڵی ١٧٦٦ دەگەرێتـەوە([١١٣٤]). لـەو ناوچـەیەی دەکەوێتـە سـەرووی گونـدی کوبـا ئەشـکەوتێك هەیـە، لەوانەیـە ئـەو خاسـیەی دابیتـە نـاوی گوندکە . لە چالاکییەك کە دەکەوێتە ناو ئەشکەوتەکە ئاوێك هەڵدەقوڵێ و موعجیزەی تیا روو دەدات. کوردەکان بەم شوێنە دەلین(قەدیشا))/واتە (قدیس/قەدیس)ـ وەرگێـر. جگـە لـە گونـدی(بامیشـمۆنی) کـە دەکەوێتـە دووری دوو کیلـۆ مـەتر لـە گونـدی(دوری) وە بـەلای باشووری خۆرهـەلات گونـدێکی تـر هەیـە لەگونـدەکانی دۆڵـی نەهلـە. لـەم گونـدە تـاوەکو ئیسـتاش هەنـدێك مەسـیحی تیـا نیشـتەجێن تـاوەکو سـالی ١٩٦١. یـەکێك لـەو قەشـانەی کەکاریکردووە لە بامیشمۆنی) ناوی(باهرین) بووە. دەستنوسێکی نووسیووە دوای ساڵی ١٧٤١ کە بریتی بووە لە ئاوازەکان و سرودەکانی سرووتی و نوێـژەکانی بەرەکـەت([١١٣٥]). کەنیسـەی ئـــەم گونـــدە لـــەژێر نـــاوی شـــەفاعەتی پـــاکیزەی قەدیســـە لـــە نزیـــك ئـــەو گونـــدە درەختێکی(داربـەروو) هەیـە، هەنـدێك پێـی دەڵـێن (درەخـتی مـار یوسـب) ـ(داربـەڕووی ماریوسف) ـ وە هەندێکی تر دەڵێن هی (مـاڕیۆ حـەننان)ە ، بـەلام ئـەو مـاریۆ حەننانـە ئـەو

یوحەننا دەیلەمی یە نیە کە پێش کەمێك ئاماژەمان پێیدا کەلە نزیك دووری ڕەزوو کۆریتەو مەڵبەندی کارکردنی هەبوو . رەنگە ئەو یۆ حەننانە ئەوە بێ ناسراوە بە(بوحننان) لە نەهلە. دزی پاساو هێنەر توانی دەستگیری بکات کە چیرۆکی ژیانی کەمەو نوسراوە لە دەستنوسێك باسیکردوە لە ناوەرۆکی دەستنوسەکانی پەرتوکخانەی سعرت([١١٣٦]). لەژێر ژمارەی (٦١) کەبزر بووە لەگەڵ بزرکردنی پەرتووکخانەکەو ناوەختەکانی بەهۆی وێرانکردنی تەواوەوە کە دووچاری بوو، وە بادجر سەردانی([١١٣٧]). گوندی بامیشمۆنی کرد، سەیری کرد کەنیسەی هەیە بەبێ قەشە وە دەخێزانی مەسیحی. تاوەکو ئیستاش لە دەشتی گوندی بامیشمۆنی شوێنەواری تێکدان هەیە دەگەڕێتەوە بۆ(مارئەپری) یە وە هەروەها لە نزیکیدا گوندی(ئارتۆن) هەیە، ئەویش کەلاوەی تێکدراوی کە نیسەی مارگۆرگیسی تیایە لەوێ دەستنوسێك هەیە بۆ ئینجیلی پیرۆز لە ساڵی ١٧٥٥ نوسراوە بە دەستنوسی یەکێك لە باوەڕداران لە رۆڵەکانی ئەم گوندە خۆی وە ناوی(ئیشوع کوری ئیبراهیم)ە تاوەکو ئیستا پارێزراوە لە پەرتووکخانەی ئاکرێ([١١٣٨]). لە سەردانی بادجر بۆ گوندی ئارتۆن لەساڵی ١٨٥٠ ژمارەی خێزانەکانی مەسیحی لەو گوندە(١٥خێزان) بووە ([١١٣٩]). بووە. کەنیسەیەك و قەشەیەکی تایبەت بە خۆیان هەیە و خزمەتکردنی روحیان دەکات. ئەمڕۆ هیچ مەسیحیەك لەو گوندەی ئارتۆنە نێشتەجێ نەماوە و نیە.لە رۆڵەکانی گوندی (ئاراتۆن) ی ڕەسەن ، خۆشنووس و خاوەن پێنووسی بەناوبانگ (زەمیا کوڕی هورفرد) کە شوێنی لەدایکبوونی بەجێهێشتووە و چووە لە گوندە (صانایی) نێشتەجێبووە کە تاوەکوو ئێستا مەسیحیەکان تێیدا نێشتەجین و نزیکە لە شوینی لەدایکبوونیەوە. (زەمیا) بەپێنووسەکەی دەستنوسیکی نووسیوە تەفسیری ئینجیلی تیایە لەسالی ١٨٨٥.ئەو دەستنوسە ئەمڕۆ لە ئاکرێ یە ([١١٣٠]). کەنیسەی گوندی (صانایی) بەکاردەهێنرێت تاوەکو ئەمڕۆش ـ ساڵی١٩٦١ ـ کەبەناوی (مارگورگیس) نراوە . پێشتریش لە وێ دەستنووسێکی ئینجیلی پیرۆز هەبوو بەپێ ی سرووتی کلدانی لە ئامێدێ سەرچاوەکەی کەنیسەی مارگۆرگیسە کە لەسەرەوە ئاماژەی پێدرا. ئەم دەستنووسە لە ئەلقۆش تەواوکراوە لەسالی ١٦٩٦ وەلەسەر داوای عەودێشۆع لەگوندی صانایی.ئەم گوندە بە زۆرەملێ کوچیان پێکراوە و گواستنەوەیەکی خوێناویان بینیوە لە ساڵی ١٨٥٨ و١٨٦٣و قەشە داود بارزانی دوو کوری خۆی لەدەستداوە دواتر رایکردووە و گوندەکەی بەجێهێشتووە دوای ئەوەی دانیشتوانەکەی بەزۆرەملێ دەرکراون کە مەسیحیبوون لەو ماوەیەدا لە ئەنجامی ئەو هەراو هۆریاو کێشەیەی لەهەموو ناوچەکە بلاوبۆوە و هەبوو. لە دۆڵی نەهلە شوێنەواری کۆمەڵێك کەنیسە دەبینرێ کە بۆ گوندە مەسیحیەکان دەگەڕێتەوە. لەخوارەوە ئاماژە بە هەندێکیان دەدەین : کەنیسەی

دوری گـەورە ، وەکەنیسـەی کۆسـا کـە هـەردووکیان لـەژێر نـاوی (مارسـاوا) ن. کەنیسـەی گوندی (کورتکا) وە هەروەها لەسەرئەوە شەوە کانیاوێك هەیە پێی دەڵین (کانی زارکی) وە هەروەها(کانیاوی پاکیزە)، وە لە ناوچەی(مازرگان). وە بەدووری نیو کاتژمێر بە پیادە لەو دووگوندەی سەرەوە گوندی (کربش) لەو گونـدە کۆمەڵە دارو درەختێك هەیە تایبەتە بە شوێنی پیرۆز پێی دەڵین(بیرمامێ) لە دۆڵی (بیرمامێ) پاشماوەی کەنیسەیەك دەبینرێ، وەهـەروەها هەندێك ئەشـکەوت دەبینـرێ کـە بەڵنیاییـەوە ئەشـکەوتە کـۆریتی کـۆنن و تایبـەتن بەرەبەنـەکان(کـە بەتـەنهادەژین ). پاشماوەکـان و کاولکاریـەکانی کەنیسـەکانی تـر ئیستاش دەبینرێـت لـە: سیراتا، دووبیری، دودی خـواروو، کۆسـکیا، هێشـتکا، دواتـر عامـادا . گونـدی (کەشـکاوە) و (تشامیزینی/شـامیزینێ /شـەمزێنی)ژیان گەرایـەوە ناویـان دوای گەرانـەوەی ئاشـووریەکان بـۆ ئـەوەی بۆجـاری دووەم تیاییـدا نێشـتەجێ بـبن. ئـەو کەسـە مەسیحیانەی گەراونەتەوە ئـەمڕۆ کەنیسە کۆنـەکان بـەکاردێنن بـۆ نوێـژکردن کە تیایانـدا هەیـە .لـەوەی سـەرەوە ئـەوەمان بـۆ دەردەکـەوی ، دەتـوانین بلێن دۆڵی نەهلە ناوچـەیەکی قەرەبالغی نیشتەجێ ی مەسیحیەکان ، ئەمە جگەلە ژمارەی ئەو دێرانەی کە هەیە بەهۆی کـەمی ژمارەیـان بەبـەراورد بـەو ژمارەیـەی دێرەکـان کـە پـێ یـان گەیشـتین لـەکاتی لێکۆڵینەوەمان لەناوچـەی بیرتـا . بـەردەوامبوونی ژیـانی بـاوك و باپیرانمـان و رۆڵـەکانیان و نـەوەکانیان کـە چـەند جێلیکـی باپیرانمـان بـەدواوە ماوەتـەوە لەلایـەك وەگەرانـەوەی هەنـدێکیش بـۆ ئـەوەی لـە نیشتیمانی کـۆن و ناوچـەی خـۆی بـژیت لـە هەنـدی لـە گونـدە مەسیحیەکان ئەوناوچەیە لەلایـەنی دووەم دوو هۆکاری گرنگی بـۆ پاراسـتنی داب و نـەریت و نـاوی شـوێنەکان ئـەوەی جێ داخـە ئـەو دەقانـەی یاریـدەدەرن بـۆ باسـکردنی مانـای ئـەو تاوانـە تـاوەکو ئێسـتا پێویسـتی بەلێکۆڵینـەوە هەیـە ، وە هـەروەها دۆزێنـەوەیان. نەخشـەی ئیستای باری مەسیحیەکان تایبـەت بـەو ناوچـەیە وەهـەروەها لەناوچـەکانی تـریش زۆرە لـە چوارچێوەی کوردستاندا نەخشەیەکی پر کەم وکورتی هەیە و یارمەتیمان نـادات بـۆ ئـەوەی مەبەسـتەکەمان بپێکـێ وە نـاتوانین چـاکی بکەینـەوە. بـەهۆی بەجێهێشـتنی دانیشـتوانی زۆربەی گونـدە مەسـیحیەکان گونـدەکانیان کۆچـکردنیان بـەزۆرە ملـێ بـەهۆی رووداوەکـانی خویناوی کەناوچەکەی گرتەوە لەساڵی ١٩٦١([١٣١]).

## دێری گەورە

تاوەکوئیستا هەوڵمان نەداوە بۆ زانینی ناسنامەی شوینی دێری گەورە، کە وتمان کەوتەبـەر دەستی کورسی مەترانی داسن لەگـەڵ ناوچـەکانی نەهلـەو تلاتـا. دوای خـۆ کێشاونەوەی لـە

دەسەڵاتی کورسی مەترانی مەرگە. تاکە شوێنی لەبار بۆ ئەو دێرە ئەو خێگە نزیکەیە(سیرگاندیل/سەر کەندال) کەدەکەوێتە کۆتایی دوورترین دۆڵی نەهلە بەری رووباری زاب. لەوێ کۆمەڵێك ئەشکەوت دەدۆزینەوە وە پاشماوەی کاولگە بۆ دێرێك قەبارەی هاوشێوەی قەبارەی دێری رەبەن هورمزە. رەنگە ئەو ناوە بەخشینە ببێتە بێزارکردنی هەندێك صەفاییەکان(صەفائی ئەومیە گەزۆر سوورە لەسەر صافی زمان/واتە زمان پاراو- وەرگێر) و ناونانی بە(دێری گەورە) بەجێهێشت کە تایبەت بوو بەدێری(ئیزلا)بەتەنها . ئارەزوومانە هیچ ئەشکالێك نەمێنێت وەیا هیچ شێواندنێك کە توشی ببین، هەڵساین بە نووسینی ناودێری باسکراو لە دوییدا ـ دێریی ئیزلا ـ بە پیتی گەورە(بەزمانی فەرەنسی) وەناوی ئەو دێرەی کەئێمە باسی دەکەین لێرەدا بە پیتی بچووکە. ئەوەی تایبەتە بەبابەتی ناسنامەی ئەو دێرە کەبە (دێری گەورە )باسمان کرد دەڵێین: رەنگە ئەو دێرە ناسراوە دێری زخا ئیشۆع بێت ئەوە(دێری گەورە) بێت، کە مەبەستمانە و بابەتی لێکۆڵینەوەکەمانە لێرەدا. لەگەڵ وریابوون کە ئەو دێرە ناوی دیکەشی هەیە، کە ئەویش(دێری بێت رەبانە). هەروەها هەر یەك لە تۆما مەرگەیی و ئیشۆع دناح جێگیریان کردووە لە ناوچەی داسن. هەموو ئەو شوێنانەی، کە هەیە بە تەواوی بەلام لە دوای چاکسازی و رێکخستنی کەنەسی، کە ئیشۆع عەمما پێی هەڵسا. ناوی بێت رەبان بەکاردێت وەك سەرچاوە بۆ رچەڵەکی زۆر کەس لە مامۆستاکان کاتێك باری تایبەتی بە یۆحەننان و ئیبراهیم لە بێت رەبان دەکرێ و ئەو دووانە دوو زانای نەستۆری بوون لە قوتابخانەی(نسێبین) لە کۆتایی سەدەی شەشەمی ز. کاتێك باسی هەندێ کەس دەکەین گوایە ئەوانە(لە خێزانی مامۆستان) ئەمە ئەو مەبەستەیە ئەوانە خزم و کەسی(نرسای)([1132]). مەلفا و بەمانای نزیك لەوەی باسمان کرد، بەلام لەگەڵ ئاماژە کردن بە مامۆستای نەناسراو رەنگە ناوی نووسەرێکی یەعقوبی بدۆزینەوە، ناوی(داود) ە لە بێت رەبان. قسەکردنمان ئێستا لەسەر مامۆستایەکی بەناوبانگە ناسراوە بە(رەبەن زخا ئیشۆع) ئەم رەبەنە یەکێکە لەو سێ قوتابیانەی ئیبراهیمی گەورە کە چۆتە ناوچەی داسن. دوای پەرش و بلاوەپێکردنەوەی برایانی رەبەنەکانی دێری ئیزلا، کە لە کۆتایی سەدەی شەشەمی زاینی رووخا. دوو رەبەنەکەی تر یەکەمیان لە ناویان دا ناوی رەبەن ئیبراهیمە، بەلام ناوی دووەمیان ناوی رەبەن یۆحەننان بووە و نازناوەکەی لە ئازرمەیە([1133]). یەکێك لە سەرۆکەکانی دێری بێت رەبان ناوی ئیبراهیم بووە([1134]). مێژووی ژیانی ئەو سەرۆکە سۆریەشۆع رۆستەم نووسیویەتی زۆر بەداخەوە دەستنووسی ئەو مێژووە بزرە. ئەو سەرۆکە تەمەنی گەورە بوو، ئەمە واتای ئەومیە لە سەرەتاکانی سەدەی حەوتەمی زاینیدا،

گەرتی داسنی بەجێهێشت لەبەر ئەوەی ئاو و هەواکەی زۆر سارد بوو و چووە دێری بێت عاوی کە ئاو و هەواکەی([1135]). خۆشەو پلەی گەرمایی بەرزترە کە گەیشتە ئەو دێرە(بێت عاوی) بە سەرۆکی دێرەکە دیاری کرا بەهۆی بەهێزی کەسایەتی ئەو سەرۆکە بۆ کارگێری. بۆیە پاش بەجێهێشتنی دێری بێت رەبان لە داسن رەبەنەکانی ئەو دێرە هەستیان بەوە کرد کەوا دێرەکەیان سەرۆکی راستەقینە و باشی لەدەست داوە، بۆیە بڕیاریان دا پەیمانێک ببەستن بە دوو قۆلی لەگەڵ دێری بێت عاوی.

بەپێی ئەو پەیمانە بۆ هەر دوو دێرەکە سەرۆکێکی کارگێڕی هەبێت بە هەڵسوڕانی کاروباری هەردوو دێرەکە و کۆمەڵە رەبەنە براکان بەیەکەوە بێت بە پێی ئەو رێککەوتنە رەبەنەکانی دێری بێت رەبان بە هیچ کارێک هەڵناستن بە پێی دەرچوونی فەرمان لەلای سەرۆکی کارگێڕی کە لە بێت عاویدا دادەنیشت نەبێت و بە پێچەوانەی هەروەها راستە.

تاوەکو کۆچی دوایی رەبەن ئیبراهیم ئەو هاوبەشیەی کە رێککەوتنی لە سەر کرابوو جێبەجێ دەکرا و بەم شێوەیە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەردەوام بوو. لە نێوان ساڵانی ٧٨٠ و ٨٢٣ مەترانی کوردەکان یەکێك بوو لە رەبەنەکانی دێری زخائیشۆع و ناوی(داود) بوو، و ئەو پەرتووکی(بەهەشتی بچوکی) نووسیوە، کە پێشتر باسمان کرد([1136]).

کانی فەلا، لاپەڕە یەك لە دەستنووس نووسراوە لەلایەن قەشە داود بارزانی ١٨٦٨، بڕوانە لاپەڕە(٢٣١) لە بابەتی(گوندەکانی فەلان).

(بە زمانی سریانی نووسراوە).

(١١)

## تیلانا ـ تلانە

ئەوەی جێی سەرنجە ناوی تیلانە لەسەر نەخشە بزر بووە بەتەواو([١١٣٧]).
ئەوەی تەنها بتوانین بیدۆزینەوە گوندێك هەیە پێی دەڵێن(تیلانـە) دەکەوێتـە ناوچـەیەك بیسـت کیلۆمـەتر لـە رواندزەوە دوورە، لـەلای باکوریـەوە بـە ئاراسـتەی بـاکووری خۆرهەڵاتیـەوە. بـەڵام بـەهۆی ئـەو شـوێنەیەوە زۆر زەحمەتـە ئـەم شـوێنە وای دابنـێین کـە دەکەوێتە نێوان کەرتی مەرگە و داسن.
ئـەم هەڵکەوتـە خـۆی بەسـەر گونـدی تلانـە جێبـەجێ دەبێـت. هـەر وەك بـادجر باسـی کـردووە([١١٣٨]). کـە لـە پارێزگـای جیلـۆ دایـە لـە کـەرتی(تجـال). کەواتـە پێویسـتە لەسـەرمان ئێستا هەوڵ بدەین بەدوای تیلانەدا بگەڕێین بۆ گەڕانەوە بەدوای دەقەکان کە باسـی دەکـەن ئەو دەقەی لە هەموو دەقەکان روونترە([١١٣٩]).
ئەو دەقـە کـە بـاس لـە دوو هـەتیو دەکـات کـە خـەڵکی تلانـە بـوون و بـۆ خوێنـدن دەهاتنـە قوتابخانەی(شلمات) ئەم دەقە جەخت لەوە دەکاتەوە، کەوا ئەو دوو شوێنە لـە یـەکتری دوور نین.
گـەڕان بـەدوای تلانــە وا پێویسـت دەکـات، کـە لـەو ناوچـانە بگـەڕێین، کـە دەکەونـە دەوروبەری(شلمات). بـۆ زانیـاری باشـووری شلمات و رۆژهـەڵاتی بەشـێکن لـە سفسـفا، بـەڵام باکورەکەی بـە دۆڵـی نەهلـە ئـاوەدان کراوەتـەوە. کەواتـە هیچمان بەدەستەوە نـەماوە تـەنها لای خۆرئـاوا نـەبێت، کـە ئەوبـەری دووەمـی رووبـاری خـازرە. لـە واقیـعدا پێویسـتە ئـەو تێبینیە بکەین، کەوا درێژبوونـەوەی دۆڵـی نەهلـە بـە رووبـاری خـازر ئـەو ناوچەیەیە کـەوا هـەموو مەرجـەکانی خـوازراوی تێدایـە و بـەس. ئێسـتا ئـەو ناوچـەیە پێـی دەڵێن(بـەرواری گێـڕ ـ جـیر)، کـە گـەمارۆ دراوە لـە نێـوان چـیای گـارە لـە بـاکوری چـیای(تگیـاخێر) لای باشووریەوە، کە زنجیرەکەی نێوان تلانـە و بیرتـا دەکاتـە دوو بەشـەوە و جیایـان دەکاتـەوە. درێژبوونـەوەی ئـەو دۆڵـەی ئاماژەمـان پێـی دا بـەردەوام دەبێـت بـە درێژبوونـەوەی بـەرەو خۆرئاوا تاوەکو دەگاتە رووباری گۆمەڵ. لەوێدا ئەو رووبارە دەبێتە سنوورێکی سروشتی بۆ ناوچـەکە. لـەلای خۆرهـەڵات بـەردەوام دەبێـت ناوچـەی تیلانـە بەلاربوونـەوە(لێژبوونـەوە) تاوەکو دەگاتە رێڕەوی رووباری خازر.

پێشتر سەردانی ئەو ناوچەیەم کردووە. لە سەردانەکەم دا تووشی پیاوێکی بەساڵاچوو بووم، بەڵام ناوچەکە پێدەزانێت و بە درێژی و وردەکاریەوە، کە خۆی بە پیادە بەناوچەکەدا گەڕاوە و پێش ئەوەی ئۆتۆمبێل بگاتە ئەو ناوچەیە. کە پرسیاری ناوچەکەم لێ کرد، نیشانەی نەزانین دەموچاوی داگرت، چونکە ناوە کۆنەکەی ناوچەکەی نەدەزانی کە ناوەکەم بەبیر هێنایەوە، بەبیری هاتەوە و شتێکی درکاند وتی: لەوێ گوندێکی بچوك هەبوو بەو ناوە بەڵام لە سەر نەخشەدا بوونی نیە گوندی(تلانیتا)(ئێستا پێی دەڵێن تلانیتا) بەلام کوردەکان پێی دەڵێن(دەفیك). بەلای خواروو لە" ئارجن" بە دووری بیست خولەك لەوێ لە دامێنی چیای گارە.

١ ـ تلانیسا ـ تلانیتا

سێ دەستنووس هەیە لە گوندی تلانیتا بۆمان هاتووەو لە مەترانیەی ئامێدی پارێزراون. یەکەمیان دەستنووسێکە بۆ پەرتوکی نوێژە سروتیەکانی رۆژانە و پێی دەڵێن قەزام دەوئاثر. ئەم دەستنووسە لە بارێکی زۆر خراپ دا بوو و ناتەواو بوو. ئەم دەستنووسە لە ساڵی ١٧٠٠ نووسراوە. بە پێنووسی قەشە هومو ئەلقوشی، لە سەر داوای(دنحا کوڕی خۆشابوو لە گوندی تلانیتا). وەچەی دنحا قەشە بووە و ناوی(ئەیار کوڕی قەشە نیسان بووە)([١٤٠]).

ئەم قەشەیە داوای لە شەماش(شەمعون کورشی قەشە ئیسرائیل ئەلقوشی کردووە دەستنووسێکی بۆ بنووسێت بە ناوی(وەردە)(رەنگە ئەو داوایە دەستنووسی وەردەی بەناوبانگ بێت لە سەدەی ١٢ ـ وەرگێڕ).

بۆ ئەوەی پێشکەشی بکات بە کەنیسەی شەهید قریاقۆز لە گوندی تلانیتا کە دەکەوێتە ناوچەی(حاکر)(مەبەستی هەکاری) یە و هەمان قەشە لە ساڵی ١٧٤٥ داوای لە قەشە حەنا کوڕی قەشە هومو ئەلقوشی کردووە دەستنووسێکی بۆ بنووسێ بۆ نوێژەکانی تایبەت بە جەنازە و ناشتنی مردووان. بەو دواییە تلانیتا لە بێدەنگی راپەڕی کە پێشتر باڵی بەسەر دا کێشابوو، دوای گەڕانەوەی دانیشتوانە مەسیحیەکەی کە بە زۆرە ملێ کۆچیان کردبوو و لە(سیان)(شارمن) نیشتەجێ بوون، کە دەکەونە سفسفا و ژیان سەر لە نوێ بۆی گەڕایەوە بۆ سەر مەزارگە و شوێنەوارە کاولکاریەکانیان و بزر بوونی مردن. بەڵام بۆ جارێکی تریش نیشانەکانی مردن سەر لە نوێ بەدەرکەوت و باڵی بەسەر گوندەکە کێشایەوە بە هۆکاری رووداوەکانی ساڵی ١٩٦١، و بۆ جاری دووەم خەڵکەکە گوندەکەیان چۆڵ کرد و ئاوارە بوون. داب و نەریتێکی خۆجێی هەیە کە گوایە تلانیتا بارەگای کورسی مەترانی(رەبارەکە) بووە، ئەم ئەگەر و گریمانەیە ئەوە دەگەیەنێت بە سروشتی حاڵی هەرێمی تلانا ئەبرەشیەکی

سەربەخۆ بووە لە کەرتی مەرگەدا یان داسن و لە ماوەیەکی نەزانراوی مێژوودا لەبەر ئەوەی دەقە تۆمارکراوەکان هیچ هەواڵێکمان بەو زانیاریانە پێنادا لە سەر ئەوە.

٢ ـ عەتووش

گوندی عەتووش دەکەوێتە بەروارى ژێری(بەرواری گرد)، لە ساڵی ١٧٤٥ چوونە ناو مێژووەوە و بە هۆی دەستنووسێك بۆ نوێژە فەرزیەکان بە پێی سروتی بەکارهێنراو لە دێری سەروو تاوەکو ئەم دواییەش ئەو دەستنووسە پارێزراو بوو لە ئامێدی کە نووسراوە لە سەر داوای یەکێك لە باوەڕداران بە ناوی داود کوڕی کانون. لە ئەلقوش نووسراوە بە پێنووسی قەشە حەننا کوڕی قەشە هومو بۆ بەکارهێنانی لە کەنیسەی مارگۆرگیس لە گوندی عەتووش.

لە هەمان کەنیسە دەستنووسێکمان پێگەیشتووە بەڵام بە بێ پێشەکی و مێژووی نووسین و بە پێنووسی کێ نووسراوە و لە کوێ و لە سەر داوای کێ؟ وە بۆ بەکارهێنان لە چ کەنیسەیەك؟ ئەم دەستنووسە یەکێکی ترە پارێزراوە لە ئامێدی. دەستنووسی دوایی دواتر دووبارە چاککراوەتەوە لە سەردەمی پاپا پیوسی نۆیەم و پەتریك یووسف ئۆدۆ و بەبایەخدانی سەرۆك یەڵدا.

لە ساڵی ١٨٥٠ ـ لە سەردانی بادجر(١٤١). بۆ ناوچەکە ـ لەو گوندە دوو کەنیسە هەبووە؟ و (١١) خێزانی مەسیحی بەبێ قەشە بۆ ئەوەی خزمەتکردنی روحی پێویستیان بۆ بکات. لە ساڵی ١٨٧٨ رەبەن یاقۆ کوڕی سۆمو دەستنووسێکی نووسیوە بە پێنووسی خۆی کە لەو گوندە ژیاوە و ئەم دەستنووسە بریتیە لە سرود و شیعری هەمەجۆر ئێستا ئەو دەستنووسە لە پەرتوکخانەی دێری پاکیزە پارێزەری کشتوکاڵ'(١٤٢) ە.

لە ساڵی ١٩٦١ لە عەتووش شەش ماڵ هەبوو کوردی تێدا دادەنیشت و چوار ماڵە مەسیحی تێدا دادەنیشت لە کلدانەکان. ئەو کەنیسەی کە نوێژیان تێدا دەکرد نیوەی تێکدرابوو پاشماوەی کەلاوە بوو. لە نزیکیدا چیایەك هەیە و چەند کونە ئەشکەوتێکی تێدایە کە دەگەڕێتەوە بۆ رەبەنە تاك و تەنیاکانی پێشووی کۆن.(گوندی سدارە) ئەمڕۆ گوندێکی کوردیە لە ساڵی ١٩٤٧، سێ قەشەی کلدانی تێدا بوو، کە خزمەتی روحی خێزانە مەسیحیەکانیان دەکرد کە لەو گوندەدا نیشتەجێ بوون، بەڵام هەموو ئەوانە کۆچیان پێکرا و رۆیشتن بۆ ئەوەی لە عێن سفنێ نیشتەجێ ببن.

٣ ـ ئیسان

گوندی ئیسان بە عەرەبی پێی دەڵێن(صیان ـ سیان) لە دەستنووسی ئینجیل کە لە ئامێدی پارێزراوە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٥٢، لە دیزی نووسراوە و یان(بیدویل) کە

دەکەونە سەر رووباری کۆمەڵ، ناوی ئەو گوندە بە سیغەی عسیون. دەخوێنرێتەوە. نووسەری ئەم دەستنووسە قەشە ئیسحاق کوڕی حەننا لە خێزانی(خلمۆکا) - خاڵۆموکا - ی([١٤٣]). ئەلقوشی. ئەو پیاو چاکەی کە دابینکردنی خەرجی پێویست بۆ پەرتووکە دەستنووسەکە کرد قەشە(مرخایا)/(مرخایێ) کوڕی قەشە شەمعوون خەڵکی گوندی(ئیسان)ن ئەو دەستنووسە تایبەت بوو بۆ کەنیسەی دوو شەهیدەکە: مارقریاقۆس و مارزەدیقا. بە کردەوە ئەو کەنیسەیە ناسراوە بە کەنیسەی مارقریاقۆس St. Curiae بەڵام تاکی مارزەدیقا بە شوێنێکی تر دەگوترێت، کە لە چیای تەنیشتەوەیە. وە بە پێی رای خوالێخۆش بوو مەترانی(حەنناقریو) مەترانی ئامێدی ئەم ناوە شێواندرا بۆ ناوی قەدیس(مارزادوقا) من ئەم بنەمایە نازانم کە ئەو مەترانە بەرێزە پشتی پێبەستووە لە بۆچوونەکەی خۆیدا. لە ساڵی ١٩٦١ دانیشتوانی گوندەکە مەسیحی بوون، بەشی زۆریان کلدان بوون لەگەڵ کەمینەیەك لە نەستۆری. لەلای خۆرئاوای ئەو گوندە و بە دووری دوو کیلۆمەتر لەوێدا دۆڵێك هەیە پێی دەڵێن(رائولادا) دما واتە دۆڵی خوێن - ئەوەی تایبەت بەو ناوە دەگوترێ کە ناو نراوە ئەوەیە کاتێك کە خەڵکی ئەو گوندە لە سەر بت پەرستی مابوون. مەترانێك ویستوویەتی سەردانیان بکات. خەڵکە بت پەرستەکە ئەو مەترانەیان لەو دۆڵەدا کوشت.

٤ - ئارجن

لە بەراییدا، پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە لە سەرمان پێویستە جیاوازی بکەین لە نێوان ئەو گوندە و ئەو گوندەی کە یۆحەننا دەیلەمی بۆی دەگەڕێتەوە. ژمارەی خێزانەکانی نیشتەجێی ئەم گوندە (سەرەوە) لە ساڵی ١٩٦١ ١٥ خێزانی کلدانی بوون و کەنیسەیەکیان هەبوو دروست کرابوو بە ناوی مارگۆرگیس. زانیاریەکانمان لەسەر ئەمە بەستراوە بە پێشەکی دەستنووسێك مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٧٥٣. ئەم دەستنووسە گواستراوەتەوە بۆ مەترانی ئامێدی لە ساڵی ١٩٦٠. لە ئەلقوش نووسراوەتەوە بە پێنووسی دنحا کوڕی قەشە ئێلیا کوڕی قەشە یەڵدا. وە لە سەر داواکاری قەشە ئیبراهیم کوڕی قەشە هورمز لە ئارجن. ئەم دەستنووسە بەرگ کراوەتەوە بۆ جاری دووەم لە ساڵی ١٩٢٨ لە ئەلقوش هەروەها هیچ شوێنەواری کاولگە و پاشماوەی دێر لەو گوندە نیە تەنها ئەوە نەبێت هەندێك درەختی زەیتوونی تێدایە باس دەکرێت بە(پیرۆز) ی لە سەر گردۆکەکە مەزارێك هەیە پاڵی بە بەردێکی گەورە داوە دەڵێن هی مارئەورەهایە. تەنها ئەمە دەزانین لە بابەتەکەدا.

٥ - صورا

کاتێـك بـەرەو تـەواو بـوون دەچـین لـە کاروانەکـەمان دا بـۆ دۆزینـەوەمان بـۆ ناوچـەی رووبارەکە کاروانەکەمان بەرەو لای خۆرهـەڵات لە گوندی عـەتووش لـە ناوەڕاسـتی رێگـا لـە نێـوان ئـەو و رووبـاری خـازر گونـدی صـوڕا دەبیـنین. یەکـەمیان لـە نێوانیـان دا(صـورای سەروو) کە بانگی دەکەن بە(صوڕا جۆر)(سـورای ژوور)، کـە ئەمڕۆکـە بریتیـە لـە کاولگـە و پاشمـاوەی شـوێنەوار. لـە تەنیشـت کانیاوەکـە پاشمـاوەی بینایـەك دەبیـنین رووبەرەکـەی گەورەترە لە بینایەکانی تر، ئەم بینایە رەنگە هی کەنیسـەیەکی کۆن بێـت. لـە نـاو خـەڵك وا قسـە دەکرێـت کـەوا لـەو گونـدە وێرانکـراوە بـازاڕێکی گـەورە هـەبووە. دووەمیـان لەوانـە گوندی(صوڕای خـواروو) کـە پێـی دەڵێن(سوڕای ژێـری) و ئـەم گونـدە تـا کـاتێکی نـزیکیش هەندێك ئاشووری تێدا نیشتەجێ بـوون. دوای ئـەوە ئـەویش بـوو بـە کـەلاوە و لـەم گونـدە ئەشکەوتێك هەیە بـەناوی(مـاڕگریکوار) لـە راسـتیدا زۆر زەحمەتـە کـە ئـەو ئەشکەوتە هـی رەبەن قەدیس گریگۆریۆسی یۆنـانی رەسـەن بێـت کـە لـە نێـو رەبەنـەکانی یۆنـانی بـووە لـە سـەردەمی ئیمپراتـۆر(ڤـالانس)، کـە دێرەکـەی نزیـك لـە گونـدی بیلایـە([١١٤٤]). باسـەرکەوین ئیستا بەرەو لای خۆرئاوا لە گونـدی عـەتووش ئاراسـتەمان بـەرەو گونـدی(بـی بـوزی). لێـرە دەگەینە گوندێکی بچووك:(صوزیە / سۆزیە) کەتەنها پاشمـاوەی شوینەواری تیـا ماوەتـە، وە بەتایبـەتی شـوێنەواری کەنیسـەکەی. دواتـر گونـدی(تشـیمانگی) کـە ئیسـتا کـوردی تیـا نیشتەجێیە. بەڵام بەرەسەن دانیشتوانەکەی لە مەسیحیەکانن. بـەدووری (٣)کیلـۆ مـەتر، وە بەئاراسـتەی باشـووری خۆرهـەڵاتی عـەتووش گونـدی(کـانی مـازی) هەیـە پاشمـاوە و شوێنەواری کەنیسـەی ماڕیوحـەننان هەیـە کوردەکـان ئـەم شوێنـە پـیێ دەڵـین(بـیر حـالان). (ئافۆکێ) گوندێکی قەبارە گەورەبووە. ئەمرۆکە وێرانەو هیچی تیانـابینین تـەنها شوێنەوار و پاشماوەکە باسیان ناکرێت. دەکەوێتە دامێنی چیای گارا. ئەم گونـدە هـەمان ئـەو گوندەیـە کـەوا تۆمـا مەرگـەیی باسـی دەکـات بـەناوی(ئـەواخ) وە دەڵـێ دەکەوێتـە ناوچـە(تلانـا). لـەم گوندە(ئەحا) لەدایك بووە. کەرۆژێك سەرۆکی دیـڕی بێـت عـاوی بـوو. وە هـەروەها براکـەی کەناوی(شوحالماران )([١١٤٥]) بووە.

ئـەم دوو برایـە کـە قسـەمان لـە سـەر کـردن لـە قوتابخانـەی شلمات خوێندوویانـە خـەڵکی گوندی(ئەواخ) بەناوبانگە بـە نوێـژکردن و لـە خـوا ترسـدا. بۆیـە دەبینـین لـەو گوندەدا لـە مـاوەی یـەك ٧٠ حـەفتا قەشـە هـەبووە هـەر هـەموویان لـە خزمـەت کەنیسـەی گوندەکـە دابوون([١١٤٦]).

هەروەها لە خزمەت باوەڕداران دا یادگاری ناوبانگی ئـەو خـوا پەرسـت و باوەڕدارانـە تـاوەکو ئێستاش پارێزراوە لە نەوەکانی دوای ئەوان دا لە رۆڵەکانی ئـەو ناوچەیە تـاوەکو ئـەمرۆش. گوندی(برا منکێ) -(بەرا منکێ) کە ئەمڕۆ گونـدێکی کوردیـە لـە رۆژگارێکدا مەسیحی بـوو

کەنیسەی هەبوو بە ناوی مارگۆرگیس لە سەر جێگەی ئەو کەنیسەیە ئاغای گوند و سەرۆکەکەی کۆشکی خۆی لێ دروست کرد کە تاوەکو ئێستا مەلەوانگەی کەنیسەکە خۆی قووت دەکاتەوە و دیارە(؟). لە ناوڕاستی بینایەکە بە سەرکەشی و سەربڵندیەوە.

٦ ـ میزی

شوێنی ئەم گوندە بە دووری ٨ کیلۆمەتر لە عەتووش و بەلای خۆرئاوای لە باکووری خۆرهەلاتیەوە تاوەکو ئێستا ئەو گوندە لە سەر مەسیحیەتی خۆی ماوەتەوە و کەنیسەی هەیە بینایەکەی لەسەر ناوی(بەنی شمۆنی) ناونراوە. لەو کەنیسە سێ دەستنووسمان پێگەیشتووە ئێستا لە پەرتووکخانەی مەترانیەی ئامێدی پارێزراون. یەکەمیان هیچ پێشەکی تێدا نیە، بریتیە لە کەشکۆلێك لە ئەلقۆش نووسراوە دواتر چاکسازی بەسەردا هاتووە لە نزیکەوە لە ساڵی ١٨٨٤ لە سەر دەستی قەشە یاقۆ کوڕی سۆمۆ لە گوندی بیوز، لە ساڵی ١٨٨٢ سەرۆکی گوندەکە کە ناوی کێخوا کوڕی پۆڵس کوڕی نیسان هەڵسا بە داخوازی بۆ چاکردن و تەواوکردنی دەستنووسی نوێژە فەرمزەکان بە پێی سروتی دێری سەروو، کە لە گوندەکە دا هەیە، لە رەبەنەکانی دێری رەبەن هورمزد هەمان سەرۆك داوای کرد هەروەها بە تەواوکردنی نووسینی دەستنووسی ئینجیل بۆ بەکارهێنان لە گوندەکەیدا ئەوەی کە خەرج کراوە و داویەتی لە بری ئەم کارەدا نۆهەت قران بووە(پارەی سەردەمی عوسمانیەکان ـ وەرگێڕ).

یان بەرامبەر بە سەنگی چوار(باتمان لە برنج)(باتمان) یەکەیکی سەنگە کاتی خۆی بەکاردەهێندرا وابزانم یەکسانە بە وەزنە. هەروەها بە(چوار ئەمنان) ـ وەرگێڕ.

ئەم دەستنووسە تەواو بووە و نووسراوە کە ئینجیلی پیرۆزە لە گوندی ئەلقۆش بە پێنووسی قەشە ئەورەها کوڕی شەمعون کوڕی ئەورەها کوڕی دانیەل لە خێزانی قەشە ئیسرائیل و لە بنەماڵەی سەرۆك حەننایەو خێزانەکەی ناسراوە بە شکوانا. واتە(مێروولە).

لە ساڵی ١٨٨٨، سەرۆك(کێوا و قەشە یاقۆ) بەردەوام بوون لە هەوڵ و کۆشش بۆ تەواو کردنی کۆمەڵێك پەرتووکی سرووتی پێویست بۆ کەنیسەکەیان بۆیە چوون بۆ ئەلقوش و داوایان لە عیسا کوڕی شەعیا کوڕی قریاقۆس لە گوندی(ئیقرۆر) کرد کە سەر بە شارۆچکەی سمێلی سەر بە قەزای زاخۆیە، بۆ نووسینی دەستنووسێك بە ناوی(کزا) بە پێی سروتی بەکارهێنراو لە شاری موسڵ. بە تەئکید، ئەو گوندە بوون بە کاسۆلیکی لەو کاتەدا، مادەم لە پێشەکیەکەیدا دەخوێنین لەو دەستنووسەدا ناوی پاپالیۆنی سێزدەهەم نووسراوە لە پاڵ ناوی بەتریك ئیلیای حەوتەم.

لەلای باشووری میزی و بە دووری یەك چارەگ سەعات بە پیادە لێی شوێنێك هەیە پێی دەڵێن عومرکا(واتە دێری بچوك) لێرەدا بەردێکی هەڵکەندراو بە خاچێك لە سەر بەردەکە و هەندێك دار و ردەخت کە جێگەی ڕێزلێنانە و هەروەها لە چیای گارە ئەشکەوتێك هەیە پێی دەڵێن(ئەشکەوتی مارداویز) هەر دەم ئەو نەخۆشانە سەردانی دەکەن کە نەخۆشی گونیان هەیە.

٧ ـ خوردبنێ

گوندی خوردبنێ دوا گوندە(١٢٠٨) لە ڕێگەدا تووشی دەبین، و پێش ئەوەی بگەینە گوندی بیبوزی کە ئێمە بە ئاراستەی خۆرئاوا دەڕۆین بە پیادە سێ کاتژمێر لە بیبوزی دوورە. کەنیسەیەکی گەورەی تێدایە کە بریتیە لە سێ باڵ، بە ناوی پاکیزەی قەدیسە. تاوەکو ئێستاش بە شکۆیی و هەیبەتەوە ماوەتەوە. سەرۆکی کوردەکان کە لەو گوندە نیشتەجێن بەکاری دێنی وەك ماڵ خانوو بۆ خۆی. لە شوێنێك کە زۆر دوور نیە لەو گوندە کانیاوێك هەیە خەڵك پێی شیفا دەبێت ئەوانەی تووشی تا دەبن. ئەم کانیاوە بە ناوی هیچ قەدیسێك نیە، ناوەکەی زۆر بە ساکاری(کانیاوی تایە).

کەنیسەی گوندی خوردبنێ بە ناوی(دایکی ڕۆناکیەکان) و چەند دەستنووسێکی بەناو کراوە و ژمارەیەکی گەورە لەو دەستنووسانە ڕێگەی خۆی گرت بەرەو پەرتووکخانە جیاکان. کۆنترین دەستنووس لەو دەستنووسانە پاش ماوەیەکی کورت گەیشتۆتە ئامێدی کە بریتیە لە کەشکۆڵێك لە ئەلقۆش نووسراوە بە پێنووسی قەشە گۆرگیس کوڕی قەشە ئیسرائیل([147]).

لەو گوندە قەشەیەکی زۆر چالاك ژیاوە، هیچ کەسێکی تری هاوشێوەی نەزانیوە. پاش ماوەیەك لە خزمەتکردن لەو گوندە بڕیاری داوە کەوا بە ناوی ئەو کەنیسەیەی کە خزمەتی باوەڕداران دەکات ژمارەیەکی نوێ و تەواو لە پەرتووکەکانی سروتی و هی تریش. ناوی ئەو قەشە چالاك و خانەدان و بە غیرەتە قەشە یووسف کوڕی شەمماشە هورمز بووە. چیرۆکێك پەیوەندی هەیە بە پەرچووەکانی(مەریەمی پاکیزە) دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٦٩٠([148]).

زانیاریەکمان دۆزیەوە پەیوەندی بەو گوندەوە هەیە. لە خوێندنەوەی درێژەی چیرۆکەکە تەفسیرێکی روون و ئاشکرا دەبینرێت لە سەر ناوی ئەو گوندە. کورتە چیرۆکەکە:(لەوێدا بازرگانێکی زۆر دەوڵەمەند هەبووە، بەهۆی کارەکەی، پێویستی بەوە بووە سواری کەشتیەك ببێت کە کەلوپەلەکانی هەڵدەگرت و بۆ چەند جارێك ئەو بازرگانە بۆ سێ جار ڕووبەڕوو بۆوە، ئەو کەشتیەی کە هەڵیگرتووە خەریکە نقوم دەبێت بە مسۆگەر، بەڵام کاتێك پرسیار لە مەریەمی پاکیزە دەکات یارمەتی دان و ڕزگار بوون لە مردنێکی

مسۆگەرەوە بە خنکان، مەریەمی پاکیزە داواکەی قبوڵ دەکات و یارمەتی دەدات. لە جاری دواییدا و پاش رزگار بوونی و گەیشتنی بە وشکانی، خۆی بینی کەوا لە دوورگەیەکی دابڕاوی چۆڵ دایە و لەوێدا گەیشتە رەبەنێکی خوا پەرست و تاك و تەنها لەوێ دەژی دابڕاو لە مرۆڤ و هەراوهۆریای جیهان بە تەواوەتی. ئەو رەبەنە بازرگانەکەی ئاگادار کرد و ئامۆژگاری کرد کەوا کەنیسەیەك دروست بکات بەناوی کەنیسەی پاکیزە بۆ سەلماندنی سوپاگوزاریەکەی بۆ پاکیزە و ئەو یارمەتیە گەورەیەی پێشکەشی کردووە. دوای ئەوە دەعبایەکی دەریایی بۆ هات و سێ دانە مرواری گرانبەهای پێشکەش کرد، دوای ئەوە فریشتەیەکی ئاسمانی بۆی هات و هەڵیگرت بۆ وڵاتی خۆرهەڵات. یەکسەر دوای دانانی لەلایەن فریستەکانەوە لە سەر زەوی پێی گوت: تەماشای لای خۆت بکە دەقی وتەکانی فریشتەکە بە سریانی ئەمەیە(حۆرلزەبتاخ) لەو جێگەیە ئەم بازرگانە هەیکەلێکی قەشەنگی لە سەر شەرەفی پاکیزە دروست کرد. لەو کاتەوە ئەو گوندە پێی دەڵێن(خورتبینی). بۆ درێژە دان بە قسەکردن لەسەر قەشە یووسف دەڵێن(سەرەرای ئەوەی بە ناوی کەنیسە وەقفی کرد لە دەستنووسەکان، لە ساڵی ١٦٨٢ داوای کرد دەستنووسێکی بۆ ئامادە بکرێت، کە ناوەرکەکەی ئاوازەکان و شیعرەکانی وەردەی تێدا بوو(١٢١١). دوای تێپەڕبوونی دوو ساڵ بەسەر ئەمەدا داوای کرد بە نووسینی دەستنووسێك بۆ هەر(٥) پێنج سفرەکانی موسا([149]).

دواتر لە ساڵی ١٦٨٧ بایەخی دا بە چاکسازی کردن بە دەستنووسێکی گرنگ رەنگە بە گەنجینە و خەزێنەیەکی بەنرخ بێت([150]). لە ساڵی ١٦٨٩ بایەخدرا بە پەرتووکی Lectionnarie ([151]). یان پەرتووکی خوێندنەوەکان، لە ساڵی ١٦٨٧ داوای کرد ئەو دەستنووسە بنووسرێت، کە بریتیە لە شیکردنەوەیەکی دوور و درێژ بۆ نوێژە فەرزەکان([152]). لە هەمان ساڵ دا داوای کرد بۆ نووسینی دەستنووسێك بۆ سفرەکانی پێغەمبەران و سفری الحکمە([153]). لە ساڵی ١٧٠٠ جگە لە کارەکانی تری هەڵسا بە دەستنوویکی تر کە بریتی بوو لە سروده ئاینیەکانی تایبەت بە رەبەن هورمز(ئونێسا)([154]). لە ساڵی ١٧٠١ دەستنوێکی نوێ کاری لە سەر کرا کە بریتیە لە خوێندنەوەی سفرەکانی پێغەمبەران([155]) و دەستنووسێك بۆ نامەکان(١٢٢٠). لە ساڵی ١٧١٦ دەستنووسێکی تر نووسراو تەواو بوو بەناونیشانی(پەرتووکی قەشەکان) کە ئەمەش لەسەر داوای ئەو بوو([156]).

لە کۆتایی دەستنووسێکی تایبەت بە مێژوو، کە مێژووەکەی لەسەر نیە بەڵام ناوی لە سەر تۆمار کراوە([157]).

لە ساڵی ١٧٥٥ ، لەم گوندە قەشەیەکی تر بە ناوی قەشە یووسف دەرکەوت، کە ناوی باوکی قەشە گبرئیل بوو، ئەم قەشە نوێیە بەردەوام بوو بۆ کاری دیار و گرنگ(واتە هاوشێوەی ناوی خۆی بوو) بەلام نەدەگەیشتە پلەی ئەو قەشەیەی یەکەم کە ماوەی خزمەتکردنی لە سەرەتای سەدەکەدا بوو. ئەوە قەشە یووسف کوڕی گەوریل خستیە سەر ناوەڕکی پەرتوکخانەی کەنیسەی پاکیزە(كنيسة العذراء) کە تایبەتە بە گوندەکە، دەستنووسێك نوێژەکانی سروتە تایبەتیەکان بە ڕێوڕەسمی ناشتنی مردووان بۆ بەکارهێنانی ئیکلیرۆس. ئەم دەستنووسە لە ئەلقۆش نووسراوە، بە پێنووسی قەشە دنحا کوڕی قەشە ئیلیا. بەم دوایە لە پەرتوکخانەی مەترانیەی ئامێدی بوو. لەو زانیاریانەی کە مێژوونووس بادجر لە ساڵی ١٨٥٠ تۆماری کردووە هاتنی قەشەیەکی نوێ بۆ سەر مەزهەبی کاسۆلیکی، کە دواتر هەموو باوەڕدارانی تر کە سەر بە کەنیسەی ئەو بوون هاتنە سەر مەزهەبی کاسۆلیکی. لە شوێنێکی تر باس لە شوێنی گوندەکە دەکات و دەڵێ شوێنەکەی نزیکە لە کانیاوێکی سەرەکی کە ئاوەکە بەشێکە لە ئاوی رووباری کۆمەڵ([158]).

لە مومتەلەکاتی پەرتوکخانەی نیشتمانی لە پاریس زەخیرەیەك لە گوندی خورتبنێ گەیشتووە و دەستنووسێك لە سەر ژیاننامەی قەدیسەکان دزراوە لە کاتی رووداوەکانی تالان و برۆ دا کە دەستدرێژی کرا بە سەر کەنیسەکە و ئەوەی لە ناویدایە و پەرتوکخانەکەی کە لە سەرەتادا قەشەیەك سەرپەرشتی دەکرد لە خێزانی هۆمۆی بەناوبانگ بە خۆشنووسەکانی ئەلقۆشەوە دواتر ئەو دەستنووسە بووە خاوەنداریەتی بەرێز پەتریك عەودیشۆع خەیات کاتێك کە میتراپۆلیتی ئامەد و مووسڵ بوو، کەواتە ئەمە دەبێ پێش ساڵی ١٨٩٤ روویدابێت. لەبەر ئەوەی نووسینی ئەو دەستنووسە لە ساڵی ١٨٦٦ بووە. بۆیە لە توانامانداییە ئەوەمان دەست کەوێت کەوا رووداوی هێرشکردنە سەر کەنیسە و پەرتووکخانەکەی و تالانکردنی ناوەڕکەکەی لە نێوان ساڵانی ١٨٦٦ و ١٨٩٤ ناتوانین هیچ دیاریکردنێکی تر لەمە زیاتر بدەین([159]).

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بدەم کە وتم ئەمڕۆ گوندی خورتبنێ گوندێکی کوردیە بەتەواوەتی. ئێستا ئەگەر هەوڵ بدەین بەردەوام بین لە سەر ڕێچکەی باسەکەمان کە ئێمە تاوەکو ئێستا لەم دۆڵە جوان و دلڕفێنەداین کە زەویەکانی بە درەختی سنۆبەر داپۆشراوە کە وای کردووە ئەم دۆڵە جوانترین ناوچە بێت لە زەوی عێراق، وە چووینە خوار بەرەو باشووری دوور([160]). گەیشتنمان بۆ پێچاوپێچەکانی چیا کە دەڕوانێتە ئەو ڕەزوباخانەدا کە دەوڵەمەندن و ناسراوە بە بلکێفێ([161]).

(باکلۆیێ ـ جێگەی سەگەکان) هەندێك ئەشکەوت دەبینین لە ناو بەردەکان دا هەڵکەندراو نەقاری کراون. دواتر دەگەینە ئەوپەڕی لای خۆرئاوا لە تیلانا لێرە و بە دووری ٢١

